بەرگی دووەم

# محەممەدی مەلەکەتی نوور

◄ ڕۆمانی ژیانی باشترین پیاو

◄ لە کۆچەوە بۆ خەندەق

نووسینی
◄ ماکوان کەریم



# مەملەکەتی نوور

## ڕۆمانی ژیانی باشترین مرۆڤ

(بەرگی دووەم)


نووسینی: **ماکوان کەریم**

پێداچوونەوەی: **شەوبۆ جەلال، زیوەر ئەنوەر**

نوسینەوەی: **فیردەوس موحەممەد**



کتێبخانەی **حاجی قادری کۆیی**




بەڕێوەبەری گشتی: **موحەممەد خضر ئەحمەد ٠٧٨٢٤٦٧١٣٩٤ - ٠٧٥٠٤٦٧١٣٩٤**

بەڕێوەبەری هونەری: **موستەفا موحەممەد کوردی ٠٧٥٠٩٩٩٨١٨٢**

فەیسبووک: **کتێبخانەی حاجی قادری کۆیی/ M.Ktebxana**

ئنیستکرام: **کتێبخانەی حاجی قادری کۆیی/ M.Ktebxana**

لقی یەکەم: **بەرانبەر دەرگەی قەڵا - بازاڕی ڕۆشنبیری**

لقی دووەم: **چوارڕیانی شێخ مەحموود - بەرانبەر مزگەوتی مەحموود عەلاف**

ئیمێل: **mdmaktaba@gmail.com**

نەخشەسازیی ناوەوە: **موستەفا موحەممەد کوردی**

نەخشەسازیی بەرگ: **برەو نەججاڕ**

چاپی یەکەم: **٢٠٢٤**

پێوانە: **١٧ * ٢٤**

تیراژ: **٤٠٠٠**

نرخ: **٣٠٠٠٠**

**لە بەڕێووبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان - هەرێمی کوردستان**

**ژمارە سپاردنی (١٨٨)ی ساڵی (٢٠٢٠) پێدراوە**

# مەملەکەتی نوور

## ڕۆمانی ژیانی باشترین مرۆڤ

(بەرگی دووەم)

نووسین:

ماکوان کەریم

چاپی یەکەم

٢٠٢٤

یا مزمل بـۆ خەڵاتێ یا مدثـر بۆ کاڵای تـۆ
یاسین لەقەبی تەشریفت طه بۆ بەدری گۆنای تۆ

م. عبدالکریم مدرس



# سەرەتایەكی سەرەتایی

كاتێك كە بەرگی یەكەمی مەملەكەتی نوورم نووسی فریا نەكەوتم بە چاپكراوی ببینم، بەڵكو دەستگیر كرام، نەرویج دوو مانگ زیندانی كردم پاشان ڕادەستی ئیتاڵیا كرام.

لە ماوەی گیرانەكەمدا لە نەرویج داوای كتێبەكەی (فەرغەلی)م كرد بۆیان هێنام، بوو بە هاوڕێی زیندانم. لەگەڵ خۆمدا زیندان بە زیندانم پێدەكرد لەخۆم زیاتر ئاگام لێی بوو، چونكە بووبووە خەمڕەوێنم! تاكە هۆكار بوو دەیبردمە دەرەوەی زیندان و لەناكاو لە غەفڵەتدا دەگەڕامەوە بۆ كونجی زیندانی ڕۆم و خاچپەرست و مولحیدان!

كتێبەكەی فەرغەلی بووبووە مایەی دڵخۆشكەریم، دەمگوت مادام خاوەن ئەو كتێبەم ئیتر كێشە چییە؟ لەگەڵیدا دەژیم و بگرە لەگەڵیشی دەمرم.

كە چوومە یەكەم زیندان لە ڕۆما بەناوی (جڤێناڤێگا) هەموو كەرەستەكانی خۆمیان لێ سەندم تا ١٥ ڕۆژ كەرەنتینە كرام، لە دوایي تەواو بوونی ماوەی كەرەنتینە وام زانی ئەو ئێوارەیە هەموو شتومەكەكانم دەدەنەوە، بەڵام بردیانم بۆ دوورگەیەك بەناوی (دوورگەی سەردینیا)، لەوێش ١٥ ڕۆژ كەرەنتینە كرام ئەوەی كە پێم بوو خرایە جێگای تایبەت تا لە دواییدا وەری بگرمەوە.

ماوەی كەرەنتینەی ئەوێشم تەواو كرد دەنگ نەبوو، زمانی ئیتاڵیم نەدەزانی ئەوانەی لەوێش كاریان دەكرد هیچ ئینگلیزییان نەدەزانی، تەنانەت نەیاندەتوانی بە ئینگلیزی بپرسن ناوت چییە؟

بوو بە ١٧ ڕۆژ كەس بەلامدا نەهات، بۆیە لە ژوورەكەی خۆمەوە هاوارم كرد (معەسكەر)ی نازی، پیاوانی گوانتانامۆ، خاچپەرست و خاچدروشمەكان. چی لە ژوورەكەدا بوو شكاندم، هەمووان كۆبوونەوە بە ئیتاڵی قسەیان دەكرد لەگەڵمدا منیش یەك وشە تێنەدەگەیشتم. كێشەی من ئەوە بوو كە دۆسییەكەم تیرۆر بوو، هیچ كەس لە زیندانییەكانی تر بۆیان نەبوو قسەم لەگەڵ بكەن، ئەو كاتەی ئەم كارەم كرد ئێوارەی (٢. ١١. ٢٠٢٠) بوو كوڕێكی لیبییان هێنا، بوو بە وەرگێڕ لە نێوان من و ئیتاڵییەكاندا.

كوڕە لیبییەكە وتی: فەرموو ئەو ئیتاڵیانە دەڵێن چی دەوێت؟!

ماكوان: قورئانەكەم و جل و بەرگ و هەندێك كتێب و تەزبیحەكەم؟!

ماوەی ١٧ ڕۆژە لەم ژوورەدام کەس لێی نەپرسیووم، دەکرێ بپرسم بۆچی من هاتووم بۆ ئێرە و چیتان دەوێت؟!

کەوام وت کوڕە عەرەبەکە بۆی وەرگێڕان، بوو بە مقۆ مقۆ لە نێوانیاندا، کوڕە لیبییەکە ناوی خۆی وت کە گوایە ناوی -محمد-ە، ئیتاڵییەکان نەک لێم دەترسان، بەڵکو تەنانەت نزیکی دەرگاکەش نەدەبوونەوە، وایان دەزانی من دەیان خۆم، ئاگام لێبوو محمد-یش دەترسا.

محمد: دەڵێن بەدەست ئێمە نییە، ئێمە لێرە تەنها پاسەوانین و هیچ فەرمانێکمان بۆ ئەم کەسە پێ نییە؟!

ماکوان: باشە برا، تۆ خۆ موسڵمانیت تۆ هاوکاریم بکە، ئەمە ژمارە مۆبایلی خێزانمە تەنها تەلەفۆنێکیان بۆ بکە و بڵێ ماکوان لەم شارە و لەم دوورگەیە زیندانی کراوە؟

محمد: ژمارەکە بنووسە، من ناتوانم قسەت زۆر لەگەڵ بکەم هەرچی دەڵێیت دەبێت وەریگێڕم دەنا منیش سزای زیاتر دەدرێم، دەڵێن تۆ زۆر ترسناکی ژمارەکە بنووسە و فڕێیدە بەردەم ژوورەکە لە کلێنسێک دا منیش هەڵی دەگرمەوە و فڕێی ئەدەم، دوای خۆڵەکە دەرێژم و هەڵیدەگرمەوە.

ماکوان: خوا جەزای خێرت بداتەوە، بەپەلە چوومە دواوە و لە مەجالێکدا پاسەوانەکان سەرقاڵ بوون نووسیم بۆم فڕێدا، ئەویش هەڵیگرتەوە. پاش کەمێک کەسێکی بەتەمەن بۆ لام هات، زۆر ڕێزی نواند و وەکو هیندییەکان سەلامی لێ کردم، تۆزێ ئینگلیزی دەزانی تێگەیشتم کە لێپرسراوی پاسەوانەکانە، وتی ئەم ئێوارە ئەتگوازینەوە بۆ قاتی (نهۆمی)سێیەم و دەچیت بۆ لای خەڵکی زۆر باش!

زۆر لەسەر ئەم باسە و وردەکارییەکانی نادوێم، بە پشتیوانی خوای پەروەردگار لە جێگای تردا بە ڕوونی بۆتان باس دەکەم.

چوومە بەشێکی نوێ لە نهۆمی سێیەم ناسراو بوو بە بەشی تیرۆر و مافیا، وامزانی زۆر ترسناکە، بەڵام پێچەوانەکەی ڕاست بوو، هەموو خەڵکی خواناس و بەڕێز و دیندار بوون، زۆربەیان وەکو خۆم بەزوڵم گیرابوون کە زانیان کەسێکی نوێ هاتۆتە بەشەکەیان هەموو بەدەممەوە هاتن، وەکو برا و باوک و کەس و کار وابوون، لە ئەلبانی، پاکستانی، مەغریبی، توونسی، سووری، جەزائیری و میسری؛ ئەم جۆرە خەڵکانەی لێبوون چەند موسڵمانێکی ئیتاڵی کە ڕەگەزیان ئیتاڵی بوو موسڵمان بووبوون لەسەر ئەوەش گیرابوون کە بانگەوازیان کردووە.



خۆشحاڵ بووم لەناو ئەو موسڵمانانە دابووم مزگەوتمان هەبوو لەناو بەشەکەمان بانگ ئەدرا و جومعە و جەماعەتمان زۆر ڕێکوپێک بوو، دوای چەند ڕۆژێک هەموو جل و بەرگ و کتێبەکانیان بۆ گەڕاندمەوە.

لەدوای قورئان خوێندن دەستم دایە کتێبەکەی فەرغەلی دەستم کرد بە خوێندنەوەی، بە هیوای ئەوەی بچمە خزمەت پێغەمبەری ئازیز ﷺ بەشی یەکەمم تەواو کردبوو، بەدوای بەشی مەدیەن دەگەڕام چاوم کەوتە سەر بەشێکی گرنگ لە هیجرەت لەسەری وەستام، لەم کتێبەدا نووسرابوو پێغەمبەر ﷺ پێش ئەوەی بگاتە شاری یەسریب لە ڕێگا لە نزیک بەنی تەمیم ئەگات بە قافڵەی بازرگانی زوبێری کوڕی عەوام و تەڵحەی کوڕی عوبێدوڵلا، دوو قاتی سپی واتا کراس و شەڕواڵ کە هەردووکیان عەرەب پێیان دەڵێن (ثیاب) دایانە پێغەمبەر ﷺ و ئەبوبەکری صدیق، بە بەرگی سپییەوە کەوتنە ڕێ بەرەو شاری یەسریب، من لەناو زیندانەکەم چاوم نا بەیەکدا و کتێبەکە بردمی بۆ نزیک شاری مەدینە بە چواردەوری خۆم هەڵخولام کەس نەبوو، بەڵام زۆر دڵخۆش بووم چونکە ترسم لە هیچ نەبوو، خەمی گەڕانەوەم نەبوو، دەمزانی زیندانم لە زیندانی خاچپەرستانی ڕۆم.

لەپڕ دوو کەسم لێ پەیدا بوو بەرەو لای من ڕایان دەکرد، منیش ڕووەو ئەوان بە هێمنی دەڕۆیشتم، کە نزیک بوونەوە لێم شمشێریان لێ دەرهێنام و وتیان چیت پێیە داینێ، ئەیانڕوانییە پێشەوە هەستیان دەکرد کەمینم بۆیان دانابێت، لێیان پرسیم چی دەکەیت لەم ناوە لەگەڵ کام قافڵە دایت؟ هەر خۆتی یان کەسی ترت لەگەڵدایە؟!

ماکوان: نا، هەر خۆمم هێمن ببنەوە پارە و شتم پێ نییە و لەقافڵەکەم ون بووم، بەشوێنیاندا دەگەڕێم ئەگەر بۆم بدۆزنەوە هاوکاری باشتان دەکەم؟!

یەکێک لە دووکەسەکە پرسی خەڵکی کوێیت؟! سەرۆک قافڵەتان ناوی چییە؟!.

ماکوان: وڵاتی فارس و کوردم!

هەروام وت شمشێرەکەیان خستەوە کێلانەکانیان و وتیان قافڵەی (نومێرە).

گوێم لێ بوو بەیەکەوە قسەیان دەکرد پشتیان تێکردم و وتیان ئەمە هیچ سوودی نییە، زۆر بەئاسانی جێیان هێشتم، هەرچی بانگم کردن هەر وەڵامیان نەدامەوە.

ڕێگاکە تەپۆڵکە و گردی زۆری لێبوو، لەسەر گردێکەوە چاوم لە دۆڵێک بوو تەپوتۆزی لێ هەڵدەستا منیش ڕووەو ئەو غوبار و خۆڵە ڕۆیشتم، وتم بەدڵنیاییەوە یان سوارە یان قافڵە و کاروانە یاخود بازاڕ و ناوچەیە. کەوتمە ڕێ وردە وردە گرد و نشێوم دەبڕی دیسان دوو



کەسەکەم لێ پەیدابوونەوە، هەموو ماوەی کاتژمێر و نیوێک یان دوو کاتژمێر لێم دوور کەوتبوونەوە، دیسان بەدیم کردنەوە هاوارم لێ کردن، پیاوی چاک بن هاوکاریم بکەن؟

ئەمجارە بە دەموچاوی پێکەنیناوی هاتن بۆلام و وتیان چیت پێویستە هاوکاریت بکەین؟

ماکوان: دەمەوێت بڕۆم بۆ شاری مەدینە؟

وتیان لەم ناوە جێگایەک نییە ناوی شاری مەدینە بێت، تەنها شارێک هەیە لە پشتی ئەو دوو گردەوە ناوی یەسریبە.

ماکوان: دەی سوپاستان دەکەم، من بۆ ئەوێ دەچم، چۆن بڕۆم زوو دەگەم.

وتیان: ڕێگا مەگۆڕە هەر لێرەوە بە کاتێکی کەم دەچیتە ناو شار، ئەی تینووت نییە، ئاوت نەدەینێ؟ یان ئەگەر برسیتە خورمامان پێیە؟

زۆر سەرسام بووم بەوەی کە کەسانێک پێش ئێستا دەیانویست ڕووتم بکەنەوە و دزیم لێ بکەن و چەتە بوون، چۆن لە ماوەیەکی کورتدا ئاوا بوونە پیاوچاکی خوا؟! حەپەسا بووم بە دیاریانەوە.

ماکوان: ئەگەر دەکرێت کەمێک ئاوم بدەنێ تینوومە؟!

ئاو و خورمایان دەرهێنا و خستیانە بەردەمم، لەگەڵ یەکتردا قسەیان دەکرد باسی کەسێکیان دەکرد کە زۆر میهرەبانە و چاکەی لەگەڵ کردوون.

ماکوان: دەکرێت بپرسم ئەو کەسە کێیە؟!

وتیان: ئێمە چەتە و ڕێگرین دزی لە خەڵکی دەکەین، ئەوە ماوەی ساڵێکە کەس لەم ڕێگاوە هاتووچۆ ناکات مەگەر بەدەگمەن، بەڵام ئەمڕۆ تۆ و دوو پیاوی ترمان بەدی کرد، زانیمان تۆ هیچت پێ نییە ڕۆیشتین فریای ئەو دوو کەسە بکەوین، پێشتر لە دوورەوە کەمینمان بۆ دانابوون کە نزیکیان بووینەوە پیاوێک هات بۆ لامان، ئێمە ویستمان ڕووتیان بکەینەوە کەچی ئەو پیاوە ئێمەی ڕووت کردەوە لە تاوان و بانگەوازی کردین بۆ جوانترین و بەڕێزترین ڕەوشت، ماوەیەکی کەم لە خزمەتیدا بووین، ئێمەی لە دزەوە کردە پیاو چاک.

ماکوان: ناوی چییە؟

وتیان: ناوی محمد-ە ﷺ خەڵکی شاری مەککەیە و ماوەیەکە خەڵکی باسی دەکەن، خۆشی وتی من پێغەمبەرم ﷺ ئێمە ناومان لێنراوە (ئەو کەسانەی کە



ناپوختە و ئیهانە کراون و ئیهانە دەکەن) کەچی ئەو ناوەکەی گۆڕی بۆ دوو کەسە بەڕێزەکە، ئێمەش پەیمانمان داوەتێ تا دەمرین قسەی نەشکێنین و بڕوامان هێناوە پێی.

ماکوان: خۆشحاڵ بووم بە ناسینتان، ئەوەی کە ڕێزی لێ ناون خۆی بەڕێزترین کەسی مرۆڤایەتییە، بە یارمەتیتان من دەڕۆم بەڵکو بە خزمەتی بگەم.

خوا حافیزیم لەوان کرد کەوتمە ڕێ بەرەو شاری یەسریب، کاتێک نزیک شار بوومەوە لە ڕێگا قافڵەیەک لە نزیک باخێک لای دابوو منیش ڕووە و ئەو قافڵەیە ڕۆیشتم بۆ پرسیار کردن، نزیک بوومەوە لێیان و پاسەوانی قافڵەکە بەرەو ڕووم هات، سڵاوم لێ کرد پێم وت لەڕێگای دوورەوە هاتووم دەمەوێت پشوو بدەم پاشان بەرەو شاری یەسریب دەڕۆم، کەسەکە پێشوازی لێ کردم و وتی: شیر و خورمامان زۆر لایە بڕۆ پشوو بدە ئێستا بۆت دەهێنم.

چوومە ژێر سێبەری دارخورمایەک و پاسەوانی قافڵەکە جامێک شیر و قاپێک خورمای بۆ هێنام، منیش سوپاسم کرد وتم ببورە بەڵام من هیچ پارە و سەروەت و سامانێکم نییە لە حەقی ئەوەی بتدەمێ!؟

پاسەوانەکە: نا پێویست ناکات خاوەن قافڵەکە کەسێکی دەست و دڵ باشە و لە پێناوی خوادا ئەو کارە دەکات.

ماکوان: خوا جەزای بداتەوە بۆی بخاتە ئەجری قیامەتی، ئامین.

پاسەوان: تۆ موسڵمان بوویت؟!

ماکوان: بەڵێ سوپاس بۆ خوا، دەمەوێت بڕۆم بۆ خزمەتی پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ لەم شارە.

پاسەوانەکە: بەندەی خوا تۆ ناوت چییە؟

ماکوان: من ناوم ماکوانە و ناسراوم بە (أبو آناء).

پاسەوانەکە: خواردنەکەت بخۆ و پاش کەمێکی تر دێمەوە لات.

ماکوان: بفەرموو بەڕێز، سوپاس بۆ ماندوو بوونت و بۆ سەرۆک قافڵەکەشتان.

سەرقاڵی خواردنی شیر و خورما بووم لە پڕ پاسەوانەکە و کەسێکی تر ڕووەو من هاتن، منیش لە دڵی خۆم دا وتم حەتمەن دەڕۆن لەم ناوە بۆیە وا بەپەلە ڕووەو من هاتن بۆ ئەوەی قاپەکانیان بەرنەوە، بە پەلە شیرەکەم نۆشی، ڕۆیشتم بەرە و جۆگەلەی ئاوەکە قاپەکەیان بۆ بشۆم، لە دواوە کەسێک باوەشی پێدا کردم، ئاوڕم داوە (نومێرە).



نومێر: ئەوە لەکوێیت برا عەزیزەکەم زۆر لەمێژە چاوەڕوانتین.

ماکوان: تۆی پڵنگی[1]؟ برام چۆنی و باشی سڵاوی خوای پەروەردگارت لێ بێت، ئەوە چی دەکەیت لەم ناوە؟!

نومێر: چاوەڕوانی تۆ بووین، زۆر لە مێژە بەدواتا دەگەڕێم، بڕۆ بچینە ژێر دەوارەکەمان، خواردن ئامادە دەکەین!

ماکوان: زۆر باشە، دەنگوباسی سەعد و عەبدوڵلا و ئەوان چۆنن؟!

نومێر: لە مەککە سەرقاڵی کاری ترن و لێرە خەڵکێکی ترم لەگەڵدایە، سوپاس بۆ خوا هەموو موسڵمانن، ئەمڕۆ پێغەمبەری خوا ﷺ دەگاتە (قوبا)[2] نزیک شاری مەدینە.

ماکوان: بەڵێ دەزانم، هەر لە ڕێگای کتێبەکەوە گەڕاومەتەوە بۆ ئێرە بەڵام دەزانی من زیندانم لە ئیتاڵیا دەستگیر کراوم! نەرویج ڕادەستی ئیتاڵیای کردووم!

نومێر: دەمزانی شتێک ڕوویداوە، بەڵام نەمدەزانی چییە، زۆر باشە گرنگە کە گەڕاینەوە بۆم باس بکە. پاشان با بەو کەسانەشت بناسێنم لەگەڵ قافڵەکەماندان، ئەوان هەموو تۆ دەناسن و باسی تۆم بۆ کردوون، ئەم ماوەیە لە شاری مەدینەی پێغەمبەر ﷺ دەمێنینەوە.

ماکوان: بە پشتیوانی خوای پەروەردگار بۆت باس دەکەم بەڵام با پەلە بکەین، بەڵکو بگەینە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ بەڕاستی موشتاقم بۆ لای!

نومێری برام بەڕاستی زۆر ماندوویان کردووم مەگەر ماندوویتیم لە بینینی ئەو ئازیزە ﷺ دەربچێت.

نومێر: دەڕۆین دەیبینین، بەڵام دەبێت بزانیت تۆ و من ناتوانین بچینە خزمەتی دەبێت هەر لە دوورەوە تەماشای بکەین؟!

ماکوان: بۆ برا، بۆ؟ ئەو بڕیارە قورسە چییە، گەشبینبە؟!

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

١ ـ (نومێر) لە زمانی عەرەبیدا بەمانای پڵنگ دێت.

٢ ـ قوباء.



نومێر بەپێکەنینە خۆشەکەی خۆی وتی: هەر بمانەوێت بچینە خزمەتی ڕاستەوخۆ دەگەڕێینەوە بۆ زەمەنی خۆمان، جا بۆ ئەوەی زیاتر لە خزمەتی دابین و لە دوورەوە تەماشای دەکەین و فێربین لێی و بزانین جەنابیان چی دەکەن و چی لێوە فێردەبین.

ماکوان: خوای گەورە ئاسانی بکات.

ڕۆیشتنە ژێر دەوارەکەیان منیان بە کۆمەڵەکەی ناساند لەگەڵیدابوون، زیاتر لە (٧) پیاو و (٣) ئافرەت بوون، هەندێک لە پیاوەکانی ناردبوو بۆ بازاڕی یەسریب لەوێ خەریکی کڕین و فرۆشتن بوون، منیش باسی خۆمم بۆ گێڕایەوە و زۆر خەمی بۆ خواردم و دڵی دامەوە، وتی خەمی پارە و سەروەت و سامانت نەبێت، پارەمان زۆرە و قافڵەکەمان سوود و قازانجی باشی کردووە.

نومێر: پشووبدە بەیانی بەیەکەوە دەچین بۆ (قوبا) نزیک شاری مەدینە.

ماکوان: قوبا چییە؟

نومێر: دێیەکی بچووکە لە خوار شاری مەدینە، نزیکە لە قەڵای یەهوودییەکان بەتایبەت ناوچەی (بنو نظیر).[٣]

ماکوان: ئێستا پێغەمبەری خوا ﷺ لە کوێیە؟

نومێر: لە قوبا لە ماڵی کەسێک بەناوی (سەعدی کوڕی خەیسەمە)[٤]یان (کەلسومی کوڕی هەدم).[٥]

ماکوان: ناوی کەلسوم پیاوە یان ژنە؟

نومێر: ناوی کەلسوم عەرەب بۆ هەردووکیان بەکاری دەهێنێت.

ماکوان: واتا دوێنێ گەیشتۆتە قوبا، ئێستا ساڵی چەندە؟

نومێر: ساڵی (٦٢٢) ز. جەنابی پێغەمبەر ﷺ ٢٢ی مانگی ٩ گەیشتە قوبا.

ماکوان: واتا ئەم شەو کە من لێرەم شەوی(٢٣. ٩. ٦٢٢) ز.؟

نومێر: بەڵێ، پشووبدە بەیانی دەچین بۆ خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ.

---

٣ ـ (بنو نظیر) وشەیەکی عەرەبیە و لەمەودوا لەم کتێبەدا بەڕێنووسی کوردی بەنوو نەزیر دەینووسین

٤ ـ سعد بن الخیثمة

٥ ـ تەواوی ناوەکان لەم کتێبەدا بە ڕێنووسی کوردی نووسراون، کلثوم بن الهدم.



ڕۆژ بوویەوە بەرەو قوبا ڕۆیشتین من ئاواتم بوو پێغەمبەر صَلَّىٱللَّهُعَلَيْهِوَعَلَىٰآلِهِوَسَلَّمَ ببینم لە ڕێگادا کاتێک دەڕۆیشتم خەیاڵم هەر لای پێغەمبەر صَلَّىٱللَّهُعَلَيْهِوَعَلَىٰآلِهِوَسَلَّمَ بوو، لە هۆش خۆم چووم لە ڕێگا کە هۆشم هاتەوە چاوم کردەوە تەماشام کرد بەیانی زووە شیر و قاوەیان هێناوە بەسەر زیندانەکەدا دابەشی دەکەن، کەسێک بەناوی (ئەبویەحیا) لە خەو هەڵیساندم وتی ئەبو ئانا شیر و قاوەکەت وەرگرە.

لە دڵی خۆمدا وتم توخوا وەختی قاوە و شیر بووە؟ ئەوەندە خەفەتم خوارد هەڵسام دەستنوێژم گرت و دوای نوێژ نان و چای بەیانیم خوارد وەکو هەموو ڕۆژێکی زیندان چاوەڕێی ئەوە بووم کە بڕۆمە ناو حەوشەی زیندانەکە و تۆزێک لاشەم بجوڵێت.

چەند ڕۆژێک هەر خەریکی خوێندنەوەی کتێبەکەی فەرغەلی بووم، بەڵام نەدەگەڕامەوە زۆر بێزار بووم، بەیانییەک کە ئەبویەحیا شیر و قاوەی دابەش دەکرد.

وتم: تکایە ئەگەر خەوتبووم خەبەرم مەکەرەوە، چونکە کاتژمێر پێنج و نیو بۆ شەش دابەشی دەکرد نوێژی بەیانی کاتژمێر (٦:٢٠) بانگی ئەدا تا کاتژمێر (٨:١٥) خولەک ڕۆژ هەڵدەهات.

ئەبویەحیا: زۆر باشە، بەس گەردەنم ئازادکە.

ماکوان: گەردنت خۆش و ئازاد بێت.

بۆ شەوەکەی دوای نوێژی عیشا جوزێک قورئانم خوێند زۆر دوعام کرد کە بگەڕێمەوە ڕووداوەکانی پێغەمبەری خوا صَلَّىٱللَّهُعَلَيْهِوَعَلَىٰآلِهِوَسَلَّمَ ببینم و لەگەڵیدا بژیم، سوپاس بۆ خوا چوومە ناو جێگا و کتێبەکەم کردەوە چەند دێڕێکم لێی خوێندەوە چاوم نیشت و لە پڕ نومێر خەبەری کردمەوە پرسی: باشتر بوویت؟

چاوم کردەوە هەرچی لەگەڵیدا بوون بەسەر سەرمەوە وەستابوون منیش لە خۆشیدا بەهێز هەڵسام و نومێر پێدەکەنی و ئەوەی لەوێدابوون سەریان سوڕما بوو!

نومێر: برسیت نییە نانت بۆ بهێنین؟!

ماکوان: نا، بابڕۆین بۆ قوبا.

نومێر: تۆ چەند ڕۆژێکە بێهۆشی جارێ پشووبدە.

ماکوان: تۆ دەزانی بۆچی بێهۆش کەوتم لەولا قاوە و شیریان بۆ هێنام گەڕامەوە بۆ زیندان، بەدەست خۆم نەبوو!!



نومێر: زانیم شتێک ڕوویداوە.

ئەوەی گوێی لێمان بوو وایان دەزانی من شێتم و ئەقڵم لەدەست داوە.

ماکوان: ئێستا چی بکەین؟!

نومێر: ئاخر پێغەمبەر ﷺ چوو بۆ مەدینە دوای ئەوە تۆ گەڕایتەوە، ئیتر ڕووداوەکان چاوەڕێی تۆ ناکەن، بۆ شیر و قاوە ڕووداوەکانت لەدەست دەرچووو! (بەپێکەنینەوە).

ماکوان: چی ڕوویدا بۆم باس بکە.

نومێر: کە پێغەمبەر شەوی یەکەم مایەوە لە قوبا بۆ بەیانی دەستی کرد بە دروست کردنی مزگەوتێک و بە سێ یان چوار ڕۆژ کۆتاییان پێ هێنا، ئەو چەند ڕۆژ چاوەڕێی عەلی کوڕی ئەبو تاڵیبی دەکرد تا لەمەککەوە بێتە لای.

ماکوان: بۆ مزگەوت بە چوار ڕۆژ تەواو دەکرێت؟!

نومێر: مزگەوتێک لەشێوەی کەپرێک دابوو جێگایەکی بچوک بوو یەکەم مزگەوتە کە پێغەمبەری خوا ﷺ بونیادی ناوە خوای پەروەردگار لە قورئان باسی دەکات لە سورەتی (التوبة)دا دەفەرمووێت:

﴿لَا تَقُمْ فِيهِ أَبَدًا ۚ لَّمَسْجِدٌ أُسِّسَ عَلَى ٱلتَّقْوَىٰ مِنْ أَوَّلِ يَوْمٍ أَحَقُّ أَن تَقُومَ فِيهِ ۚ فِيهِ رِجَالٌ يُحِبُّونَ أَن يَتَطَهَّرُوا۟ ۚ وَٱللَّهُ يُحِبُّ ٱلْمُطَّهِّرِينَ ﴿١٠٨﴾﴾

واتە: هەرگیز لەو مزگەوتەدا ڕامەوەستە بۆ نوێژ کردن (چونکە) بەڕاستی مزگەوتێک شایستەیە کە تۆ تیایدا بوەستیت بۆ نوێژ کردن تیایدا کە هەر لە یەکەم ڕۆژەوە لەسەر بنچینەی تەقوا و خواناسی دروست کراوە، (چونکە) لەو مزگەوتەدا چەند کەسانێکی مەردی تیادایە کە زۆر حەز دەکەن خۆیان خاوێن ڕابگرن (لە دەروون و ڕواڵەتدا)، خوایش بەردەوام ئەوانەی خۆش دەوێت کە خۆیان پاک ڕادەگرن.

ماکوان: وتت چاوەڕێی ئیمامی عەلی -ڕەزامەندی خوای لەسەر بێت- دەکرد؟!

نومێر: بەڵێ ڕۆژی شەممە گەیشتە ئەوێ تا ڕۆژی پێنجشەممە مایەوە ئێوارەی چوارشەممە عەلی کوڕی ئەبو تاڵیب بەسەلامەتی گەیشتە لای پێغەمبەر ﷺ بەیەکەوە لەگەڵ (١٠٠) شمشێر بەدەستی عەشیرەتی خاڵوانی کە ناسراون بە عەشیرەتی (بەنی نەججاڕ) هاتن



بۆ پێشوازی و ڕۆژی جومعە لە نزیک عەشیرەتی بەنی سولەیم لەوێدا کۆبوونەوە، پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ یەکەم جومعە وتار و جەماعەتی نوێژی بۆ کردن و لەگەڵ ئەبوبەکر و عەلی و (١٠٠) پیاوی بەنی نەججارِ بەرەو ناو جەرگەی شاری یەسریب ڕۆیشتن، بەداخەوە نەتبینی چ پێشوازییەکی لێ کرا!

ماکوان: ئەم (١٠٠) کەسە چۆن کۆبوونەوە و هاتن و بۆچی ناوی شاری یەسریب گۆڕا بۆ مەدینە، بەو خێراییە؟!

نومێر: پێشتر ئاگاداری ماڵی خاڵوانی پێغەمبەر صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ کرابووەوە زۆرێک لە ڕێکخستنە ئیسلامییەکان ئاگادار بوون بە هاتنی پێغەمبەر صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ، ئەو ڕێکخستنەی لە بەرپرسی تەنزیماتی پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ دروستی کرد ناوی (موسعەبی کوڕی عومەیر) بوو ناوی شاری یەسریبی گۆڕی بۆ مەدینە، لە ڕاستیدا شارەکە پێشتر هەمیشە جەنگ و شەڕی برا کوژی تێدا بوو، ناوی ئەو جێگایە نرا بوو بە جێگای خراپەکاران (یەسریب)[٦] واتا خراپ و شووم، بەڵام پێغەمبەر صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ بانگەوازەکەی ڕەحمەتە چۆن لە جێگای شووم و خراپەوە بانگەواز دەکات و ئەو پەیامی ئیسلام چۆن لە شوێنێکی شووم و خراپەوە بڵاو دەکاتەوە.

ماکوان: واتا شارەکە ناونراوە بە شاری پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ، وایە؟!

نومێر: بەڵێ بەدڵنیاییەوە وایە.

ماکوان: ئەی پێشوازییەکە چۆن بوو؟!

نومێر ڕۆژی هەینی هەموو چاوەڕوانی پێغەمبەر صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ بوون، بەڵام پێغەمبەر صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ بە هۆکاری جومعە و جەماعەت دواکەوت و دوای نیوەڕۆ گەیشتە شاری مەدینە، یەهوودییەک ئاشکرای کرد کە پێغەمبەر صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ لە دوورەوە دەرکەوت و هاواری کرد، عەرەب ئەوە پێغەمبەرەکەتان هات یان دەڵێن وتی ئەی عەرەب ئەوە باپیرتان هات!

ماکوان: بۆ دەبێت یەهوودییەک پێغەمبەر بەوان بناسێنێت؟!

نومێر بە پێکەنینەوە وتی: لەبەر ئەوەی یەهوود پێغەمبەر محمد صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ یان زیاتر لە منداڵەکانی خۆیان دەناسی، بۆ ئەوەی حوججە بێت لەسەریان و هەنجەتیان

---

٦ ـ يثرب.



نەمێنێت، چونکە لە (سەحیفەی حەبقوق)[7] دا لە (٣:٣) دا هاتووە کە محمد لە چیای فارانەوە دێت.

"اَللهُ جَاءَ مِنْ تِيمَانَ، وَالْقُدُّوسُ مِنْ جَبَلِ فَارَانَ. سِلاَهْ. جَلاَلُهُ غَطَّى السَّمَاوَاتِ، وَالأَرْضُ امْتَلأَتْ مِنْ تَسْبِيحِهِ." (حب ٣: ٣).

ماکوان: ئێ چیتر ڕوویدا بۆم باس بکە؟!

کە پێغەمبەر دەرکەوت لەگەڵ کۆمەڵە خەڵکەکەدا هەموو موسڵمانی شاری مەدینە تەکبیریان کردو بەدەنگی بەرز سوپاسی خوایان دەکرد، دەیان وت (الحَمْدُ لِلّهِ واللّهُ أكْبَر)، شاری مەدینە مێژووی وای بەخۆیەوە نەدیبوو.

پاشان کچانی ئەنسار[8] شیعر و سروودیان دەوت بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ.

ماکوان: کچانی ئەنسار چیان دەوت؟!

نومێر:

| | |
|---|---|
| أشرق البدر علينا | من ثنيات الوداع |
| وجب الشكر علينا | ما دعا لله داع |
| أيّها المبْعوث فينا | جئت بالأمر المطاع |

پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ لە وشترەکەی دانەبەزی، چونکە هەموو شاری مەدینە ماڵ بە ماڵ ئاواتە خوازبوون بەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ میواندارییان بکات، بەڵام پێغەمبەر فەرمووی: واز لە وشترەکەم بهێنن فەرمانی پێ کراوە چووە هەر جێگایەک ئەوە ماڵی میوانداریمانە، خودی پێغەمبەر ﷺ حەزی دەکرد لەناو ماڵی خاڵوانی بمێنێتەوە، وشترەکە گەڕا و ڕووە و زۆرێک لە ماڵەکانی مەدینە دەڕۆیشت تا لە کۆتایی لە جێگای مزگەوتی ئێستای پێغەمبەری خوا ﷺ دانیشت. پێغەمبەر ﷺ دابەزی ئەو ناوچەیەش هەموو ناوچەی ماڵە خاڵوانی پێغەمبەری خوا ﷺ بوو، زۆرێک لە پیاوماقوڵانی شاری مەدینە هاتنە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ کە میوانداریان بکات لە ماڵیاندا بمێنێتەوە لەوانە (ئەسعەدی کوڕی زەوارە)، بەڵام پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: لێرەوە ماڵی کام لە خزمان نزیکە؟

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

٧ ـ صحيفة حبقوق.

٨ ـ الأنصار.



ئەبو ئەیووبی ئەنساری فەرمووی: یا رسول الله ماڵی من، ئەوەش دەرگاکە بەس دوو نهۆمە، نهۆمێکیان بۆ جەنابت و من و خێزانیشم دەچینە نهۆمی دووەم، پێغەمبەری خوا ﷺ تەشریفی بردە ماڵی ئەبو ئەیووب و لەوێ مایەوە؟!

ماکوان: ئەی پێغەمبەر ﷺ هەر خۆی بوو؟ واتا مەبەستم ئەوەیە ماڵ و منداڵی لەگەڵ نەبوو؟

نومێر: نا، تەنها عەلی و ئەبوبەکر -ڕەزامەندی خوایان لەسەر بێت- لەگەڵ بوو، بەڵام دوای چەند ڕۆژێک خێزانی پێغەمبەر ﷺ خاتوو سەودە و منداڵەکانی پێغەمبەر ﷺ فاتیمە و ئوم کلسوم گەیشتن کە ئوسامەی کوڕی زەید[٩] یان لەگەڵ بوو و لەگەڵ ئوم ئەیمەن[١٠] ئیتر وردە وردە ماڵ و منداڵ بەرەودوا گەیشتن، وەکو ماڵ و منداڵی ئەبوبەکر کوڕەکەی ئەبوبەکر هەموویانی هێنا بۆ مەدینە.

ماکوان: ئەی لەشاری مەدینە خۆشحاڵ بوون، ئەو خەڵکەی شاری مەککە؟!

نومێر: ڕاستت دەوێت هەموویان خەمبار بوون، تەنانەت هەندێکیان مەرگیان پێ خۆشتر بوو لە بەجێهێشتنی شاری مەککە، تەنانەت بیلال و ئەبوبەکر ئەوەندە نارەحەت بوون هەردووکیان شیعریان بۆ مەککە دەوت، خاتوو عایشە بۆ پێغەمبەر ﷺی گێڕایەوە حاڵی خەڵکە کۆچ کردووەکەی مەککە بۆ مەدینە چۆنە، بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ دوعای خێری کرد بۆیان تا شاری مەدینەیان لەبەر چاوی خۆشەویست بکات، خوای گەورە وا خۆشەویستی کرد لەبەر چاویان تەنانەت دوای فەتحی مەککەش نەگەڕانەوە.

ماکوان: بۆچی غەمبارییان پێوە دیار بوو، خۆ شاری مەدینە زۆر خۆشتر و جوانترە وەکو دیمەن لە شاری مەککە، شاری مەدینە هەموو باخ و باخاتە، مەککە زۆر وشک و دۆڵ و نشێو و هەورازی زۆرە؟!

نومێر: فرە زۆری دانیشتوانەکەی شاری مەدینە بێزارکەر بوون.

ماکوان: بۆچی خۆ هەموو خەڵکی شاری مەدینە جیاوازییان چییە؟!

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

٩ ـ اسامة بن زيد.

١٠ ـ أم أيمن.



نومێر: نا، جیاوازییان زۆره، لەشاری مەدینه چەند جۆر خەڵکی تێدایە هیچی قسەی نییه لەگەڵ یەکتر، جوولەکەکان لەناو خۆیان دژی یەکن، عەرەبەکان دژی یەکن، تەنانەت ئەعرابییەکانیش دژی یەکن.

ماکوان: بۆ لە شاری مەدینه چەند جۆرن؟

نومێر: زۆرن.

ماکوان: ئەی چۆن پێغەمبەری خوا ﷺ مامەڵەی لەگەڵ ئەم کۆمەڵگەیەدا کرد؟

نومێر: گومانی تێدا نییه کە پێغەمبەری خوا ﷺ بەوەحی ئاڕاسته دەکرا، بەڵام پێوەر بۆ ژیانی واقیعی مرۆڤەکانی زۆر سیاسیانه و سیستەماتیکانه مامەڵەی کرد، کۆمەڵگەی ناسی و جیای کردنەوه و مامەڵەی لەگەڵ کردن و پاشان ڕێکی خستن.

ماکوان: چۆن ڕێکی خستن؟! چۆن مامەڵەی لەگەڵ ئەو کۆمەڵگەیه دەکرد.

نومێر: وەره بڕۆین بۆ مەدینه لەوێ بە چاوی خۆت ببینه و بزانه ئەو پێغەمبەره ﷺ ئازیز و بەڕێزه چۆن مامەڵەی کردووه، جێگای سەرنج و ئیعجابه و بەڕاستی ئیعجازییشه.

ماکوان: هەر دەبێت وابێت، چونکه خوای پەروەردگار لە ڕێگای جوبریلەوه ئاڕاستەی کردووه بەوەحی، فەرموو بابڕۆین.

کەوتینه ڕێ و نزیک چەند کاتژمێرێک ئێمه دوور بووین لە شاری مەدینه، بە پێ بە پیاسه و دەمه تەقێ لەگەڵ نومێردا کەوتینه ڕێ بەرەو شار.

لەڕێگادا نومێر وتی: بزانه شاری مەدینه سێ جۆر خەڵکی تێدایە کۆمەڵگەی موسڵمان بە هەموو جۆرەکانی، کۆمەڵگەی موشریک و هاوبەشدانەر و بتپەرستەکان بە هەموو جۆرەکانی، کۆمەڵگەی یەهوودی بەهەموو جۆرەکانی.







ڕێگای کۆچی پێغەمبەر ﷺ لە مەککەوە بەرەو مەدینەی مونەوەرە

# پڕۆژەی برایەتی ئەنسار لەناو خۆیاندا

ماکوان: سەرەتا باسی کۆمەڵگەی موسڵمانم بۆ بکە؟

نومێر: ئەو کۆمەڵە دوو بەش بوون لە ئەنسار و موهاجر.

ماکوان: سەرەتا باسی ئەنسارم بۆ بکە ئەنسار کێن؟!

نومێر: ئەنسار ئەو کۆمەڵە خەڵکەن کە موسڵمان بوون لە دوو عەشیرەتی گەورەی ناو شاری مەدینەی پێغەمبەر صَلَّىٰٱللَّهُعَلَيۡهِوَعَلَىٰٓاٰلِهِۦوَسَلَّمَ، بریتی بوون لە ئەوس و پاشان عەشیرەتی خەزرەج، ئەم دوو عەشیرەتە بەدرێژایی مێژوو لە نێوان خۆیان جەنگ و شەڕیان بوو، شمشێر و خەنجەرەکانیان خوێنی یەکتری لێ دەچۆڕا، دایم کینەیان بوو لەیەکتری هەمیشە لە تۆڵە سەندنەوە و لە مەتەرێزدا بوون بۆ یەکتری، خەزرەج سێ جار یاخود سێ ئەوەندەی عەشیرەتی ئەوس ئەبون.

ماکوان: شاری مەدینە گەورە بوو یان شاری مەککە؟!

نومێر: ئێستا دەچین، شاری مەدینە نزیکەی (٥٠٠٠) کەسی تێدا دەژیا شارێکی بەرفراوانە، گەڕەکەکانی لەیەکەوە زۆر دوورن، یەهوودیش لەدەرەوەی شاری مەدینە قەڵا و گەڕەکی خۆیان بوونیاد ناوە.

ماکوان: ئەی پێغەمبەر صَلَّىٰٱللَّهُعَلَيۡهِوَعَلَىٰٓاٰلِهِۦوَسَلَّمَ چۆن توانی کێشەی ئەوس و خەزرەج چارەسەر بکات؟!

نومێر: لە ڕاستیدا کێشەیەکی زۆر ئاڵۆز بوو، دوو ساڵ پێش پەیمانی عەقەبە واتە نزیکەی پێنج ساڵە کە پێغەمبەر صَلَّىٰٱللَّهُعَلَيۡهِوَعَلَىٰٓاٰلِهِۦوَسَلَّمَ چۆتە مەدینە، نە ئاشتی و نەشەڕ لە نێوانیاندا بەرقەرارە، هەروەکو وتم گەورەترین جەنگ لە نێوانیاندا ڕوویدا، پێش پێنج ساڵ بەر لەهاتنی پێغەمبەر صَلَّىٰٱللَّهُعَلَيۡهِوَعَلَىٰٓاٰلِهِۦوَسَلَّمَ بۆ مەدینە، زۆریان لەیەکتری کوشت، ماڵی مەدینە نەماوە دوو کوژراو یان کوژراوێکی بەدەستی یەکتر نەبێت، ئەو جەنگەی ڕوویدا ناوی جەنگی (بەعاس)[١١] بوو، سەرەتا پێغەمبەر صَلَّىٰٱللَّهُعَلَيۡهِوَعَلَىٰٓاٰلِهِۦوَسَلَّمَ لە مێشکی موسڵمانە ئەوس و خەزرەجییەکاندا وشەی عەشیرەتی دەرهێنا و بەناوی ئەنسار ناوی پێدەرکردن، ئەمەش گرنگترین چارەسەر بوو بۆ کێشەی ئەو عەشیرەتانە، ناوی ئەوس و خەزرەجی گۆڕی بە ئەنسار، دەبێت لەمەولا هەردوو

---

١١ ـ بعاث.



عەشیرەت لەیەک کیان و لە ژێر یەک ئاڵادا کۆببنەوە و یەک پەیوەندی کۆیان دەکاتەوە، ئەویش پەیوەندی بیروباوەڕە واتە نە خاک، نە زمان، نە ئابووری، هیچ لەمانە کۆیان ناکاتەوە تەنها ئاڵا و دروشمی (لااله الا الله محمد رسول الله) کۆیان دەکاتەوە، بەرگری لەم دروشمە دەکەن نەک دروشمی عەشیرەتگەری.

ئەنسار ڕاستگۆ بوون لەگەڵ بیروباوەڕەکەیاندا بۆیە بە زوویی پرۆژەکەی پێغەمبەر ﷺ یان قبوڵ کرد، زانییان پرۆژەی محمد ﷺ پرۆژەیەکی دروستکەری دەستی مرۆڤ نییە، ئاراستەی وەحییە و خوای گەورە بە یاسا بۆیانی داڕشتووە، بۆیە بیریان لەوە کردەوە کە زوو پشتگیری پرۆژەکە بکەن و ئەوس و خەزرەج بەیەکەوە بەرگری لە ئیسلام و یاسای خوای پەروەردگار بکەن.

ئەنسار وازیان لە یاساکانی زەوی هێنا، خوای گەورە بەیاسای خۆی عەزیزی کردن.

ماکوان: واتا سەرەتا پێغەمبەر ﷺ ئەوس و خەزرەجی کردە برا، نەک ئەنسار و موهاجیر؟!

نومێر: بەڵێ بەدڵنیاییەوە، ئەوە بەداخەوە کەم کەس باسی دەکات، پرۆژەی یەکەمی پێغەمبەر ﷺ برایەتی نێوان ئەوس و خەزرەج بوو، ئەم برایەتییە بووە هۆکاری دروست بوونی ئەنسار.

ماکوان: جا بەڕاستی دوژمنایەتی و هەموو تۆڵەسەندنەوەیەکی لەبیر بردنەوە؟

نومێر: بەڵێ، بەدڵنیاییەوە ڕاستگۆ بوون هەندێک کێشەی بچوک ڕوویدا، بەڵام سوپاس بۆ خوا پێغەمبەری خوا ﷺ خێرا چارەسەری کردن، ئەویش لەکاتی خۆیدا بۆت باس دەکەم، ئەوس و خەزرەج لە یەک خەندەق و مەیداندا بەیەکەوە بەرگریان دەکرد، ئەمە یەکەم پرۆژەی پێغەمبەر ﷺ بوو.

ماکوان: کەواتە با بڵێین یەکەم پرۆژەی پێغەمبەر ﷺ برایەتی خستە نێوان ئەوس و خەزرەج؟

نومێر: نا، باشترە بڵێین یەکەم پرۆژەی پێغەمبەر ﷺ یەکتاپەرستی بوو، بە پرۆژەی یەکتاپەرستی و پەیوەندی بیروباوەڕ پرۆژەی دووەم بەرهەم هات، ئەویش برایەتی ئەوس و خەزرەج بوو کە پرۆژەکە ناونرا بە پرۆژەی مامەڵەکردنی پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ ئەنسار.

ماکوان: ئەی دوای ئەنسار کێی تر بوون لە موسڵمانەکان واتا موهاجیرەکان بوون وایە؟



نومێر: گومانی تێدا نییە موهاجیرەکان بوون، بەڵێ ئەمەش پڕۆژەیەکی تری نوێی پێغەمبەرە ﷺ کە توانی لە کێشەوە بیکاتە پڕۆژە! زۆر سەرکەوتووانە مامەڵەی لەگەڵ پەناهەندەکانی موهاجیردا کرد.

ماکوان: پێغەمبەر ﷺ چۆن مامەڵەی لەگەڵ ئەم کێشەیەدا کرد.

نومێر: ڕەوشی موهاجیرەکان لە ڕووی ئابوورییەوە زۆر خراپ بوو، ئەگەر بڵێین زۆر ترسناک و کارەسات باربوو! موهاجیرەکان هەموو ماڵ و سەروەت و سامان و خاکیان لە شاری مەککە جێ هێشتبوو، بێجگە لەوەش لە هەمووی سەیر تر یادگاری و عەشیرەت و تەنانەت لە پێناوی ئایینەکەیاندا کۆچیان کرد و کەسوکاریان جێهێشت، بڕوا بکە زۆر شتێکی گەورەیە کەسێک خانوو و بازرگانی و ماڵ و پارە و هەموو ئەمانە جێبهێڵێت و خۆی برسی بکات لە پێناوی خوادا.

ماکوان: زۆر ڕاستە، ئەی پاشان چۆن بوون کە هاتنە ناو خاکێکی نوێ کە خاکی خۆیان نەبوو؟ یان جوانتر بڵێم چۆن مامەڵەیان لەگەڵ ئەم پەناهەندە کۆچکردووانە دەکرد، چونکە لە ڕاستیدا دەبنە کێشە بۆ شاری مەدینە، لە کاتێکدا شاری مەدینە خەڵکەکەی بە گشتی هەژارن و زۆر دەوڵەمەند نین، چونکە وەکو ئەوەی باسمان کرد و ئەو جەنگ و شەڕە درێژخایەنانە خەڵکی مەدینەی هەژار کردوون، چۆن پێغەمبەر ﷺ توانی ئەم کێشە چارەسەر بکات؟



## پڕۆژەی چارەسەری کێشەی پەناهەندە

نومێر: پرسیارەکە سەرنج ڕاکێشە، ئەگەر بڵێین چۆن پێغەمبەری خوا ﷺ توانی چارەسەری کێشەی کۆچەرەکان بکات لە کاتێکدا شاری مەدینە دووچاری گەورەترین کێشەی ئابووری دەبێتەوە، لەکاتی هاتنی ئەو هەموو خەڵکە پەناهەندانە، چۆن لەهەمان کاتدا چارەسەری کێشەی دەروونی موهاجیرەکانی کرد کە ماڵ و سامان و شاری مەککەیان جێهێشت بوو؟

ماکوان: باشە دەی چۆن وا گوێم گرتووە! چۆن نومێر؟!

نومێر: بەو پەڕی حیکمەت و دانایی پێغەمبەری خوا ﷺ توانی پڕۆژەیەکی نوێ بخاتە گەڕ و چارەسەری ئەو کێشەیەش بکات.

ماکوان: چۆن؟

نومێر: پەلە مەکە بۆت باس دەکەم بە (پێکەنینەوە)! پڕۆژەکە بەم شێوەیە لە چەند خاڵێک پێکهاتووە کە پێغەمبەری خوا ﷺ بەخێرایی گرتییە بەر.

### خاڵی یەکەم: نزیک کردنەوەی موهاجیر و ئەنسار لە یەکتری و بەرزکردنەوەی ئاستی دەروون و ناخ لە نێواندا.

خوای پەروەردگار قورئانی دابەزاند بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو کێشەیە بە تەواوەتی چارەسەر دەکات، موسڵمان یەکبگرن لەیەک گیان و جەستە و هێزدا، پاشان قورئان دابەزی لەسەر موهاجیر و کۆچبەرانی کە ماڵ و منداڵ، سەروەت و سامان، خاک و عەشیرەتیان لە پێناوی خوای پەروەردگاردا جێ هێشتووە، بۆ ئەوەی هەست بە لاوازی و زەلیلی نەکەن، قورئان شەرەف و شانازی پێ بەخشین، ئێستا ئەو موهاجیرانە بەخۆشحاڵییەوە دەڵێن ئێمە موهاجیرین.

هەر چەندە قورئان ئاستی بەرزی دایە موهاجیرەکان، هەروەهاش ئاستی بەرزی داڵدەدانی دایە ئەنسار کە پشت و پەنای کۆچکردووەکان بوون.

ئیتر وای لێهات پلەی موهاجیر خەڵکی بەشوێنی دا دەگەڕا نموونەی سورەتی آل عمران ئایەتی ١٩٥:



﴿فَٱسْتَجَابَ لَهُمْ رَبُّهُمْ أَنِّي لَآ أُضِيعُ عَمَلَ عَٰمِلٍ مِّنكُم مِّن ذَكَرٍ أَوْ أُنثَىٰ بَعْضُكُم مِّنۢ بَعْضٍ فَٱلَّذِينَ هَاجَرُواْ وَأُخْرِجُواْ مِن دِيَٰرِهِمْ وَأُوذُواْ فِي سَبِيلِي وَقَٰتَلُواْ وَقُتِلُواْ لَأُكَفِّرَنَّ عَنْهُمْ سَيِّـَٔاتِهِمْ وَلَأُدْخِلَنَّهُمْ جَنَّٰتٍ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ ثَوَابًا مِّنْ عِندِ ٱللَّهِ وَٱللَّهُ عِندَهُۥ حُسْنُ ٱلثَّوَابِ ﴿١٩٥﴾﴾.

واتە: (کاتێ کە ئیمانداران بەم شێوەیە نزایان کرد، کە پەروەردگاری ئازیزیان فێریان دەکات) بێگومان ئەو زاتە دوعاکانیان لێ وەردەگرێت (بە هاناو هاواریانەوە دەچێت بۆیە دەفەرمووێت): بەڕاستی من هەوڵ و کۆشش و کار و کردەوەی هیچ کام لە ئێوە بەزایە نادەم، چ نێرینە و پیاوتان، چ مێینە و ئافرەتان (چونکە) هاوکاری یەک بوون (لە چاکەو چاکەکاریدا) جا ئەوانەی کۆچیان کرد لە شوێنەواری خۆیان دەربەدەر کران و ئازارو ئەشکەنجە دران لە پێناوی مندا جەنگان و شەهید کران، بەڕاستی چاوپۆشی دەکەم لە هەڵەو گوناهەکانیان، دەیانخەمە باخ و باخاتی بەهەشتەوە کە جۆبارو ڕووبار بەژێر درەختەکانیدا و بەناو کۆشکەکانیدا دەڕوات، ئەمەش پاداشتێکە لەلایەن خواوە (پێشکەشیان دەکرێت) خوا چاکترین پاداشتی لایە، (بۆ چاکەخوازان).

پاشان لە سورەتی الحشر ئایەتی ٨ باسی موهاجیرەکان دەکات و لە ئایەتی ٩ باسی چاکە و خواناسی و پیاوەتی ئەنسار دەکات.

﴿لِلْفُقَرَآءِ ٱلْمُهَٰجِرِينَ ٱلَّذِينَ أُخْرِجُواْ مِن دِيَٰرِهِمْ وَأَمْوَٰلِهِمْ يَبْتَغُونَ فَضْلًا مِّنَ ٱللَّهِ وَرِضْوَٰنًا وَيَنصُرُونَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥٓ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلصَّٰدِقُونَ ﴿٨﴾﴾.

واتە: هەروەها لەو دەستکەوتانە بەشی کۆچکەرانی هەژار دەبێ بدرێت، کە لە شوێنەوار و سامانیان دوورخرانەوەو دەرکراون، ئەوانە بەتەمای بەخششی خوا و ڕەزامەندیی ئەون، بەبێ هیچ تەماعێک پشتیوانی لە خوا و پێغەمبەرەکەی دەکەن و هەوڵی سەرخستنی بەرنامەکەیان دەدەن، بێگومان ئا ئەوانە ڕاستگۆ و ڕاستانن.

﴿وَٱلَّذِينَ تَبَوَّءُو ٱلدَّارَ وَٱلْإِيمَٰنَ مِن قَبْلِهِمْ يُحِبُّونَ مَنْ هَاجَرَ إِلَيْهِمْ وَلَا يَجِدُونَ فِي صُدُورِهِمْ حَاجَةً مِّمَّآ أُوتُواْ وَيُؤْثِرُونَ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ وَلَوْ كَانَ بِهِمْ خَصَاصَةٌ وَمَن يُوقَ شُحَّ نَفْسِهِۦ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ ﴿٩﴾﴾.

واتە: ئەوانەی کە پێشتر ماڵ و شوێنی خۆیان (ئامادە کرد بۆ پێشوازیی لە کۆچکەران، دڵ و دەروونی خۆیان ڕازاندەوە) بە ئیمان، ئەوانەیان خۆش دەوێت کە کۆچیان کردووە بۆ لایان، لە

دڵ و دەروونیاندا جێی هیچ جۆرە حەسوودیی و بەخیلییەک نابێتەوە (لەسەر ئەوەی کە بەشی کۆچکەران دراوە و بەشی ئەوان نەدراوە، حەز بە بەخشینی دەستکەوتەکان بەوان دەکەن تا خۆیان هەرچەندە هەژار و نەداریشن، جا ئەوەی خۆی لە نەفسی ڕەزیلی بپارێزێت و زاڵ بێت بەسەریدا ئەوانە سەرفەرازن.

هەروەها پەروەردگار هەردووکیانی بەیەکەوە باس کردووە وەکو تای تەرازوو کە پلە و ئاستی هەردوولا بەرزە چونکە لە پێناوی خوادا هیجرەتیان کردووە، ئەنساریش داڵدەیان داون، خوای پەروەردگار لە سورەتی التوبة ئایەتی ١١٧دا دەفەرموێت:

﴿لَّقَد تَّابَ ٱللَّهُ عَلَى ٱلنَّبِيِّ وَٱلْمُهَٰجِرِينَ وَٱلْأَنصَارِ ٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُوهُ فِي سَاعَةِ ٱلْعُسْرَةِ مِنۢ بَعْدِ مَا كَادَ يَزِيغُ قُلُوبُ فَرِيقٍ مِّنْهُمْ ثُمَّ تَابَ عَلَيْهِمْ إِنَّهُۥ بِهِمْ رَءُوفٌ رَّحِيمٌ ﴿١١٧﴾﴾

واتە: سوێند بەخوا بەڕاستی خوا تەوبەی قبوڵ کرد لە پێغەمبەر و کۆچبەران و پشتیوانان، ئەوانەی کە شوێنی پێغەمبەر کەوتن لەکاتی سەغڵەتی و تەنگانەدا (لە غەزای تەبووکدا)، دوای ئەوەی کە خەریک بوو دڵی دەستەیەکیان لە خشتە بچێت و (بێزاری دەربڕێت)، لەوەودوا تەوبە و پەشیمانی ئەوانیشی قبوڵ کرد، چونکە بەڕاستی ئەو پەروەردگارە لەگەڵیاندا بەسۆز و میهرەبانە.

خوای پەروەردگار کێبڕکێی خستە نێوانی خەڵکی بە قورئان و لە ڕێگای پێغەمبەرەکەیەوە، بۆ نموونە پلە و پایەی موهاجیری بە چەند سیفاتێک بەرزکردووە.

ئارامگرتن و تەوەکول بەخوا.

﴿وَٱلَّذِينَ هَاجَرُواْ فِي ٱللَّهِ مِنۢ بَعْدِ مَا ظُلِمُواْ لَنُبَوِّئَنَّهُمْ فِي ٱلدُّنْيَا حَسَنَةً وَلَأَجْرُ ٱلْءَاخِرَةِ أَكْبَرُ لَوْ كَانُواْ يَعْلَمُونَ ﴿٤١﴾﴾

واتە: ئەو کەسانەی لەبەر خواو بۆ خوا کۆچیان کرد دوای ئەوەی کە ستەمیان لێکرابوو، هەر لە دنیادا پاداشتی چاکیان دەدەینەوە، بێگومان پاداشتی ئەو جیهانیان گەورەتر و فراوانتر و زۆرترە ئەگەر بزانن.

﴿ٱلَّذِينَ صَبَرُواْ وَعَلَىٰ رَبِّهِمْ يَتَوَكَّلُونَ ﴿٤٢﴾﴾

واتە: ئەوانەی کە ئارامگرو خۆگرن، پشت بە پەروەردگاریان دەبەستن (ئەوانە بەختەوەرن). هەروەها لە سورەتی التوبة ئایەتی ٢٠ دا هاتووە، کە باسی جیهاد و خۆبەخت کردن لە پێناو ئیسلامدا.



﴿ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَهَاجَرُواْ وَجَٰهَدُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ بِأَمۡوَٰلِهِمۡ وَأَنفُسِهِمۡ أَعۡظَمُ دَرَجَةً عِندَ ٱللَّهِۚ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡفَآئِزُونَ ۝٢٠﴾

واتە: جا ئەوانەی باوەڕیان هێناوە و کۆچییان کردووە و جیهاد و هەوڵ و کۆششیان ئەنجامداوە لە پێناویی ڕەزامەندیی خوادا، پلە و پایە و پاداشتییان زۆر گەورە و بێسنوورە هەر ئەوانیشن سەرفراز و بەختەوەرن.

هەروەها لە سورەتی الحشر ئایەتی ٨ کە پێشتر ئاماژەمان پێداوە باسی ڕاستگۆیی و سەرخستنی خوای پەروەردگار[١٢].

ئەوانەی باوەڕیان هێناوە و کۆچیان کردووە و جیهاد و هەوڵ و کۆششیان ئەنجامداوە لە پێناوی ڕێباز و ڕەزامەندیی خوادا بە ماڵیان و بەگیانیان، پلەوپایە و پاداشتیان لای خوا بێ سنوور و گەورەترە، ئا ئەوانەش کە باسکران هەر ئەوانە سەرفرازو بەختەوەرن...

خوای گەورە گەورەترین مەدحی کردوون بە جیهاد و خۆبەخش کردن لە پێناو ئیسلامدا کە ئاشکرای دەروونیانی کردووە ئەویش ڕەجائە لە سورەتی البقرة ئایەتی ٢١٨دا دەفەرمووێت:

﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَٱلَّذِينَ هَاجَرُواْ وَجَٰهَدُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ أُوْلَٰٓئِكَ يَرۡجُونَ رَحۡمَتَ ٱللَّهِۚ وَٱللَّهُ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ۝٢١٨﴾

واتە: بەڕاستی ئەوانەی کە باوەڕیان هێناوە و ئەوانەی کە کۆچ و جیهادو تێکۆشانیان کردووە لە پێناوی خوادا، ئا ئەوانە بە هیوای ڕەحمەت و میهرەبانی خواوەندن، بێگومان خوایش لێخۆش بوو دلۆڤانە.

ئینجا هەردوولا کێبڕکێ دەکەن، ئەوەی دەیەوێت لە پێناوی خوا ببێتە موجاهیر لەبەرامبەردا کێبڕکێکە زۆر سەختە کەسێکی ئەنسار دەیەوێت دالّدەی بدات، سورەتی التوبة ئایەتی ١٠٠:

---

١٢ ـ لاپەڕە١٩٥.



﴿وَٱلسَّٰبِقُونَ ٱلۡأَوَّلُونَ مِنَ ٱلۡمُهَٰجِرِينَ وَٱلۡأَنصَارِ وَٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُوهُم بِإِحۡسَٰنٖ رَّضِيَ ٱللَّهُ عَنۡهُمۡ وَرَضُواْ عَنۡهُ وَأَعَدَّ لَهُمۡ جَنَّٰتٖ تَجۡرِي تَحۡتَهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدٗاۚ ذَٰلِكَ ٱلۡفَوۡزُ ٱلۡعَظِيمُ﴾

**واتە: خوای میهرەبان لەوانەی کە پێشکەوتن و یەکەم کەس بوون لە ئیسلام بوون و خزمەت کردنی ئیسلامدا لەکاروانی کۆچبەران و پشتیوانان و ئەوانەی کە بە ڕێکوپێکی شوێنیان کەوتوون، ڕازی بووە و ئەوانیش لەو ڕازی بوون، باخەکانی بەهەشتی بۆ ئامادە کردوون کە چەندەها ڕووبار بە بەردەم کۆشکەکانی و بەژێر درەختەکانیدا دەڕوات، هاوڕێ لەگەڵ نەمریدا بۆ هەمیشەیش تیایدا دەمێننەوە، ئەو سەرئەنجامە سەر کەوتنێکی زۆر گەورەیە.**

**ئینجا شاهێدی دانی خوای پەروەردگار لە سەرەنجامی موهاجیر و ئەنسار لە سورەتی الأنفال ئایەتی ٧٤**

﴿وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَهَاجَرُواْ وَجَٰهَدُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ وَٱلَّذِينَ ءَاوَواْ وَّنَصَرُوٓاْ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ حَقّٗاۚ لَّهُم مَّغۡفِرَةٞ وَرِزۡقٞ كَرِيمٞ﴾

**واتە: ئەوانەش باوەڕیان هێناوە و کۆچیان کردووە و تێکۆشاون لە پێناوی خوادا، ئەوانەش جێگەی کۆچبەرانیان کردەوە و (پێشوازیان کردن) و یارمەتیان دان، هەر ئا ئەوانە بڕواداری ڕاستەقینەن، (لە بەهەشتی بەریندا) بۆیان ئامادەیە لێخۆشبوون و ڕزق و ڕۆزی بەپێز و پڕ بەرەکەت و جوان و ڕازاوە.**

**پاشان پەیمانی خوای گەورە لە دانی ڕزق و ڕۆزی بە موهاجیرەکان بۆ ئەوەی نەترسن لە هیجرەت کردن، خوای پەروەردگار لە سورەتی النساء ئایەتی ١٠٠ دەفەرمووێت:**

﴿۞ وَمَن يُهَاجِرۡ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ يَجِدۡ فِي ٱلۡأَرۡضِ مُرَٰغَمٗا كَثِيرٗا وَسَعَةٗۚ وَمَن يَخۡرُجۡ مِنۢ بَيۡتِهِۦ مُهَاجِرًا إِلَى ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ ثُمَّ يُدۡرِكۡهُ ٱلۡمَوۡتُ فَقَدۡ وَقَعَ أَجۡرُهُۥ عَلَى ٱللَّهِۗ وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورٗا رَّحِيمٗا﴾

**واتە: ئەوەی کۆچ بکا لە پێناوی خوادا دەرووی زۆر و بەرەکەتی زۆر ڕووی تێ دەکات لەو سەرزەمینەدا (کە کۆچی بۆ دەکات) کە ماڵ و حاڵی خۆی بەجێ بێڵێ و دەرچێت (بەرەو وڵاتی ئیسلام، یاخود شوێنێکی ئازاد) کۆچ بکات، بەڵام مردن یەخەی پێ بگرێت، ئیتر ئەو کەسە پاداشتی کەوتۆتە سەر خوا (وە هەر خۆی دەزانێت چۆن پاداشتی دەداتەوە) خوا هەمیشەو بەردەوام لێخۆشبوو میهرەبانە (بە تایبەت بۆ ئەو جۆرە کەسانە).**



لە هەمووی گەورەتر لێخۆشبوونی تاوان هەرکەس هیجرەت بکات خوای پەروەردگار لێی خۆش دەبێت، بەپێی ئایەتی ١٥٥ سورەتی آل عمران کە خوای گەورە دەفەرمووێت:

﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ تَوَلَّوۡاْ مِنكُمۡ يَوۡمَ ٱلۡتَقَى ٱلۡجَمۡعَانِ إِنَّمَا ٱسۡتَزَلَّهُمُ ٱلشَّيۡطَٰنُ بِبَعۡضِ مَا كَسَبُواْۖ وَلَقَدۡ عَفَا ٱللَّهُ عَنۡهُمۡۗ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ حَلِيمٞ﴿١٥٥﴾﴾

واتە: بێگومان ئەوانەی پشتیان هەڵکرد (لە غەزای ئوحود)دا، ئەو ڕۆژەی هەردوو دەستەی (ئیمان و کوفر) بەرەنگاری یەک بوون، ئەوانە شەیتان تووشی هەڵەی کردن بەهۆی هەندێک گوناحەوە کە ئەنجامیان دابوو، بێگومان خوا لێیان خۆش بوو، چونکە بەڕاستی خوا لێخۆشبوو و بەئارامە.

پێچەوانەکەی ئەوەی توانای هیجرەتی هەیە و نایکات بەر هەڕەشەی خوای پەروەردگار دەکەوێت، سورەتی النساء ئایەتی ٩٧:

﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ تَوَفَّىٰهُمُ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ ظَالِمِيٓ أَنفُسِهِمۡ قَالُواْ فِيمَ كُنتُمۡۖ قَالُواْ كُنَّا مُسۡتَضۡعَفِينَ فِي ٱلۡأَرۡضِۚ قَالُوٓاْ أَلَمۡ تَكُنۡ أَرۡضُ ٱللَّهِ وَٰسِعَةٗ فَتُهَاجِرُواْ فِيهَاۚ فَأُوْلَٰٓئِكَ مَأۡوَىٰهُمۡ جَهَنَّمُۖ وَسَآءَتۡ مَصِيرًا﴿٩٧﴾﴾

واتە: بەڕاستی ئەوانەی کە لە سەرەمەرگ دا فریشتە (دەگەنە لایان بۆ گیان کێشانیان) لە کاتێکدا کە ئەوان ستەمیان لە خۆیان کردووە (ئیمان و باوەڕیان لە مەترسی دا بووە کەچی کۆچیان نەکردووە بۆ نیشتمانی ئیمان، بە توندی پیایاندا هەڵدەشاخێن) و دەڵێن: باشە ئێوە لە کوێ ژیانتان دەبردە سەرو بە چییەوە سەرگەرم بوون؟! لە وەڵام دا دەڵێن: ئێمە بێدەسەڵات و لاواز بووین لە زەویدا، فریشتەکان دەڵێن: باشە ئایا سەرزەوی خوا فراوان نەبووە تا کۆچی تیا بکەن و (کۆچ بکەن بۆ نیشتمانێک کە تیایدا ئیمانداران فەرمانڕەوان یاخود سەربەستن).

ئا ئەوانە شوێنەواریان دۆزەخە، کە جێگەو ڕێگەیەکی زۆر ناخۆش و ناسازە.

کەواتە بەرزکردنەوەی ئاستی دەروونی موهاجیرەکان و دانی پلە و پایەی ئەنسار بەداڵدەدانیان، قورئان زۆر بە ئاسانی کێشەکەی چارەسەر کرد.

ماکوان: ئەم پرۆژەیە لە هیچ شارستانییەتێک و مەنهەج و یاسا و دەستوورێک دا نییە بڕوا بکە بێجگە لە ئایینی ئیسلام، ئەگەر تەماشای حاڵ و گوزەرانی پەناهەندە بکەین لەهەموو جیهاندا لە کۆن و نوێ و ئێستادا، کام پەناهەندە لە جیهاندا جا ئیتر پەناهەندەی سیاسی بێت



یان ئابووری یاخود سەربازی و کۆمەڵایەتی کە دەچنە هەر وڵاتێک قورساییەکی زۆر دروست دەکەن لەسەر خەڵکی ئەو وڵاتە، جا خەڵکی ئەو جێگایە بەچاوی کەم تەماشای پەناهەندەکان دەکەن تەنانەت زۆرجار تانە و تەشەر و شەڕ و ئاژاوە دروست دەکەن.

بەڵام بە پێچەوانەوە کۆمەڵێک لە خاک و سەروەت و سامانی خۆیان وەدەرنراون و دەربەدەرکراون، لە هەمانکاتدا شاری مەدینە خۆی هەژارە، خەڵکەکەی بە گشتی هەژارن، بەڵام چ خۆشی و شادییەک لە قسەکانتا دەردەکەوێت بۆ ئەنسار و موهاجیرەکان.

نومێر: نە بەدڵنیاییەوە زۆر لەوە گرنگتر بە چاوی خۆت دەبینی کە من باسم کرد، بەڵام ماکوان ئەوە بزانە کە ئەو پەیوەندییە لە هیچ جێگایەک دەست ناکەوێت تەنیا لەیەک جێگا نەبێت، ئەویش ئەو جێگایەیە کە خەڵکەکەی پەیوەستن بەخوای گەورە و پەیوەندی ڕاستەقینەیان بەخواوە هەیە.

ئەبێت تۆ ئەوە لەبەر چاو بگریت، هەموو ئەم ئاڕاستە گرنگەی کەبۆت باس دەکەم کۆتایی و ئامانجی خوا و پێغەمبەرەکەی دامەزراندنی دەوڵەتی ئیسلامییە لەشاری مەدینە و چواردەوریدا.

ماکوان: دامەزراندنی دەوڵەت، پێغەمبەری خوا ﷺ بەسێ بنەما دایڕشتووە، ئەگەر تەماشا بکەین بریتییە لە خواناسی (عەقیدە) پاشان (زانست) لە کۆتایی (ئەخلاق).

نومێر: جارێ زۆر ڕۆ مەچوو لەم باسەدا، با بڵێین سەرەتا ئەوەی لە مێشکی موهاجیرەکاندا ڕوواند کە جێهێشتنی ماڵ و سامان لە پێناو خوادا شەرەف و شانازییە و بەهەشتی لەگەڵدایە، پاشان ئەنساریش ئامادەبوون بۆ کەفالەت کردنی موهاجیر، ئەم ئامادەکارییە گرنگە سەرەتا بیزانین، بۆ ئەوەی تۆش و خەڵکیش ئەوە بزانن کە دامەزراندی دەوڵەتی پێغەمبەر ﷺ بە پرۆژە و کارکردن بووە نەک بە موعجیزەیەک لە توانای مرۆڤدا نەبێت، بەڵکو پێغەمبەری خوا ﷺ زۆر بەسیاسەت کێشەکانی چارەسەر کرد بە ئاڕاستەی قورئان.

ماکوان: مەبەستت چی بوو لە کەفالەت کردنی موهاجیرەکان؟!

نومێر: ئەوە خاڵی دووەمی باسەکەمانە کەفالەتی برایەتییە.



## خاڵی دووەم: کەفالەتی برایەتی

کەفالەتی خێرا بۆ موهاجیرەکان لەلایەن ئەنسارەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ ئەبووە ئومێد و هیوا، دەبوو جێگا بۆ ئەو هەموو خەڵکە دابین بکات کە هاتبوونە ناو شاری مەدینە و کار ئاسانیان بۆ بکات.

ماکوان: پێغەمبەری خوا ﷺ چی کرد؟!

نومێر: کارێکی کرد لە مێژوودا ڕوونەداوە و هەتا هەتایەش ڕووناداتەوە.

ماکوان: چۆن؟!

نومێر: چۆن برایەتی خستە نێوان موهاجیر و ئەنسارەکان، چۆن وای کرد هەر کۆچکەرێکی مەککە بکاتە برای ئەنسارێکی مەدینە.

ماکوان: کەواتە ئێستا تێگەیشتم کەوا ناوی (ئەنسار) واتاکەی بە کوردی (پشتیوانە) لەوە هاتووە!

نومێر: ئەشێ لەوەوە وەرگیرابێت، بەڵام ئەم برایەتییە وەکو برایەتی سەرزارەکی نەبوو تەنها بەدەم یان فەنتازیا بێت، بەڵکو برا بوون لەهەموو شتێک دا. تەنانەت لە سەرەتادا میراتیان لە یەک دەگرت، هەر کامێکیان بمردنایە میراتیان لەیەک دەگرت لە ئەنسار و موهاجیر، بەڵام لە دواییدا زۆری نەبرد ئەو حوکمە خوای گەورە نەسخی کردووە و بەتاڵ کراوە لەلایەن خوای پەروەردگارەوە بە وەحی بۆ پێغەمبەرەکەی.

ماکوان: ئێستا پێم بڵێ ئەم جێگایە کوێیە کە من و تۆی لێین، خەڵکی زۆر و ماڵ و قەڵای زۆر دەبینم، ئێرە شاری مەدینەیە؟!

نومێر: بەڵێ، ئێرە شاری مەدینەیە من و تۆ لە شاری مەدینەی پێغەمبەری خواین ﷺ.

ماکوان: نزیک مزگەوتی پێغەمبەرین ﷺ؟!

نومێر: نا جارێ مزگەوت دروست نەکراوە!

ماکوان: ئەها ڕاست دەکەیت، ئەی ئێستا لە کام قۆناغ و زەمەنی ژیانی پێغەمبەری خواین ﷺ؟!



نومێر: لەو جێگایەدایت کە پێغەمبەری خوا ﷺ موهاجیر و ئەنساری کردە بەش بەش، هەموو ڕۆژێک پێغەمبەر ﷺ تەشریفی هێناوە لە قۆناغی برایەتی هەردوو لاکەداین.

ماکوان: ئێستا چی بکەین بڕۆین بۆ کوێ؟!

نومێر: وەرە با سەردانێکی ماڵی ئەنسارەکان بکەین بزانین چۆن لە ڕووی پیادەکردن و لە واقیعەوە چیان کردوە، بڕۆین بۆ کوێ؟!

ماکوان: خۆت سەردەست بە هەڵبژێرە و من لە خزمەتدام.

نومێر: وەرە بڕۆین بۆ ماڵی کەسێک بە ناوی سەعدی کوڕی ڕەبیع[١٣] -ڕەزامەندی خوای لێبێت-

ماکوان: بەخۆشحاڵییەوە بابڕۆین.

نومێر: بەڵام ئەوان تۆ نابینن، بەس تۆ ئەوان دەبینی!

ماکوان: ئەی ناتوانم قسە و باسیان لەگەڵ بکەم؟!

نومێر: بەداخەوە لە ئێستادا نەخێر، بەڵام هەوڵبدە گوێیان لێ بگرە یان پرسیارم لێ بکە بۆت باس دەکەم

ماکوان: ئەی تۆ دەمبینیت؟!

نومێر: ژیانی من و تۆ پەیوەستە بەیەکەوە لە یەک زەمەن و سەردەمدا دەژین.

ماکوان: ئێ خۆ چەند ڕۆژێک بەر لە ئێستا لەگەڵ خەڵکی قسەم دەکرد؟!

نومێر: ئاخر لەدەرەوەی شاری مەدینە بوویت کە هاتیتە ناوەوە کەس ناتبینێت، بەڵام تۆ ئەوان دەبینێ!

ماکوان: چارەم چییە، خۆشحاڵم بەس نییە من دەیانبینم و خزمەتیان دەکەم.

نومێر: بەڵێ، بەڕاستی نیعمەتێکی گەورەیە خوای پەروەردگار پێی بەخشیوین.

ماکوان: بابڕۆین بۆ ماڵی سەعدی کوڕی ڕەبیع بزانین چی ڕوویداوە کێ بووە بە برای.

ڕۆیشتین لەسەر بەردێک هەردووکمان تروشکەمان کردو گوێم بۆ نومێر شل کرد

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

١٣ ـ سعد ابن الربيع.



نومێر: ئەو پیاوە باڵا بەرزە چوارشانە دەبینی؟

ماکوان: بەڵێ، دەیبینم! ئەوە سەعدی کوڕی ڕەبیعە؟!

نومێر: نا، ئەوە برا موهاجیرەکەیەتی ناوی عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوف-ە.[١٤]

ماکوان: ئەوە عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوفە؟

نومێر: بۆ دەیناسیت (بە پێکەنینەوە).

ماکوان: نا، بەس ژیانم خوێندۆتەوە لە دە مژدە پێدراوەکەیە.

نومێر: ڕاستە لە دە مژدە پێدراوەکەی بەهەشتە، بەڵام بزانە ئەم بووە بە برای سەعدی کوڕی ڕەبیع.

ماکوان: من ژیاننامەیم خوێندۆتەوە کە باسی برایەتییەکەی کرا وتم لەوانەیە ئەو مێژووە ڕاست نەبێت، بەڵام سبحان الله لەهەموو سیرەکاندا باسکراوە تەنانەت ئیمامی بوخاریش باسی کردووە.

نومێر: بەڵێ، بەڕاستی لە خەیاڵ خەیاڵترە، تەماشای ئەو برایەتییە بکە سەعدی کوڕی ڕەبیع لە گەورە هاوەڵانی پێغەمبەرە، لە شەهیدانی جەنگی ئوحود، کاتێک پێغەمبەر ﷺ کردنی بەبرا لەگەڵ عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوف، عەبدووڕەحمان ئەگەرچی بازرگان و دەوڵەمەندی شاری مەککە بوو، بەڵام کە هاتە شاری مەدینە هیچی پێ نەبوو.

سەعد پێی دەڵێت من دەوڵەمەندی شاری مەدینەم دەوڵەمەنترینی ئەنسارم نیوەی سەروەتەکەی خۆمت ئەدەمێ!!

ماکوان: بەڕاستی لە خەیاڵ زیاتر سەرسامت دەکات! ڕاستە دەوڵەمەندە بەڵام ئەگەر بیوتایە لە ٥٪ یان لە ١٠٪ لە سەروەتی خۆمت پێ دەبەخشم هەر زۆر زۆر بوو، تەنها دەست مایەکەی بدات بە عەبدووڕەحمان یان بیکاتە هاوبەش لە کارکردندا نەک لە سەروەت و ساماندا!

نومێر:- ڕاستە، بەڵام ئیمان و ئیسلام و هەست و سۆز و موحیبەتی برایەتی دایکی و باوکی زیاتری پێ بەخشیووە، بۆیە دەڵێت براکەم سەروەت و سامانەکەم دەکەم بە دوو کەرتەوە لەگەڵتدا!

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

١٤ ـ عبدالرحمن بن عوف.



ماکوان: بڕوا بکە وەکو تۆ دەفەرموویت برای دایک و باوکیش زۆر ئەستەمە ئەوە بکات.

نومێر: لەوە سەرسامتر و عەجیب تر، ئەوەیە دەڵێت دوو ژنم هەیە، یەکێکیان هەڵبژێرە با تەڵاقی بدەم ببێتە خێزانی تۆ!

ماکوان: بەخشین لەپێناو خوادا گەیشتە ئاستی شەرەف، بەڕاستی عەفییە.

نومێر: کێشە لەوە دایە هەڵبژاردە ئەداتە دەستی عەبدووڕەحمان دەڵێت کامیانت دەوێت هەڵبژێرە، بۆ ئەوەی یەکێکیان خۆی هەڵبژێرێت، لەوانەیە بوترایە ئەوە ڕقی لەو ژنەیەتی دەیەوێت لە کۆڵی ببێتەوە!

بەڵکو هەڵبژاردە ئەداتە دەستی عەبدووڕەحمان، بەڵام سبحان الله پیاوی خاوەن عیزەت و کەرامەت و شەهامەت و ئازا و جوامێر و خواناسن، نەیووت فرسەتە با هەلەکە بقۆزمەوە.

بەڵکو وتی: خوای گەورە بەرەکەت بخاتە ناو خێزانەکانت و ماڵ و منداڵ و سەروەت و سامانت، بەس پێم بڵێ بازاڕەکەتان لە کوێیە؟

ماکوان: بەڵێ بازرگان بەدوای بازاڕەوەیە، بۆیە بازرگانی سەرکەوتوو دەم پاک و دەست پاکە، بۆیە دەڵێت بازاڕەکەتان لە کوێیە.

نومێر: هەڵسە با بڕۆین بچین با ماڵێکی ترت بۆ باس بکەم.

ماکوان: جارێ کۆتایی ئەم چی بوو بۆم باس بکە.

بەڕێگاوە نومێر کەوتەوە قسە کردن بۆم، سەعدی کوڕی ڕەبیع بردی بۆ بازاڕی بەنوو قەینووقاع لەوێ دەستی کرد بە کەسابەت و بازرگانی، خوای گەورە سەروەت و سامانی زۆری پێ بەخشی.

جا بۆیە بەوە دەستم پێ کرد ماکوان گیان لەبەر ئەوەی بزانیت سەروەت و سامان لای خاوەن ئیمان گرنگ نییە، بەڵکو بەدوای پاداشتەوەیە زۆرێک لە هاوەڵان هەژار بوون، بەڵام برایەتی تەنها لە سەروەت و سامان نییە.

ماکوان: مەبەستت چییە؟ واتا هاوکاریمان کردووە لە بواری کۆمەڵایەتی و بوارەکانی تردا؟

نومێر: بەڵێ، بەدڵنیاییەوە مەبەستم ئەوەیە، ئەو ژنە دەبینیت؟!

ماکوان: بەڵێ، بەڵێ، دەیبینم نازانم بۆچی وا پەشۆکاوە؟!

نومێر: ئەوە نە پەشۆکاوە، بەڵکو لە هاوسەرەکەی بێزارە.



ماکوان: بۆ ئەوەیە؟

نومێر:- ئەوە (دایکی دەردائە)[١٥] خێزانی هاوەڵی بەڕێزی پێغەمبەری خوایە ﷺ باوکی دەردائە[١٦] پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەڵ سەلمانی فارسی[١٧] دا کردنییە برا، سەلمان لە موهاجیرەکان هەژمار دەکرێت ئەبو دەردائیش لە ئەنسار، سەلمان لەبەر دەرگا قسەی لەگەڵدا دەکات، دەیان بینێ ئەوە براژنی سەلمانی فارسییە.

ماکوان: باسی چی دەکەن؟

نومێر: خێزانی ئەبو دەردا دەردەدڵ لای سەلمانی فارسی دەکات دەڵێت براکەت ئەبو دەردا هیچ گرنگیم پێ نادات.

سەلمان لێی دەپرسێت بۆ وا شێواو و شڵەژاویت؟!

ئوم دەردائیش لە وەڵامدا دەڵێت، ئاخر براکەت هیچ گوێی بەمن و ژیانی خۆی نادات؟!

سەلمان هەست دەکات کە کێشەیەک هەیە لە ماڵی براکەیدا، چونکە برایەتی لەسەر بنەمای پەناهندەیی و کۆچکردن و ئابووری و عەشیرەت نەبوو، بەڵکو برایەتی زۆر بەهێزتر بوو لە برایەتی دایک و باوکی. لەبەرئەوەی یەک بیروباوەڕ کۆی کردبوونەوە، لێرەدا پرەنسیپ و مەبدەئو ڕۆڵ دەبینێت کە فاکتەرێکی زۆر بنەڕەتییە لە خۆشەویستی و وابەستە بوونە بەیەکەوە، کەواتە ئەم برایەتییە برایەتی ئیمان و عەقیدە بوو، نەک پراگماتیکی و سوود بەیەک گەیاندنی دنیایی.

ماکوان: ڕاستە، ئەی سەلمان چی دەکات؟

نومێر: لەپاش ئەوەی سەلمان لێی پرسی بۆ وا پەشۆکاویت، ئەویش پێی وت کەوا براکەت هیچ گوێ بە ژیانی خۆی و ئێمە نادات.

سەلمان زۆر لەسەر باسەکە نەڕۆشت ڕاستەوخۆ چووە ماڵی خۆی و خواردنی ئامادەکرد و ئەبو دەردای برای بانگێشت کرد بۆ نانخواردن، بەڵام ئەبو دەرداء وتی ناخۆم، بەڕۆژووم.

ئەوکات سەلمان تیگەیشت کەوا ئەبو دەردا هەموو ژیانی تەرخان کردووە بۆ بەندایەتی، بە شەو خەریکی شەونوێژ و بەڕۆژ بەڕۆژوو دەبێت، هەمیشە سەرقاڵی بەندایەتییە و وازی لە

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

١٥ ـ أم درداء.

١٦ ـ أبو درداء.

١٧ ـ سلمان الفارسي.



ماڵ و منداڵی هێناوە. لەڕاستیدا ئەم کێشەیە کێشەیەکی گەورەی خێزانییە و هەروا ئاسان نییە چارەسەری. بۆیە سەلمان خۆی تەرخان کرد بۆ چارەسەری کێشەکە و هەڵسا بە ڕاستکردنەوەی چەمکی بەندایەتی بۆ ئەبو دەردای برای و فێرکردنی ئەو چەمکانەی کە سوودی هەیە بۆ پێکەوە ژیانی خێزانی.

لەگەڵی دانیشت و پێی وت ڕۆژووەکەت بشکێنە و بەیەکەوە نان دەخۆین، ئەبو دەردا بە قسەی سەلمانی کرد ڕۆژووەکەی شکاند و پێکەوە نانیان خوارد.

کاتێک شەو بەسەردا هات هەستا دەستنوێژی گرت و ویستی دەست بکات بە شەو نوێژ و هەموو شەوەکە تەرخان بکات بۆ بەندایەتی، بەڵام سەلمان پێی وت بخەوە، چونکە لەماڵی سەلمان بوو نەیدەتوانی موخالەفەی قسەکانی بکات، جارێکی تر هەڵسایەوە سەلمان پێی وت بخەوە، لە کۆتایی شەودا سەلمان هەڵیساند، وتی: هەستە با بەیەکەوە شەونوێژ بکەین.

لە دواییدا سەلمان بە جەنابی ئەبو دەردای فەرموو: خوای گەورە فەرمانی بەسەر ئەوە هەیە، پاشان نەفس و لاشەت مافی بەسەرتەوە هەیە هەروەها خێزان و هاوسەرەکەت مافی بەسەرتەوە هەیە، میوانەکەشت هەقی بەسەرتەوە هەیە، بۆ هەر خاوەن مافێک مافی خۆی بدە.

ماکوان: ئەبو دەردا چی وت؟

نومێر: قەناعەتی نەبوو بە قسەکانی سەلمانی برای چوو بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ سکاڵای خۆی لا بکات لەسەر سەلمانی برای لەبەر ئەوەی بەڕۆژوو بوو ڕۆژووەکەی پێشکاندووە لەسەرەتای شەوەوە ویستوویەتی شەونوێژ بکات نەیهێشتووە لە کۆتایی شەودا ڕێگای داوە، هەموو ڕووداوەکەی بۆ پێغەمبەر ﷺ گێڕایەوە.

ماکوان: ئەی پێغەمبەر ﷺ چی فەرمووی؟

نومێر: پێغەمبەر خوا ﷺ فەرمووی (سەلمان ڕاستی کردووە).

ماکوان: بەڵێ ڕاستە، دەبێت لە ژیانی مرۆڤی موسڵمان پارسەنگی هەبێت لەنێوان ژیان و قیامەت لەنێوانی ڕاستی و ماف و حەق و دادپەروەری...هتد.

بەڵام ئەوەی سەرنجی منی ڕاکێشاوە پیاوێکی فارس دەبێتە برای پیاوێکی عەرەبی، ماڵەکەیان بۆ یەکتری کراوەیە، کۆمەڵگەیەکی جوان و پاک بوون ئەگەر چی بڕوای بە کارەکەی سەلمان نەبوو، بەڵام لەبەر ئەوەی لە ماڵەکەیدا بوو هیچی نەوت برایەتییەکەیان زۆر بێ وێنە



بوو بەڕاستی، برایەتی ئەوان تەنها قسە نەبووە لەسەر وەرەقە نووسرابێتەوە، بەڵکو برای ڕاستەقینە بوون هەستی بە ئازار و سۆزی براژنەکەی کرد.

بۆیە بەڕاستی هەتا وەکو ئەو ئەزموونە نەگەڕێتەوە ناومان ئەم ئومەت ی ئیسلامییە ناتوانێت پێشەوایەتی سەر زەوی بکات کە پێشتر کردوویەتی، بەو برایەتی و ئیمان و بیروباوەڕە نەبێت ئەو ئوممەتە پێک نایەتەوە.

نومێر: ڕاستە، هەمووی سەرچاوەکەی لە ئیمان و خواناسییەوە سەرچاوەی گرتووە، پێغەمبەری خوا ﷺ زۆر ئامۆژگاری دەکردن و هانی دەدان بۆ پرسی قیامەت و خواناسی و برایەتی، پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو:

لَا يُؤْمِنُ أَحَدُكُمْ، حتَّى يُحِبَّ لأخِيهِ ما يُحِبُّ لِنَفْسِهِ[18]

واتە: ئیمانی نییە کەسێک لە ئێوە، تا ئەوەی بۆ خۆی پێی خۆشە بۆ براکەشی پێی خۆش بێت.

## خاڵی سێیەم: برایەتی لە پێناوی خوادا

ماکوان: ڕاستە پەیوەندی برایەتی ئەوان بۆ بەهەشت و ڕازیکردنی خوای پەروەردگار بوو بۆیە پێغەمبەر ﷺ دەیفەرموو:

والَّذي نفسي بيدِهِ لا تدخلوا الجنَّةَ حتَّى تؤمنوا ولا تؤمنوا حتَّى تحابُّوا أولا أدلُّكم علَى شيءٍ إذا فعلتُموهُ تحاببتُم أفشوا السَّلامَ بينَكم.

واتە: سوێند بەو کەسەی گیانی منی بەدەستە، ناچنە بەهەشت تاوەکو ئیمان نەهێنن، ئیمانتان دامەزراو نابێت تاکو یەکترتان خۆش نەوێت، شتێکتان پێ بڵێم تا خۆشەویستی لە نێوانتاندا زیاد بکات، ئەویش سڵاوی ئیسلام لەیەکتری بکەن.

بەداخەوە خەڵکانێک هەیە نایانەوێت خۆشەویستی لە دڵی یەکتردا بڕوێنن وشەی (السلام عليكم) بەکار ناهێنن، دەڵێن (ڕۆژ باش، بەیانی باش... هتد).

پێغەمبەری خوا ﷺ هەوڵی زۆری داوە ئەم برایەتییە ئاوا لە نێوانیاندا بەرپا بکات.

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

١٨ ـ الراوي: أنس بن مالك،المحدث: بخاري، المصدر: صحيح البخاري.



نومێر: بەڵێ، بەدڵنیاییەوە ئەو فەرموودانە كاریگەری تەواوی هەبوو لەسەر دڵ و دەروونی هاوەڵان لەو واقیعەدا هەموو پیادەیان كرد، ژیانیان لەسەر بنەمای برایەتی بوونیاد نا.

بەڵام پێغەمبەری خوا ﷺ زۆر واقیعانەتری كردووە، بەتەنها برایەتی بەس نەبوو بەڵكو پێویستە بۆ دامەزراندنی دەوڵەتی ئیسلامی ڕێگای تربگرێتە بەر، چونكە بەدڵنیاییەوە دووچاری كێشەی گەورەتر دەبێتەوە، هەروا بە ئاسانی دەستبەردار نەبوو یاخود بەجێبهێڵێت بۆ نەفس و برایەتی، چونكە شەیتان و یەهوود و هاوبەشدانەرەكان و ئەعراب هەموو لە ناوچەكەدا هەبوون، پێویست بوو كە یاسا و قانونیش لە هەمان كاتدا هەبێت، هەڵسا بە نووسین و دەستوور و دانانی یاسا بەشێوەیەكی نووسراو، ئاڕاستەكەی وەحی خوای پەروەردگار بوو.

ماكوان: دەستوور و یاسای ئیسلامی؟!

نومێر: بەڵێ، دەستوور و یاسای ئیسلامی.

خاڵی یەكەم: برایەتی نێوان موهاجیرەكان و ئەنسار بوو وەكو باسم كرد.

خاڵی دووەم: كەفالەتی نێوان موهاجیر و ئەنسار بوو.

خاڵی سێیەم: وەكو تۆ ئاماژەت پێدا، برایەتی بوو لە پێناوی خوادا.

خاڵی چوارەم: نووسینەوەی دەستوور.

## خاڵی چوارەم: نووسینەوەی دەستوور

ماكوان: ئەو میساق و دەستوورە زۆر بەناوبانگە، بۆچی پێغەمبەری خوا ﷺ دەستی كرد بە نووسینەوەی، هۆكاری نووسینەوەی ئەو قانوونە چی بوو؟!

نومێر: بەڵێ، بەڕاستی گرنگی خۆی هەیە و ڕێكخستنی ناو كۆمەڵگەكەی پێ پابەند دەكات لەبەندی یەكەمی ئەو یاسایانەدا هاتووە؟

یەكەم: موهاجیر و ئەنسار ئوممەتێكی یەكگرتوون و جیاوازتر لە خەڵكی تر هیچ جیاوازییەك لە نێوانی موهاجیر و ئەنساردا نییە.

بەڵام پێغەمبەری خوا ﷺ زۆر بەوردی كاری كرد.



یەکەم: سەرژمێری هەموو شاری مەدینەی کردوو زانی چەند ماڵ و چەند جۆرە خەڵکی تێدا دەژیا.

دووەم: کۆچکردووەکانی قورەیش لەهەموو گیروگرفتێکدا بەیەکەوە مامەڵە دەکەن، هەر ڕووداوێکی نەخوازراو ڕوویدا، دەبێت خۆیان چارەسەری بکەن، وەکو نموونەی (الدیة) واتا ئەگەر کەسێک بە دەستیان کوژرا دەبێت خۆیان (خوێنبای)یەکەی بدەنە خانەوادەی مردووەکە، یاخود ئەگەر ئەسیرێک لە موهاجیرەکان دەست دوژمن کەوت بۆ ڕزگارکردنی لە دیلی دەبێت موهاجیرەکان دییەکەی بدەن و ئازادی بکەن، هەروەها ئەنسار بەهەمانشێوە بۆ مەبەستی دانی دییە دەبێت هاوکاری یەکتر بکەن.

پێغەمبەری خوا ﷺ کۆمەڵەکەی کرد بە چەند بەشێک (لە قورەیش و ئەوس و خەزرەج) لەسەر بنەمای عەشیرەت ڕێکیخستن، هەریەک لەو عەشیرەتانە لەسەر بنەمای هۆزەکانیان. لەبەر ئەوەی برایەتی تەنها لە بواری جەنگ و خوێندا ڕۆڵی نابێت، لە هەمانکاتدا دەوڵەتی ئیسلامی کە پێغەمبەر ﷺ دایمەزراندووە نوێیە و لاوازە لە ڕووی ئابوورییەوە دارایی و سەروەتی نییە، بەیتولمالی خاڵییە، سەروەت و سامانێکی وای نییە کە فریای لێ قەوماوەکان و بێدەرەتانەکان بکەوێت و دەست گیرۆییان بکات.

لەسەر بنەمای عەشیرەت و هۆز پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ یاساکانی موسڵمانانی ڕێکخستن، ئەگەر چی ئیسلام حەزی بە عەشیرەت و هۆزگەرایی نییە.

یاخود حیزب و گروپ لەسەر بنەمای عەشایەر و هۆزگەرای دروست بکات، تەنها بەمەرجێک ئەو کارە ئەنجام ئەدرێت کە لەسەر هاوکاری کردنی تەقوا و چاکەخوازی بێت، هاوکاری لێ قەوماو و خاوەن پێداویستی بێت.

کەواتە ئیسلام ڕۆڵی عەشیرەت و هۆز و تیرە پشتگوێ ناخات بە تەواوەتی بەڵکو ڕێکی دەخات لەسەر بنەمای چاکە و هاوکاری کردنی یەکتر لە خوێن بەیەکەوەی بەستوون، یاخود خزمایەتی و سیلەی ڕەحم.

پێغەمبەری خوا ﷺ یاساکانی نووسیوە، پاشان سنوورەکانی دیاریکرد و دەستنیشانی کرد، سەپاندی بەسەر عەشیرەتەکاندا، بەڵام ئەم یاسا و ڕێسایانە پیادە ناکرێت تا برایەتی لە نێوان موسڵماناندا دروست نەبێت، هەر بۆیە ئەو پرۆژە کاری یەکەمی پێغەمبەری خوا ﷺ بوو بۆ بونیادنانی یاسا و ڕێساکانی ئیسلامی، شەریعەتی ئیسلام ناکرێت بەشێکی وەربگرین و بەشێکی تری وازی لێ بێنین، چونکە هەموو تەواوکەری یەکترن.



دەبێت هەموو لایەک لەوە تێبگات کە شەریعەتی ئیسلام بۆ دونیا و قیامەتە، بۆ ئیدارەی ژیان و دونیا و دینە.

بەم شێوەیە پێغەمبەی خوا ﷺ دانی نا بە عەشیرەت و هۆز و تیرەکان، لەسەر بنەمای چاکە خوازی و هاوکاری، فیکری ئیسلامی لە کارەکانی پێغەمبەر خوا ﷺ سەرچاوە دەگرێت، بەڵام سنووری بۆ دانرا. ئەمەش بەواتایەکی بەرفراوانتر واتای ئەوەیە، ئەگەر دەستدرێژی کرایە سەر خەڵکی و هاونیشتمانی دەوڵەتی ئیسلامی پێویستە بەرگری لەخۆیان بکەن یان هاوکاری دەکرێت لەلایەن ئەوانەی کە لە ڕووی جوگرافیاوە لێی نزیکن واتا ناکرێت لە دەوڵەتی ئیسلامیدا ئەوانەی جەنگیان لەبەرامبەر دەکرێت لە ڕۆژهەڵات خەڵکی ڕۆژئاوا هاوکارییان بکات، ئەگەر خۆیان توانای هاوکاری و بەرگری کردنیان هەبوو، ڕیتم و سیستەمە پێغەمبەری خوا ﷺ بەشی جیۆپۆلیتیک، جیۆپۆلیتاری و ئاسایشی دەوڵەتی دامەزراند لە گشت بوارەکاندا، هەروەها نموونەی زەکات، ئەگەر ڕۆژئاوا لە بەیتولمالی دا زەکاتی هەبوو تەنها دابەش دەکرێت بەسەر خەڵکی ڕۆژئاوادا، ئەگەر لەوان زیاد بوو ئەهلی ڕۆژهەڵات پێویستیان بوو ئەوە لە بەشی ڕۆژئاوا پێی دەدرێت، ئەمەش سیاسەت و ستراتیژی سەرەتای پێغەمبەری خوا ﷺ بوو لە دەوڵەتەکەدا و بۆ هاوکاری لە نزیکەکانەوە بە بازنەیەکی بچوک ئەگەر خەڵکانی تر پێویستیان بوو ئەوە بازنەکە گەورەتر دەکرێت.

ئەوەش زیاتر هۆکاری یەکگرتن و خۆشەویستی و نزیک بوونەوەی گەلان و خەڵکییە بە گشتی لە یەکتری، هەموو وەکو یەک لاشە بەیەکەوە کار دەکەن لە دەوڵەتی ئیسلامیدا، چونکە موسڵمان ناهێڵێت هەژار و قەرزار و لێقەوماو لەناو دەوڵەتی ئیسلامیدا بمێنێت، خەڵکی بەگشتی پێداویستی یەکتری دەبێت پڕ بکەنەوە لەسەر بنەمای یەکترناسین و لێک نزیک بوونەوە، ئەوەش لەسەر بنەمای دەقی قورئان کە خوای پەروەردگار لە سورەتی الحجرات ئایەتی ١٣ دا دەفەرموێت:

﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَـٰكُم مِّن ذَكَرٍ وَأُنثَىٰ وَجَعَلْنَـٰكُمْ شُعُوبًا وَقَبَآئِلَ لِتَعَارَفُوٓاْ إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِندَ ٱللَّهِ أَتْقَىٰكُمْ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ ١٣﴾

واتە: ئەی خەڵکینە ئێمە هەمووتانمان لە نێرومێیەک دروستکردووە (کە باوکە ئادەم و دایکە حەوایە)، کردوومانن بە گەلان و تیرەو هۆزانی جۆربەجۆر، تا یەکتر بناسن و



پەیوەندیتان خۆش بێت بە یەکەوە..بەڕاستیی بەڕێزترینتان لای خوا ئەوەتانە کە زۆرتر لە خواترسە و فەرمانبەرداری خوایە، بێگومان خوا زانا و ئاگایە بە هەموان.

سێیەم لەباسی دەستووردا هەموو موسڵمان دەبێت یەک دەنگ و یەکگرتوو بن لە دژی ئەوانەی کە دەستدرێژ و خراپەکاری و زوڵم و تاوان ئەنجام ئەدەن، بەواتای ئەوەی ئەگەر کەسێک لە عەشیرەتەکە یاخود کوڕی کەسێکی ناودار لەناویاندا دزی و فەسادی و دوژمنایەتی بڵاوکردەوە ئەوا هەموو یەک دەنگن لەسەر سزادانی ڕەچاوی هیچ بنەمایەکی خزمایەتی عەشایەری و هۆزگەرایی ناکرێت و تاوانبار سزا دەدرێت.

موسڵمان لەسەر کافر ناکوژرێت و نابێت ئیماندار بکوژرێت، هەروەها ئیماندار نابێت کافر سەربخات بەسەر ئیمانداردا، ئەمەش بەشێک بوو لە دەستوور کە ئەوپەڕی گرنگی خۆی هەیە، چونکە دەوڵەتی ئیسلامی دەچێتە ناو ململانێیەکی دژوار لەگەڵ زۆرێک لایەندا، لەگەڵ قوڕەیش، ئەعراب، جوولەکە...هتد.

ئەگەر کەسێک موسڵمان بوو، باوکی یاخود برایەکی یان نزیک و خزمێکی لەگەڵ کافرەکان کەوتنە جەنگ و شەڕکردن لەگەڵ موسڵماناندا، ئەگەر کەسێک لەکافرەکان کوژرا و برا و کەسوکاری کەسێکی موسڵمان بوو، ناتوانێت داوای خوێن یاخود تۆڵەسەندنەوە بکات، هەر لەبەر ئەوەبوو ئەم یاسا گرنگە داڕێژرا کە موسڵمان لەبەرانبەر کافردا ناکوژرێتەوە، چونکە دوای زەمەنێکی نزیک جەنگ و شەڕکردنی زۆر ڕوونەدات لە نێوان کافرەکانی قوڕەیش و نیوەدوورگەی عەرەبی.

هەروەها بەند و یاسا و ڕێسای زۆری تر لەو دەستوورەدا ئاماژە پێکراوە، بەڵام من لێرەدا کۆتایانت بۆ باس دەکەم کە دەشێت لەهەمووی گرنگتر بێت و کۆکراوەی دەستوورەکە بێت ئەویش کە پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمووێت:

ئێوە لە هەر شتێکدا ڕای جیاوازتان هەبوو دەبێت بگەڕێنەوە بۆلای پەروەردگار کە مەبەست قورئانە، پاشان بۆلای محمد پێغەمبەری خوا ﷺ ئەویش بە ئاڕاستەی وەحی کێشەکان و ڕای جیاواز چارەسەر دەکات، بەم شێوەیە سەرچاوەی سەرەکی یاسای ئیسلامی لەناو دەوڵەتی ئیسلامدا بریتییە لە: (قورئان و سوننەت).[١٩]

ئەمەش بەشێکی کورت بوو لە دەستوور و سیاسەتی شاری مەدینە یان دەوڵەتی ئیسلامی.

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

١٩ ـ إنكم مهما اختلفتم فيه من شيء فن مرده إلى الله عز وجل وإلى محمد ﷺ. سيرة ابن هشام، باب الدستور.



ماکوان: بەڕاستی هەر ئەوەندە بوو دەستوور و سیاسەتەکە؟!

نومێر: نا، زۆرە بەڵام پێم خۆشە لەگەڵ ڕووداوەکاندا زیاتر باسی بکەم، خۆشت بەچاوی خۆت هەموو بەند و یاساکان دەبینیت.

ماکوان: ئەی خاڵی پێنجەم چییە؟

نومێر: مەبەستت چییە لە خاڵی پێنجەم؟!

ماکوان: ئەی خوا عەفوت بکات وتمان خاڵی یەکەم برایەتی موهاجیر بوو لەگەڵ ئەنسار، خاڵی دووەم کەفالەتی نێوان موهاجیر و ئەنسار بوو، خاڵی سێیەم برایەتی بوو لەپێناو خوا، خاڵی چوارەم نووسینەوەی دەستوور، ئەی خاڵی پێنجەم چییە؟!

نومێر: ببوورە ڕاستە، خاڵی پێنجەم نەهێشتنی بێکاری بوو لە شاری مەدینە.

## خاڵی پێنجەم: پڕۆژەی نەهێشتنی بێکاری

ماکوان: ئەو پڕۆژە گرنگە پێغەمبەر ﷺ چۆن چارەسەری کێشەی بێکاری کرد؟!

نومێر: وەکو باسمان کرد ئیسلام وەکو ملوانکە وایە، هەموو دەنکە مرواری و مێرووەکانی لەیەک بەکرەدا هۆنراوەتەوە، پڕۆژەکان وابەستەن بە پەت و حەبلی ئیمان، بۆیە سەرکەوتنی دەوڵەتی ئیسلامی پێش هەموو شتێک بە خواناسی و ئیمان دەست پێدەکات، پاشان پڕۆژەکانی بەو خواناسییە دەهۆنرێتەوە و ڕیز دەکرێت و تا کۆمەڵگە و سیستەمی کۆمەڵایەتی پێ ڕێکبخرێت.

ماکوان: چۆن و مەبەستت چییە و جوانتر بۆم ڕوون بکەرەوە؟!

نومێر: ماکوان گیان، ئیمان مەخلوقێکی زۆر عەجیبە لە ڕۆح عەجیبترە، درۆ و تەزویر قبوڵ ناکات، خۆ ئەگەر کەسێک وتی ئیماندارم و وانەبوو، دووڕووە زۆر زوو بە کردار و گوفتاریدا دەردەکەوێت، هەر خۆی بۆ خۆی ڕسوا دەبێت و لە قیامەتیش لە ئاگری دۆزەخ لە خواری خوارەوەیە.

ئاخر ناکرێت موهاجیرەکان بەو جۆرە ناو شاری مەدینەدا بمێننەوە کۆڵ و بارین بەسەر خەڵکی شاری مەدینە، ڕاستە سەرەتا لەوانەیە نەرمە تەریقەتی و هەست و سۆز وابکات کە ئەنسار قبووڵی هەموو ئەو قورساییە بکات یان گومانی تێدا نییە، ئەوان باشترین ڕەوەند و



جیل بوون و هەر بە پێشەنگی دەمێنێتەوە، بەڵام لە هەمووی گرنگتر پێغەمبەری خوایە ﷺ زۆر واقیعیانە بیری دەکردەوە، خوای پەروەردگاریش ئاراستەی وەحییەکەی بۆ پێغەمبەر ﷺ لەسەر بنەمای قسەکردن بوو لەگەڵ دڵ و دەروونی خەڵکی دا و لە واقیعی ژیانی خەڵکی ئەدوێت.

ئەگەر تەماشای ئیمانی ئەنسار بکەین ئەوەندە بەهێزە بە قورسایی ئاسمانەکان پێوەر دەکرێت، شاری مەدینە خورما و باخ خورمای زۆری تێدا بوو، هاتن بۆلای پێغەمبەر ﷺ بۆ ئەوەی باخە خورماکان دابەش بکەن لەگەڵ موهاجیرەکاندا، سەرچاوەی دارایی و خۆراکی شاری مەدینە خورمایە، خورما یەکجار زۆر بوو لەو شارەدا، بۆیە بە پەلە هاتن وتیان باخەکانیش دابەش بکە ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ.

ماکوان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ چی کرد؟!

نومێر: وەکو وتم پێغەمبەر ﷺ زۆر واقیعی بوو، ڕازی نەبوو داواکەی ڕەت کردنەوە، ئەو هەموو بەخشیشە گەورەیە لەلایەن ئەنسارەوە ئیمان داینەمۆکەیەتی، پێغەمبەری خوا ﷺ نایەوێت ڕۆژێک لە ڕۆژان پەشیمانی بە ئەنسارەوە ببینێت لە بەخشینی ئەو سەروەت و سامانەی کە دارایی وڵاتەکەیە.

لێرەوە پرۆژەکەی پێغەمبەر ﷺ دەستی پێکرد داوای کرد لە ئەنسار کە موهاجیرەکان لە گەڵیاندا لە باخەکاندا کار بکەن و لە داهاتی باخەکە و بەروبوومی خورما بەشداری بکەن، بەمەش موهاجیر و ئەنسار کەوتنە کارکردن و بەباشترین شێوە خزمەتی دارخورما و باخ و سەروەت و سامان و دارایی وڵاتیان دەکرد، لەڕووی کشتوکاڵ و بازرگانی مەدینە بەرەو پێش دەڕۆیشت.

لەم ڕۆژەدا چەند لایەنێکی تر هەیە لەکاتی خۆیدا بۆت تەواو دەکەم، ئەویش دامەزراندنی بازاڕی ئازادە دوور لە باج و خەراج و ڕیبا، کە پێغەمبەر ﷺ پاش ماوەیەکی تر دایدەمەزرێنێت.

بەهەرحاڵ موهاجیرەکان کەوتنە کارکردن لە خاکی ئەنساردا و باخ و باخاتیان پڕ بەرەکەت تر کرد و توانای کاری زیاتریان هەبوو لە باخەکاندا، بەم هۆکارە ڕۆڵی موهاجیر لەناو دەوڵەتی ئیسلامیدا گرنگ و چالاک بوو، شاری مەدینە تەنها نەبووە کەمپی پەناهەندە بۆ موهاجیرەکان، بەڵکو بوونە توخمێکی سەرەکی هاونیشتیمانی لە شار و کۆمەڵگە و دەوڵەتەکەدا.



بۆ زانیاریت ئەمانەی کەباسیان دەکەم زۆربەی لە دەستووری ئیسلامدا بەیاسا پێغەمبەری خوا ﷺ ڕێکی خستووە هەموو بەشێکن لەو دەستوورە.

ماکوان: ئەی چی گرنگتر هەیە لەو دەستوورەدا؟!

نومێر: بابیکەین بە خاڵی شەشەم، ئازادی هاونیشتیمانی بوون لە شاری مەدینە.

## خاڵی شەشەم: ئازادی تەواو بۆ موهاجیرەکان لە شاری مەدینەدا

یاسایەکی تر بریتی بوو لە ئازادی موهاجیرەکان لە شاری مەدینەدا کە بەتەواوەتی ئازادن و مافیان وەکو مافی ئەنسارە، لە بوارەکانی موڵک و کڕین و فرۆشتن، هاوسەرگیری، چوونە ناو شوورا و مەجلیسی ڕاوێژ کردن، ئازادی سەرکردایەتی لە سوپا و بوارەکانیتردا، بەڵکو ئازادی لە سەرۆکایەتی دەوڵەت. ئەمەش لە واقیعدا ڕوویدا هەر چوار خولەفای ڕاشیدین لە موهاجیرەکان بوون، بەڵکو ڕۆژێک لە ڕۆژان ئەنسار قیادەی دەوڵەتیان نەکردووە.

بەمەش لەدڵ و دەروونی هەموو لایەکدا چەسپا جیاوازی لە نێوان ڕەگەز و نەتەوە و عەشیرەتدا نییە، بەڵکو هەموو هاونیشتمانبن لەم خاکەدا و لەم دەوڵەتەدا پاش چەند مانگێکی تر وای لێدێت جیاوازی لە نێوان موهاجیر و ئەنساردا ناکرێت و هەموو توخمێکی گرنگن لە دەوڵەتەکەدا و بەیەکەوە و هەموو بەرگری لە خاک و نیشتیمان دەکەن.

تەنانەت موهاجیرەکان دوای فەتحی مەکەش نەگەڕانەوە بۆ شاری مەکە هەموو لە شاری مەدینە مانەوە.

ماکوان: بەڕاستی ئەوەی کە جەنابت باست کرد نومێر، ڕێک دەڵێت ئەمریکا و وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا ژیان و سیرەی پێغەمبەریان خوێندۆتەوە، لە واقیعی ئەواندا ڕێک ئەم یاسایانە پیادە کراوە بگرە لە کەنەدا و لە بەریتانیا و ئوستوڕالیا و لەم دوایانەشدا هەموو ئەوروپا بەگشتی.

نومێر: بەڵێ، بەدڵنیاییەوە ڕۆژئاوا بەگشتی لێکۆڵینەوەیان کردووە لەسەر ژیانی پێغەمبەر ﷺ و شارەزان لە مێژووی ئەو پێغەمبەرە، بۆیە سەرکەوتوون و ئەوان هەرچی شتی چاکی ئێمەیە بردوویانە بۆ خۆیان و کاری پێ دەکەن، ئێمەش هەرچی پۆخڵەواتی ئەوانە هێناومانە بۆ خۆمان و لە جیهانی ئیسلامیدا کاری پێ دەکەین.

ماکوان: بەڕاستی وایە، ئەگەر تەماشای ئەمریکا بکەین لە سەدەی ١٨دا پێنج ملیۆن دانیشتوانی هەبوو، بەڵام دوای سێ سەدە دانیشتوانی گەیشتۆتە سەرووی (٣٠٠) ملیۆن کەس،



بەدڵنیاییەوە شارەزان لە مێژووی پێغەمبەری خوا ﷺ خوێندنەوەیان بۆ (١٤ سەدە) کردووە کە پێغەمبەر محمد ﷺ چی کردووە، دەوڵەتێکیان دروست کردووە لە جیهاندا نموونەیان کەمە و قسە ڕۆیشتوون بە توانا و زاڵن و خاوەنی دەیەها ئوسطوڵی گەورە و ملیۆنەها سەرباز و تەکنەلۆجیای سەربازین، ئەویش بە دووخاڵی گرنگ کە هەردووکی سەرچاوەکەی لە ژیانی پێغەمبەر ﷺ و دەوڵەتەکەیدا بەدی دەکرێت.

خاڵی یەکەم: بەیەکگرتنی خەڵکەکە چۆن پێغەمبەری خوا ﷺ یەکگرتوویی خستە ناو ئەوس و خەزرەج، پاشان موهاجیرەکانی کردن بەهاونیشتمان و گیانێکی یەکگرتوو هەروەها ئەمریکا توانی (٥٢ ویلایەت) لەناو دەوڵەتێکدا کۆ بکاتەوە و یەک سەرکردەی هەبێت، ئەمەش ئەو توانا و هێزەی بەخشی بە ئەمریکا.

نومێر: ئەی خاڵی دووەم چییە؟

ماکوان: خاڵی دووەم بریتییە لە دانی ڤیزە بۆ ئەوانەی لە دەرەوەی ئەمریکان بۆ هاتن بۆ ناو خاکی ئەمریکا و هەموو مافێک وەردەگرن و دەبنە هاوڵاتی لەو وڵاتەدا، عەرەب و کورد و ئەوروپی و ئاسیایی...هتد، دوای هەموو بەخۆیان دەڵێن ئەمریکی و تەنانەت لە ئێستادا وتنی پاشگری وڵاتی تر دانانێ بۆ خەڵکی وەکو دەمارگیری قەدەغەیە و سزای لەسەر وەردەگرێت.

نومێر: بەڕاستی وایە هەموو یەک مافیان هەیە، ئەگەر چی یەکێک بنەڕەتی هۆڵەندی بێت یان ئەڵمانی یان هەر نەتەوەیەکی تر.

ماکوان: چاویان لە پێغەمبەری خوا ﷺ کردووە، تەماشا بکە بەشێوەیەکی شارستانی و زۆر جوان و ڕاقی، هەموو هۆز و عەشیرەت و تەنانەت نەتەوەکانی تریشی تێکەڵ کرد و پەیوەندی ئیمان و خواناسی بەیەکەوە بەستینەوە لە دەوڵەتێکی سەربەخۆ و یەکگرتوودا لە بوارەکانی ژیان و دنیادا، هەروەها لە بوارەکانی قیامەت و بەهەشتدا، خۆشی دنیا و قیامەتی بۆ تێکەڵ کردن.

نومێر: بەدڵنیاییەوە ئەو قسەت زۆر گرنگە چونکە دەوڵەتان بەشێوەیەکی گشتی دەتوانن ژینگەیەکی باش و هێمن دروست بکەن، بەڵام ئەگەر بونیادی خواناسی و بیروباوەڕی لەگەڵدا نەبێت ئەوە بەدڵنیاییەوە خەڵکەکەی لە بۆشاییەکی ڕۆحیدان و ئەو خۆشییەی باست کرد بەدی نایەت، خۆ ئەگەر بەدی هات ئەوە خۆشی دنیاییە و لەزەتەکانییەتی، بەهۆکاری نوقسانی قیامەتی خۆشی ژیان هەر لەدەست ئەدات.



ماکوان: کەواتە بەم شێوەیە پێغەمبەری خوا ﷺ کێشەی موهاجیر و پەناهەندەی چارەسەر کرد، بەڵکو لە کێشەوە دەرچوون بوونە هێزێکی گەورە بۆ دەوڵەتی ئیسلامی، بەڵام پرسیارێکی تر ئەی کێشەی موسڵمان لە دەرەوەی شاری مەدینە چۆن چارەسەرکرا وەکو نموونەی (موسڵمانانی حەبەشە، موسڵمانانی ناو هۆز و عەشیرەتەکانی تر، یاخود لاواز و بێچارەکانی ناو شاری مەککە لە موسڵمانان).



## موسڵمانانی دەرەوەی دەوڵەتی ئیسلام

نومێر: وەکو ئەوەی کە خۆت کردت بەسێ بەش، موسڵمانانی حەبەشە و موسڵمانانی هۆز و عەشیرەتەکانی دەرەوەی مەدینە، موسڵمانە لاواز و بێ دەسەڵاتەکانی شاری مەککە. سەرەتا با لە موسڵمانانی حەبەشەوە دەست پێ بکەین.

### موهاجیرەکانی حەبەشە

لە وڵاتی حەبەشەدا (٨٠) پەناهەندەی موسڵمانی لێبوو، لەو شار و وڵاتەدا زوڵمیان لێ نەدەکرا، حاکمەکەی دادپەروەر بوو، بەڵام کە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم جێگیر بوو ڕەوشەکە ئاسایی بوویەوە لە شاری مەدینە، پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم ناردی بە شوێن هەندێکیاندا کە بە زووترین کات بگەڕێنەوە، هەموویان نا بەڵکو هەندێکیان بۆ ئەوەی هاوکاری پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بکەن لە بونیادنانی دەوڵەتەکەیدا، چونکە بونیادنانی دەوڵەت توانا و هێز و خەڵکی لێهاتووی دەوێت، لەگەڵ ئەوەدا کە دەیتوانی بڵێت هەمووتان بگەڕێنەوە بەڵام پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم کەسێکی واقیعی بوو دوور بوو لە سۆز و عاطیفە ئەگەر هەموویان بانگ بکاتەوە، ئەوە جارێکیتر پێناچێت جێگای موسڵمانان لەو وڵاتەدا بکرێتەوە بۆیە بەشێکی هێشتنەوە، تا کۆمەڵێک لە موسڵمان لە مەترسی هەر بەدووربن.

تاکو حەبەشە جێگا و حەشارگە و قاعیدەیەکی تری موسڵمانان بێت، چونکە مەترسی قوڕەیش زۆرە و هەمیشە لە کەمیندان بۆ موسڵمان لە لایەکی ترەوە مەترسی یەهوود هەیە، یاخود گەل و هۆزەکانی تری چواردەور، هەر لەبەر ئەم هۆکارانە بوو پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ هەندێکیانی هێشتەوە لە وڵاتی حەبەشە، تا ئەو کاتەی ڕەوشی واقیعی دەوڵەتی ئیسلامی جێگیر و بەهێزتر دەبێت و بەتەواوەتی خۆی دەگرێت، هەر بۆیە گەڕانەوەی موسڵمانان دوای گەڕانەوەی پەیمانی حودەیبیە ڕوویدا، بەتەواوەتی هەموویان گەڕانەوە لە حەبەشە دوای شەش ساڵی تر ئەو کارە ئەنجام دەدرێت.



## موسڵمانانی ناو گەل و هۆز و عەشیرەتەکانی دەرەوەی مەدینە

### کە بریتی بوون لە موسڵمانانی یەمەن غیفار و ئەسلەم... هتد

پێغەمبەری خوا ﷺ ئەمری پێ کردن لە جێگا و مەنزڵگای خۆیان بمێننەوە، بەڵام هەریەک لە موسڵمانانی ئەو هۆز و عەشیرەتانە ببنە شوعلە و مەشخەڵێک بانگەوازی خەڵکی ناوچەی خۆیان بکەن و ڕێنیشاندەر و هیدایەت دەری ئەو خەڵکە بکەن، نموونە لەناو گەلی (دەوس) وڵاتی یەمەن کەسێک بەناوی (طوفەیلی کوڕی عەمری دەوسی)[٢٠] بانگەوازی دەکرد لەناو هۆز و عەشیرەتی غیفاردا کەسێکی تر بەناوی (ئەبو زەڕی غیفاری)[٢١] بانگەوازی دەکرد، لەناو هۆز و عەشیرەتی ئەسلەم (عەمری عەبسە) بانگەوازی دەکرد، بەم شێوەیە لە هەموو ناوچەکانی تردا کەسێکی دانابوو بۆ بانگەواز و ڕێکخستنی خەڵکی بۆ ئیسلام، بۆیە پێغەمبەر خوا ﷺ وازی هێنا لەو خەڵکانە لە جێگای خۆیان بمێننەوە، لە کاتی پێویستدا هەمووی بانگێشت دەکات بۆ دەوڵەتەکەی، بەگشتی ئەو خەڵکە هێزی دەوڵەتەکەی زیاتر دەکات. بەڵام لە ئێستادا نایەوێت ئەو قورساییە بڕواتە سەر خۆی، زیاتر دەینێرێت تا کاتی دیاریکراو نایەوێت جەبهە و شەڕ زۆر یەخەی دەوڵەتەکەی بگرێت، لەهەمانکاتدا مانەوەیان بۆ بانگەواز و ڕێکخستنی سەرتاسەری ناو گەل و هۆز و عەشیرەتەکان زۆر پێویستە، ئەوانیش دوای پەیمانی حودەیبیە بانگهێشت دەکرێن بۆ دەوڵەتی پێغەمبەری خوا ﷺ.

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

٢٠ ـ طفيل بن عمرو دوسی.

٢١ ـ أبو ذر الغفاري.



## لاوازی دەسەڵات و بێهێزەکانی شاری مەککە لە موسڵمانان

ئەم کۆمەڵە لە شاری مەککەدا لاواز و بێ دەرەتانن و توانای هیجرەت کردنیان نەبوو، بێ پارە و بێ هێز بوون، بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ داوای لێکردن بە نهێنی بمێننەوە و کەس پێیان نەزانێت، تاکو کافرەکانی قورەیش ئازاریان نەدەن و لە ناویشیان بەرن، ئەو کێشە چارەسەر نەکرا هەتا وەکو ئازاد کردنی شاری مەککە و فەتحکردنی لەدوای هەشت ساڵ لە دامەزراندنی دەوڵەتی پێغەمبەر ﷺ لە شاری مەدینە، ئا بەم شێوەیە پێغەمبەری خوا ﷺ بەرخوردی کرد لەگەڵ کۆمەڵگەی ئیسلامی لە ناوە و دەرەوەی دەوڵەتەکەیدا.

ماکوان: بەڕاستی بەوپەڕی حیکمەت و لێ هاتووییەوە کار و پڕۆژەکانی ئەنجام دەدا و پێویستە هەرچی سیاسی هەیە لەسەر ئەم زەوییەدا چاوی لێبکات، بەوانەشەوە وانەی زانستە سیاسی و ستراتیژەکان دەڵێنەوە لە ئەکادیمییەکانی جیهاندا، بەڕاستی کارکردنی زۆر جێگای سەرنج و لێکۆڵینەوەیە.

نومێر: بەدڵنیاییەوە وتەکەت تەواوە، با ئەوەمان لەبیر نەچێت ڕاستە پێغەمبەری خوا ﷺ مرۆڤە، بەڵام بە ئاڕاستەی وەحی کارەکانی ئەنجام داوە.

ماکوان: باشە من لاریم لەوە نییە، بەڵام وەحییەکەی بۆ ئێمە و جیل و ڕەوەندەکان بەجێ ماوە و لەبەردەستماندایە ئەوە نییە من و تۆ قسەی لەسەر دەکەین، ئەویش قورئان و سوننەتەکانییەتی، بەهەر حاڵ ئەوەم پێ بڵێ موشریکەکانی مەدینە چییان دەکرد؟!

نومێر: بەڵێ، بەدڵنیاییەوە قسەکە تەواوە منیش لاریم لێ نییە، بەڵکو وەحییەکە لەبەر دەستماندایە، بەڵام دەمەوێ ئەوە بگەیەنم کە محمد ﷺ تەنیا سیاسییەکی ڕووت نەبووە، بەڵکو پێغەمبەر و سیاسی بووە. پاشان سەرکردە و پێغەمبەر بووە، هەروەها سەرکردەی سەربازی و پێغەمبەر بوو، باوک و پێغەمبەر بووە، باشترین هاوسەر بووە بۆ هاوسەرەکانی لەگەڵیدا پێغەمبەر بووە ﷺ، ئەوەت پێبڵێم کە وەحی لە لایەن خواوە بۆ پێغەمبەر ﷺ هاتووە، قسەکردن بوو لەگەڵ ناخی مرۆڤەکان و واقیعیان، دەرنەچووە لە تواناکانی مرۆڤ.

بۆ ئەوەی وەڵامی پرسیارەکەت بدەمەوە درێژە بەم باسانە نادەین، ئیتر چونکە ئەم پرسیارەت زۆر گرنگە، زۆر شتمان لەو واقیعەدا بۆ ڕوون دەبێتەوە، هاوبەشدانەرەکان ئەوانیش



كۆمەڵێک بوون، بەهەمان شێوە پێغەمبەری خوا ﷺ مامەڵەی لەگەڵ دەكردن و بەرخوردی لەگەڵ دەكردن، چونكە بەشێک بوون هاونیشتیمانی دەوڵەتەكەی!

ماكوان: پێغەمبەری خوا ﷺ مامەڵە و بەرخوردی لەگەڵ موشریک دەكرد؟!

نومێر: بەڵێ، بەدڵنیاییەوە دەیكرد چونكە ستراتیژی دەوڵەتەكەی پێغەمبەر ﷺ ئاشتی و پاراستن و هێمنی و ئاسایش بوو لە ناوچەكەدا، بەڵكو باش بوو بوون بۆ دراوسێ هاوبەشدانەرەكانی و خۆ پاراستن لە ڕووبەڕووبوونەوە و بەریەک كەوتن، بەڵكو هاوكاری كردنی یەكتری بوون لە كێشە هاوبەشەكاندا یاخود كێشە بنەڕەتییەكاندا.

ماكوان: نموونە یان بەڵگەت هەیە بۆ ئەم قسانە كە دەیڵێیت نومێر؟!

نومێر: بەڵێ، سێ جۆر هاوبەشدانەر هەبوون كە پێغەمبەر ﷺ لە گەڵیاندا مامەڵە و گفتوگۆ كاری لەگەڵ دەكردن (هاوبەش دانەرەكانی مەدینە، هاوبەش دانەرەكانی دەشتەكی و ئەعرابی، هاوبەش دانەرەكانی عەشیرەت و هۆزەكانی تر).



# مامەڵە کردن و بەرخورد لەگەڵ کافرەکانی مەدینە

یەکەم کاری پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ گفتوگۆ و دیبەیت بوو لە نێوان موشریکەکان و پێغەمبەر صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ، کاتێک پێغەمبەر صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ هاتە ناو شاری مەدینە کەسێک بەناوی (ئەبو عامری فاسق)[٢٢] خۆی ناوی (ئەبو عامری ڕاهیب) بوو لە گفتوگۆ و دیبەیتەکەی ژێر کەوت، نەیتوانی ڕووبەڕووی پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ ببێتەوە، لە بوغزی و پیسی خۆی بڕیاری دا شاری مەدینە جی بهێڵێت.

ماکوان: دەی جا باشتر با بڕوات، کێشەیەک کەمتر.

نومێر: بە پێکەنینەوە ڕاستە بابڕوات، بەڵام بەو سادەیە نییە تەماشای ئەم کەسە بکە، ناوی تەواوی (ئەبو عامری عەبدی عەمری صدیق ئەوسییە) باوکی هاوەڵی بەڕێزی پێغەمبەری خوایە صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ (حەنظەڵەیە) کە ناسراوە بەوەی لە دوای شەهید بوونی مەلائیکەت شۆردوویەتی لە جەنگی ئوحددا، ئەم پیاوە واتا ئەبو عامری فاسق بانگەشەی ڕاهیب بوون و ئایینی حەنیفەی دەکرد، خۆی بەکەسێک لە زانا و ڕاهیبی ئەو ئایینە دەزانی و لەسەر وەحی جاهیلی پێ دەوترا، (المسوح) جۆرە زاتێکی حەنیفەین ئەم کەسە چووە لای پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ بۆ دیبەیت.

ئەبو عامری فاسق: ئەم دینە چییە تۆ هێناوتە ئەی محمد صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ؟!

پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ: ئایینی حەقیقییە، ئایینی ئیبراهیمە.

ئەبو عامری فاسق: دەی من لەسەر ئەم ئایینەم.

پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ: نا، تۆ لەسەر ئەو ئایینە نیت، (چونکە ئەو ئایینە دەستکاری کراوە لە بنەڕەتی خۆی دەرچووە).

ئەبو عامری فاسق: بەڵێ من لەسەر ئەم ئایینەم، بەڵام محمد صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ تۆ هاتوویتە ناو ئایینێک کە حەقیقی نییە و تۆ لەسەری نیت.

پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ نا وانییە، بەڵکو من لەسەر ئەم ئایینەم و هێناومە وەکو شیر سپی و بێ لەکە و بێ پەڵەیە.

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

٢٢ ـ أبو عامر الفاسق/ أبو عامر الراهيب.



ئەبو عامری فاسق: دەی خوا درۆزن لە دووره وڵاتی و دەربەدەری تەنهایی و غەریبیدا بکوژێت.

خۆی ئەم قسەی بەرامبەر پێغەمبەر صلى الله عليه وعلى آله وسلم کرد و تۆمەتی درۆی دایە پاڵ پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وعلى آله وسلم کە مادام درۆ دەکات خوا بە تەنهایی و غەریبی و دەربەدەری بیکوژێت.

پێغەمبەری خواش صلى الله عليه وعلى آله وسلم زۆر بە هێمنی و سادەیی فەرمووی، بەڵێ هەر کەس درۆی کرد خوای گەورە ئەوەی لەگەڵ بکات کە تۆ دەیڵێیت ئەبو عامر.

ئەبو عامری فاسق: ئەویش وتی ڕازیم، هەر لەدوای دیبەیتەکەیان زانی موهاجیر و ئەنسار وەکو سەرکردە تەماشای پێغەمبەر دەکەن صلى الله عليه وعلى آله وسلم، ئەو بە گەورە و سەرۆکی شاری مەدینە دەزانن، توانای نەبوو دابنیشێت و چاوی بەو وەزعە هەڵنەدەهات، ڕۆیشتە شاری مەککە و مەدینەی جێهێشت و دوای ئازادکردنی مەککە بە( ٨ ساڵ) ڕۆیشت بۆ طائیف و دوای فەتحی طائیف ڕای کرد بۆ شام، لەوێ بە تەنهایی و غەریبی و دەربەدەری مرد!!

لەناو شاری مەدینەدا (١٠-٢٠) کەس لە داخی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وعلى آله وسلم چوونە دەرەوەی شاری مەدینە و مەدینەیان جێهێشت، بەڵام هیچ پێداکێشانێک نەبوو، بەڵام ئەبوعامری ڕاهیب کە دەرچوو ناونرا بە ئەبو عامری فاسق.

ماکوان: لەشاری مەدینە زۆرینە موسڵمان بوون؟

نومێر: نا زۆری شاری مەدینە لە ئەوس و خەزرەج موشریک بوون و لەسەر هاوبەش دانانیان مابوونەوە.

ماکوان: ئەی چۆن پێغەمبەریان قبووڵ کرد وەکو گەورە و سەرکردەی شاری مەدینە؟!

نومێر: موشریکەکان قبووڵیان نەکرد، تەنها موسڵمانەکانی ئەوس و خەزرەج و موهاجیرەکان وەکو سەرکردەی مەدینە و دەوڵەت مامەڵەیان لەگەڵ پێغەمبەر صلى الله عليه وعلى آله وسلم دەکرد، بەڵام زۆربەی موشریک و کافرەکانی مەدینە بێلایەن بوون، نە لەگەڵ پێغەمبەر بوون نە دژیشی وەستانەوە، کە دەیانبینی کارەکانی جوان و پرۆژەکانی بەجێ بوو، خەڵکی خاوەن ئینسانییەت بوون، هەر بۆیە دژی نەبوون.

ماکوان: مەبەستت چییە لە بێلایەنی بۆ لایەنی تر هەبوو دژی پێغەمبەر خوا صلى الله عليه وعلى آله وسلم یان ململانێ لەگەڵ پێغەمبەردا بکات؟!



نومێر: بەڵێ سەرۆکی موشریکەکانی مەدینە (عەبدوڵڵای کوڕی سەلول)[٢٣] بوو، دوایش دەبێتە سەرۆکی مونافیقەکان، ئەو پیاوە پێش هاتنی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وعلى آله وسلم جێگا و مەکانێکی زۆر گەورەی هەبوو لەناو ئەوس و خەزرەج دا، ئەوس و خەزرەج بڕیاریان دابوو بیکەنە پادشای خۆیان، هەموویان لەسەر دەستی ئەو کۆببوونەوە، پێگەی فراوانی هەبوو لەناو هەردوو عەشیرەتەکەدا، بەڵام لە پڕ وەزعەکە و ڕەوشەکە گۆڕا و (٦) کەسەکەی موسڵمان بوون هەموو لە خەزرەج بوون عەبدوڵلا کوڕی سەلولیش لە خەزرەج بوو پاشان بوونە (٢٢) کەس لە بەیعەتەکەی عەقەبە و دوای بە (٧٣) کەس لە پەیمانی عەقەبەی دووەمدا، عەبدوڵڵای ئەبی سەلول بەمەی نەزانی بوو، هەر خۆشی لەساڵی (١٣)ی پێغەمبەرایەتی سەرۆکی وەفدی مەدینە بوو بۆ خەزرەج کە بریتی بوون لە (٣٠٠) کەس ئەو دەمە لە یەسریبەوە هاتن و (٧٥) کەس موسڵمان و (٢٢٥) کەس موشریک بوون وایزانی عەشیرەتەکان هیچی لێ ناشارنەوە، کاتێک قورەیش گومانی بۆ دروست بوو پەیمانیان لەگەڵ موحەممەد صلى الله عليه وعلى آله وسلم بەستووە، ئەو بەرگری زۆری کرد وتی خەڵکەکەم هیچم لێ ناشارنەوە، ئەگەر شتی وا ڕوویدابا ئەوە ڕاوێژیان پێ دەکردم، جا ئەم ڕووداوە لە مانگی ذي الحجەی ساڵی (١٣)ی پێغەمبەرایەتی ڕوویدا، دوای سێ مانگ پێغەمبەر صلى الله عليه وعلى آله وسلم هیجرەتی کرد بۆ مەدینە موسڵمانەکان پێغەمبەری خوایان بە سەرۆک و سەرکردە تەماشا دەکرد، زۆرێک لە گەورە پیاوانی ئەوس و خەزرەج موسڵمان بوون و شوێن پێغەمبەر صلى الله عليه وعلى آله وسلم کەوتن، ئیتر پێگەی ئەو لاواز بوو ئەمەش بووە هۆکاری ڕق لێبوونەوە و ئیرەیی بە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وعلى آله وسلم، زۆر دڵپیس و خراپەکار بوو بەرامبەر بە پێغەمبەر و موسڵمانان بە گشتی.

ماکوان: ئەی چۆن ئەو توانی هانی خەڵکەکەی بدات کە محمد پێغەمبەر صلى الله عليه وعلى آله وسلم لە عەشیرەت تەنانەت لە شارێکی ترەوە هاتووە، چۆن دەتوانێت ببێتە سەرۆک؟!

نومێر: بەڵێ ئەوەی کە تۆ دەیڵێیت کردی، بەڵام ئیمان و خواناسی و داینەمۆی بیروباوەڕی موسڵمان زۆر لەوە بەهێزتر بوو، ئەو بتوانێت بەم شێوە کەلێنی تێبخات، بۆیە ئەوەی لەدەور و پشتی بوون و بەهێز بوون هەموو موسڵمان بوون، ئیتر ئەویش ناچار بوو بێدەنگ بێت، بەڵام هەمیشە لە پیلان و فێڵبازی بوو بۆ پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وعلى آله وسلم.

---

٢٣ ـ عبد الله بن أبي ابن سلول.



هەروەكو وتم كافرەكانی دەوروپشتی هەموو بێلایەن بوون، سەریان نەدەخستە سەر پێغەمبەری خوا ﷺ و بێدەنگییان هەڵبژارد.

ئەویش بە تەواوەتی ڕەتی كردەوە بێتە ناو ئیسلام و لەسەر شەریك دانان و كافری خۆی مایەوە، دەستی لەگەڵ هەموو شەیتان و دوژمنانی پێغەمبەردا تێكەڵ كرد بۆ لەناوبردنی دەوڵەتی پێغەمبەر و موسڵمانان بەگشتی.

هەروەكو وتم ستراتیژی بانگەوازی ئیسلامی و دەوڵەتی ئیسلامی زۆر لەسەرخۆ و ئاشتیانە بوو، چونكە لە ئاشتیدا بانگەواز دەكرێت و لە ململانێی سەربازیدا زۆرجار بانگەواز ئامانجی خۆی ناپێكێت، بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ هەوڵی ئەدا خەڵكی بانگەواز بكات بۆ ئیسلام و هیدایەتیان بدات.

ماكوان: ئەی هیچ پێكێشان و ڕووبەڕووبوونەوە ڕووی نەدا لەگەڵ كافرەكانی شاری مەدینە؟!

نومێر: لێرە و لەوێ بۆڵە بۆڵ و وردە جەنجاڵی ڕووی ئەدا پێغەمبەری خوا ﷺ خێرا چارەسەری دەكرد، نموونەیەكت بۆ باس دەكەم بەڵام پێش ئەوەی ئەم باسەت بۆ بكەم شتێكم بیر كەوتەوە پێویستە پێتڕاگەیەنم ئەویش؛ بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ لە ناو خەڵكیدا خۆشەویست و قسە ڕۆیشتوو بوو؟

پێغەمبەر ﷺ هەرگیز وەكو عەبدووڵای كوڕی سەلول و سەركردەكانی تر نەبو جل و بەرگی گرانبەها و ئاڵتون و زیو بەخۆیەوە بكات، جل و بەرگی زۆر سادە بوو، سواری ماین و ئەسپی جوان و وڵاغی زین نەدەبوو، زۆر لە خۆ بردوو بوو هەمیشە گوێدرێژی بەكاردەهێنا بۆ سەفەرەكانی لەناو شاری مەدینە، لوتبەرز نەبوو، لەگەڵ هەموو چین و توێژێك گفتوگۆی دەكرد، لەگەڵ منداڵان و پیروپەكەوتە و بەندە و كۆیلە و ژن و كچ ڕێزی هەمووانی دەگرت، گوێی بۆیان دەگرت و لەگەڵ خەمەكانیاندا بەشداربوو، چونكە ژیانی پێغەمبەرایەتی جیاوازە لە ژیانی هەموو سەركردە دونیاییەكان، وەكو ئاماژەم پێداوە پێغەمبەر ﷺ دەبێتە سەركردەی دەوڵەت و سەركردەی سەربازی، بەڵام ڕەفتار و كرداری جیاوازە لە سەركردە دونیاییەكان. ئەو كردار و ڕەفتاری تایبەت بەخۆی هەیە و خاوەنی كۆشك وتەلار و خەڵات و زینەت و لووتبەرزی... هتد نییە كە سەركردەكانی ئێستا هەیانە.

ماكوان: بەڵێ، بەدڵنیاییەوە وایە چونكە پێغەمبەر ﷺ بەدوای ناوبانگەوە نییە، خوای پەروەردگار هەڵیبژاردووە شان و شەوكەتی بەرز كردۆتەوە، نموونەیەكم بۆ باس بكە چی ڕوویداوە لە نێوان پێغەمبەر ﷺ و عەبدوڵڵای كوڕی ئەبی سەلول؟!



نومێر: بەسەرچاو، پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ سەردانی سەعدی کوڕی عوبادە یەکێک بوو لە سەرکردە و گەورە پیاوانی خەزرەج بە گوێدرێژەکەی دەڕوات بۆ سەردانی و لەگەڵ خۆیدا لە دوای گوێدرێژەکەوە ئوسامەی کوڕی زەید لەگەڵ خۆی دەبات، واتە لەدوای خۆیەوە دانیشتووە لەسەر گوێدرێژەکە.

پێغەمبەری خوا ﷺ بەلای کۆمەڵێک لە خەڵکی شاری مەدینەدا تێپەڕ دەبێت و لە وانەی دانیشتوون موسڵمان و یەهوود و موشریک تێکەڵن.

ماکوان: کەواتە موسڵمان تێکەڵاوی کافران دەکات؟!

نومێر: بەڵێ بەدڵنیاییەوە، بەو مەرجەی موسڵمان کاریگەری لەسەر ئەوان دابنێ نەک بە پێچەوانەوە، نابێ کاریگەری هاوبەش دانان و تاوان و گوناحیان لەسەر موسڵمانان دروست بکات، هەربۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموویێت: ئەو ئیمانداری تێکەڵاوی خەڵکی دەکات و لەسەر ئازارەکانیان ئارام دەگرێت، زۆر باشترە لەو ئیماندارانەی کە گۆشەگیرن و ئارام ناگرن لەسەر ئازارەکانی خەڵکی و تێکەڵاویان ناکەن.[٢٤]

پێغەمبەری خوا ﷺ بەلای ئەو مەجلیسەدا تێپەڕی کە موسڵمانان لەو مەجلیسەدا بوون وەکو (عەبدوڵڵای کوڕی ڕەواحە)[٢٥]، هەروەها لە دانیشتیوانی ناو مەجلیسەکە عەبدوڵڵای کوڕی ئەبی سەلول بوو، کاتێک گوێدرێژەکە تێپەڕی هەندێک تەپوتۆز و غوباری بەسەر مەجلیسەکەدا ڕشت، لەدەسەڵاتی کەس دا نەبوو بێ ئەوەی ویستی پێغەمبەری ﷺ لەسەر بێت، عەبدوڵڵای کوڕی سەلول زۆر بە ناشرین و دەنگی بەرز وتی: تەپوتۆز مەکە بەسەرماندا، زۆر بەڕق و کینەوە وتی، بەڵام پێغەمبەر ﷺ گوێی خۆی لێ خەواند، دەیتوانی وەڵامی بداتەوە بەوەی گوێدرێژەکە ئەنجامی داوە و توڕەبوونەکە بۆ گوێدرێژەکەیە، پیاوی ئاقڵیش لە گوێدرێژ توڕە نابێت، بەڵام پێغەمبەری خوا ﷺ وەڵامی نەداوە و ویستی تێپەڕێت، بەڵام بۆ دڵدانەوەیان دابەزی و چووە لایان و سڵاوی لێ کردن، پاشان بانگی کردن بۆ ئیسلام و چەند ئایەتێکی قورئانی بۆ خوێندن، چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ شەو و ڕۆژ لە بانگەواز دابووە، هیچ کۆمەڵ و مەجلیس و هۆز و تیرە و عەشیرەتێک نەماوە بانگەوازی پێغەمبەر

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

٢٤ ـ الْمُؤْمِنُ الَّذِي يُخَالِطُ النَّاسَ، وَيَصْبِرُ عَلَى أَذَاهُمْ؛ أَفْضَلُ مِنَ الْمُؤْمِنَ الَّذِي لَا يُخَالِطُ النَّاسَ، وَلَا يَصْبِرُ عَلَى أَذَاهُمْ.

٢٥ ـ عبدالله بن رواحة.



ﷺی پێنەگەشتبێت دوای تەواوبوونی لە خوێندنی قورئان، عەبدوڵڵای کوڕی سەلول بە دڵێکی پڕ کینەوە ڕوویکردە پێغەمبەر ﷺ و وتی: ئەی تۆ یان ئەی زەلام ئەوەی کە دەیڵێیت زۆر جوان و باشە ئەگەر ڕاست بکەیت، بەڵام لە مەجلیسەکەماندا ئیزعاجمان مەکە و لە کوێوە هاتووی بڕۆوە بۆ ئەو جێگایە! ئەوەی تۆی بۆ ئێرە هێناوە بڕۆ قسە و باسەکانت بۆ ئەو بکە و چیرۆکی خۆتیان بۆ باس بکە!

لەمەجلیسەکەدا دەست بەجێ عەبدوڵڵای کوڕی ڕەواحە لە موسڵمانەکان بوو فەرمووی: بەڵێ پێغەمبەری خوا ﷺ هەمیشە تەشریف بهێنە بۆ مەجلیسەکەمان ئێمە جەنابتمان خۆش دەوێت، یەکسەر بەرگری کرد لە پێغەمبەرەکەی ﷺ بە پێچەوانەی عەبدوڵڵای کوڕی سەلول، عەبدوڵڵای کوڕی ڕەواحە کوڕێکی تازە تێگەیشتوو بوو، بەڵام بیروباوەڕی دامەزراو بوو، لەو کاتەدا شمشێر لە یەکتری ڕاکێشرا لە نێوان موشریک و موسڵمانەکان، هەرچەندە یەهوودییەکان بێدەنگ بوون بەڵام ئەوان هەمیشە ئاگر خۆشکەر بوون، لەو کاتەدا پێغەمبەری خوا ﷺ هەموو لاکانی هێور کردەوە شمشێرەکانی پێ خستنەوە کێلان.

هەرچەندە عەبدوڵڵای کوڕی سەلول کینە و ئاشووبی دەویست، سوپاس بۆ خوا پێغەمبەر ﷺ چارەسەری کرد و هەموویانی سارد کردەوە، بەڵام نەیهێشت هەروا بەسەریدا بڕوات تەشریفی برد بۆلای سەعدی کوڕی عوبادە، یەکێک بوو لە گەورە پیاوانی خەزرەج پێی فەرموو کە ئەبو حوباب مەبەستی عەبدوڵڵای کوڕی ئەبی سەلول بوو چ ڕەفتارێکی نواندووە و چی وتووە لە وەڵامدا سەعد بە پێغەمبەر ﷺ ی ڕاگەیاند کە لێی خۆش بێت و پەڕەیەکی نوێ لەگەڵیدا هەڵبداتەوە، سەعد باری دەروونی عەبدوڵڵای کوڕی ئەبی سەلولی بۆ پێغەمبەر ﷺ شیکردەوە، سوێندی بۆ خوارد بەوەی کە خوای پەروەردگار بەحەق ناردوویەتی و قورئانیشی پێدا ناردووە، خەڵکی ئەم شار و ناوچە ویستویانە بیکەنە گەورە و پادشا بەڵام کە جەنابت تەشریفت هێناوە هەموو دەسەڵات و تواناکانی لەدەست داوە، ئەوەی ئەو بەتەمای بوو خوای پەروەردگار بەخشیویەتی بە جەنابت، جا تکام وایە لێی ببووریت.

لێرەدا مەبەستم ئەوەیە سەرکردەکانی ناو شاری مەدینە دید و تێڕوانینێکی ڕوون و ئاشکرایان هەبوو، ئامۆژگاری پێغەمبەری خوای ﷺ کرد و بوارەکەی بۆ شی کردەوە، ئەوەی ڕاگەیاند کە ئیسلام نوێیە و جارێ زۆر گوێی لە قورئان نەبووە، لەوانەیە خوای



گەورە هیدایەتی بدات، پێغەمبەری خوا ﷺ بەقسەی سەعدی کوڕی عوبادەی کرد و لێی خۆشبوو.

پێغەمبەری خوا ﷺ هەوڵی ئەدا بەگوێرەی توانا هیچ پێداکێشانێک ڕوونەدا و بانگەوازەکەی بگاتە هەموو لاکان بەتایبەتی موشریکەکانی ئەوس و خەزرەج پێغەمبەری خوا ﷺ دەیزانی موشریکەکانی شاری مەدینە هەموو وەکو عەبدوڵلای کوڕی ئەبی سەلول نین، بەڵکو بێ لایەن و هەمیشە گوێ دەگرن و نەچوونەتە ناو ململانێ و دژی ئایینی پێغەمبەری خوا ﷺ و دژایەتی ناکەن.

ماکوان: بەڕاستی بانگەواز و گەیاندنی ئایینی پیرۆزی ئیسلام لە کەشی جەنگ و تورەییدا ناگات، بەڵکو بە ئاشتی و هێمنی خەڵکی گوێی بۆ دەگرن، ئەمە مانای وانییە کە لە شان و شەوکەتی جیهاد و قیتال کەم بکاتەوە هەرچەندە هەمووی بەشێکە لە جیهاد کردن، مەبەستی کۆشش و ئارگۆمێنت (حوجە) و قسە و گفتوگۆ زووتر دەگات لە چەک، بەڵام چەکیش لەکاتی خۆیدا زۆر پێویستە، ئەگەر هێز نەبێت هەرگیز ئاشتی و هێمنی ناپارێزریت.

زلهێزەکانی جیهان کاتێک چەکی قورس و ئەتۆم دروست دەکەن، دەڵێن ئەم چەکە بۆ پاراستنی ئارامی وڵاتە.

نومێر: بەڵێ بەڕاستی وایە، دەبێت پارسەنگی هەبێت لە نێوان هێز و ئاشتیدا، هەر وەکو تۆ وتت هەرگیز ئارامی دروست نابێت گەر هێزت نەبێت.

با باسی موشریکەکانی دەشتەکیت بۆ بکەم.



## موشریکە ئەعرابییەکانی دەوری شاری مەدینە

پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ هەریەکە لەو دەشتەکییانە هاوەڵانی دەنارد بۆ ئەوەی بانگەوازیان بکات بۆ ئیسلام، لە نموونەی ئەبو زەڕی غیفاری لە هۆزی غیفار کە ئەعرابی بوون، هەموو هاتنە ناو ئیسلام بە بانگەوازی ئیسلام ڕازی بوون، بەڵام لە جێگای خۆیان مانەوە نەدەهاتنە ناو شاری مەدینە، پێغەمبەری خوا ﷺ یەکێک لە خۆیانی دەنارد بۆ بانگەواز کردنیان، لە کۆتاییدا هێزێکی زۆر گەورەی لێ کەوتەوە لە داهاتوودا زیاتر بەچاوی خۆمان لە ڕووداوەکان دەیانبینین چۆن مەفرەزە و سوپا ڕێک دەخەن و خەڵکێکی خواناس و موهاجیر و چاونەترس و خاوەن وەرع لەدەشتەکییە ئەعرابییەکان دروست دەبێت.

ماکوان: ئەی دەڵێن ئەعراب زۆر نەزان بوون، زۆر ڕۆچووبوون لە کوفر و نیفاق خوای گەورە فەرموویەتی:

﴿ٱلۡأَعۡرَابُ أَشَدُّ كُفۡرٗا وَنِفَاقٗا وَأَجۡدَرُ أَلَّا يَعۡلَمُواْ حُدُودَ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ عَلَىٰ رَسُولِهِۦۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٞ ٩٧﴾

واتە: زۆربەی عەرەبە کۆچەری و دێهاتی و بیابان نشینەکان (لە عەرەبە شارنشینەکان) دڵڕەقترن لە بارەی کوفر و دووڕووییەوە (چونکە دوورن لە سەرچاوەکانی زانست و مەدەنییەتەوە)، شایستەترن ئەو سنوورانە نازانن کە: خوا ناردوویەتیە خوارەوە بۆ پێغەمبەرەکەی (دەربارەی حەڵاڵ و حەرام) خوای گەورەش زانا و دانایە (بە بەندەکانی).

﴿وَمِنَ ٱلۡأَعۡرَابِ مَن يَتَّخِذُ مَا يُنفِقُ مَغۡرَمٗا وَيَتَرَبَّصُ بِكُمُ ٱلدَّوَآئِرَۚ عَلَيۡهِمۡ دَآئِرَةُ ٱلسَّوۡءِۗ وَٱللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٞ ٩٨﴾

واتە: هەر لەو عەرەبە بیابان نشینانە، کەسانێک هەیە کە ئەوەی دەیبەخشێت بە سەرانە و غەرامەی دەزانێت چاوەڕێی ئەوە دەکەن چەندەها بەڵاو ناخۆشی بێتە سەرتان، یاخوا مەینەتی خراپ بەسەر ئەواندا بێت، خوایش هەمیشە بیسەرە (بە گوفتاریان)، زانایە (بە نییەتیان).

لەوێدا بە ئاشکرا باسی کردوون؟



نومێر: ڕاستە، بەڵام هەر بەدواییدا لە سورەتی التوبة ئایەتی ٩٩ - ١٠٠ باسی جۆری ئیمانداری ئەعراب دەكات و دەفەرموێت:

﴿وَمِنَ ٱلۡأَعۡرَابِ مَن يُؤۡمِنُ بِٱللَّهِ وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِ وَيَتَّخِذُ مَا يُنفِقُ قُرُبَٰتٍ عِندَ ٱللَّهِ وَصَلَوَٰتِ ٱلرَّسُولِۚ أَلَآ إِنَّهَا قُرۡبَةٞ لَّهُمۡۚ سَيُدۡخِلُهُمُ ٱللَّهُ فِي رَحۡمَتِهِۦٓۚ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ٩٩﴾

واتە: لەو عەرەبە بیابان نشینانە كەسانی تریان هەیە كە ئیمان و باوەڕ بەخوا و بەڕۆژی دوایی ئەهێنن و ئەوەی خەرجی دەكەن و دەیبەخشن بەچەندەها هەنگاوی نزیک بوونەوەی لای خوای دادەنێن و بۆ ئەوەی بەهرەمەند بن، لە چەندەها دوعای خێری پێغەمبەر ﷺ، - ئاگاداربن- بەڕاستی ئەو بەخشینەیان مایەی سەرفرازی و نزیک بوونەوەیانە لە خواوە، سەرەئەنجام خوا دەیانخاتە ژێر سایەی ڕەحمەتییەوە، بەڕاستی لێخۆشبوو میهرەبانە.

﴿وَٱلسَّٰبِقُونَ ٱلۡأَوَّلُونَ مِنَ ٱلۡمُهَٰجِرِينَ وَٱلۡأَنصَارِ وَٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُوهُم بِإِحۡسَٰنٖ رَّضِيَ ٱللَّهُ عَنۡهُمۡ وَرَضُواْ عَنۡهُ وَأَعَدَّ لَهُمۡ جَنَّٰتٖ تَجۡرِي تَحۡتَهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدٗاۚ ذَٰلِكَ ٱلۡفَوۡزُ ٱلۡعَظِيمُ﴾

واتە: خوای میهرەبان لەوانەی كە پێشكەوتن و یەكەم كەس بوون لە ئیسلام بوون و خزمەت كردنی ئیسلامدا لەكاروانی كۆچبەران و پشتیوانان و ئەوانەی كە بە ڕێكوپێكی شوێنیان كەوتوون، ڕازی بووە و ئەوانیش لەو ڕازی بوون، باخەكانی بەهەشتی بۆ ئامادە كردوون كە چەندەها ڕووبار بە بەردەم كۆشكەكانی و بەژێر درەختەكانیدا دەڕوات، هاوڕێ لەگەڵ نەمریدا بۆ هەمیشەیش تیایدا دەمێننەوە، ئەو سەرئەنجامە سەركەوتنێكی زۆر گەورەیە.

وشەی ئەعراب لە ئیسلامدا ئێستا بۆتە زاراوەیەک كە مانای وشەی ئەعراب بەواتای دەشتەكی ئەدات، بەڵكو زانایان دەڵێن ئەعراب واتە نەهاتنە ناو خانەو حوكمی ئیسلامی لە دەرەوەی حوكمی ئیسلامدا ژیان دەكەن، واتە ئەوەی لە دەرەوەی حوكمی دەوڵەتی مەدینەدا بوو با موسڵمانیش بێت بە ئەعرابی بوونەوە.

زۆر لەسەر ئەم باسە نادوێین تا كاتی خۆی و ڕووداوەكانی دێنە پێشەوە، بەڵام دەتهێنمەوە بۆ بەشی كۆتایی موشریكەكانی دەرەوەی مەدینە و ئەعرابەكان.



## موشریكی عەشیرەت و هۆز و تیرە گەورەكانی دەرەوەی شاری مەدینە

دەربارەی هاوبەشدانەرەكانی عەشیرەت و هۆزەكانی چواردەوری شاری مەدینە، پێغەمبەری خوا ﷺ دەیویست هەرچۆن بوو پەیمان و ڕێككەوتنامەیان لەگەڵدا بكات.

ماكوان: بەڵێ، بەدڵنیاییەوە دەبەسترێت پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەڵ عەشیرەتی گەورەی موشریک لە ڕۆژئاوای مەدینە پەیماننامە و ڕێككەوتنی لەگەڵ كردن بەناوی هۆزی (جوهەینە) یان (جهينة) كە لەسەر ڕێگای قافڵەی قورەیش بوون و لەشاری مەككەوە دەڕۆیشت بۆ شام، ئەو جێگایەی مسۆگەر كرد و بۆ ئەوەی لە داهاتوودا سوپای بنێرێتە سەر بازرگان و كۆمپانیاكانی قورەیش.

ئەمەش سیاسەتی پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیویست لەگەڵ هەموو هۆز و تیرە و عەشیرەتێكدا لە چواردەوەری شاری مەدینەدان پەیماننامە و ڕێكەوتنیان لەگەڵ بكات، یان بیانكاتە هاوپەیمان وەكو لەم سەردەمەی پێغەمبەردا باو بووە بە ناوی (الأحلاف).

ئەوەی كە ماوەتەوە (٥٠٠)كم دووره لە شاری مەدینەی پێغەمبەر ﷺ سەرسەخترین دوژمن لە هەوڵ و كۆشش و خەباتی خۆیان ناكەون تاكو پێغەمبەر و موسڵمانان لەناو بەرن، لە بۆسە و خۆئامادەكردندان و ئەوانیش بەدوای حەلیف و هاوپەیمانی و ڕێ كەوتن دەگەڕێن دژی پێغەمبەری خوا ﷺ، ئەوەشمان لەیاد نەچێت هەرچەندە موسڵمانان خۆیان بەدوور بگرن لە شەڕ و جەنگ و ئاشووب، بەڵام دوژمنەكانیان وازیان لێ ناهێنن بۆیە پێویستە موسڵمانیش وریا و چالاک و چاوكراوە بێت، ئەم یاسا و سوننەتە خواییە تا ڕۆژی قیامەت بەردەوامە كە كوفر دژی ئیمانە و خوانەناسان دژی خواناسانن.

لە گەرمەی قسەدابووین لە پڕ كۆمەڵێک دەركەوتن، بەرد و خۆڵ و قسڵیان لە كۆڵ گرتبوو، نومێر لەباسی پلان و هێرشی قورەیش بوو كە چۆن دەیانەوێت پیلان دابڕێژن بۆ لەناو بردنی موسڵمانان و پێغەمبەر ﷺ لە شاری مەدینە، ئەو كۆمەڵە دەركەوتن نومێر وتی: ماكوان تەماشای پێغەمبەری خوا ﷺ بكە، لەگەڵ ئەو كۆمەڵەیەدایە بەردی بەشانی موبارەكی هەڵگرتبوو، پشتی موبارەكیم بینی ڕووی لەمن نەبوو، لەگەڵ كۆمەڵێک لە



هاوەڵانی بوون خەریکی دروستکردنی مزگەوت بوون لە شاری مەدینە، خۆم پێڕانەگیرا و ڕام کرد ببینم و دەستی بگوشم و تێر تێر قاچ و دەستی موبارەکی ماچ بکەم.

بەڕاکردنێکی خێرا ڕۆیشتم قاچەکانم قورس بوون، وەکو چیمەنتۆ بە خاکەوە نوساو لە تاو ئازاری قاچ عارەقێکی زۆرم کرد، چاوم کردەوە بەسەر سەرمەوە دوو پۆلیسی ئیتاڵیی ڕاوەستابوون، وتیان هەڵسە ژوورەکەت ئەپشکنین، هەموو مانگێ جارێک ژوورەکانیان دەپشکنی، هەموو زیندانییەکانیان دەکردە قاعەیەک یاخود هۆڵێکی تایبەت، کاتەکەشی لە بەیانییەکی زوودا بوو کاتژمێر (٤ بۆ ٥ )کارەکەیان ئەنجام ئەدا.

پۆلیسێکیان زانی عارەقم زۆر کردووە، وتی ماکوان مەترسە هیچ نییە تەنها ژوورەکەت ئەپشکنین.

کە وای وت زۆر پەستبووم، هەستم کرد دەیەوێت عیزەتم بشکێنێت منیش بەیەکێک لە زیندانەکان کە قسەکەی بۆ وەرگێڕام وتم پێی بڵێ با بەشەو بێت ئینجا لێیان ناترسم!!

ئەو نارەسەنە وتی ئەی بۆ وا ئێمەت دی عارەقت کرد؟!

منیش لەوەڵامدا وتم کە بۆنی ئێوەم بۆ دێت و لێم نزیک دەبنەوە بۆگەنتان پیسە ڕاستەوخۆ حەساسێک دەگرم و لەتاو بۆ گەنەتان عارەق دەکەمەوە.

ئاگام لێبوو زۆر توڕەبوو، بەڵام دەری نەبڕی بەپێکەنینەوە وتی باشە بڕۆ بۆ هۆڵەکە.

لەدواییدا گەڕامەوە هەرچی جل و بەرگ و خواردن و دۆشەک و بەتانیم بوو تێکەڵیان کردبوو بەسەریەکدا.

ئەو نارەسەنە تەماشای دەکردم و پێدەکەنی وەکو بڵێ ئاوات لێدەکەم، دەیویست باری دەروونیم تێکبدات توڕەبم.

منیش دانم بە خۆمدا گرت، کوڕێکی میسری لەنزیکم بوو ناوی حوسام بوو، وتم حوسام پێی بڵێ ئەوەی لە ڤاتیکانە ناوی پاپایە، پاپای ئیتاڵیا و مەسیحییەکانە؟

حوسام: ئەبو ئاناء ئەو پرسیارە بۆ چییە؟

ماکوان: تۆ پێی بڵێ بزانین وەڵامی چییە؟

حوسام پێی وت و ئەویش وایزانی موجامەلەی ئەکەم وتی: ناوی پاپایە.



وشەی (pappa) لەزمانی زۆربەی وڵاتانی ئەورووپا بەمانای باوک دێت، هەرچەندە لە ڕاستیدا ماناو مەفهومێکی تری هەیە لە زاراوەی ئایینی نەسرانیدا، کە وتی بەڵێ ویستی بۆم شیبکاتەوە خۆشحاڵ بوو بە پرسیارەکەم، منیش نەمهێشت زیاتر قسە بکات وتم: ئەی ماماکەی ڤاتیکان نابینم.

(mamma)لە کوێیە؟

بە حوسامی وت: گاڵتەمان پێ دەکات؟

حوسام تەماشای کردم و پرسی گاڵتەیان پێ دەکەیت؟

بە عەرەبی بە حوسام-م وت: بە دڵنیاییەوە پرسیارەکە گاڵتەجاڕییە بۆیان، ڕۆڵی ئافرەت نییە لە ئایینەکەیاندا، ئەگەر پاپا لە ڤاتیکان بێت، کەواتەئەبێت مامایەکیش هەبێت.

وەڵامیان نەدایەوە و ڕۆشتن و چیم نووسیبوو لەگەڵ خۆیان بردیان، بەهەرحاڵ کردمیانەوە ژوورەکەی خۆم وا هەڵیان شێواندبوو بەسەریەکدا لە نوێژی بەیانییەوە تا کاتژمێر ١٠ خەریکی ڕێکخستن و پاککردنەوەی بووم.

پاشان چووینە حەوشەی زیندانەکە، هەموو هاوڕێ زیندانییەکانم هاتن بۆ لام قاقای پێکەنینیان لێئەدا، ئەرێ وتم چییە برایان بۆ وا دڵتان خۆشە، هەموو وتیان وەڵا (مامای) ڤاتیکانەکەت زۆر بەهێز بوو، تەنانەت هەندێک لە پۆلیسەکانیش دەیانوت کوا (ماما)ی ڤاتیکان.

ئیتر تا یەک مانگ کە منیان ئەبینی هەردەیان وت ئەبو ئانا هەواڵی مامای ڤاتیکان دەپرسێت.

ڕۆژانە لە زینداندا بە قورئان خوێندنەوە و قسەو باسی لەگەڵ برایاندا بە گشتی بەسەرمان دەبرد و لەهەموو جۆرەکانی وڵاتانی تێدابوو.

هەر لە ئەفغانی، تونسی، میسری، سووری، ئەلبانی، عێراقی و پاکستانی...هتد، لەهەموو جۆرە کلتور و ڕۆشنبیرەکانی گەلانی لێبوون.

لەناو زیندانەکەدا ئەو برایانە هۆڵی یاریکردنیان کردبوو بە مزگەوت بۆ نوێژی نیوەڕۆ و مەغریب، کاتژمێرێک دەچووینە ناو مزگەوتەکە، لە ڕاستیدا بۆ یاری کردنی تێنس و دوو گۆڵی دەست کاتمان پێ درابوو، بەڵام ئەو دوو سەعاتە بۆ نوێژی جەماعەت و دەرس و دەور بەکارمان دەهێنا.



پیاوێکی تونسی لێ بوو بەناوی ئەبو یەحیا بانگی ئەدا، بەڵام بانگەکەی هەڵە بوو لەبەر ئەوەی (١٨) ساڵ زیندانی کرابوو لە زیندانی ئیتاڵییەکان خوێندەواریشی نەبوو، ئێمەش لەو زیندانەدا کتێب قەدەغەبوو، واتا کتێبی ئیسلامی بێجگە قورئان، هەموو کتێبێکی تر قەدەغە بوو بە هۆکاری ئەوەی لە زیندانەکانی ترەوە لەگەڵ خۆی هێنابووی نزیکە (٢٥) کتێبی لابوو زۆربەی نوقسان بوو، لەوانە بەرگی (٤) زاد المعاد پێبوو بەرگی (٣)ی تەفسیری ئبن کەسیری پێبوو بەو شێوەیە، خۆشی نەیدەخوێندەوە، نەیئەدا بەکەسی تر. ڕۆژێک بانگم کرد وتم ئەبویەحیا لە ڕای خوا کتێبێکم بدەرێ بیخوێنمەوە.

ئەبویەحیا: بەخوا ببوورە سوێندم خواردووە کتێب نادەم بەکەس، بەهەر حاڵ قسە لە من و قسە لە ئەو بوو بە شەڕمان لەسەر کتێب، کوڕێکی سووری هات وتی ئەبو ئانا خۆت ماندوو مەکە تاکە ڕێگا بۆ وەرگرتنی کتێب لەم پیاوە دەبێت شتی بۆ بکڕیت، ئینجا کتێبت ئەداتێ.

بە ئەبو جیهاد، خۆی ناوی عوسمان بوو کوڕێکی هەبوو ناوی جیهاد بوو ئیتر نازناوی ئەبو جیهادیان لێ نابوو، وتم مەردی خوابە و ئاشتمان بکەرەوە و چی دەڵێیت بەقسەت دەکەم!

ئەبو جیهاد چوو قسەی لەگەڵ کرد و دوای تۆزێک دەستم کردە ملی و ئاشت بووینەوە، ویستم بڕۆم داوای کتێبی لێبکەم مصطفی و ئەبو جیهاد وتیان پەلە مەکە با تۆزێکی بەسەردا بڕوات دوای یەک ڕۆژ بڵێ مریشکێکت بۆ دەکڕم و کتێبێکم بدەرێ بیخوێنمەوە!

بەفیکرەکەیان ڕازی بووم، دوای چەند ڕۆژێک بەینم خۆش کردەوە لەگەڵیدا وتم ئەبویەحیا حەز لە مریشک دەکەی؟

ئەبویەحیا: ئەرێ وەڵڵا ئەبو ئانا زۆرم حەز لە مریشکە.

ماکوان: ئەوە مریشکێک دیاری بێت لە منەوە بۆ تۆ.

ئەبویەحیا: جزاک الله خیرا.

ماکوان: ئەگەر کرا مەمنوونت دەبم کتێبێکم بدەرێ بیخۆنمەوە؟!

ئەبویەحیا: بەسەر چاو کتێبێکم لایە زۆر موهیمە بەس بەکەس مەڵێ بۆت دەهێنم.

ماکوان: ناوی چییە و هی کێیە؟!

ئەبویەحیا: تۆ حەقت نەبێت کتێبکی بەرگ ڕەشە و چواردەوری زەردە.

ماکوان: جزاک الله خیرا، ئینجا بۆم دەرکەوت کە نەیدەزانی بیخوێنێتەوە کتێبەکانی بە بەرگەکەی دەناسییەوە، دەیوت کتێبە ڕەشەکە، یان کتێبە بەرگ سەوزەکە، ئیتر وەکو چۆن



كاتی خۆی عێراق نەوتی دەفرۆشت بەرامبەر بە خواردن، منیش مریشكم دەكڕی و دەمدا بەو لە حەقی كتێب خوێندنەوە، جاری وا هەبوو بۆ كتێبێك سێ مریشكی پێدەكڕیم تا شەش مانگ خۆم دەمم لە گۆشتی مریشك نەدا لەبەر ئەبویەحیا.

جاری وا هەبوو حەزم لە مریشك بوو، بەڵام كتێبەكانم لا گرنگتر بوو، ئەویش زۆر بێڕەحم بوو، هەموو مریشكەكانی دەخوارد بەشی منی نەئەدا، دەشیزانی لە هەفتەیەكدا دەتوانین تەنها یەك مریشك بكڕین، گۆشتی لێ نەبوو سەرەتا تەنها مریشك دەهاتە ناو زیندانەكە.

جارێ شەش مانگ گۆشتی مریشكم نەخوارد لەبەر خاتری ئەبویەحیا، كوڕێكی مەغریبی بە ناوی حوسێن ناسرابوو بە ئەبو دوعا ئەو جار و بار لە ڕای خوا ڕانێك مریشكی بۆ دەهێنام، ڕۆژێك ئەبویەحیام بانگ كرد و پێمگوت ئەبویەحیا تۆ دەزانی من دەنووسم زۆر حەز دەكەم باسی تۆ بكەم، نەیهێشت قسەكەم تەواو بكەم، وتی ئەبو ئانا مادام باسی من دەكەیت دەبێت دوو مریشكی ترم بۆ بكڕیت!

وتم جارێ پەلە مەكە با قسەكەم تەواو بكەم.

ئەبویەحیا: نا، تۆ باسی ژیانی من دەكەیت، خۆ بەلاش نییە.

ماكوان: باشە بۆت دەكڕم، بەڵام ناكرێت تۆزێك هاوكاریم بكەیت جار و بار مریشكم لێ وەرنەگریت، زۆر حەز دەكەم وەكو قارەمان و پیاو چاكێك باست بكەم. هیچ نەبێت لەناو نووسینەكانمدا پاڵەوانییەكت بۆ دروست بكەم ؟

ئەبویەحیا: من پاڵەوانی و شتی وام ناوێت (١٨)ساڵە گیراوم یەك كەس هاوكاری نەكردووم واتا تەمەنم (٥٨) ساڵە و سێ ساڵی تریشم ماوە زیندانەكەم تەواوبێت، نە ژنم هەیە نە ژیان نە كەس و كار، كە چوومە دەرەوە خاوەنی هیچ نیم، یەكسەر دەمنێرنەوە بۆ تونس، ئیتر قارەمانی چی و پاڵەوانی چی؟! من دەمەوێت مریشك بخۆم و پارەی خۆم خەرج نەكەم تێگەیشتی ئەبو ئانا، لای خوا شكاتت لێ دەكەم ئەگەر دوو مریشكم بۆ نەكڕیت و باسم بكەیت؟

ماكوان: بە دوو مریشك ڕازی دەبیت؟!

ئەبویەحیا: زۆر باشە خوا نەی بڕێت.

ماكوان: ئەم هەفتە لەسەرم بوەستە هەفتەی داهاتوو تا كۆتایی مانگ دوو مریشكت بۆ دەكڕم، بەڵام وەكو خۆت باست دەكەم.



ئەبوبەحیا: بەس با خەڵک بزانێت خوا و پێغەمبەرم خۆش دەوێت و باسی دڕندەیی و سەختی ئەم ئیتاڵیا و ئەوروپایە بکە بە گشتی ئیتر گەردەنت ئازا بێت، ماوەیەکی زۆر سەرقاڵی خوێندنەوەی کتێبی تر بووم، نەمپەرژایەوە سەر کتێبەکەی فەرغەلی، چونکە پێشتر زۆر نەدەچووممەوە بۆ لای نومێر ئێوارەی یەکەم ڕەمەزانی ساڵی ٢٠٢١ دوای نوێژی تەراویح دەستم دایەوە کتێبەکەی فەرغلی و ئەمویست بزانم پێغەمبەری خوا ﷺ چۆن دەوڵەتی دامەزراند و قورەیش هەڵوێستی چی بوو کە پێغەمبەری خوا ﷺ لە شاری مەدینە خەڵک لە چوار دەوری کۆبۆتەوە.

خەوم لێ کەوت بەسەر کتێبەکەوە هەر ئەوەندەی چاوم چووە خەو، وەکو هەڵۆ و باز و شاهین چاوم کراوە و لەدەم و بەیانییەکی فێنکی ناو دەوارەکەی نومێر خەبەرم بوویەوە، زۆر تینووم بوو هەڵسام لە مەرکانەیەک ئاوم خواردەوە و تینوێتیم شکاند، کە من هەڵسام ئەوانەی لەگەڵماندابوون لە دەوارەکەدا هەواڵیاندا بە نومێر و هات بۆلام، بە پێکەنینەوە وتی زۆر دەمێکە لێمان دوورکەوتیتەوە، بەخێر بێیتەوە!

ماکوان: بڕوا بکە نومێر زۆر هەوڵمدا نەدەگەڕامەوە.

داوای کرد لەو کەسانەی دەور و پشتمان کە بەجێمان بهێڵن، ئاگام لێبوو هەموو دەمیان داچەقاندووە!

نومێر: بەهەرحاڵ بەخێربێیتەوە هیچ دەسەڵاتێکمان نییە، هەر کات لە دونیای خۆت بانگ کرایت دەبێت بە ئاگا بێیتەوە لێرە دەگەڕێیتەوە.

ماکوان: وەکو خۆت دەڵێیت بەهەرحاڵ دەسەڵاتمان نییە ئەوە ڕەوش و گوزەرانەکەمە، بەڵام لەو جێگایەی جێم هێشتی بۆم باس بکە چی ڕوویداوە و ئێستا لە کوێ داین و ڕووداوەکانم وەکو هەواڵی جەزیرە و بی بی سی بۆ باس بکە.

نومێر: بەسەرچاو! لە هەنگاوی یەکەمی پێغەمبەری خوادا بووین کە چۆن دەوڵەتی دامەزراند و لە باسی موشریکەکانی چواردەوری شاری مەدینە بووین ویستم باسی ئەوەت بۆ بکەم کە قورەیش چی دەکات و بەتەمای چییە؟!

ماکوان: بڕوا بکە بۆ ئەوە گەڕاومەتەوە.



# دەوڵەتی ئیسلام و موشریکەکان

نومێر: وەکو ئاماژەم پێدا هەنگاوی یەکەمی پێغەمبەری خوا ﷺ لە شاری مەدینەدا پلانی دامەزراندنی دەوڵەتی ئیسلامی بوو، پێشتر لە شاری مەککە (١٣) ساڵ کاری لەسەر ئەوە کرد ڕێکخستنە نهێنییەکانی پێکهێناوە، بناغەی بەردی دروستکردنی ئوممەت و دەوڵەتی دامەزراند بوو کە بیروباوەڕ و ئاست و ڕۆشنبیری هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ بە وەحی پڕ بووبوون، چونکە ئەوان دید و تێڕوانینیان هەموو لەسەر بناغەی بیروباوەڕ بوو، بۆیە هەنگاوی یەکەمی پێغەمبەر ﷺ یەقینی ئەوەی پێدا بوون کە ئیمانیان بە خوای پەروەردگارە و گوێڕایەڵ و گەردنکەچن وەکو سەرباز لە ئاستی ئایینە قورئانییەکاندا خاڵ و هەنگاو بە هەنگاو پیادەیان دەکرد، پاشان یەقینی ئەوەی دروست کرد بۆ هاوەڵان کە محمد کوڕی عەبدوڵڵا پێغەمبەری خوایە ﷺ لە خۆیەوە قسە ناکات و لە لایەن خوای پەروەردگارەوە ڕەوانە کراوە، ئەو یاسا و شەریعەتەی کە پێغەمبەری خوا ﷺ دایدەمەزراند سەرچاوەکەی وەحییە و لە خوای موتەعالەوە سەرچاوەی گرتووە، ئەنجامی بیر و فیکرەی محمد ﷺ نییە وەکو کەسایەتی، بەڵکو وەحییە چۆن گوێڕایەڵیان بۆ قورئان هەبوو گوێڕایەڵیان بۆ فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ و سوننەتەکانی هەبوو.

ماکوان: کەواتە ئەو دوو خاڵە کە باست کرد لە بەشێکی زۆر گرنگ سەرچاوەی گرتووە لەناو دەوڵەتی ئیسلامی و ئوممەتی ئیسلامی، ئەویش بەڕاستی قورئان و سوننەت هەردووکیان سەرچاوەی سەرەکین بۆ یاسا و ڕێنمایی و شەریعەتی ناو دەوڵەتی ئیسلامی، مانای وایە هیچ هەڵبژاردەیەکی تری نییە، بێجگە لەو دوو سەرچاوە، بەڵکو فەرز کراوە لەسەرمان کە شوێنکەوتوی قورئان و سوننەت بین، ئەگەر وا نەکەین ئوممەتێکی سەرکەوتو و سەربەست دانامەزرێت.

نومێر: بەڵێ بەدڵنیاییەوە قورئان و سوننەت سەرچاوەی سەرەکین، بەڵام سەرچاوەی ترمان زۆرە بۆ دامەزراندنی تەشریعی ئیسلامی، بەو مەرجەی کە دژی قورئان و سوننەت نەبێت.

ماکوان: وەکو چی؟

نومێر: ڕای هەر چوار خولەفاکە و پاشان هاوەڵان بەگشتی ئینجا ئیجتیهاد و قیاس و پێوەر و عورف و بەرژەوەندی گشتی تر کە لە زانستی ئوصوڵ و فیقهدا باسکراوە، ئیمامی شافیعی



دایمەزراندووە، پاشان ئوممەت لەسەری ڕۆیشتووە بەگشتی...هتد، بەڵام سەرچاوەی سەرەکی و بنەڕەتی قورئان و سوننەتە.

ماکوان: ڕاستە، کەواتە لێکۆڵینەوە لە ژیان و سوننەتی پێغەمبەرمان ﷺ ڕەهەندێکی ترمان پێدەبەخشێت، واتە فەرموودە و ڕەفتار و دانان بەکردەوەکانی هاوەڵان و پەیماننامە و جەنگ و غەزا و پلان و هەموو هەڵسوکەوتێکیان بۆ ئێمە دەبێتە یاسا و ڕێسا، بەجوانتر بڵێین خودی دینەکەیە، لە ئایینەکەوە سەرچاوەی گرتووە.

نومێر: هەر لەبەر ئەوەیە حەز دەکەم بە ورد و درشتی باسی ژیانی پێغەمبەر ﷺ بکەم و لە خزمەتیدا هەنگاو بە هەنگاو بڕۆین بۆ ئەوەی تێبگەین خوای پەروەردگار چۆن کاری کردووە چۆن ئاڕاستەی کردووە لە ڕێگای جوبرەئیل و وەحی قورئان.

ماکوان: بەدڵنیاییەوە پێویستە زۆر بە وردی شیکاری لە خزمەت ژیانیدا بین و نەک کاتی بۆ تەرخان بکەین بەڵکو دەبێت تەمەنمان بۆ دابنێین و هەموو تەمەنمان لە ژینی ئەودا خەرج بکەین، تا خۆشبەختی دونیا و قیامەت ببین.

ئەو دوو بناغەیەی باسمان کرد لەوپەڕی گرنگیدایە و بونیادی ئوممەت و ژیان و دەوڵەتی لەسەر دادەمەزرێت، بڕوا بوون بە خوای پەروەردگار و پەروەردەکردنی گەل و نیشتیمان لەسەر ئەو بنەمایە و پاشان پەروەردەکردنی گەل و خەڵکی لەسەر ئەوەی کە پێغەمبەری خوا ﷺ یەقینمان هەبێت قسە و فەرموودەی وەکو قورئانە.

نومێر: بناغەی تر زۆرە بۆ ئەوەی لە بیری نەکەین کە پێغەمبەری خوا ﷺ دایڕشت، لەوانە هەست کردن بە چاودێری خوای پەروەردگار، چونکە بڕوابوون بەخوا بەس نییە، بەڵکو بڕوا بوون بە ناو و سیفات و توانا و هێزی خوای پەروەردگار زۆر پێویستە، لە سەرووی هەموویانەوە چاودێریکردنی بەندەکانی بەوەی هەرچی بکەن پاداشت و سزای لەسەر وەردەگرن، لە سورەتی المزمل ئایەتی ٧-٨دا دەفەرموێت:

﴿إِنَّ لَكَ فِي ٱلنَّهَارِ سَبۡحٗا طَوِيلٗا ٧﴾

واتە: تۆ لە ڕۆژدا هەوڵ بدە (بانگەواز بکەیت) بگەڕێیت، کۆششی زۆر بکەیت.

﴿وَٱذۡكُرِ ٱسۡمَ رَبِّكَ وَتَبَتَّلۡ إِلَيۡهِ تَبۡتِيلٗا ٨﴾

واتە: تۆ هەمیشە بەناوی پەروەردگارت ویردی سەر زارت بێت، بە دڵسۆزیی و ملکەچییەوە لێی بپاڕێرەوە و بیپەرستە.



ماکوان: بەدڵنیاییەوە ڕاستت فەرموو، بێجگە لەوەی فەرمووت مزگەوت دەوری سەرەکی هەیە، بەڵام من مەبەستم بوو کە هەموو لەو دوو بناغەوە سەرچاوە دەگرێت، دەنا مزگەوت بۆ بونیادنانی شارستانی و دەوڵەتداری ئوممەت سەرچاوەی سەرەکییە.

نومێر: با منیش دانەیەکی ترت بۆ زیاد بکەم کە بناغەی دەوڵەت و شارستانییەت و ئوممەتە، ئەویش یەکگرتنی ئوممەتی موسڵمانە، بینیمان ئەو یەک دەنگ و یەکبوونەی ئەوس و خەزرەج و برایەتی نێوان ئەنسار و موهاجیر، چ هێز و توانایەکی دایە دەوڵەتەکەی پێغەمبەر ﷺ، ئەو یەکگرتنە لەسەر بنەمای نەتەوە و عەشیرەت و هۆزگەرایی نەبوو، بەڵکو بناغەی بیروباوەڕی ئیسلام و ئیمان بوو، بەڵام مانای وانییە کە پەیوەندی نەتەوە و عەشیرەت و هۆزگەرایی فەرامۆش بکات، بەڵکو بە پێچەوانەوە لەسەر بنەمای پەیوەندی مرۆیی ئەو سروشتەی لە نێوان خودی مرۆڤدایە، ڕەحمەت و خۆشەویستییە لە نێوانی نەتەوە و عەشیرەت... هتد، بەڵکو ئیسلام لە چوارچێوەی شەریعەتدا ڕێکیخستووە.

ماکوان: با منیش بۆی زیاد بکەم، ئەویش پێغەمبەری خوا ﷺ بناغەی دەوڵەتی لەسەر بنەمای (فیقهی واقیع) دامەزراند.

نومێر: زۆر باسی فیقهی واقیع دەکەیت، ئەو زانستە چییە؟!

ماکوان: یەکێک لە بونیادنانی بناغەی دەوڵەت و ڕێکخستن و ژیار و ئوممەت (فقهی واقیعی)ە ئەمەش واتای لێکۆڵینەوە و لێبوردن و خوێندنەوە بۆ کردنی ئەو ڕووداو و گۆڕانکارییانەی لە چواردەوردان واقیعەکە دروست دەکەن، دەست نیشان کردنی ڕێگاکان و پلان دانان بۆی، بەگوێرەی ئەو کێشە و ئەزمانەی کە ڕووبەڕووت دەبێتەوە، چۆنیەتی مامەڵەکردن لەگەڵیدا بە گوێرەی پێوەر و کێشی خۆی.

هەروەها بە گوێرەی ئەو کەش و هەوایەی ڕووداو و کێشەکان تێدا ڕوو ئەدەن و چۆنیەتی مامەڵەی دروست و گونجاو لە چوارچێوەی یاسا و شەریعەتی خوای پەروەردگار، واتا بەگوێرەی واقیع و ڕەوشەکە مامەڵەی شەرعی و تەندروست لەگەڵ کێشەکاندا بکەین، بۆ نموونە وەکو جەنابت باست کرد، پێشتر لە ژیانی پێغەمبەر لە قۆناغی یەکەمدا بینیمان چۆن مامەڵە دەکات، پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ هەموو واقیعەکاندا مامەڵەی جیاوازی کردووە، لەگەڵ هەر ئەزمە و کێشە و تەنگ و چەڵەمەیەکدا لەگەڵ سروشتی ڕووداوەکان چۆن بووە، بەو شێوە و میتۆدە و بەهەماهەنگی حەکیمانە مامەڵەی کردووە و پەلەی نەکردووە و هەڵەشە نەبووە، دەشبینیت مامەڵەی لەگەڵ تاک و کەسایەتی ناودار و هۆز و عەشیرەت و تیرەکاندا چۆن بووە.



نموونەی واقیعەکە ئەوس و خەزرەجی بەیەکەوە ئاشت کردەوە، لە شاری مەدینەدا موهاجیری لە پەناهەندەوە کردە هێزێکی چالاکی گەل، هەمووی کردە هێزێکی ئابووری و سیاسی، نەیدەهێشت دوژمنی بۆ دروست ببێت، بەدوای دۆستایەتی و هاوپەیمانییەوە بوو.

لەگەڵ موسڵمانانی حەبەشە جۆرە (بەرخودێکی مانی چییە؟) هەبوو، هەندێکیانی بانگ کردەوە، هەندێکیانی هێشتەوە تا وەزع و ڕەوشەکە هێمن بوویەوە لەگەڵ موسڵمانی عەشیرەت و گەل و هۆزەکانی تردا مامەڵەی واقیعی کرد لە جێگای خۆیان مانەوە و بانگەوازیان دەکرد، تاکو ببنە بزوتنەوەیەکی گۆڕانکاری بانگەواز بۆ ئیسلام لە نیوەدوورگەی عەرەبیدا.

لەگەڵ موسڵمانانی لاواز و بێهێز و بێ دەرەتان، کە توانای هیجرەتیان نەبوو، پێی فەرموون بێدەنگ بن و خۆتان بشارنەوە، خۆتان مەخەنە بەرچاو و با تووشی ململانێ نەبن لەگەڵ عەشیرەتەکان بەگشتی، تا خوای پەروەردگار سەرکەوتن و هێز بۆ موسڵمان بڕیار ئەدات.

هەر وەکو بینیمان لەگەڵ موشریکەکانی ئەوس و خەزرەج ستراتیژی وابوو، پێغەمبەری خوا ﷺ مامەڵەیان لەگەڵدا بکات بە بانگەوازی ئیسلام بەوەی کە چاکە و باشە و هەوڵدان بۆ هێنانی توخمە باشەکانیان بۆ ناو ئیسلام بە گوێرەی توانا، خۆشەویستمان کردی، پاشان خۆبەدوورگرتن لە ململانێ ناوخۆیی یان بەیەکدا کێشان و بەرپابوونی جەنگی ناوخۆیی، چونکە ئەمانە هەموو دەوڵەت و ئوممەتەکە لاواز دەکات، پێغەمبەر ﷺ ئەمەی نەدەویست بۆ ئەوەی دەوڵەتە ساوا و نوێیەکەی شکست نەخوات.

هەروەها لەگەڵ ئەعرابەکانی چواردەوری شاری مەدینەدا دەیویست هەر چۆن بێت بانگەوازیان بکات بۆ ئیسلام، هەوڵی هاوپەیمانی و دۆستایەتی دەکرد لەگەڵیاندا لە کاتێکدا ئەو قەبیلە و هۆزانەی ئەعراب لە چواردەوری مەدینەدا بوون بۆ ئاسایشی ئابووری و ناو شاری مەدینە ترسناک بوون، هەموو قافڵە و کاروانی بازرگانی شاری مەدینە بە ناوچەکانی ئەواندا ڕەت دەبوون، ئەو هۆز و عەشایەرانەی ناو ئەعراب بە چەتەیی و ڕێگری و خراپەکاری ناسراوبوون.

لەگەڵ گەل و هۆزە گەورەکانی عەرەب هەمان ستراتیژی هەبوو، هاوپەیمانی و دۆستایەتی بەتایبەت لەگەڵ ئەو هۆزەی پێشتر بۆت باسکردم بەناوی گەل و هۆزی (جوهەینە) لە نزیک شاری مەدینەی منەوەرە.

ئەوە فیقهی واقیعە کە پێغەمبەری خوا ﷺ پیادەی کردووە و مامەڵەی لەگەڵ چواردەوردا کردووە.



نومێر: ئەی بارک الله، ئەوەی ڕووی دابوو لە ژیانی پێغەمبەر صَلَّىٰٱللَّهُعَلَيۡهِوَعَلَىٰٓآلِهِۦوَسَلَّمَ لە ماوەی ئەم یەک دوو مانگەدا هەموو شیکاریت بۆ کردوو زانستی فیقهی واقیعیشت ناساند، بەگوێرەی قسەکانی بەڕێزت شیکاری سیاسی و خوێندنەوەی واقیعەکەیە.

ماکوان: ئەتوانین وا بڵێین، بەڵام شیکاری سیاسی و خوێندنەوەی واقیع ئەچێتە خانەی کاری سیاسی یان هونەری سیاسەت.

نومێر: بەهەرحاڵ ئەو دو گروپەی باست کرد لە ڕووداوەکاندان زۆر گرنگن یەهوود یان جوولەکەکانی ناوچەی عەرەبی لەگەڵ موشریکی شاری مەککە، بە گوێرەی ئەو زانستی فیقهی واقیعە بێت کە تۆ باست کرد دەبێت پێغەمبەر صَلَّىٰٱللَّهُعَلَيۡهِوَعَلَىٰٓآلِهِۦوَسَلَّمَ مامەڵەیان لەگەڵ بکات لەسورەتی المائدة ئایەتی ٨٢دا دەفەرموویێت:

﴿۞ لَتَجِدَنَّ أَشَدَّ ٱلنَّاسِ عَدَٰوَةً لِّلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱلۡيَهُودَ وَٱلَّذِينَ أَشۡرَكُواْۖ وَلَتَجِدَنَّ أَقۡرَبَهُم مَّوَدَّةً لِّلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱلَّذِينَ قَالُوٓاْ إِنَّا نَصَٰرَىٰۚ ذَٰلِكَ بِأَنَّ مِنۡهُمۡ قِسِّيسِينَ وَرُهۡبَانًا وَأَنَّهُمۡ لَا يَسۡتَكۡبِرُونَ﴿٨٢﴾﴾

واتە: سوێند بەخوا دەبینیت سەرسەخترینی خەڵک لە دوژمنایەتیدا بەرانبەر بەوانەی کە باوەڕیان هێناوە، جوولەکەن و ئەوانەی هاوەڵیان بۆ خوا داناوە، سوێند بێت دەبینیت نزیکترینیان لە سۆز و خۆشەویستی بۆ ئەوانەی کە باوەڕیان هێناوە ئەوانەن کە دەڵێن: بەڕاستی ئێمە نەصرانین، ئەوەش لەبەر ئەوەیە بەڕاستی ئەوان قەشەی دیندارن و هەندێکیشیان گۆشەگیر و کەسانی خواپەرستن و بێگومان ئەوان خۆ بەگەورە دانانێن لە ئاستی حەقدا (دوای تێگەیشتن باوەڕ دەهێنن).

ئیتر بۆت دەردەکەوێت مامەڵەی ئەوان دوژمنکارانەیە، هەر بۆیە پێغەمبەری خوا صَلَّىٰٱللَّهُعَلَيۡهِوَعَلَىٰٓآلِهِۦوَسَلَّمَ لەگەڵ واقیعی ئەوانیش یەک بەرخودی کردووە.

ماکوان: تەماشای ئەو ئایەتە پوختە بکە خوای گەورە بە چەند وشەیەکی کورت موعجیزەیەکی گەورە نیشانی ئێمە ئەدات، ستراتیژی یەهوود و موشریکەکانە لە هەموو کات و زەمەنێکدا تەمەشا بکە یەهوود چی دەکەن لە جیهاندا، ئەگەر تەماشای موشریک و بتپەرستەکان بکەیت دەبینن چیان کرد لەسەردەمی تەتار و مەغۆل تا ئەم دواییانە لە بۆرما و چین و ناوچەکانی تری توورکستان.



نومێر: بەدڵنیاییەوە وایە، هەر ئەو دوو هێزە لە جیهاندا ئێستا تاڕادەیەک فەرمانڕەوایی دەکەن، یەهوود لەبەشی ڕۆژئاوای بتپەرست و موشریکەکان لە ڕۆژهەڵات، مەبەستم ئەمریکایە کە یەهوود مۆنۆپۆلی کردووە، ئەمریکاش ڕابەرایەتی هەموو ڕۆژئاوایە بە ئەورووپا و ئوستralیا و کەنەداوە، ڕۆژهەڵات یابان و چین و هیند و دەوڵەتانی ترە، جیهانی ئیسلامیش خەوی قووڵی لێ کەوتووە وەکو ورچی ماندوو مرەی دێ لە شیرینی خەودایە.

ماکوان: پێم بڵێ ئەوەی قورەیش ویستی بیکات چی بوو لە دوای ئەوەی وا چەند مانگێکە یاخود سێ مانگ دەبێت پێغەمبەر ﷺ جێگیر بوو لە شاری مەدینە و ڕۆژ بەڕۆژ خەڵکی لە دەوری کۆ دەبێتەوە؟

نومێر: هەوڵی قورەیش لەناوبردنی دەوڵەتی ساوا و نوێی پێغەمبەری خوا ﷺ بوو.



# هەوڵی قورەیش بۆ لەناوبردنی دەوڵەتی ئیسلامی

ماکوان: ئێ کە پێغەمبەر ﷺ لە شار و زێد و مەڵبەندی خۆی دەرکراوە و هاوەڵانی دەرکراون و خەڵکی تر لە ڕێگای خوا جێگای کردوونەتەوە، ئیتر حەقی چییە بەسەریانەوە کە (٥٠٠کم) دوورن لە شاری مەککەوە؟!

نومێر: ئاخر دەبێت بزانیت گەل و هۆزی قورەیش لەناوچەکەدا خاوەنی سەربەرزی و مێژوون، هەروەها گەورەترین گەل و هۆزی عەرەبن و یان سەربەرزترین و بەعیزەتترین و دەوڵەمەندترینی عەرەبن.

لەناو تیرەکانی دوورگەی عەرەبیدا ڕووی نەدابوو هیچ گەل و هۆزێکی تری عەرەب دژی قورەیش بوەستێتەوە.

بەڵکو بە پێچەوانەوە هەموو گەل و هۆزەکانی عەرەب لە پێشبڕکێ دابوون بۆ ئەوەی لەگەڵ قورەیشدا بونیادی پەیوەندییەکی بەهێز بینا بکەن چ لەڕووی دیبلۆماسییەوە بێت، یاخود ئابوورییەوە، چونکە قورەیش سەرپەرشتی ماڵی خوا دەکات و چاودێری کەعبە دەکات، قورەیش لە شاری مەککەدا گرنگی ئەدات بە حاجیان، خاوەنی قورسایی و کێشی زۆر گەورە بوون لە دڵی عەرەبدا بەگشتی.

ئەگەر بە زانستی فقهی واقیعیش تەماشای بکەین کە لەتۆوە فێربووم و بەو چاوە سەیری ڕووداو و شیکاری بۆ واقیعەکە و ڕەوشەکە بکەین، قورەیش بێدەنگ نابێ، چونکە تانە و خەنجەری لەسەر دڵ دراوە زۆر بە ترسناک تەماشای موهاجیر و پێغەمبەری خوا ﷺ دەکات و بە ترسناک دای دەنێت بۆ سەر ئاسایشی نەتەوەیی، بەو چاوەشەوە تەماشا دەکات کە هۆزی ئەوس و خەزرەج وەستاونەتەوە لەبەردەم هێز و گەورەیی پێغەمبەر ﷺ، لەبیری قورەیشدا بەهۆکاری ئەوەی میوانداری خاوەن ماڵیان لە پێغەمبەر و هاوەڵان و ئیمانداران کردووە بەگشتی!

بۆ قورەیش کێشەکە هەروا ئاسان نەبوو، بۆی بووە کێشەی کەرامەت و دەستدرێژی کردن، ئەوەشمان لەبیر نەچێت لەسەرەتای ئەم بانگەوازەی ئیسلامەوە گەورە و سەرکردەکانی قورەیش کەوتنە دژایەتی کردن و لەناوبردن و مراندنی ئەم بانگەوازە ئیسلامییە.



بەرێگای جیاواز، بە ترس و تۆقاندن، کوشتن و داگیرکردنی ماڵ و سامان، هەرچەندە نەیانتوانی، بەڵام دەبێت ئەوەش لەبەرچاو بگرین سەرکردە و گەورەپیاوانی قورەیش هەروا بە ئاسانی دەست هەڵناگرن و دان بەشکستی خۆیاندا نانێن، وایە؟

ماکوان: بەدڵنیاییەوە وایە ئەوەتا تۆ بە فیقهی واقیعەکە قسە دەکەیت و من دەبێت لە تۆوە فێرببم، ئەوەشمان لەبیر نەچێت پەیوەندی نێوان شاری مەککە و مەدینە پەیوەندی هاوپەیمانی و بازرگانی و تەنانەت پەیوەندی ژن و ژنخوازی بوو لەنێوانیاندا، ماڵی خاڵوانی پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ هەموو خەڵکی شاری مەدینەن، چوونی پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ بەدڵنیاییەوە کاریگەری لەسەر ئەو پەیوەندییە دادەنێت و دەبێتە کێشەیەکی زۆر گەورە لە ڕووی ئابووری سیاسی و کۆمەڵایەتی بۆ شاری مەککە و قورەیش.

نومێر: گومانی تێدا نییە لە دید و بۆچوونی قورەیش شتێکی زۆر ترسناک هەبوو کە ئەوان حیسابیان لەسەر کردبوو، ئەوان وایان دانا بوو پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ بڕواتە شاری مەدینە زۆربەی یەهوود تێیدا نیشتەجێن، پێدەچێت هەموو موسڵمان بن، ئەگەر یەهوود بڕۆنە سەر هێزی موسڵمانان ئەوە بەدڵنیاییەوە هێزی گەورە و بەهێزیان لێ دەردەچێت، بەو پێیەی یەهوود خاوەنی چەکی زۆر و قەڵای بەهێز و پتەو بوون و خاوەنی جەنگاوەر و هێزی ئابووری و سامانی زۆر بوون، ئەم دید و تێڕوانینەی قورەیش لەوەوە سەرچاوەی گرتبوو کە یەهوود ئەهلی کیتابن و هەمیشە باس لە یەک خوایی و پێغەمبەران دەکەن، باسی کتێبە ئاسمانییەکان دەکەن، ئەوان بوون بڵاویان کردەوە سەردەمی هاتنی پێغەمبەرێکە لەو زەمەنەدا، هەربۆیە قورەیش بەدووری نەدەزانی یەهوودییەکان موسڵمان بن، خۆ ئەگەر زیاتر لێکۆڵینەوە بکەین دەبینین هەموو ئەمانە لەسەر ڕێگای قورەیش بوون بۆ بازرگانییەکانیان لەگەڵ شامدا، بوونی موسڵمانان لەو ناوچەیە هێزێکی ترسناکە لەسەر بەرژەوەندییەکانی قورەیشدا، چونکە قورەیش دەیزانی دەوڵەتی ئیسلامی هەڕەشەیە لەسەر بەرژەوەندییە ئابوورییەکانی قورەیش و لێدانێکی بەئازارە لە ئابووری شاری مەککە.

جا لەبەر ئەوە قورەیش هەروا دەست هەڵناگرێت لە گەورەبوونی دەوڵەتی ئیسلامی، وازی لێناهێنێت ڕۆژ بە دوای ڕۆژ گەورەتر بێت بێئەوەی ڕووبەڕووی ببێتەوە، شەو و ڕۆژ لە بیر و پیلانی ئەوەدابوون چۆن محمد صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ و هاوەڵانی لەناو بەرن، لەبیرمان نەچێت سوننەتێکی خودای پەروەردگارە کە کافر و بێباوەڕان هەمیشە لە بیر و پیلانی ئەوەدان موسڵمانان لەناو بەرن، لە سورەتی البقرة ئایەتی ٢١٧دا دەفەرمووێت:



﴿يَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلشَّهْرِ ٱلْحَرَامِ قِتَالٍ فِيهِ ۖ قُلْ قِتَالٌ فِيهِ كَبِيرٌ ۖ وَصَدٌّ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ وَكُفْرٌۢ بِهِۦ وَٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ وَإِخْرَاجُ أَهْلِهِۦ مِنْهُ أَكْبَرُ عِندَ ٱللَّهِ ۚ وَٱلْفِتْنَةُ أَكْبَرُ مِنَ ٱلْقَتْلِ ۗ وَلَا يَزَالُونَ يُقَٰتِلُونَكُمْ حَتَّىٰ يَرُدُّوكُمْ عَن دِينِكُمْ إِنِ ٱسْتَطَٰعُوا۟ ۚ وَمَن يَرْتَدِدْ مِنكُمْ عَن دِينِهِۦ فَيَمُتْ وَهُوَ كَافِرٌ فَأُو۟لَٰٓئِكَ حَبِطَتْ أَعْمَٰلُهُمْ فِى ٱلدُّنْيَا وَٱلْءَاخِرَةِ ۖ وَأُو۟لَٰٓئِكَ أَصْحَٰبُ ٱلنَّارِ ۖ هُمْ فِيهَا خَٰلِدُونَ ﴿٢١٧﴾﴾

واتە: پرسیارت لێ دەکەن دەربارەی جەنگ لە مانگی حەڕامدا (کە بریتین لە ذوالقعدة و دوالحجة و محرم و رجب) بڵێ: جەنگ لەو جۆرە مانگانەدا کارەساتێکی گەورەو هەڵەیەکی گەورەیە، بەرهەڵستی ڕێبازی خوا و بێباوەڕییە پێی و (تاوانێکی گەورەیە) و (جەنگ) لە مزگەوتی حەڕام دا، دەربەدەرکردنی خەڵکەکەی زۆر گەورەترە لای خوا (لە کوشتنی کەسێک یا چەند کەسێک) و زۆر هێنان بۆ ئیمانداران تا پاشگەز بکرێنەوە تاوانێکە لە کوشتن گەورەترە، (بێگومان بێباوەڕان) بەردەوام دژتان دەجەنگن هەتا واتان لێ بکەن کە لە دین و ئایینتان پاشگەز ببنەوە ئەگەر بۆیان بکرێت، جا ئەوەی لە ئایینەکەی پەشیمان ببێتەوە بە کافری بمرێت، ئەو جۆرە کەسانە کارەکانیان پووچ دەبێت لە دنیا و لە قیامەتدا، ئەوانە جێنشینی ناو ئاگری دۆزەخن و ژیانی هەمیشەیی تیا دەبەنە سەر.

بەم هۆکارانە قورەیش بەشێوەیەکی ڕێکخراوەیی هەنگاوی هەڵهێنایەوە و پیلانی بۆ دارشتن، بۆ لەناوبردنی دەوڵەتی ساوای پێغەمبەری خوا ﷺ، سەرەتا بەشێوەی ئاسان دەستی پێکرد و مەنهەجی دیبلۆماسی بەکار هێنا لەناردنی خەڵک و وەفد بۆ ناو هۆز و عەشیرەتەکان و دانوستان و هاوپەیمانی لەگەڵیاندا، هەموو ئەم کارانە ئەگەری زۆر ترسناکی خستە سەر شاری مەدینە و دەوڵەتی پێغەمبەر ﷺ، هەموو ئەو کارانەی قورەیش لە شێوەی پەیماننامە نەبوو بۆ ئەوس و خەزرەج بەڵکو لە شێوەی هەڕەشە و داگیرکردنی شارەکە بوو.

ماکوان: کارەکان بریتی بوون لە چ فاکتەر و ئەجندای قورەیش چی بوو چی بەکار دەهێنا؟!

نومێر: خاڵی سەرەکی قورەیش شەڕی دووبەرەکی و فیتنە و ئاشووب بوو لەنێوان خەڵکی شاری مەدینەدا، دەیویست جەنگی خۆکوژی و برا کوژی لەنێوان ئەوس و خەزرەج زیندوو بکاتەوە، یان دەرکردنی پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵان بەوەی ئەوان بڕۆن شاری مەدینە لە دەستدرێژی قورەیش ڕزگاری دەبێت.



بۆیە قورەیش کاری لەسەر ئەوە کرد کە عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی کوڕی سەلول کە تا ئێستا گەورە و سەرکردەی موشریکی ئەوس و خەزرەجە، ناردی بەشوێنیدا و لە ناو دارونەدوە کۆبوونەوەیان بۆ سازدا و لەسەر تەوەری ئەوەی ئەو گەورە و سەید و سەرکردەی شاری مەدینەیە و ڕەغبەتی موڵک و سیاسەت و پادشایان دایە عەبدوڵڵای کوڕی سەلول، ڕق و کینەی عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی کوڕی سەلولیان بەکار هێنا دژی پێغەمبەری خوا ﷺ. دوای ئەوەی کە زانیان عەبدوڵڵای کوڕی سەلول ترسنۆکە و هیچی پێناکرێت نامەیەکی هەڕەشە ئامێزیان نارد بۆی و لەنامەکەدا دەڵێت: (ئێوە داڵدەی محمد ﷺتان داوە، سوێند بەلات و عوزا یان شەڕ لەگەل محمد ﷺ دەکەن یان دەری دەکەن لەناوخۆتاندا و یان سوپا دەکەینە سەرتان و دێین هەموو جەنگاوەر و پیاوەکانتان دەکوژین و خێزان و ماڵ و منداڵتان دەبەین).[٢٦]

ماکوان: ئەی چی ڕوویدا و عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی کوڕی سەلول چی کرد دوای ئەو هەڕەشە گەورەیەی قورەیش؟

نومێر: هەڵسا بە کارێکی زۆر ترسناک چاوەڕواننەکراو، بەبڕیارێکی زۆر ترسناک هێزی کۆکردەوە لە موشریکی ئەوس و خەزرەج بۆ لێدانی موسڵمانانی ئەوس و خەزرەج!

ماکوان: بەلامەوە زۆر ئاساییە هیچ غەریب نییە، هەموو دونیا دژی یەک بن، بەڵام بۆ لێدانی موسڵمان هەموو دەبن بەیەک و لە مێژوودا زۆر ڕوویداوە، کە فارس و ڕۆم هەمیشە جەنگیان بوو لە دژی موسڵمانان بوون بەیەک هێز، لە ئەندەلووس بە هەمان شێوە لە جەنگی خاچپەرستان هەربەهەمان شێوە، لە داگیرکردنی سەدەی (١٩-٢٠) هەموو هێزی دونیا جەنگیان بوو دژی موسڵمان کە لە ڕاستیدا دژی یەکترن، ئەوان و هیندۆس بەیەکەوە دژی موسڵمانان لە هیندستان و پاکستان، ئەمریکا و ڕووسیا دژی یەکن، بەڵام بۆ لێدانی موسڵمانان هاودەنگن، فەڕەنسا و ئینگلیز دانوویان بەیەکەوە ناکوڵێت بۆ لێدانی موسڵمان یەک ڕیزن، شووعی و سەرمایەداری بەیەکەوە هەرگیز ناگونجێن، بەڵام بۆ لێدانی موسڵمانان موو ناچێت بە نێوانیاندا، خوای گەورە لە سورەتی النساء ئایەتی ٨٩ دا دەفەرمووێت:

---

٢٦ ـ (أنَّ كفَّارَ قُرَيْشٍ كتبوا إلى ابنِ أُبَيٍّ، ومن كانَ يعبُدُ معَهُ الأوثانَ منَ الأوسِ والخزرجِ، ورسولُ اللَّهِ صلَّى اللَّهُ علَيهِ وسلَّمَ يومئذٍ بالمدينةِ قبلَ وقعةِ بدرٍ: إنَّكم آويتُمْ صاحبَنا، وإنَّا نُقسِمُ باللَّهِ لتقاتلُنَّهُ، أو لتخرجُنَّ أو لنَسيرنَّ إليكم بأجمعِنا حتَّى نقتلَ مقاتلتَكم، ونَستبيحَ نساءَكمالراوي: رجل من الصحابة، المحدث: الألباني، المصدر: صحيح أبي داود).



﴿وَدُّواْ لَوْ تَكْفُرُونَ كَمَا كَفَرُواْ فَتَكُونُونَ سَوَآءً فَلَا تَتَّخِذُواْ مِنْهُمْ أَوْلِيَآءَ حَتَّىٰ يُهَاجِرُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ فَإِن تَوَلَّوْاْ فَخُذُوهُمْ وَٱقْتُلُوهُمْ حَيْثُ وَجَدتُّمُوهُمْ وَلَا تَتَّخِذُواْ مِنْهُمْ وَلِيًّا وَلَا نَصِيرًا ﴿٨٩﴾﴾

واتە: (ئەو دووڕووانە) ئاواتە خوازن کە ئێوەش کافر و بێ باوەڕبن وەک خۆیان، تا وەک یەکتان لێ بێت، هەرگیز ئەوانە بە پشتیوان و یاوەر دامەنێن هەتا کۆچ نەکەن لە پێناوی خوادا، خۆ ئەگەر یاخی بوون و پشتیان تێکردن، ئێوە بیانگرن و بیانکوژن لە هەرکوێدا ئەوانەتان دەست کەوت، هەرگیز نەکەن ئەوانە بکەنە یاوەر و هاوکار.

پێم بڵێ لە کۆتاییدا ڕووداوەکان چۆن هاتنە پێش و پێغەمبەر چۆن چارەسەری کرد؟!

نومێر: هەروەکو وتم عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی کوڕی سەلول هێزی کۆکردەوە، بۆ ڕشتنی خوێنی ئەوس و خەزرەج، لە بیری چووە خۆی لە گەورەی خەزرەجە، بەڵام وەکو تۆ وتت بۆ لێدانی خواناسان هیچ بەربەستێک نامێنێت، کە موشریکەکان کۆبوونەوە ناچار موسڵمانانی ئەوس و خەزرەج کۆبوونەوە بۆ جەنگی موشریکەکان، ئەمەش سەرەتای جەنگی ناوخۆیە و کاریگەری زۆر خراپی لێ دەکەوێتەوە.

ماکوان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ لە کوێیە ئاگای لەمانە نییە؟!

نومێر: بەڵێ، بەدڵنیاییەوە ئاگای لێیەتی و هەروا دەستەوەستان دانەنیشتووە سەرکردەی حەکیم و قائیدی گەورە لەکاتی کینە و ڕووداو و ئەزمەکاندا دەردەکەوێت و بە باشترین شێوە چارەسەری دەکات، بەتایبەت پێغەمبەر ﷺ کە بە ئاڕاستەی وەحی کاردەکات.

پێغەمبەری خوا ﷺ بە خێرایی هات هەموو هەوڵێکی خۆی خستەگەڕ کە هیچ پێداکێشانێک ڕوونەدات، ململانێکە بوەستێنێت، پێش ئەوەی جەنگ دەستپێبکات فریایان کەوت و کەوتە نێوانیان، لێرەدا ئەو فیقهی واقیعەی کە باس دەکەیت زۆربەجوانی دەردەکەوێت.

ماکوان: چی بوو بۆم باس بکە؟!

نومێر: لەو جێگایەدا کە موسڵمان و موشریکەکان وەستابوون هیچ باسی خواناسی و بەهەشت و جەهەنەمی نەکرد، باسی پرەنسیپ و مەبدەئی ئیسلامی نەکرد، چونکە تێکەڵاون لە موشریک و موسڵمان، بەڵام پێغەمبەر ﷺ لەسەر دوو تەوەرە کاری کرد کە زۆر گرنگ بوو لەو واقیعەدا یەکەم ئازایەتی و پاشان ڕەحم.



ماکوان: چۆن، زیاتر باسی بکە؟!

نومێر:

وەتەری یەکەم: ئازایەتی و شەهامەت و غیرەت و پیاوەتی و کەسایەتی لە ناویاندا زیندوو کردەوە کە عەرەب بەگشتی شانازی پێوە دەکرد جا موسڵمان و موشریک هەردوولا هاوبەش بوون لەو پێناسە و خەسڵەتانەدا ئەویش بریتی بوو لە فەرموودەکەی پێغەمبەر ﷺ.

فەرمووی پێیان: لەوەتەی هەڕەشەی قورەیشتان پێگەیشتووە لە ترساندا ئارامتان لێهەڵگیراوە، ئەو ترس و بیمەی خۆتان بۆ خۆتان دروست کردووە، دەتانەوێت یەکتر لە ناوبەرن، قورەیشی لێتان دوورە، بەڵام کار و پەیامی قورەیش جێبەجێ دەکەن و ئەنجامدانی ئەوان پیادە دەکەن.[٢٧]

پاشان لە نێوانیاندا گیانی ئازایەتی و بەرەنگار بوونەوەی دروست کرد ڕۆحی شۆڕشگێڕی و گەریلای دایە موسڵمانان، فەرمووی لە ترسی ئەوان و هەڕەشەی ئەوان کوڕ و برا کانتان یەکتر دەکوژن.[٢٨]

تُريدونَ أنْ تُقاتلوا أبناءَكم وإخوانَكم؟!

واتا: ئەوسی ئەوسی بکوژێت و خەزرەج خەزرەجی بکوژێت، خەڵکی شارەکە یەکتری بکوژێت قورەیش لەماڵی خۆی دانیشتووە.

موسڵمان و موشریک گوێیان لە قسە شیرینەکانی پێغەمبەر بوو ﷺ هەموو بڵاوەیان کرد و ڕۆیشتن.

ئەمەوێ بڵێم کە پێغەمبەری خودا ﷺ بەڕاستی فیقهی واقعی پیادە کردووە، ئەگەر چاومان لەو بکردایە ئێستا تووشی ئەو کێشە و نارەحەتی و ناهەمواریانە نەدەبووینەوە لە کوردستانەکەی تۆ و عیراق و سووریا و میسر و لیبیا و...هتد.

گەورەترین فیتنە بۆ ئەوەی دەوڵەت و ئوممەت و ژیان لەناو بەرێت جەنگی ناوخۆ و جەنگی طائیفەکانە لە ناوخۆدا.

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

٧ ـ (لقد بلَغَ وَعيدُ قُرَيشٍ منكم المبالغَ، ما كانَتْ تَكيدُكم بأكثَرَ ممَّا تُريدونَ أنْ تَكيدوا به أنفُسَكم)

٢٨ ـ هەمان فەرموودەی پێشوو.



بەڵام پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ چارەسەری کرد و نەیهێشت ئەجندا و کار و فیتنەکانی قورەیش سەربگرێت.

ئەمەش لە پێغەمبەرەوە صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ ئەوەمان فێر دەکات چۆن شەڕی ناوخۆ و ململانێی طائیفەگەرایی وەلا بنێین و فێرمان دەکات بەدوای خاڵە هاوبەشەکاندا بگەڕێین، من و تۆ کە موسڵمانین ٪۳۰ خاڵی هاوبەشمان هەیە، بەڵام مرۆڤ لەگەڵ برایدا ٪۷۰ هاوبەشن، لە ٪۳۰ هاوبەشی بیروباوەڕ و نیشتمان و ئوممەت کۆمان دەکاتەوە.

بەڵام قورەیش دەستەوەستان نەبوون، ڕاستە هەوڵی یەکەمی سەری نەگرت فەشەلی هێنا بەڵام جەنگ بەردەوامە.

ماکوان: پلانی دووەمی قورەیش چی بوو دژی موسڵمانان؟!

نومێر: جەنگی دەروونی دژی موسڵمان.



# جەنگی دەروونی دژی موسڵمانان لە شاری مەدینەدا

ماکوان: ئەم جەنگە دەروونییە چۆن دەستی پێکرد دژی موسڵمانان؟

نومێر: جەنگە دەروونییەکە بە بەرنامەیەکی هەڕەشە ئامێز دەستی پێکرد، لە نامەکەدا بە موسڵمانان دەڵێت: بەوە دڵخۆش مەبن لە ژێر دەستمان دەرچوون و ڕۆیشتنە شاری یەسریب، دڵنیابن دێینە سەرتان و لەناوتان دەبەین، لەناو ماڵ و منداڵ و جێگای گەرمتاندا لەناوتان دەبەین.[٣٩]

جۆرێکە لە هەڕەشەی جددی و چاوترساندنی موسڵمانان، ئوسلوبێکی کۆن و نوێ بەکار دەهێننەوە، بەم شێوە هەڕەشەیە زۆرجار بۆ جەنگی دەروونی و ڕوخاندنی ورەی بەرامبەر بەکار دەهێنرێت، موسڵمانان کارەکە و هەڕەشە نامەکەیان بە گشتی و بەجددی وەرگرت و زۆر گرنگیان پێدا، چونکە دەیانزانی قوڕەیش لە توانایدا هەیە بێتە سەر شاری مەدینە و داگیری بکات، دەیانزانی لە ڕێگای بەکرێگیراوە ئەعرابییەکانەوە قوڕەیش خەڵک دەنێرێت بۆ کوشتنی پێغەمبەری خودا ﷺ، چونکە پێشتر لە شاری مەککە ئەزمونی ئیغتیالی پێغەمبەر ﷺ پیلانی بۆ دارێژرابوو، ویستییان هەموو هۆزەکان پێغەمبەر ﷺ بکوژن و خوێنەکەی دابەش بکەن بەسەر هۆز و عەشیرەتەکاندا، هەروەها بڕیاریاندا هەرکەس محمد ﷺ بکوژێت یان ڕادەستی قوڕەیشی بکات، ١٠٠ وشتر بەدیاری وەردەگرێت، هەموو ئەمانە وای کرد موسڵمانان و پێغەمبەری خودا ﷺ کارەکە بە جددی و گرنگ وەربگرن، بەجۆرێک ئەوانیش پلانی بۆ دابڕێژن و زۆربەی کاتەکان پێغەمبەری خوا ﷺ شەوان نەدەخەوت و ئێشکگری دەکرد و پاسەوانی دەکرد بۆ خۆی و ماڵ و خێزانەکانی لە ترسی غەدری قوڕەیش، ماوەیەکی زۆر بەم شێوەیە مایەوە پێغەمبەر ﷺ زۆر ماندوو بوو لەوەی چەند شەوێک بوو نەخەوتبوو، فەرمووی خۆزگە پیاوچاکێک لەهاوەڵانم ئەمشەو پاسەوانی دەکردم و منیش تۆزێک دەخەوتم.

ماکوان: ڕەوشەکە ئەوەندە ترسناک بوو؟

---

٣٩ ـ ( أَرْسَلَتْ قُرَيْش إِلَى ٱلْمُسْلِمِينَ تَقُولُ لَهُمْ : لَا يَغْرَنْكَمْ أَنَّكُمْ أَفْلِتُمُونَا إِلَى يَثْرِبَ ، سَنَأْتِيكُمْ فَنَسْتَأْصِلكُمْ وَنُبِيد خَضْرَاءَكَمْ فِي عُقْرِ دَارِكُمْ). روى البخاري ومسلم.



نومێر: بەڵی، پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوەندە ماندوو بووبوو بەدوای پاسەوان دەگەڕا تا پاسەوانی بکەن، تا پێغەمبەری خوا ﷺ گوێی لە تەقە و خشەی شمشێر دەبێت لە دەرەوەی ماڵەکەی، پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێت کێیت زەلام؟!

لەوەڵامدا: سەعدی کوڕی أبی وەقاص[٣٠] پورزای پێغەمبەر بوو فەرمووی؛ من سەعدم ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ!

پێغەمبەر فەرمووی بەمشەوە چی دەکەیت لەم ناوە؟!

سەعد: فەرمووی کەوتە دڵم ئەم شەو پاسەوانیت بکەم و هەستم کرد هەڕەشەت لەسەر بێت، ئینجا پێغەمبەر ﷺ زۆر خۆشحاڵ بوو، دوعای کرد بۆ سەعد و ئەو شەوە بە ئارامی خەوت.[٣١]

لە شاری مەدینەدا ئەوە حاڵ و گوزەرانی موسڵمانان بوو، ئەم دیاردەیە یەک شەو و چەند شەو نەبوو، بەڵکو ماوەی مانگێک زیاتر پێغەمبەری خوا ﷺ ئاوا بە شەودا ئێشکگربووە، هەمیشە یان خۆی یان پاسەوانی هەبووە، تا ئەو کاتەی خوای گەورە، ئاگاداری کردووە کە چیتر پێوست بە پاسەوان ناکات، خوای پەروەردگار ئەتانپارێزێت، سورەتی المائدة ئایەتی ٦٧:

﴿۞ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلرَّسُولُ بَلِّغْ مَآ أُنزِلَ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ ۖ وَإِن لَّمْ تَفْعَلْ فَمَا بَلَّغْتَ رِسَالَتَهُۥ ۚ وَٱللَّهُ يَعْصِمُكَ مِنَ ٱلنَّاسِ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلْكَـٰفِرِينَ ﴿٦٧﴾﴾

واتە: ئەی پێغمبەر ﷺ و فرستادە، هەرچی فەرمان و پەیامێکت بۆ دابەزیووە لەلایەن پەروەردگارتەوە (بێ دوودڵی و بێ ماتڵی) ڕایبگەیەنە، خۆ ئەگەر بەو کارە هەڵنەسایت ئەوە مانای وایە پەیامەکەت (بەتەواوی) نەگەیاندووە (دڵنیاش بە کە) خوا دەتپارێزێت لە شەڕو خراپەی خەڵکی، چونکە بەڕاستی خوا هیدایەت و ڕێنموونی قەومی بێباوەڕان نادات.

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

٣٠ ـ سعد بن أبي وقاص.

٣١ ـ أَنَّ رَسُولَ اَللَّهِ صَلَّى اَللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ سَهِرَ ذَاتَ لَيْلَةٍ وَهِيَ إِلَى جَنْبِهِ قَالَتْ : فَقُلْتُ : مَا شَأْنُكَ يَا رَسُولُ اَللَّهِ ؟ قَالَ : ( لَيْتَ رَجُلاً صَالِحًا مِنْ أَصْحَابِي يَحْرُسُنِي اَللَّيْلَةَ ) قَالَتْ : فَبَيْنَا نَحْنُ كَذَلِكَ إِذْ سُمِعَتْ صَوْتَ اَلسِّلَاحِ فَقَالَ رَسُولُ اَللَّهِ صَلَّى اَللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ : ( مِنْ هَذَا ) ؟ قَالَ : سَعْدُ بْنُ مَالِكٍ قَالَ : ( مَا جَاءَ بِكَ ) ؟ قَالَ : جِئْتُ لِأَحْرُسُكَ يَا رَسُولُ اَللَّهِ قَالَ : فَسَمِعَتْ غُطَيْطَ رَسُولُ اَللَّهِ صَلَّى اَللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي نَوْمِهِ صحيح البخاري.



که ئەو ئایەته هاته خوارەوه پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ لەسەر دیوار و بنمیچی ماڵەکەیەوە سەری دەرهێنا و به پاسەوانەکانی فەرموو: هەموو بگەڕێنەوه ماڵەوه خوای گەوره دەمپارێزێت.[٣٢]

ماکوان: واتا لەو کاتەوه پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ پاسەوانی نەما؟!

نومێر: بەڵێ لەو کاتەوه تا وەفاتی کرد پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ پاسەوانی نەبوو.

ماکوان: ئەوه بەڕاستی لێکۆڵینەوەی دەوێت، موعجیزەیەکی زۆر گەورەیه لەو حاڵ و گوزەرانەدا داوا بکات که پاسەوانم ناوێت، چونکه دڵنیامان دەکاتەوه که هیچی لێنایەت، لەبەر ئەوەی پەیامەکه تەواو نەبووه، بەڵام دڵنیام ئەوه تایبەت بووه به پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ وایه؟!

نومێر: بەڵی، بەدڵنیاییەوه تایبەته به پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ، قیاداتی ئیسلامی پێویسته خۆیان بپارێزن و پاسەوان و ئێشگریان هەبێت.

چونکه ئەو هەڕەشه و چاو سوورکردنەوەی قوڕەیش تەنها بۆ پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ نەبوو، بەڵکو بۆ هەموو هاوەڵان و ئیمانداران بوو بەگشتی تایبەت بۆ سەرکردەکانی دەوری پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ.

ئەوەمان لەبیر نەچێت قوڕەیش بڕیاری دا هەرکەس ئەبوبەکر بگرێت بەزیندوویی و به مردوویی (١٠٠) وشتر خەڵاتی ئەدرێتی، هەموو قیاداتی دەوروپشتی پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ هەموو لەیەک ئاستدا تەماشا دەکرا و هەموو داوا کراو بوون به مردوویی یان به زیندوویی.

ماکوان: ڕاسته له کتێبەکەدا خوێندمەوه ئوبەی کوڕی کەعب[٣٣] -ڕەزامەندی خوای لەسەر بێت- دەفەرمووێت: کاتێک پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ هاته شاری مەدینه و ئەنسار بوونه پشتیوان، پێشەوایانی قوڕەیش هەموویانی خسته ناو کەوانەیەکەوه، ئەوانیش شەو و ڕۆژ به چەکەوه دەگەڕان و هەمیشه خۆیان پڕ چەک کردبوو به شەو و ڕۆژ له ئامادە باشیدابوون،

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

٣٢ ـ عن عائشة قالت كان النبي صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ قَوْلِهِ تَعَالَى: (والله يعصمك من الناس) لِأَنَّهُ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ تَرَكَ الِاحْتِرَاسَ حِينَ نَزَلَتْ هَذِهِ الْآيَةُ، وَأَمَرَ أَصْحَابَهُ بِالِانْصِرَافِ عَنْ حِرَاسَتِهِ.

٣٣ ـ أبى بن كعب.



چونکە لەناوبردن و تیرۆرکردنی قیاداتی ئیسلامی ئامانجی بێباوەڕانە لەهەموو سەردەم و کاتێکدا. [٣٤]

نومێر: بەڵێ ڕاستت فەرموو، ئەوە جەنگی نەفسی بوو قورەیش لەگەڵ موسڵمانان کردی، بەڵام سەرکەوتوو نەبوو بەڵکو گوڕوتین و چالاکی دایە ئیمانداران و زیاتر لەمە ڕیزەکانیان بەهێزکرد و ڕووبەڕووی دوژمن وەستانەوە، ئەزموونیان زیادی کرد.

ماکوان: بەوەندە دەستیان هەڵگرت؟!

نومێر: نا، بەڵکو جەنگێکی تریان دەست پێ کرد.

ماکوان: چی بوو؟

نومێر: جەنگی دابڕاندنی پەیوەندی و دبلۆماسییەت.

---

٣٥ ـ (لِمَا قَدَّمَ رَسُولُ اَللَّهِ صَلَّى اَللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ وَأَصْحَابُهُ اَلْمَدِينَةَ وَآوَتْهُمْ اَلْأَنْصَارُ ، رُمَّتُهُمْ اَلْعَرَبَ عَنْ قَوْسٍ وَاحِدَةٍ كَانُوا لَا يَبِيتُونَ إِلَّا بِالسِّلَاحِ وَلَا يُصْبِحُونَ إِلَّا فِيهِ).



## جەنگی دابڕینی پەیوەندییە دیبلۆماسیەکان

نومێر: لە ڕابردوودا قوڕەیش شانازی و فەخری بەوەوە دەکرد هیچ هۆز و عەشیرەتێک خاوەنی ئەو ئیمتیازە نییە، تەنها و تەنها قوڕەیش خاوەنیەتی، ئەویش بریتی بوو لە ئاودان بە حاجییەکان، ئاوەدان کردنەوەی ماڵی خوا و پاک ڕاگرتن و خزمەتی حاجییەکان، هەموو عەرەب و قوڕەیش بەو یاسایە ڕازی بوون هەرکەس چووە ناو کەعبە ئەوا ئەمن و ئاسایشی پارێزراوە، بەڵکو ڕێز لێگیراویشە و دەبێت خزمەت بکرێت، هەموو عورف و عادات و یاساکانی نیوەدوورگەی عەرەب بەمە ڕازیی بوون و ڕێزی ئەم یاسایەیان دەگرت و خودی قوڕەیش دایمەزراندبوو!

بەڵام لە دژی موسڵمانان هەموو یاسا و عورف و عادات و وەفا و پیاوەتییان لەدەست دا، بەڵکو بڕیاریان دا خەڵکی شاری مەدینە بۆی نییە بڕوا بۆ حەج و کەعبە، سەردانی ماڵی خوا بکات!

ماکوان: بڕوا بکە لەم سەردەمەدا هەروایە عورف و یاسا و باسەکانی مافی مرۆڤ و پیاوەتی و شەرەف و کەرامەت، هەموو لە ئاستی موسڵمان و ئیمانداران دەوەستێت، مافی مرۆڤ ئەوکات دەبێتە یەک تاکە پێڵاو بە قاچی طاغوت و ملهووڕەکان، ئەشکەنجە و ئازاری موسڵمانانی پێئەدەن.

وشەی ئازادی و ماف و ئەرک و دیموکراسی و لیبراڵ... هتد.

هەموو وتەی بێ مانا و قسەی باقوبریق.

کوا مافی مرۆڤ لەبەرامبەر (محمد مورسی) میسر لە زیندان کوشتیان، کوا دیموکراسی کاتێک بەدەنگی خەڵکی هاتە سەر حوکم؟!

کوا مافی ئەو هەموو مافخوراوانەی یەمەن و سووریا و کوردستان و شیشان و فەڵەستین و تورکستان... هتد.

بڕوا بکە تەنها و تەنها دەسەڵات بڕیار ئەدات نەک ماف و دیموکراسی قسە قۆڕەکانی ڕۆژئاوا و ڕۆژهەڵات... هتد.



نومێر: بەڵێ، ڕاستە دەزانم ماکوان توڕەیت، بەڵام بگەڕێرەوە بۆ ئەم ژیانەی تێیدا دەژین، پرۆژەکەی من و تۆ زۆر گەورەیە با پێکەوە خەریکی کاری خۆمان بین و پرۆژەکە تەواو بکەین کارمان زۆرە.

ماکوان: بەڵێ باشە، پرۆژەکەمان بۆ ئەوەیە خەڵکی ئاگادار بن لە کۆن و نوێدا دوژمن هەمان فاکتەر بەکار دەهێنێتەوە.

نومێر: بەڵێ، بەدڵنیاییەوە مەبەستم ئەوەیە زیاتر لە باسی خۆمان دەرنەچین، خۆ ئەگەر پێویستی کرد ئەوەی ڕاستی و حەقە دەیڵێین و باسی دەکەین.

ماکوان: زۆر باشە چی ڕوویداوە لە ڕووداوەکانی دابڕاندنی پەیوەندییە دیبلۆماسییەکانی قوڕەیش دژی شاری مەدینە؟!

نومێر: قوڕەیش هەموو عورف و عادات و کلتوری عەشایەری لە بیرکرد و قەدەغەی کرد خەڵکی شاری مەدینە بڕۆنە مەککە، بەتایبەت بۆ حەج، جا ڕووداوێکی سەیر ڕوویدا سەعدی کوڕی موعاز[35] گەورە پیاوی ئەوس بوو سەرکردەی ناسراوی شاری مەدینە بوو، یەکێک بوو لە پیاوە ناودار و ئازا و دەوڵەمەند و سەرکردەکانی عەرەب دەچێتە شاری مەککە، بەڵام بە بڕیارەکەی نەزانیووە. دیارە بڕیارەکەیان دەرکردووە سەعد بەڕێگاوە بووە بۆ شاری مەککەی پیرۆز، بەهەرحاڵ سەعد و ئومەییەی کوڕی خەڵەف[36] هاوڕێی یەکن، هەردوولا بڕۆیشتنایەتە مەککە یان مەدینە لای یەکتر دەمانەوە، سەعد بڕیاری دابوو بڕوات بۆ عومرە، لای هاوڕێکەی دابەزی ئومەیەیەی کوڕی خەڵەف، تاڕادەیەک کاروانی بازرگانی قوڕەیش سەعد دەیپاراست لە ڕێگای مەدینە بۆ شاری مەککە.

بە ئومەییەی وت هاتووم بۆ عومرە پێم بڵێ چ کاتێک کەعبە چۆڵە با طەواف بکەم و لە نیوەڕۆ دەستی کرد بە طەواف لە دەوری کەعبەدا، لەپڕ ئەبو جەهل دەرکەوت، گەیشت بە سەعد لەگەڵ ئومەییەی کوڕی خەلەف دابوو، ئەبو جەهل وتی: ئەی ئەبو سەفوان ئەمە کێیە لەگەڵتا، ئەو نیشانەی لووتبەرزی و خۆبەزلزانی بەسەر سەعدی کوڕی موعاز دا، ئەبو جەهل ویستی بچوکی بکاتەوە لە کاتێکدا دەیزانی گەورەی ئەوسە و قسە ڕۆیشتوشە لە ناو خەزرەجدا، ئومەییەش دەزانێت کێیە تەنها ئیشارەت بەناوەکەی دەکات و دەڵێت بۆ نازانیت ئەوە سەعدە؟

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

٣٥ ـ سعد بن معاذ

٣٦ ـ أمَيَّة بن خَلف.



ئینجا ئەبو جەهل جاهیلیەتی خۆی دەرخست و وتی: ئەبینم لە شاری مەککە بە ئارامی طەواف دەکەیت و دوژمنەکانی ئێمەشت داڵدەداوە و خزمەتیان دەکەیت و بەسەرماندا سەریان دەخەیت، بەڵام سوێند بەخوا ئەگەر لەگەڵ ئەبو سەفوان نەبوویتایە، نەمدەهێشت بەئاسانی بگەڕێیتەوە شاری مەدینە!

ئەگەر تەماشا بکەیت هەڕەشەکەی زۆر جددییە و ترسناکە، ئەوەندە داخ لە دڵە لەبیری چۆتەوە سەعد گەورەی ئەوس و خەزرەجە و دوو هۆزی گەورە لە پشتییەتی، بەڵام کۆنترۆڵ لەدەست دەدا و ئەو قسەیە بەرامبەر بە سەعد دەکات، وەکو خۆی مامەڵەی لەگەڵدا ناکات، بەڵام شتێکی چاوەڕوان نەکراو ڕوودەدات، سەعد زۆر بەتوڕەییەوە دەنگ بەرز دەکاتەوە دەڵێت: سوێند بەخوا تۆ نەهێڵیت و ڕێگر بیت لەبەرامبەر مندا زۆر خراپترت بەسەر دەهێنم ئەویش ڕێگای مەدینەت نامێنێت.

ماکوان: بەڕاستی سەربەرز و خاوەن عیزەت بوو، چۆن وەستاوە بەرامبەر فیرعەونی ئوممەت و قیادەی گومڕا، چونکە ئەگەر بەرامبەر لووتبەرز و خۆبەزلزان نەرمی بنوێنیت زیاتر لە خۆبایی و لووتبەرز دەبێت و خۆی تیادەچێت، بۆیە حەجمی خۆی دایەوە وەکو هەورە بروسکە توڕەبوویەوە و دەمار و مێشکی گرت و لە جێگای خۆیدا وەستاندی.[٣٧]

نومێر: بۆ هەڵوێستەکەی سەعد واقیعی بوو، وا بەدڵەوە باسی دەکەیت؟

ماکوان: بەڵێ بەدڵنیاییەوە زۆر واقیعی بوو لەسەرووی واقیعشەوە بوو، ئەگەر جوان وردبیتەوە وەڵامی هەڕەشەکەی داوە، لەبەرامبەردا هەڕەشەکەی زۆر واقیعی بوو، هەڕەشەی نەکرد بەوەی ئەبو جەهل دەکوژێت، یان شاری مەککە داگیر دەکات، یان نەیوت دێم و هەردوو چاوت دەرچێ و عومرەی خۆم دەکەم، ئەمانەی هیچی بەکار نەهێنا، بەڵکو هەڕەشەی بەوە لێ کرد لە توانایدا هەیە.

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

٣٧ ـ أنَّهُ سَمِعَ عَبْدَ اللَّهِ بنَ مَسْعُودٍ رَضِيَ اللَّهُ عنْه حَدَّثَ، عن سَعْدِ بنِ مُعَاذٍ أنَّه قَالَ: كانَ صَدِيقًا لِأُمَيَّةَ بنِ خَلَفٍ، وكانَ أُمَيَّةُ إذَا مَرَّ بالمَدِينَةِ نَزَلَ علَى سَعْدٍ، وكانَ سَعْدٌ إذَا مَرَّ بمَكَّةَ نَزَلَ علَى أُمَيَّةَ، فَلَمَّا قَدِمَ رَسولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ المَدِينَةَ انْطَلَقَ سَعْدٌ مُعْتَمِرًا، فَنَزَلَ علَى أُمَيَّةَ بمَكَّةَ، فَقَالَ لِأُمَيَّةَ: انْظُرْ لي سَاعَةَ خَلْوَةٍ لَعَلِّي أنْ أطُوفَ بالبَيْتِ، فَخَرَجَ به قَرِيبًا مِن نِصْفِ النَّهَارِ، فَلَقِيَهُما أبو جَهْلٍ، فَقَالَ: يا أبَا صَفْوَانَ، مَن هذا معك؟ فَقَالَ هذا سَعْدٌ، فَقَالَ له أبو جَهْلٍ: ألَا أرَاكَ تَطُوفُ بمَكَّةَ آمِنًا، وقدْ أوَيْتُمُ الصُّبَاةَ، وزَعَمْتُمْ أنَّكُمْ تَنْصُرُونَهُمْ وتُعِينُونَهُمْ، أما واللَّهِ لَوْلَا أنَّكَ مع أبِي صَفْوَانَ ما رَجَعْتَ إلى أهْلِكَ سَالِمًا، فَقَالَ له سَعْدٌ ورَفَعَ صَوْتَهُ عليه: أما واللَّهِ لَئِنْ مَنَعْتَنِي هذا لَأَمْنَعَنَّكَ ما هو أشَدُّ عَلَيْكَ منه، طَرِيقَكَ علَى المَدِينَةِ الراوي: عمرو بن ميمون، المحدث: البخاري، المصدر: صحيح البخاري.



سەعد وەکو ئەبو جەهل کۆنترۆڵی لەدەست نەدا، بەڵکو قسەکانی جەرگبڕ و جێگای ئیعتباری خۆی هەبوو، ئەبو جەهلی بێدەنگ کرد، ئەوەی کە هێزی ئەوە و لەو جێگایەدا بەکاری هێنا زانی دوژمنەکەی بەچی لاواز دەکات، بەرژەوەندی شاری مەککەشی دەزانی، زانی پشت بە چ فاکتەرێکی سیاسی دەبەستێت هەڵوێستەکەی زۆر پیاوانە بوو، تەنها ئیماندار دەتوانێت بەو شێوەیە بدوێت لە بەرامبەر ملهوڕاندا، کە ڕێگای بازرگانی لە مەدینەوە نامێنێت.

نومێر: باشە با من پرسیارێکت لێ بکەم، ئەمەوێت بەو زانستی فیقهی واقیعە بۆم شی بکەیتەوە؟!

ماکوان: فەرموو..

نومێر: سەعد زۆر بەتوڕەیەوە وەڵامی ئەبوجەهل-ی دایەوە لە کاتێکدا پێغەمبەری خوا ﷺ لە مەدینە زۆر بەهێمنی و ئارامییەوە وەڵامی سەرکردەی موشریکەکانی دایەوە کە عەبدوڵڵای کوڕی ئەبی سەلول بوو، لە کاتێکدا قسەی ناشرینی بەرامبەر بە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد.

ماکوان: وەڵامەکەی زۆر ئاسانە فیقهی واقیع کار لەسەر کات و زەمەن و گۆڕانکارییەکان دەکات، لەبەر ئەوەی جێگاکە جیاواز بوو هەروەها زەمەن و کاتەکە جیاوازبوو، کەسایەتییەکانیش جیاواز بوو لە ڕووی گفتوگۆ و ڕووبەڕوبوونەوە، پێغەمبەر ﷺ گفتوگۆ لەگەڵ سەرکردەی موشریک دەکات، هیچ کات لە بەردەم بانگەوازی ئیسلام و موسڵماناندا نەوەستاوەتەوە، بەلانی کەمەوە بەئاشکرا ڕێگرییان نەکردووە وەکو ئەوەی قوڕەیش کردی، بەڵکو ژمارەیەکی زۆر لە شاری مەدینە موسڵمان بوون، عەبدوڵڵا کوڕی ئەبی سەلول هەموو دوو مانگ یان سێ مانگ باسی ئیسلامی بیستووە تێکەڵاوی موسڵمانان نەبووە، بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ هیوای ئەوەی پێ هەبوو کە موسڵمان ببێت!

نومێر: بەڕاستی زانستی فیقهی واقیع جیهانبینی و فیکری فراوان ئەداتە خاوەنەکەی قسەکانت و شیکاریەکەت زۆر ڕاستە و واقیعییە!

چونکە خەڵکی مەدینە بە سروشتی خۆیان هێمن و لەسەرخۆن و زۆربەیان مەیلیان بۆ ئیسلام و موسڵمانان هەیە، جا پێغەمبەر ﷺ زۆر واقیعی بوو دەیزانی خەڵکی شاری مەدینە موسڵمان دەبن و ئەو تەنها لە شاری مەدینە کاری لەسەر دڵ و و ئەقڵی خەڵکەکە دەکرد بە قورئان و وەحی، قسەی شیرین و هێمن و لەسەر خۆی لەگەڵ ئەو کۆمەڵگەیەدا دەکرد.



هەڵوێستی سەعدی کوڕی موعاز -ڕەزامەندی خوای لەسەر بێت- بەڕاستی لەو جێگایەدا جیاواز بوو چونکە هەڵوێستەکەی لە بەرامبەر گەورەترین تاوانباری قوڕەیشدا بوو، بەڵکو دەتوانیت بڵێیت لەگەڵ خراپترین و خراپەکان بوو، باسەکە وەکو فەرمووت پێغەمبەری خوا ﷺ ناوی ناوە بە فیرعەونی ئوممەتەکەی، گرنگە ترس و بیم و دڵەڕاوکێی بخاتە دڵی ئەبوجەهل، تووشی هستریا و لەدەستدانی پارسەنگی بکات، بەڵکو کارێکی شەریعەت و لەمانجێکی ستراتیژی موسڵمانە لەسەر قسەکەی تۆ، ئەبو جەهل هەرگیز موسڵمان نابێت و هیچ هیوایەک نەماوە بۆ موسڵمان بوونی، چونکە پێغەمبەر ﷺ دوعای لێکرد و فەرمووی: خوایە لەناوی بەریت (اللهم عليك بأبي جهل) جا بۆیە، سەعد هیوای بە موسڵمانبوونی ئەبو جەهل نییە لە دوور و نزیک.

وەستانەوەی لەبەرامبەر ئەبو جەهلدا تۆمارکردنی خاڵێکی گرنگە بۆ موسڵمانان جا ئەو هەڵوێستە بەتەنها ترسێک نەبوو بۆ ئەبو جەهل، بەڵکو بۆ گشت سەرکردەکانی قوڕەیش بوو سەعدی کوڕی موعاز واتا هەموو ئەنسار بەگشتی.

چونکە قوڕەیش دەیزانی ئەنسار خاوەنی وەعد و پەیمانی خۆیانن، ئەوەی کە پەیمانە و داویانەتە پێغەمبەری خوا ﷺ دەیبەنە سەر، پەیماننامە و هەموو وتەکانیان کە لە پەیمانەکانی عەقەبەدا دابوویان خاڵ بەخاڵی جێبەجێ دەکەن، بەگیان و ماڵ و سامانیان بەرگری لە پێغەمبەری خوا ﷺ و ئیسلام و موسڵمانان دەکەن.

بەڵێ بەڕاستی قسەکەت تەواوە هەردوو هەڵوێستەکە جیاوازن، هەڵوێستی پێغەمبەر ﷺ لەبەرامبەر عەبدوڵلای کوڕی ئەبی سەلول و هەڵوێستی سەعدی کوڕی موعاز لەبەرامبەر ئەبو جەهلدا، هەردووکیان ڕاست و دروست و حەکیمانە بووە، پێویستە بار و زرووفی هەردوولا بزانین و بزانین چ وانەیەکی لێوە فێردەبین، ئەوەی لە ژیانی پێغەمبەری خوا ﷺ فێر دەبین، بە پارە و سەروەت و سامان نانرخێنرێت، بڕوا بکە نرخی یەکجار گرانە ئامۆژگاری هەڵسوکەوتی یەکجار گران و سەنگینە و ئەوەی بتەوێت لە ژیاندا تێیدایە و لێوەی فێردەبیت.

ماکوان: ڕاستە، باشە بینیمان پێغەمبەر ﷺ چۆن مامەڵەی لەگەڵ موشریکەکانی شاری مەدینە کرد و جەنگی دەروونییانی بینی دژی موسڵمان، هەڕەشە و گوڕەشەی قوڕەیش بۆ مەدینە، دابڕانی پەیوەندی دبلۆماسی لەگەڵ مەدینەدا، هەروەها بینیمان چۆن مامەڵەیان لەگەڵ گەورەی ئیسلامدا کرد سەعدی کوڕی موعاز.



هەڵوێستی سەعدی کوڕی موعاز -ڕەزامەندی خوای لەسەر بێت- بەڕاستی لەو جێگایەدا جیاواز بوو چونکە هەڵوێستەکەی لە بەرامبەر گەورەترین تاوانباری قوڕەیشدا بوو، بەڵکو دەتوانیت بڵێیت لەگەڵ خراپترین و خراپەکان بوو، باسەکە وەکو فەرمووت پێغەمبەری خوا ﷺ ناوی ناوە بە فیرعەونی ئوممەتەکەی، گرنگە ترس و بیم و دڵەڕاوکێی بخاتە دڵی ئەبوجەهل، تووشی هستریا و لەدەستدانی پارسەنگی بکات، بەڵکو کارێکی شەریعەت و ئەنجێکی ستراتیژی موسڵمانە لەسەر قسەکەی تۆ، ئەبو جەهل هەرگیز موسڵمان نابێت و هیچ هیوایەک نەماوە بۆ موسڵمان بوونی، چونکە پێغەمبەر ﷺ دوعای لێکرد و فەرمووی: خوایە لەناوی بەریت (اللهم عليك بأبي جهل) جا بۆیە، سەعد هیوای بە موسڵمانبوونی ئەبو جەهل نییە لە دوور و نزیک.

وەستانەوەی لەبەرامبەر ئەبو جەهلدا تۆمارکردنی خاڵێکی گرنگە بۆ موسڵمانان جا ئەو هەڵوێستە بەتەنها ترسێک نەبوو بۆ ئەبو جەهل، بەڵکو بۆ گشت سەرکردەکانی قوڕەیش بوو سەعدی کوڕی موعاز واتا هەموو ئەنسار بەگشتی.

چونکە قوڕەیش دەیزانی ئەنسار خاوەنی وەعد و پەیمانی خۆیانن، ئەوەی کە پەیمانە و داویانەتە پێغەمبەری خوا ﷺ دەیبەنە سەر، پەیماننامە و هەموو وتەکانیان کە لە پەیمانەکانی عەقەبەدا دابوویان خاڵ بەخاڵی جێبەجێ دەکەن، بەگیان و ماڵ و سامانیان بەرگری لە پێغەمبەری خوا ﷺ و ئیسلام و موسڵمانان دەکەن.

بەڵێ بەڕاستی قسەکەت تەواوە هەردوو هەڵوێستەکە جیاوازن، هەڵوێستی پێغەمبەر ﷺ لەبەرامبەر عەبدوڵڵای کوڕی ئەبی سەلول و هەڵوێستی سەعدی کوڕی موعاز لەبەرامبەر ئەبو جەهلدا، هەردووکیان ڕاست و دروست و حەکیمانە بووە، پێویستە بار و زرووفی هەردوولا بزانین و بزانین چ وانەیەکی لێوە فێردەبین، ئەوەی لە ژیانی پێغەمبەری خوا ﷺ فێر دەبین، بە پارە و سەروەت و سامان نانرخێنرێت، بڕوا بکە نرخی یەکجار گرانە ئامۆژگاری هەڵسوکەوتی یەکجار گران و سەنگینە و ئەوەی بتەوێت لە ژیاندا تێیدایە و لێوەی فێردەبیت.

ماکوان: ڕاستە، باشە بینیمان پێغەمبەر ﷺ چۆن مامەڵەی لەگەڵ موشریکەکانی شاری مەدینە کرد و جەنگی دەروونییانی بینی دژی موسڵمان، هەڕەشە و گوڕەشەی قوڕەیش بۆ مەدینە، دابڕانی پەیوەندی دبلۆماسی لەگەڵ مەدینەدا، هەروەها بینیمان چۆن مامەڵەیان لەگەڵ گەورەی ئیسلامدا کرد سەعدی کوڕی موعاز.



هەروەکو چۆن بینیمان گۆڕانکارییان بەسەر یاسا و عورف و عادات و کلتوری خۆیان هێنا دژی موسڵمانان و گوێیان بەهیچ پەیمان و پەیماننامەیەک نەدا چ زوڵمێک کرا لە موسڵمانان، قورەیش بەمە وازی هێنا؟!

نومێر: نەخێر، وازی نەهێنا بەڵکو ڕێگایەکی نوێی گرتە بەر ئەویش ئابلوقەی ئابووری بوو بۆ شاری مەدینە.[38]

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

٣٩ ـ سەعدی کوڕی موعاز هاوەڵێکی بەڕێزی پێغەمبەرە صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ، ناوی تەواوی سەعدی کوڕی موعاز کوڕی نیعمان کوڕی ئەمرئی قەیس کوڕی زەید کوڕی عەبدولئەشهەل، سەرۆکی هۆزی ئەوس بووە پێش کۆچکردنی پێغەمبەر صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ بۆ مەدینە، بە ئەبی عەمر ناودەبرێت، لە سەر دەستی موصحەبی کوڕی عومەیر -ڕەزامەندی خوای لەسەر بیت-موسوڵمان بووە. سەعدی کوڕی موعاز خاوەنی چەندین سیفەتی جوان و گەورە بوو لە هەڵوێستە ئازایەتیەکانی لەگەڵ پێغەمبەر صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ دەرکەتووە، هەندێک لە سیفەتەکانی سەعدی کوڕی موعاز .

* خستنە پێشی خۆشەویستی خودا و خۆشەویستی پێغەمبەرەکەی پێش هەر خۆشەویستیەکی تر.

* ورەیەکی بەرز لە بڵاوکردنەوە و بانگەشەکردن بۆ ئاینی ئیسلام.

* بێبەریبوون لە دوژمنانی خودای گەورە.

* هەوڵدان و تێکۆشان بۆ خزمەتکردنی ئایین.

* شانازیکردن بە حەق و بەکارهێنانی هێز تیایدا سەرەڕای ئەوەی کە ماوەی مسوڵمانبوونی سەعدی کوڕی موعاز حەوت ساڵی تێپەڕ نەکرد، بەڵام کاریگەرییەکی گەورەی بەجێهێشت و گەورەییەکی لە لایەن خودای گەورەوە پێدرا کە پێغەمبەر صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ پێی ڕاگەیاند بوو، سەعدی کوڕی موعاز پیاوێکی گۆشتن بوو، بەڵام لە ڕۆژی مردنی کە مسوڵمانان لاشەکەیان هەڵگرت کێشی کەم بوو و زۆر سەرسام بوون بەمە، بۆیە پێغەمبەر صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ وەڵامی دانەوە و گوتی کە فریشتەکان لەگەڵیان لاشەکەیان هەڵگرتووە وەک ڕێزگرتنێک بۆی، جارێکیان پارچە قوماشێکی ئاوریشم (حەریر) نێررابوو بۆ پێغەمبەر و هاوەڵەکانی لە جوانییەکەی سەرسام بوو بوون ، پێغەمبەر فەرمووی دەستەسڕەکانی سەعدی کوڕی موعاز لە بەهەشت دا لە حەریر نەرمتر و ناسکترە.



## ئابلوقەی ئابووری شاری مەدینە

نومێر: قورەیش بەو هەموو دەستدرێژی و هەڕەشە و چاو سوورکردنەوە نەوەستا، بەڵکو بەردەوام بوو لە پیلان دژی پێغەمبەری خوا ﷺ، هەڵسان بە پیادەکردنی پیلانی نوێ بۆ ئەوەی زیاتر موسڵمان نارەحەت بکەن و کێشەیان بۆ دروست بکەن، ئەوەش بە ئابلوقەی ئابووری لە ڕێگای گەل و هۆز و نەتەوەکانی چواردەوری مەدینە و شاری مەدینە، بەتایبەتی لەگەڵ یەهوودا بەهیچ جۆرێک مامەڵە لەگەڵ موسڵماندا نەکەن، قورەیش پەیوەندی و پارە و سەروەت و سامانی خۆی بەکار هێنا لەگەڵ عەرەبەکانی چواردەوری مەدینە بۆ ئەوەی گەمارۆی ئابووری و پەیوەندی لەگەڵ موسڵماناندا نەکەن، زیاتر کێشە و گیروگرفت لە شاری مەدینەدا بۆ موسڵمانان دروست بکەن، بەڵام لەگەڵ ئەو هەموو هەوڵ و کۆشش و بەفیڕۆدانی پارە و کات و سەروەت و سامانی قورەیش هیچ کاریگەرییەکی ئەوتۆی لەسەر شاری مەدینە دانەنا!

ماکوان: چۆن؟ بۆچی؟

نومێر: لە یەکەم ڕۆژەوە پێغەمبەر ﷺ هاتە شاری مەدینە، ئەوەی لەبەرچاوگرتبوو کە دوژمنەکانی گەمارۆ و ئابلووقەی ئابووری دەخەنە سەر موسڵمانان و شاری مەدینە بەتایبەتی، بەڵکو پێغەمبەری خوا ﷺ پلانێکی داڕشت لەوپەڕی گرنگی و حیکمەت و جوانی دابوو.

ماکوان: پێغەمبەری خوا ﷺ چی کرد؟ شتی زیاترم بدەرێ نومێر!

نومێر: پێغەمبەری خوا ﷺ هاتە مەدینە، پلانی جەنابیان دامەزراندنی ئوممەت و ژیار و دەوڵەت بوو، بونیادی ئەمانەی دەکرد، چونکە نەیدەویست قورسایی بخاتە سەر شانی موسڵمانان و خەڵکەکە بەگشتی، نەیدەویست ئابووری ئیسلامی لەسەر خەڵک بونیاد بنێت و بینای بکات، چونکە ئەگەر وا بوایە ئابوورییەکی فەشەل و بێبنەمای دەبوو، جا چی دەڵێیت ئەگەر ئابوورییەکە لەسەر دەستی یەهوود و بازاڕی یەهوودییەکاندا بووایە، وتمان ئابووری و خەڵکی شاری مەدینە هەژار بوون هۆکارەکەی ئەوە بوو هەموو بازاڕ و کڕین و فرۆشتن لەدەستی یەهوودییەکاندا بوو، بازاڕی سەرەکی شاری مەدینە لەدەستی یەهوودی بەنی (قەینووقاع)دا بووە تەنانەت گەورە و بازرگانەکانی ئەنسار هەر لەو بازاڕەدا مامەڵەیان دەکرد، واتا هەموو بازاڕی مەدینە یەهوود مۆنۆپۆلی کردبوو لەدەستی ئەواندا (قۆرخ) کرابوو.



لە هەمووی ترسناکتر پارە بوو لەدەستی یەهوود دا بوو، ئەوان خاوەن بڕیار بوون، هەموو خەڵکی شاری مەدینە ئاویان لە بیرەکانی یەهوود دەکڕی، تەنانەت ئاوی خواردنەوەش قۆرخ کرابوو لەدەستی یەهوودەکاندا بوو.

بەناوبانگترین بیری شاری مەدینە ناوی بیری (ڕووما) بوو.

بیر لەوە بکەرەوە ئەگەر یەهوود و قورەیش ببنە هاوپەیمان چی ڕوودەدات؟

یاخود یەهوود بڵێت بە هیچ جۆرێک مامەڵەی بازرگانی لەگەڵ موسڵمان ناکەم، داخۆ موسڵمانان گوزەرانیان چۆن دەبێت؟!

یان ئەگەر بە موسڵمانانیان وت ئیتر ئاوتان پێ نافرۆشین؟

ئەم هەڵوێستانە زۆر کارا بوون بۆ ئەوەی بیگرێتە بەر دژی موسڵمانان، جا پلانی پێغەمبەری خوا ﷺ بەوەحی ئاڕاستە کراوە، لەسەرەتای هاتنی بۆ شاری مەدینە بیری لەوە کردبووەوە کە چۆن ڕزگاری بێت لەو تەنگەژانە، بۆ خەڵکی ئەو سەردەمە و هەموو سەردەمەکان ئەو پلانانەی پێغەمبەر ﷺ دەبێتە یاسا و ڕێساو تەشریعی ئیسلامی بۆ ئوممەتەکەی.

هەرچەندە لە ڕووی فیقهی و بنەماکانی شەریعەت باسی بکەین کاتێکی زۆرمان پێویستە بۆ باسکردنی لێکۆڵینەوەکەی، بەڵام ئەوەی گرنگە لێرەدا باسی دەکەین و هیوادارم ماکوان تۆش بەزانستی فیقهی واقیعەکەی خۆت شیکارییەکی گرنگم بدەیتێ؟

ماکوان: بە پشتیوانی خوا تۆ جارێ باسەکەم بۆ تەواو بکە.

نومێر: یەکەم پێغەمبەر ﷺ جەختی لەسەر ئەوە دەکردەوە ئاوی سەربەخۆ بۆ موسڵمانان دەستەبەر بکات، خۆیان خاوەنی ئاوی خۆیان بن و موڵکی موسڵمانان بێت، چونکە بۆ دامەزراندنی دەوڵەت ئاو ستراتیجییەکی گرنگە، هیچ دەوڵەتێک دانامەزرێت ئەگەر ئاو نەبێت.

هەر لەبەر ئەوەیە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی کێ دەتوانێت ئاوی بیری ڕووما بکڕێت خوای گەورە لێی خۆشدەبێت.

وەکو وتم ئەو بیرە یەهوود خاوەنی موڵکی بوو.

عوسمانی کوڕی عەففان کە گوێی لە هەواڵەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ بوو چوو بیرەکەی لە یەهوودییەکە کڕی و هاتەوە خزمەت پێغەمبەر ﷺ فەرمووی



بیره ئاوەکەم کڕیووە، فەرمووی ئەبەخشیت بە موسڵمانان، ئەجر و پاداشت وەربگریت، فەرمووی بەڵی یا رسول الله.[٣٩]

ماکوان: بەڵێ، بەڕاستی عوسمانی کوڕی عەفان -ڕەزامەندی خوای لەسەر بێت- بازرگان و ئابووریناسی دەوڵەتی پێغەمبەری خوا ﷺ بوو، تەماشاکە چۆن هەستی بەرپرسیاریەتی جوڵا و خێرا چوو ئەو بیره ئاوەی کڕی، چونکە زانی و تێگەیشت کە سوودی هەیە بۆ موسڵمانان و دەوڵەتەکەیان، خۆ ئەو بازرگان بوو دەیتوانی پارە و سەروەت و سامانی لە کەمالیات و ڕەفاهیەت و خۆشی و ڕابواردن بەکار بهێنێت، بەڵام بیری لای قیامەت و هەستی بەرپرسیاریەتی بەرامبەر بە ئایین و پرنسیپ و خەڵکەکەی دەجووڵێت و بە ئاراستەی پێغەمبەری خوا ﷺ کاردەکات، دەزانێت پارە و سەروەتی لەچ بازرگانییەکی ستراتیجی بەکار دەهێنێت، لەو کاتەدا ئاو بۆ حکومەتی پێغەمبەر ﷺ زۆر گرنگ بووە، دەشێت وەکو کارە ستراتیجییەکانی دەوڵەتی ئێستا وابوو بێت، وەکو نەوت و غاز و گەنم و لۆکە و وزەی نەووی یان ئەتۆمی، بەگوێرەی واقیعەکە دەگۆڕێت.

نومێر: چیتر زیاتر قسەم بۆ بکە؟

ماکوان: ئاماژەیە لە هەمانکاتدا بۆ پەروەردەکردنی ڕەسەن، تەماشای هەڵوێستەکەی بکە، دەوری پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ پەروەردەکردنی هاوەڵان لەسەر ئیمان و بنەمای بونیادنانی ئوممەت، لەو کاتەدا پێغەمبەر ﷺ هیچ شتێکی دونیایی شک نابات بە قیامەت بیری دەخاتەوە پاداشتی قیامەت دەخاتە بەرچاوی، ئەویش قۆرخی بیرەکە ناکات و بڵێت پارەم لێ دەست دەکەوێت، بەڵکو هەموو بیرەکە بەخۆڕایی دەبەخشن بە موسڵمانان، چونکە ئەو قسەکەی پێغەمبەری ﷺ لەبەر چاودایە لە مێشکیدا خول دەخواتەوە، ئەوەی بیری ڕومە بکڕێت خوا لێی خۆش دەبێت و دەچێتە بەهەشت، بۆیە بەهەزاران درهەمی دایە خاوەنی بیرەکە تا نیوەی لێبکڕێت و ڕۆژەکان دابەشکرا بۆ فرۆشتنی ئاو، لەڕۆژی عوسماندا ئاو بۆ فرۆشتن نەبوو بەڵکو بەخۆڕایی بوو، تا ناچار کابرای یەهوودی نیوەکەی تری هەرزان فرۆش کرد بە عوسمان.

بۆیە گرنگە پێش دامەزراندنی هەرکارێک موسڵمان پڕبکرێت لە خواناسی و قیامەت، چونکە دامەزراندنی دەوڵەت و شارستانییەت و بیناکردنی ئوممەت لەخۆیەوە نایەت، بەڵکو لەسەر شانی موسڵمانان دروست دەبێت و ئەوان کۆڵە قورسەکە هەڵدەگرن، تا نەوەکانیان

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

٣٩ ـ (قالَ: مَن يَبتاعُ بئرَ رومةَ غفرَ اللَّهُ لَهُ؟ فابتعتُهُ بِكَذا وَكَذا، فأتيتُ رسولَ اللَّهِ فقُلتُ: قد ابتعتُها بِكَذا وَكَذا، قالَ: اجعَلها سقايةً للمسلمينَ وأجرُها لَكَ، قالوا: اللَّهمَّ نعَم) رواه النسائي.



یەک لە دوای یەک بیپارێزرێن، چونکە بونیادی دەوڵەت و حکومەت ناکرێت هەتا وەکو خەڵکەکەی بڕوایان بەدەوڵەتەکەی نەبێت، حکومەت و دەوڵەت دانامەزرێت و خەڵکی لەدەور کۆنابێتەوە تا خاوەنی پڕۆژەی خزمەتگوزاری نەبێت، ئەوەتا پێغەمبەر ﷺ پڕۆژەی حکومەتەکە دابینکردنی کار بۆ بێکاران و شکاندمی تینوێتی خەڵکی و حکومەتەکەیەتی.

نومێر: بۆچی دوو چەمکی جیاوازت بەکار هێنا لە وشەی دەوڵەت پاشان حکومەتت زیاد کرد بۆ؟!

ماکوان: دەوڵەت کۆکراوەی چەمکی پاراستنی خەڵک و سنوور و ئابوورییە و لەگەڵ ئاسایشی ناوخۆ و سنوورەکانی تر ناسراوە بە جیۆپۆلیتک و جیۆپۆلیتاری، ئاسایشی نەتەوەیی، بەڵام حکومەت کاری خزمەتگوزاری و بەڕێوەبردنە و ڕێکخستنی کاری خەڵکییە بەگشتی، هەربۆیە پێغەمبەر ﷺ بەو پلانەی پڕۆژەی خزمەتگوزاری دابین کرد و لەهەمانکاتدا ئاسایشی خەڵکەکەی پاراست.

نومێر: منیش بۆ چەمکی حکومەت شتێکی ترت بۆ باس دەکەم، پڕۆژەیەکی ستراتیژی و ئابووری و خزمەتگوزاری زۆر گرنگ بوو پێغەمبەر ﷺ دایمەزراند.

ماکوان: چی بوو بۆم باس بکە؟!

نومێر: لەماوەی هاتنی شەش مانگ بۆ ساڵێک کارێکی تری ئەنجامدا زۆر ستراتیژی و گرنگ بوو ئەویش، ئازادکردنی بازاڕ لە دەستی یەهوودییەکاندا و بازاڕی ئیسلامی دامەزراند.

بازاڕێکی دامەزراند لەسەر پێی خۆی بوەستێت، چونکە پێغەمبەر ﷺ دەیزانی دەوڵەتەکەی دانامەزرێت بازاڕی سەرەکی لەدەستی یەهوودی بەنوو قەینووقاع دا بێت، هەربۆیە فەرمانی کرد بە هاوەڵان بگەڕێت بەدوای جێگایەکدا بیکاتە بازاڕی ئازادی ئیسلامی و موسڵمانان خاوەنی بڕیاربن تێیدا و بازرگانییەکەی تایبەت بێت بە موسڵمانان، هاوەڵان زۆر گەڕان و بیریان کردەوە و کۆی بکەنە بازار بۆ خۆیان، بەشەرع و یاسای خوا بازاڕەکەیان بەرن بەڕێوە، دووربێت لە هەموو کاری ڕیبا و قۆرخکاری...هتد.

تەنانەت پێغەمبەر ﷺ خۆی تەشریفی دەبرد و دەگەڕا بەدوای جێگایەکی باشدا چووە سەر چەند جێگایەک لەسەرەتادا بەدڵی نەبوو، لەڕووی جێگا و ڕێگا و بان و بەرفراوانی، فراوانتر نەدەکرا وازی لێ دەهێنا، تاکو ئاگاداریان کردەوە، پیاوێک هاتە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ خەڵکی شاری مەدینە بوو فەرمووی ئەی پێغەمبەری خوا



ﷺ دایک و باوکم بە قوربانت بێت، جێگایەکم بینیوەتەوە زۆر گونجاوە بۆ پرۆژەکەی جەنابت، فەرموو تەماشای بکە.

پێغەمبەر فەرمووی: بەڵێ، بابڕۆین خێرا دەستبەجێ چوون تەماشای جێگاکەیان کرد، پێغەمبەری خوا ﷺ بەدڵی بوو تا پێی موبارەکی پێدا کێشا و فەرمووی: بەڵێ، ئەوە بازاڕەکەتانە و هیچ کەس بۆی نییە لە شان و شەوکەتی کەم بکاتەوە.

تەواو ئەو جێگایە بووە بازار و جێگای کڕین و فرۆشتنی موسڵمانان، دوور لەزەریبە و خەراج و سەرانە و ڕیبا، هیچ حاکم و دەسەڵاتدارێک پا و پێوەندی بۆ دانانێت خودی پێغەمبەری خوا ﷺ هانی خەڵکی ئەدا بۆ ئەوەی لەو جێگایەدا بازرگانی بکەن.

ماکوان: بەداخەوە لە وڵاتی موسڵمانان ئێستا ڕێک پێچەوانەکەی دەبینیت هەرچی ئاسانکارییە دەکرێت بۆ سەرمایەداری جیهان، بەڵام بازرگان و سەرمایەدارانی ناوخۆ دەپووکێنەوە، دەیان پاو پێوەند بۆ سەرمایەدار و کۆمپانیا نێوخۆییەکاندا دادەنرێت، کۆمپانیای بێگانەکان ئاسانکاریان بۆ دەکرێت.

زۆربەی بازارەکانی جیهانی ئیسلام لەسەر بنەمای سەرمایەداری بێگانە و بیانی و یەهوودی وەستاوە، کە بازار لە دەستی خەڵکی وڵاتەکەدا نەبوو بڕیاری ئابووری و تەنانەت بڕیاری سیاسی زۆر قورس دەبێت، چونکە ئەوان بە سەرمایە و بازاڕیان حکووم دەکەن و کۆمپانیاکانیان بڕیار دەدەن و خەڵکی دەکەونە ژێر ڕەحمی ئەو دڕندانە.

نومێر: زۆر ڕاستە، بەداخەوە، بۆ زانیاریت لەسەرەتای دامەزراندنی دەوڵەتی پێغەمبەری خوا ﷺ لە هەوڵی ئەوەدابوو موسڵمانان کۆچ بکەن لە بازاڕی بەنوو قەینووقاعەوە بۆ بازاڕی ئیسلامی بەشێوەیەکی هێمنانە و دوور لە هەموو کارێکی توندو تیژی، با زیاتر مامەڵە لەگەڵ بازاڕی موسڵمانان دابکرێت ئەمەش لە ڕووی ئابوورییەوە شتێکی زۆر باشە و گونجاو و پۆزەتیڤە بازاڕێک لە بەرامبەر بازاڕی تر دروست بێت، لایەنێک بەتەنها ناتوانێت بازاڕ قۆرخ بکات، بەڵکو شتومەک دەست هاوڵاتیان دەکەوێت و بەشێوەیەکی گشتی خزمەت بە هاوڵاتی و موسڵمانان بەگشتی لەشاری مەدینەدا.

---

٤٠ ـ عن أبي أسيد رضي الله عنه قال: جاء رجل الى النبي ﷺ فقال له: بأبي أنت وأمي، إني قد رأيت موضعا للسوق أفلا تنظر اليه؟ فقال: بلى فقام ﷺ معه حتى جاء موقع السوق، فلما رآه أعجبه، ورقده برجله- أي ضرب موضع السوق برجل. فقال: نعم هذا سوقكم، فلا ينتقصن-أي لا ينتقصن من قيمة هذا السوق ولا منـ . رواية الطبراني وابن ماجه.



گومانی تێدا نییە کەسەرەتا بازاڕی ئیسلامی موسڵمان بەشێوەیەکی گشتی زۆر لاواز بووە، لە بەرامبەر بازاڕی یەهوودی بەنوو قەینووقاع، بەڵام بەتێپەڕبوونی کات ڕۆژبەڕۆژ وردە ودە بەهێز بوو، بووە جێگای متمانەی گشتی، بووە بازاڕی دەوڵەت لەسەر پێی خۆی وەستا، ئەم گرنگی پێدانە لەلایەن خودی پێغەمبەری خواوە بووە ﷺ بۆ بازاڕەکە، بەڵکو نەک تەنها بۆ ئەو بازاڕە جەنابیان هەمیشە دەیویست خەڵکی مامەڵە بە ئابووری ئیسلامی بکەن، چونکە سەربەرزی دونیا و قیامەتە.

جەنابیان هەمیشە خەڵکی هان ئەدا بۆ بازرگانی و کشتوکاڵ و پیشەسازی، هەموو کارێکی گرێ ئەدا بە ئەجر و پاداشتی قیامەتەوە، ئەگەرچی کارەکەش کارێکی سادە بوایە، هەروەها ئەیبەستەوە بەسەربەرزی و عیزەتی موسڵمانانەوە لە دونیادا، هەموو ئەم هەوڵ و چالاکییە ئابووریانە سەرچاوەکەی بە ئاڕاستەی وەحی و تەشریعی ئیسلامی بوو، خەڵکی موسڵمان بەگشتی فێری ئەوە کرد مافیان چییە و ئەرکیان چییە؟

هەموو خەڵکی فێر کرد ڕەشوە و بەرتیل و دزی و قۆرخکردن و زیادەڕۆیی و ماڵ بە فیڕۆدان گەندەلی یان هەڵهاتن لە زەکاتدان، هەمووی حەڕامە و سزای دونیا و قیامەتی لەسەر دادەمەزرێنێت، هەموو لایەکی فێرکرد بەخێردان و حەڵاڵ خواردن و یارمەتیدانی خەڵکی لێقەوماو و هەژاران، بەرەکەت دەکەوێتە ناومان و سەروەت و سامان ئەگەر چی کەمیش بێت.

ڕاستە سەرەتا موسڵمان هەژار و دەستکورت بوون، بەڵام لەدواییدا بژێوییان باش بوو ئابووری دەوڵەت زۆر باش بوو لەسەر پێی خۆی وەستا.

هەموو ئەمانەی باسم کرد هێز و سەرکەوتنەکەی دەگەڕێتەوە بۆ یاساکانی قورئان و تەشریعی ئیسلام، هیچ خوارییەکی تێدانییە، پڕ لەحیکمەت و نوور و بەرەکەتە، خوای پەروەردگار لە سورەتی الأعراف ئایەتی ٩٦ دەفەرمووێت:

﴿وَلَوْ أَنَّ أَهْلَ ٱلْقُرَىٰٓ ءَامَنُوا۟ وَٱتَّقَوْا۟ لَفَتَحْنَا عَلَيْهِم بَرَكَـٰتٍ مِّنَ ٱلسَّمَآءِ وَٱلْأَرْضِ وَلَـٰكِن كَذَّبُوا۟ فَأَخَذْنَـٰهُم بِمَا كَانُوا۟ يَكْسِبُونَ ۝﴾

واتە: خۆ ئەگەر خەڵکی شارەکان بەڕاستی باوەڕیان بهێنایە و خۆیان بپاراستایە، ئەوا بێگومان ئێمە دەرگای فەڕ و بەرەکەتی ئاسمان و زەوییان لەسەر دەکردنەوە، بەڵام ئەوان کە پەیام و پێغەمبەرانی ئێمەیان بەدرۆ زانی، جا ئێمەش بەهۆی ئەو کاروکردەوانەی کە دەیانکرد گرتمانن و لەناومان بردن.



ئەو بەرەکەتەشمان بینی لە ڕەوش و واقیعەکەدا لە شاری دەوڵەتەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ.

بەم جیهانبینی و دامەزراندنی ئابووری ئیسلامییە، بەهۆکاری وەحی و پێغەمبەری خوا ﷺ، قورەیش ئەو هەڵەی لە دەستدا دژایەتی مسڵمانان بکات لە ڕێگای هاوپەیمانی و ئابڵووقەی ئابووری، موسڵمانان وەکو بەرزەکی بانان بۆی دەرچوون و هیچ کاریگەری لەسەر شاری مەدینە و دەوڵەتی پێغەمبەری خوا ﷺ نەکرد، جا کە لەسەر پێی خۆیان وەستان و ئەوەی خاوەنی موڵک و ژیانی خۆی نەبێت لە ڕووی قوت و کشتوکاڵ و بازرگانی هەرگیز ناتوانێت خاوەنی بڕیار بێت، خاوەنی ڕای تایبەتی خۆی بێت.

ماکوان: هیچ هەوڵی تریان نەدا دوای شکستی ئابووری؟!

نومێر: نا، بەڵکو دوای فەشەلە یەک لەدوای یەکەکانیان ڕقیان ئەستوورتر دەبوو غرووریان شکێنرا جار لەدوای جار، بەڵکو هەر لە پلان و دژایەتی کردندا بوون، لەهەوڵی ئەوەدابوون چ ڕێگایەکیتر بگرنە بەر بۆ لێدانی موسڵمانان، خوای گەورە لە سورەتی الأنفال ئایەتی ٣٠ دا دەفەرموێت:

﴿وَإِذْ يَمْكُرُ بِكَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لِيُثْبِتُوكَ أَوْ يَقْتُلُوكَ أَوْ يُخْرِجُوكَۚ وَيَمْكُرُونَ وَيَمْكُرُ ٱللَّهُۖ وَٱللَّهُ خَيْرُ ٱلْمَٰكِرِينَ ٣٠﴾

واتە: (ئەی محمد ﷺ یادی ئەو کاتە بکەرەوە) کاتێک ئەوانەی بێ باوەڕ بوون پیلانیان دەگێڕا دژی تۆ بۆ ئەوەی بەندت بکەن، یان بتکوژن، یان دەرت بکەن، ئەوان پیلانی خۆیان دەگێڕن و خوایش پیلانی خۆی دەخاتەکار (بەپووچ کردنەوەی کارەکانیان)، دڵنیابن خوای گەورە چاکترینی هەموو پیلان ساز و نەخشەسازانە (نایەڵێ پیلانیان سەربگرێ).

هەوڵیاندا هەڕەشەی سەربازی دژی موسڵمانان ئەنجام بدەن چەند کردارێکیان لە ڕووی مەیدانییەوە، ئەنجامدا و هاتنە شاری مەدینەی پێغەمبەری خوا ﷺ.

ماکوان: ئەمە کەی ڕوویدا؟!

نومێر: هەموو شەش مانگ بۆ ساڵێکە پێغەمبەری خوا ﷺ هاتۆتە شاری مەدینە، هەموو ئەو ڕووداوانەی باسمان کرد لە ساڵی یەکەمدا ڕووی داوە.



## هەڕەشەی هێزی سەربازی

نومێر: لە دوای ئەوەی کە بینییان موسڵمان خۆڕاگر و بەهێز و قارەمانن، ئەو زیرەکی و توانا و لێهاتووییەی موسڵمانانیان بینی لە جێبەجێکردنی شەریعەتی ئیسلام بەجوانترین شێوە و بونیادنانی دەوڵەت و بیناکردنی شارستانییەت و ئوممەت، ئیتر هیچ چارەیان نەما ناچار پەنایان برد بۆ هێزی سەربازی دژی موسڵمانان، لەشەودا دەچوونە ناو شاری مەدینە و منداڵ و ژنیان دەترساندن، وەکو چەتە و دز دەچوون مەڕ و ماڵاتییان دەدزی، یان پیاوێکیان لە شەودا دەکوشت، یان پیر و پەککەوتەیان دەترساند.

ئەوەی کەبۆت باس دەکەم لە ساڵی یەکەمی کۆچی پێغەمبەر صَلَّىٰ اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ دا بوو بۆ شاری مەدینە، موسڵمانان تەنانەت خەنجەریشیان هەڵنەدەگرت، لەدوای ئەم ماوەیە بینییان موسڵمانان خەریکی پڕۆژەی خزمەتگوزاری و دامەزراندنی دەوڵەت و ژیارن، بەسەرکردایەتی کەسێک لە قورەیش کە دواتر موسڵمان دەبێت و دەبێتە هاوەڵی پێغەمبەری خوا صَلَّىٰ اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ، قورەیش (کەرزی کوڕی جابری فەهری)[٤١] نارد و لەشەوێکدا هەندێک مەڕ و چەند سەر حەیوانی دزی لەگەڵ چەند وشترێکدا، تەنانەت پێغەمبەری خوا صَلَّىٰ اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ شوێنی کەوت و شتەکانی لێسەندەوە، بەڵام ئەو سەرکەوتوو بوو لە دزییەکەی و گەڕایەوە شاری مەککە!

ماکوان: تەماشای کوفر و بێدینان بکە چۆن هەمیشە ڕاستییەکان چەواشە دەکەن، موسڵمانان تەنها داوای ئەوەیان کرد کە باوەڕیان بە فرە خوایی نییە و تەنها یەک پەروەردگار دەپەرستن، بزانە چییان بەسەردا هێنان، سەرەتا سیناریۆی شەڕی ناوەخۆ و دژایەتیکردنی یەکتر بە خەڵکی یەک جێگا، پاشان جەنگی دەروونی و هەڕەشە و دژایەتی کردن، لەدواییدا پچڕاندنی پەیوەندی دبلۆماسی و هەموو پەیوەندییەک لە هەمووی پێکەنیناوی تر گۆڕانکاری لە یاسا و عورف و عادات و کلتوردا، لە دوای هەموو ئەمانە هەوڵدان بۆ برسیکردنی خەڵک و ئابڵووقەی ئابووری ئیتر کە پەتی ئارامییان پچڕا و خۆیان پێنەگیرا هەوڵی هێرشی سەربازیان دا.

نومێر: واتا شەش جۆر جەنگیان بەکارهێنا دژی موسڵمانان کە بریتی بوو.

١- جەنگی ناوخۆ.

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

٤١ ـ کرز بن جابر فهری.



٢- جەنگی دەروونی.

٣- جەنگی دابڕانی پەیوەندی.

٤- گۆڕانکاری لە یاسا و ڕێساکاندا.

٥- ئابڵووقەی ئابووری.

٦- هێرشی ناوەخۆیی و سەربازی.

ماکوان: بەڵێ بەدڵنیاییەوە، لە کۆن و نوێدا هەمان شێوە و مێتۆد بەکار دەهێنن ئێستاش دژی موسڵمانان لە هەرجێگایەکدا کۆمەڵێک موسڵمان یەک بگرن هەر هەمان شێوە و کار ئەنجام ئەدەنەوە، زۆر ناچمە ناو نموونەی لاوەکی بەڵام پێم وایە تۆ و هەموو کەس باش لەمە حاڵی بوون.

لەدوای دەرکردنیان لەماڵ و زێدی خۆیان و داگیرکردنی سەروەت و سامان و ماڵ و حاڵیان و خەڵکی لەڕێگای خوا جێگای کردنەوە، ئەوەتا بە عورفی قوڕەیش موسڵمانان بە تاوانبار و ئیرهاب ناویان دەبرێت لە ناو هەموو گەل و هۆزی تری عەرەبدا.

بەڵام سوێند بەخوا ئەگەر وەکو ئەوەی پێغەمبەر صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ کردی خەڵکی تر چاوی لێ بکات و پڕۆژەکانیشیان زیندوو بکەنەوە، کە هەموو ئەو پڕۆژانە بۆ ئێمە دەبنە سوننە، دڵنیات دەکەم هەرچی هێزی دونیایە کۆببێتەوە دژی خواناسان ناتوانن درزیان تێبخەن، چونکە پێغەمبەر صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ خۆی دەفەرموویت: بۆ ئێوەم جێهێشتووە دوو شت ئەگەر دەستی پێوە بگرن دوای من هەرگیز سەرگەردان و گومڕا نابن ئەویش قورئان و سوننەت، جا خەڵکی سوننەت بەدوو ڕکعات نوێژی دوای نوێژە فەرزەکان دەزانێت، نازانن هەموو ژیانی لە هەڵسووکەوت و ڕەفتار و گوفتاری بۆ ئێمە سوننەتە.

لە گەرمەی قسەدا بووم دیسانەوە سەرم کەوتەوە سەرشانی نومێر و لە دونیای نوورەوە گەڕامەوە بۆ زیندانی ڕۆم و خاچپەرستانی ئیتاڵیی، دیسان ئەبویەحیا بە ئاگای هێنام، ماوەیەکی زۆر بوو کتێبم لێ وەرنەگرتبوو، ئەویش مریشکی نەخواردبوو، هات وتی کتێبێکی شینی زۆر جوانم هەیە؟

ماکوان: ناوی کتێبەکە چییە؟

ئەبویەحیا: نازانم بەس بەرگەکەی شینە و زۆر جوانە.

---

٤٢ ـ تَركتُ فِيكم الثَّقلين، ما إن تَمسَّكتُم بهما، لن تضلُّوا: كتابَ اللهِ وسُنَّتي.



ماکوان: بڕۆ بۆم بهێنە بزانم چییە، بەپەلە ڕۆیشت کتێبەکەی بۆ هێنام تەماشام کرد، ئەم کتێبەم خوێندۆتەوە و دوو مریشکی پێ وەرگرتووە! وتم ئەم کتێبە ناوی (الداء والدواء) ئیبن قەیم نووسیویەتی، مەبەستی ئیبن قەیم لە نووسینی ئەم کتێبە زیاتر جۆری تاوان و چەرمەسەرییە، بەڵام ئەبویەحیا بەهەڵە لێی تیگەیشت، چوو بڵاوی کردەوە وتی کتێبێکم هەیە باسی دەرد و دەرمان دەکات و (طب نەبوییە)!

کوڕێکی تونسی ترمان لەگەڵ بوو لە زیندانەکە هات بۆلام وتی ئەبو ئانا هەموو ئەو کتێبانەی ئەبو یەحیات خویندۆتەوە؟

ماکوان: بەڵێ.

عەبدووسەلام: دەڵێت کتێبێکم لایە باسی دەرد و دەرمان دەکات گوایە هەمووی فەرموودەی پێغەمبەرە ﷺ ئەگەر ڕاست بکات مریشکێکی بۆ دەکڕم.

ماکوان: وەللە ئەگەر ڕاست بکات خۆشم مریشکێکی بۆ دەکڕم.

عەبدووسەلام: نا، بۆی مەکڕە من وەری دەگرم و بە دوو شە و تەواوی دەکەم و دوایی ئەیدەم بەتۆ.

ماکوان: زۆرباشە، ماڵت ئاوا بێت.

عەبدووسەلام لێی وەرگرت و بەیانی هات بۆ لام وتی ئەو کتێبە باسی هیچ جۆرە کارێکی پزیشکی و تەندروستی ناکات، وتم کتێبەکە ناوی چییە؟

عەبدووسەلام: الداء والدواء إبن قيم الجوزية.

ماکوان: دامە قاقای پێکەنین، وەڵلە هەڵی خەڵەتاندی، ئەو ناوە بۆ تاوان و چارەسەری تاوان بەکار هاتووە، هیچ پەیوەندی نییە بەو بابەتەی تۆ بەشوێنیدا دەگەڕێیت.

عەبدووسەلام کتێبەکەی بۆ بردەوە و پێی وتبوو ببوورە ئەم کتێبە باسی ئەوە نییە، مریشکت بۆ ناکڕم!

ئەبویەحیا هات بۆ لام وتی مریشکێکم بەرێ بە قەرز.

ماکوان: بەسەرچاو تەفسیری شێخی سەعدیم بدەرێ بە قەرز؟

ئەبویەحیا: تەفسیرەکەت ئەدەمێ بۆ یەک هەفتە مریشکەکەت بۆ ناهێنمەوە.

ماکوان: نا، نامەوێت مریشکی خۆمم دەوێت؟



ئەبویەحیا: بۆ یەک مانگ با لات بێت.

ماکوان: نامەوێت خوێندومەتەوە بەس چاوی پیا دەخشێنمەوە.

ئەبویەحیا: باش.

ناچار بوو بۆم بهێنێت، ئینجا فێڵەکەم دۆزییەوە، ئەو مریشکەکەی نەدەگەڕاندەوە بۆ ئەوەی داوای مریشکەکە نەکەم، باسی کتێبەکەی نەکرد زۆربەی کتێبەکانی لام بوو لە جیاتی مریشکی قەرز، ئیتر من حەسامەوە، بۆ سەرچاوە خەمم نەما لەکاتی نووسینەکاندا.

شەوێک سەرقاڵی خوێندنەوەی سورەتی البقرة بووم تەماشای تەفسیری ئیبن کەسیر و سەعدیم کرد دوو وشە سەرنجی ڕاکێشام وشەی بەنی ئیسرائیل و یەهوود، وتم داخۆ چی بێت و حیکمەت و موعجیزەی ئەم دوو وشەیە چییە کە خوای گەورە بەکاری هێناوە لە قورئاندا، کەوتمە مقۆ مقۆ لەگەڵ خۆم و کتێبەکاندا لە ژووری زیندانەکەمدا، هەرچی هێنام و بردم هیچم دەست نەکەوت، ئەو باسە سەری قاڵ کردم هیچ ئاکامێکی نەبوو وەکو جاران چوومەوە سەرکتێبەکەی فەرغەلی، دوای نوێژی مەغریب سەرم بەسەر کتێبەکەدا شۆڕ کردەوە و خەوبردمیەوە سەرم لەسەر شانی نومێر بوو.

ماکوان: من دەمێکە لە هۆش خۆم چووم نومێر؟!

نومێر: نا، زۆر نییە!!

ماکوان: سەیرە، لە کاتێکدا من گەڕامەوە بۆ زیندانەکە لای تۆوە چەندین ڕۆژم پێچوو تا گەڕامەوە لات؟!

نومێر: وەکو وتم تۆ لەزیندانی، ئەحکامی زیندان و ئەسیر دڵنیابە جیاوازە، بۆیە زەمەن و کاتەکان لەگەڵ ڕووداوەکان بەرخودی جیاوازت لەگەڵ دەکەن.





## یەهوود و دەوڵەتی پێغەمبەر لە شاری مەدینە

ماکوان: لە کوێدا بووین باسی چیمان دەکرد و بەتەمای چیت، بڕۆین؟

نومێر: جارێ لێرە دەمێنینەوە، دوایی بەدڵنیاییەوە دەڕۆینە ناو ڕووداوەکان و تێکەڵ بەواقیعەکە دەبین، بەڵام جارێ ماومانە بابەیەکەوە شیکارێک بۆ ڕووداوەکانی ساڵی یەکەمی ناو شاری مەدینە بکەین و بزانین پێغەمبەری خوا ﷺ چۆن دەوڵەت و حکومەت و دەسەڵات و ژیار و شارستانییەتی دامەزراندووە، ئەوە زۆر گرنگە بیزانین دوای ئەوە بە پشتیوانی خوای پەروەردگار هەموو ڕووداوەکانی تر تێگەیشتنی ئاسان دەبێت.

ماکوان: لەکوێی باسەکەدا بووین؟

نومێر: باسی زۆر شتمان کرد لەوانە پێغەمبەری خوا ﷺ چۆن بینای دەوڵەتەکەی کرد، باسی ئەوەمان کرد چۆن پەیوەندی دامەزراند لەگەڵ گروپ و هۆز و تایفەکانی چواردەوریدا، باسی ئەوەمان کرد لەگەڵ کافر و موسڵمان و موهاجیر و ئەنسار (ئەوس و خەزرەج)و موشریک چۆن مامەڵەی کردووە! هەروەها باسی موشریکی قوڕەیشمان کرد ویستیان چی بکەن دژی موسڵمانان، چۆن پێغەمبەری خوا ﷺ بەسەرکەوتویی لێی دەرچوو باسی پرۆژە و جۆری پرۆژەکانمان کرد کە بۆتە تەشریع و یاسا و ڕێسا، موسڵمان دەتوانێت بەکاری بهێنیت لە دووبارە ڕووبەڕووبوونەوەی ئەو کێشەو دیاردانەدا.

ماکوان: هیچی تری ماوە باسی بکەین؟

نومێر: بەڵێ پێویستە باسی کێشە و واقیعێک بکەین زۆر گرنگە و زۆریش ترسناکە، لەهەمانکاتدا ئەوپەڕی گرنگی خۆی هەیە لەم ڕووداوانەی ژیانی پێغەمبەر و تا ئەم ساتەوەختەی مرۆڤایەتی تێدا دەژی.

ماکوان: مەبەستت زەمەنی پێغەمبەر ﷺ یان زەمەنی من؟

نومێر: هەر لە زەمەنی پێغەمبەر ﷺەوە تاسەردەمێک کە تۆ تێیدا دەژیت گرنگە و لەگەڵماندایە و تا ڕۆژی قیامەت هەر لەگەڵماندا دەبێت، ئەویش باسی یەهوود و جوولەکەکانی چواردەوری مەدینە و ناو شارەکەن!



ماکوان: زۆر باشە بەردەوام بە، بەڵام بۆ پێکەوە سۆراغێکی ناو شاری مەدینە و چواردەوری دەکەین حەزدەکەم، بەڵکو پێغەمبەر ﷺ و هەندێک لە هاوەڵان ببینم.

نومێر: ئێستا کات درەنگە و بەپشتیوانی خوا سبەینێ بەیانییەکەی دەڕۆین بۆ ناو شاری مەدینە و قەڵا و قوڵلەی جوولەکەکان، با وەڵامەکەم لەبیر نەچێت لە شاری مەدینەدا سێ جۆر لە هۆز و طائیفەی جوولەکە دەژین کە هەریەکە بەشێکی گەورەی لە جوولەکە پێکهێناوە و بریتین لە یەهوودی (هۆزی قەینووقاع و هۆزی نەزیر و هۆزی قووڕەیزە) هەروەها لەدەرەوەی شاری مەدینەش کۆمەڵێک یەهوودی تری لێیە لە خەڵکێکی زۆر پێکهاتوون، لە باکووری شاری مەدینە نیشتەجێن لە دۆڵێکدا بە ناوی (وادي القرى) کە ناوچەکە ناسراوە بە (خەیبەر).

ماکوان: بۆم باس بکە چۆن پێغەمبەر ﷺ مامەڵەی لەگەڵ ئەم جوولەکە و یەهوودییانە کردووە.

لەکاتێکدا چەند جۆرە هۆز و طائیفەیەکن لە یەکتر جیاوازن و تەنانەت ناوچەکەشیان جیاوازە!

نومێر: بۆ ئەوەی بزانین پێغەمبەری خوا ﷺ چۆن ئاوێتە بوو لەناو ئەو کۆمەڵگایەی یەهوودی، پێش هەموو شتێک پێغەمبەر ﷺ ئاگاداری ستراتیژی جوولەکە بوو بەگشتی دەرحەق بە موسڵمانان، چونکە بیروبۆچوونی یەهوود دەرهەق بە موسڵمانان، گومانی تێدا نییە کوشتن و لەناوبردنی موسڵمانانە لە ئایەتێکدا خوای گەورە بۆمان باس دەکات دەفەرموێت:

﴿۞ لَتَجِدَنَّ أَشَدَّ ٱلنَّاسِ عَدَٰوَةً لِّلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱلۡيَهُودَ وَٱلَّذِينَ أَشۡرَكُواْۖ وَلَتَجِدَنَّ أَقۡرَبَهُم مَّوَدَّةً لِّلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱلَّذِينَ قَالُوٓاْ إِنَّا نَصَٰرَىٰۚ ذَٰلِكَ بِأَنَّ مِنۡهُمۡ قِسِّيسِينَ وَرُهۡبَانًا وَأَنَّهُمۡ لَا يَسۡتَكۡبِرُونَ ۝﴾

واتە: دەبینی هەموو خەڵکی زیاتر، لەهەموو دوژمنان زیاتر هۆزی جوولەکە سەرسەختانە دوژمنایەتی ئیماندارن دەکەن، هەروەها ئەوانەش کە موشریک و هاوەڵپەرستن (دوژمنایەتی ئیمانداران دەکەن)، دەبینی ئەوانەی کە سۆزیان هەیە بۆ ئیمانداران ئەوانەن کە دەڵێن: ئێمە نەسرانین چونکە قەشەیان هەیە و خواپەرستییان تیایە و فیزاوی و خۆ بە گەورە دانانێن.

ئەگەر بەچاوی لێکۆڵینەوە لێی وردبینەوە تەماشای بکەین، لەگەڵ ئەو هەموو پیلان و هێرش و جەنگەی قوڕەیش کافر و موشریک دەرحەق بە موسڵمانان کردیان جەنگ و پلانی



یەهوود زۆر قورس و ترسناکترە، دوژمنایەتی جوولەکە لەگەڵ موسڵمانان زۆر خراپترە، پلان و مەکر و جەنگیان زۆر ترسناک و خەتەرناکترە لە قورەیش و موشریکەکان، هەر بۆیە خوای گەورە دەفەرمووێ:[43]

ماکوان: من دەمگوت بزانم مەنهەجی ئیسلامی چۆن مامەڵەی لەگەڵ یەهوودا کردووە، خودی پێغەمبەر ﷺ چۆن هەنگاووی دژی ئەو خەڵکە پیلانگێڕ و دوژمنایەتی هەڵهێناوەتەوە؟! یان یاسا و شەریعەتی ئیسلامی لە بارەیانەوە چی دەڵێت؟!

نومێر: پێش ئەوەی شیکاری لەسەر پرسیارەکانت بکەین، پێم خۆشە باسی موعجیزەیەکی گەورەی ئەم ئیسلامەت بۆ بکەم، لە ڕێگای قورئان و پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵان.

ئەگەر وردبینەوە و تەماشا بکەین لە ماوەی قۆناغی مەککە بەدرێژی (١٣) ساڵ هاوەڵان ئامادەکارییەکی دەروونی لەڕێگای قورئانەوە پەروەردەی کردن لەسەر چۆنیەتی مامەڵەکردن لەگەڵ یەهوود و موشریکدا، هەموو قۆناغی مەککە هاوەڵان نەیاندەزانی دەچن بۆ شاری مەدینە، تەنانەت خودی پێغەمبەری خوا ﷺ نەیدەزانی تەشریفی دەباتە شاری مەدینە، پێشتر جێگای تری هەڵبژارد بۆ کۆچ نموونەی (طائیف، عێراق و حەبەشە و...هتد) لە شاری مەدینە کۆمەڵگەیەکی یەکجار زۆر لە جوولەکە نیشتەجێ بوون!

ئیعجازەکە لێرەوە دەستپێدەکات، ئەو هەموو سورەت و ئایەتانەی لەشاری مەککە دابەزی هەموو باسی جوولەکە و ژیانی جوولەکەیە کە ئەوەندە زۆرە لە ژمارە نایەت.

ئەگەر هەڵوەستەیەک بکەین دەبینین ئەم مەنهەجە ڕەبانییە گەورەییە زۆر لە ڕادەبەری ئەقڵ و بیر و هۆشی مرۆڤ، بەڵکو بەواتا و مانای تەواوەتی موعجیزەیە، خوای گەورە دەیویست جیهانبینیەکی فراوان بداتە موسڵمانان، چونکە لە داهاتوویاندا دەبنە خاوەنی دەوڵەت و دەسەڵات، لەو دەوڵەت و دەسەڵاتە هەموو لەگەڵ یەهوود دا دەژین و لەچواردەورتان دەبن.

یاخود خوای گەورە دەیویست موسڵمانان بزانن لە چواردەوریان چی ڕووئەدات، بۆیە بە ئاڕاستەی قورئان ئاگاداری دەکردنەوە کەوا ئاگاداری چواردەوریان بن لە ڕۆم و یەهوود و نەسارا، هەروەها ئاڕاستەی پێغەمبەرەکەی دەکرد هاوەڵان ئاگادار بکاتەوە لە ڕەوشی فارس و کیسراکان و ڕۆم و قەیسەرەکان و ژیانی موقەوقیس... هتد.

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

٤٣ ـ هەمان سورەت و ئایەتی پێشووتر.



یاخود بەگشتی شارەزابن لە پادشا و مەلیکەکانی عەجەم و بزانن لە جیهاندا چی ڕوودەدات و بە تەواوەتی جەمسەرەکانی هێز و سەنتەری هێز و لە ناوچەکە و جیهان بەگشتی چ باس و هەواڵە، لە کاتێکدا ئەم هەموو هەواڵ و زانیارییانەی دەهاتن موسڵمان لە ژێر ئەشکەنجە و ئازاردابوون و تەنانەت لە ژێر ڕەحمی زللە و شەقی قوڕەیش دابوون، هەموو پێوەرێک لە ماددە و بیرکردنەوەی مرۆڤ موسڵمانان هەرگیز بیریان لەوە نەدەکردەوە خاوەنی دەوڵەت بن، بەڵکو هەموو خۆیان بۆ مردن ئامادە کردبوو، بەڵام ویستی خوای پەروەردگار جیاوازە و بەستراتیژی قەزا و قەدەر ئەم بوونە دەبات بەڕێوە، ئەم مەنهەجە ڕەببانییە نابێت لە بیر بکرێت دەبێت موسڵمانان هەمیشە ئاگاداری جیهان بێت و لەو ڕووداوانەی کە تێیدا ڕوو ئەدەن.

ماکوان: سوبحان اللە خوای پەروەردگار لەو زەمەنەدا کاتێک هیچ ئامێرێکی ئەلکترۆنی لە مۆبایل و ئینتەرنێت و تەلەفزیۆن... هتد نەبوو داوا لە موسڵمانان دەکەن ئاگاداری جیهان بن، بەڵام بەداخەوە ئێستا ئەو هەموو کەرەستە و ئامێر و خزمەتگوزاریانە هەیە، کەچی موسڵمانان نازانن چی دەگوزەرێت، لە ناو موسڵمانان لە جیهان لە بۆرما و کشمیر و کوردستان و فەڵەستین، تەنانەت موسڵمانانی ئەوروپا لە مەقدۆنیا، ئەلبانیا، کۆسۆڤۆ، بۆسنا یان ئەوەی لە شیشان ڕوویدا و ئەوەی چین و تورکستانی داگیر کرد، یاخود پەیوەندی نێوان چین و ڕووسیا و ئەمریکا و ئەو هێڵ و تۆڕە جاڵجاڵۆکیانەی لە جیهاندا پەلی هاویشتووە، پێویستە موسڵمان ئاگادار و شارەزای هەموو ئەو باسە گرنگانە بین، من ناڵێم هەموو تایبەتمەند بن تێیدا، بەڵکو لانیکەم ئاگاداری ڕەوشەکەبن و واقیعەکە بزانن و بیخوێنینەوە، چونکە بەڕاستی سوود و قازانجی زۆری هەیە بۆ موسڵمانان، کاریگەری خۆی دەبێت لە کاتی خۆیدا.

ببورە قسەکەم بڕیت، زیاتر باسی موعجیزە و ئەو ئیعجازەم بۆ بکە کە هاوەڵانی لەسەر پەروەردە بوون لە شاری مەککە، ئەوە زۆر گرنگە.

نومێر: ئەگەر باسی قورئانی مەککی بکەین دەبینین باسێکی بێشومار لەسەر بەنی ئیسرائیل هاتووە، وەکو وتمان موسڵمانان هیچ زانیارییان نەبوو لەوەی هیجرەت دەکەن بۆ شاری مەدینەی منەوەرەی پێغەمبەر ﷺ، بزانە چۆن باسی ئەوانی کردووە لە قورئاندا لەو قۆناغەی (١٣) ساڵ قورئان کاریگەرییەکی زۆر ئیجابی و نەرێنی لەسەر دڵ و دەروونی هاوەڵان جێ هێشتووە لەسەر بەنی ئیسرائیل، لە قورئانی قۆناغی مەککی دا باسی وشەی (یەهوود) نەکراوە هەموو باسی بەنی ئیسرائیل (واتا نەوەکانی یەعقوب) تەنانەت وشەی یەهوود لە دوای ئەوەی سەرپێچی پێغەمبەرانیان -علیهم السلام- کردووە، دەنا کاتێک شوێنکەوتووی سەیدنا مووسا بوون هەر بە بەنی ئیسرائیل ناویان هاتووە لە قورئاندا،



هەروەک وتمان وشەی بەنی ئیسرائیل شەرەف و گەورەییە بۆ جوولەکە، چونکە واتای نەوەکانی یەعقوب پێغەمبەرێکە -عليه السلام- لێرەوە لە دڵی موسڵماناندا جێگای تایبەتی دەبێت، ڕێزی زۆریان بۆ دادەنێت. واتە قۆناغی مەککی کە باسی ئەم هۆزە دەکات هەر بەڕێز و گەورەیی شوێنکەوتەیی مووسا باسیان دەکات، لە قۆناغی مەککی وەکو ئاماژەم پێیدا بەهیچ شێوەیەک وشەی یەهوود نەهاتووە، لەگەڵ ئەوەشدا (٣٠) جار ئەهلی کتاب لە قورئاندا هاتووە، بەڵام یەک جار لە قۆناغی مەککی باسی ئەهلی کیتاب دەکات و دەفەرموویت:

﴿۞ وَلَا تُجَٰدِلُوٓاْ أَهۡلَ ٱلۡكِتَٰبِ إِلَّا بِٱلَّتِي هِيَ أَحۡسَنُ إِلَّا ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ مِنۡهُمۡۖ وَقُولُوٓاْ ءَامَنَّا بِٱلَّذِيٓ أُنزِلَ إِلَيۡنَا وَأُنزِلَ إِلَيۡكُمۡ وَإِلَٰهُنَا وَإِلَٰهُكُمۡ وَٰحِدٞ وَنَحۡنُ لَهُۥ مُسۡلِمُونَ ۝﴾

واتە: گفتوگۆ و (مجادلـة) مەکەن لەگەڵ خاوەنی کتێبە ئاسمانییەکان، مەگەر بەجوانترین شێوە نەبێت، جگە لەوانەیان کە ستەمیان کردووە (ئەوە ڕەفتارتان لە بەرامبەریانەوە دەبێت جیاواز بێت) پێشیان بڵێن: ئێمە باوەڕمان هێناوە بەوەی بۆ ئێمە و ئێوە دابەزێنراوە، خوای ئێمە و خوای ئێوە تەنها یەکێکە، ئێمە فەرمانبەرداری ئەو زاتەین.

واتا مەبەستەکەم ئەوەیە دوای بەنی ئیسرائیل وشەی ئەهلی کیتابیان بۆ بەکارهات و پاشان پلە بە پلە وشەی یەهوود و نەسارا بەکار هات، ئەویش بۆ بانگکردنیان بەجوانترین شێوە، خوای گەورە زۆرێک لە ئایەتەکانی قورئان باسی مووسای کردوە، واتا (١٣٦) جار (١٢٢) جاریان قۆناغی مەککی واتا قورئانی مەککی باسی کردووە!!

باسەکانی قورئانی مەککی زیاتر باسی ململانێی فیرعەونە لەگەڵ مووسا و کێشەی گەلی بەنی ئیسرائیل، باسی مووخالەفەی و بێگوێیی و لاری و لەوێری جوولەکە ناکات، ئەمەش بۆ ئامادەکردنی هاوەڵانە و بۆ تێکەڵاو بوونیان بەو گەلوهۆزە، پێش ئەوەی بیرم بچێت، باسی هەندێک لە مووخالەفە و بێ گوێیەکانیان کراوە، بەڵام بەشێوەیەکی گشتی و خوای پەروەردگار گەورەی نەکردووە لە شێوەی گەلێکی جاهیل بۆی باس کردووین، دەنا هەموو باسی مەزڵومی ئەوان و دیکتاتۆری فیرعەونە.

تەنانەت لە هەندێک جێگای قورئانی مەکیدا خوای گەورە وەسفی کردوون شتی زۆری پێ بەخشیون.



﴿وَلَقَدِ ٱخۡتَرۡنَٰهُمۡ عَلَىٰ عِلۡمٍ عَلَى ٱلۡعَٰلَمِينَ ٣٢﴾

واتە: (ئێمە ئەو کاتە نەوەی ئیسرائیلمان) هەڵبژارد لە ڕووی ئاگایی و زانیارییەوە، ڕێزی ئەوانمان دا بەسەر هەموو خەڵکی ئەو سەردەمەدا...

هەروەها باسی ئارامگری و سەبریان بۆ دەکات:

﴿وَأَوۡرَثۡنَا ٱلۡقَوۡمَ ٱلَّذِينَ كَانُواْ يُسۡتَضۡعَفُونَ مَشَٰرِقَ ٱلۡأَرۡضِ وَمَغَٰرِبَهَا ٱلَّتِي بَٰرَكۡنَا فِيهَاۖ وَتَمَّتۡ كَلِمَتُ رَبِّكَ ٱلۡحُسۡنَىٰ عَلَىٰ بَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ بِمَا صَبَرُواْۖ وَدَمَّرۡنَا مَا كَانَ يَصۡنَعُ فِرۡعَوۡنُ وَقَوۡمُهُۥ وَمَا كَانُواْ يَعۡرِشُونَ ١٣٧﴾

واتە: ئەوسا ئەو قەوم و گەلەی لاواز دەکران و دەچەوسێنرانەوە لە هەموو خۆرهەڵات و خۆرئاوای ئەو وڵاتەی کە فەڕو بەرەکەتمان بەسەردا ڕژاندبوو کردە جێنشین و بەڵێنی ڕاست و جوانی پەروەردگارت (ئەی محمد ﷺ) جێبەجێ بوو بۆ نەوەی ئیسرائیل بەهۆی ئەوەی کە ئارامیان لەسەرگرت، (کەواتە ئەگەر ئوممەتی تۆیش ئاوا خۆگربن بێگومان هەمان ئەنجام بەدەست دەهێنن)، هەرچیش فیرعەون و قەومەکەی دروستیان دەکردو ئەو کۆشک و تەلارسازیەی کە دەیانکرد، هەر هەموویمان کاول و وێران کرد.

لەبەرامبەر بەنی ئیسرائیل سەبر و ئارامییان و زانستیان، خوای پەروەردگار فەرموودەی ئاڕاستەی موسڵمانان دەکات و دەفەرموێت:

﴿۞ وَلَا تُجَٰدِلُوٓاْ أَهۡلَ ٱلۡكِتَٰبِ إِلَّا بِٱلَّتِي هِيَ أَحۡسَنُ إِلَّا ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ مِنۡهُمۡۖ وَقُولُوٓاْ ءَامَنَّا بِٱلَّذِيٓ أُنزِلَ إِلَيۡنَا وَأُنزِلَ إِلَيۡكُمۡ وَإِلَٰهُنَا وَإِلَٰهُكُمۡ وَٰحِدٞ وَنَحۡنُ لَهُۥ مُسۡلِمُونَ ٤٦﴾

کەواتە لە موسڵمانان داوا کراوە بەباشترین شێوە مامەڵە لەگەڵ یەهوود دا بکەن و بەوەی کە چاکە و ڕەفتار و گووفتاریان لەگەڵدا بکەن.

ئەمەش بووە هۆکاری ئەوەی کە لای موسڵمانان ڕوخسارێکی جوان و هێمایەکی باش بۆ بەنی ئیسرائیل دروست ببێت، لە کۆتاییدا یەهوود ئەهلی کیتابن و بروایان بە یەکتایی هەیە، خۆشیان بڵاویان کردۆتەوە کە بەم نزیکانە پێغەمبەرێک دێت، کەواتە لەڕووی هاوکێشە ماددییەکانەوە زۆر سروشتییە کە یەهوودییەکان گوێیان لە هاتنی پێغەمبەر بۆ شاری مەدینە بێت، ئەوان پێش عەرەبەکان موسڵمان بن.



هەر لەبەر ئەم هۆكارە بوو خوای پەروەردگار پێغەمبەری خوای ﷺ كردە حووجە و بەڵگە و دەلیلی تەواوەتی بەسەر ئەو گەلەوە، شێوە و ڕوخساری باشی نیشانی هاوەڵاندا بۆ مامەڵە كردن لەگەڵیاندا، تەنانەت بۆ دیبەیت و گفتوگۆ و قسەكردنیش هەر لەگەڵیاندا فەرمانیان پێكراوە بەباشترین شێوە بدوێین، ئەمەش هۆكارێكە بۆ ڕازیكردنی دڵی یەهوود و هاتنیان بۆ ناو دەوڵەتی ئیسلام، گومانی تێدانییە ئەمەش سەركەوتنێكی گەورەیە بۆ بانگەوازەكە، پاراستنی خەڵكێكی زۆرە لە ئاگری دۆزەخ.

ماكوان: بەڵام لەهەمان كاتدا خوای گەورە لە قورئانی مەككیدا باسی هەندێک لە نەریت و خراپی گەلی یەهوود كراوە، خۆشت فەرمووت نموونەی سورەتی الأعراف

﴿وَٱتَّخَذَ قَوۡمُ مُوسَىٰ مِنۢ بَعۡدِهِۦ مِنۡ حُلِيِّهِمۡ عِجۡلٗا جَسَدٗا لَّهُۥ خُوَارٌۚ أَلَمۡ يَرَوۡاْ أَنَّهُۥ لَا يُكَلِّمُهُمۡ وَلَا يَهۡدِيهِمۡ سَبِيلًاۘ ٱتَّخَذُوهُ وَكَانُواْ ظَٰلِمِينَ ١٤٨﴾

واتە: جا لە دوای چوونی مووسا (بۆ كێوی طور) قەومەكەی پەیكەری گوێرەكەیەكیان لە خشڵەكانیان دروست كرد، كە بۆڕەیەكی هەبوو! ئایا ئەوان نەیانزانی كە ئەوە بەڕاستی قسەیان لەگەڵدا ناكات و ڕێنموویان ناكات بۆ هیچ ڕێیەک، (سەیرە لەگەڵ ئەو هەموو كەم و كوڕیانەشدا) كردیان بەخوای خۆیان، ئەوانە ستەمكار بوون.

بۆ نموونە هاوەڵان بەلای كەمەوە دەیانزانی باووباپیرانی ئەمانە لە شاری مەدینە دەژین، ڕازی بوون بەوەی سوجدە بۆ گوێرەكەیەک بەرن، لەكاتێكدا مووسا (٣٠ یان ٤٠ ) ڕۆژ لێیان دووركەوتەوە.

هاوەڵان لە ماوەی (١٣) ساڵ دا لە شاری مەككەدا ڕۆژێک لە ڕۆژان بیریان لە كارێكی شیركی نەكردەوە، بەوەندەی تێگەیشتوون لە بەندایەتی بۆ پەروەردگار لەلایەن پێغەمبەری خوا ﷺ وە بەتەواوەتی هەموو ژیانیان لەسەر ڕاستەڕێگای ئیسلامەتی بوون، ئێ بەدڵنیاییەوە بۆ هاوەڵان جێگای سەرنج بووە، لەهەمانكاتدا لاشیان غەریب بوو خەڵكانێک ئیمانیان بە خوا و پێغەمبەر ﷺ هێناوە و پێغەمبەریان ﷺ لەگەڵدایە، بەڵام بەو شێوەیە مامەڵە دەكەن لەگەڵ بەندایەتی بۆ خوای پەروەردگار.

نومێر: ڕاستە، ئەوە مانای وانییە ئەوەی باسمان كرد لە قورئانی مەككی دژ بەیەک بن، نا بەڵكو پارسەنگی دایە هاوەڵان، ئەمەش واتای ئەوەیە هیوا و ئاواتیان لەسەر گەلی یەهوود یەكجار زۆر نەبێت و شێوە و ڕوخساری باشەی نیشان دان، بەڵام لەكۆتاییدا مرۆڤن و شەیتان و نەفس و دەسەڵات و كورسی و جەهلی خەڵكی لە كایەكەدا هەیە.



گەل و هۆزەکە لەسەرەتاوە خوار و خێچ لار و لەوێر بوون، بێئەدەب بوون تەنانەت، بەرامبەر پێغەمبەرەکەشیان ﷺ دەیانوت کە:

﴿قَالُوٓاْ أُوذِينَا مِن قَبۡلِ أَن تَأۡتِيَنَا وَمِنۢ بَعۡدِ مَا جِئۡتَنَاۚ قَالَ عَسَىٰ رَبُّكُمۡ أَن يُهۡلِكَ عَدُوَّكُمۡ وَيَسۡتَخۡلِفَكُمۡ فِي ٱلۡأَرۡضِ فَيَنظُرَ كَيۡفَ تَعۡمَلُونَ﴾

واتە: (قەومەکەی مووسا دیارە زۆر لە ناخۆشیدا بوون) بۆیە وتیان: پێش ئەوەی تۆ بێیتە ناومان و دوای ئەوەش کە هاتوویت (بارودۆخی ئێمە نەگۆڕاوە) هەر ئازاردراو بووین، مووسا وتی: ئومێد وایە پەروەردگارتان دوژمنەکەتان لەناو ببات و بتانکاتە جێنشین لە زەویدا، ئەوسا سەیرتان دەکات کە ئێوە چۆن کاردەکەن!

ئەگەر تەماشا بکەین چەند بێڕێز و بێئەدەب بوون بەرامبەر پێغەمبەرێکی ئولولعەزم، بێجگە لەمانە بگەڕێینەوە بۆ بەدواداچوونی گەل و هۆزی ئیسرائیل پەڕینەوە لە دەریای سوور، ئەو موعجیزەیان بینی و لەناوچوونی فیرعەونیان بینی، چی چوونە دێیەکەوە لەسەر کەناری دەریاکە بوون بتپەرست بوون لە جیاتی ئەم گەل و هۆزە بانگیان بکەن بۆ خواپەرستی و یەکتاپەرستی، کەچی داوایان کرد لە مووسا کە ئەمانیش خوایەکیان هەبێت وەکو ئەوان لەسەر زەوی بپەرستن:

﴿وَجَٰوَزۡنَا بِبَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ ٱلۡبَحۡرَ فَأَتَوۡاْ عَلَىٰ قَوۡمٖ يَعۡكُفُونَ عَلَىٰٓ أَصۡنَامٖ لَّهُمۡۚ قَالُواْ يَٰمُوسَى ٱجۡعَل لَّنَآ إِلَٰهٗا كَمَا لَهُمۡ ءَالِهَةٞۚ قَالَ إِنَّكُمۡ قَوۡمٞ تَجۡهَلُونَ﴾

واتە: لەوەودوا نەوەی ئیسرائیلمان لە دەریاکە پەڕاندەوە، دوای تاوێک ڕێیان کەوت لە خەڵکێک کە بەدەوری بتەکانیاندا دەخولانەوە و دەیانپەرستن، (دەستەیەکیان) وتیان: ئەی مووسا خوایەکیش بۆ ئێمە ساز بکە وەکو ئەوانە چەند خوایەکیان هەیە! مووسا پێی وتن: بەڕاستی ئێوە قەومێکن نەدەزانن و نەدەفامن...

هەروەها گەلێکن فەساد و خراپەکاری دروست دەکەن لەسەر زەوییدا، خوای گەورە لە سورەتی ئیسراء دا دەفەرمووێت:

﴿وَقَضَيۡنَآ إِلَىٰ بَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ فِي ٱلۡكِتَٰبِ لَتُفۡسِدُنَّ فِي ٱلۡأَرۡضِ مَرَّتَيۡنِ وَلَتَعۡلُنَّ عُلُوّٗا كَبِيرٗا﴾

واتە: (لە کتێبی تەوراتدا یا لە لوح المحفوظ دا) بڕیارمان داوە کە نەوەی ئیسرائیل (لە بەرنامەی ئێمە لادەدەن و یاخی دەبن) وە فەسادو خراپە لەسەر زەویدا ئەنجام دەدەن، (وە لە غەفڵەتی خەڵکیدا) زۆر گەشە دەکەن و دەسەڵاتێکی زۆر بەدەست دێنن.



خوای پەروەردگار دووجار دەفەرموویّت زاتی پاکی زانا ترە بەسەریانەوە پاشان دەفەرموویّت:

﴿وَقُلۡ جَآءَ ٱلۡحَقُّ وَزَهَقَ ٱلۡبَٰطِلُۚ إِنَّ ٱلۡبَٰطِلَ كَانَ زَهُوقٗا﴾

واتە: هەروەها بڵێ: تازە ئیتر حەق و ڕاستی هاتووە و بەرپا بووە، وە بەتاڵ و ناحەقی، پووچ و تەفرو توونا بووە، چونکە بەڕاستی ناحەق و بەتاڵ هەر تیاچووە و هەر بەسەر چووە و بەزیوە.

کەواتە ئەگەری ئەوەیان هەیە بگەڕێنەوە بۆ فەساد و خراپەکاری خوار و خێچی.

ئەمە لێرەوە تەواوەتی پارسەنگی ئەدات بە باسەکە، ئایا دەگەڕێنەوە بۆ خراپەکاری لە شاری مەدینەدا بەرامبەر بە پێغەمبەرێکی تر کە کۆتا پێغەمبەرە ﷺ، ئەمە پێویستی بە وەڵام و شیکاری هەیە.

ماکوان: کەواتە دەتوانیت بڵێیت گەلی یەهوود لای هاوەڵان بەم شێوە وێنا کرابوون بەشێوەیەکی پارسەنگ بێزیادەڕۆیی و کەمی، بەڵکو وەکو خۆی ئەوان لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ هاتنە ناو شاری مەدینە، دەیانزانی یەهوود وەکو ئەوان خاوەنی پەرتووکی ئاسمانین، هەروەها شوێنکەوتووی پێغەمبەرانن، بڕوا و ئیمانیان بە تاک و تەنهای خوای پەروەردگار هەیە.

بەڵام لەگەڵ ئەم هەموو نزیکییە، دەبێت خۆیان بەدووربگرن و ئاگادار و هۆشیار بن لەوەی یەهوود گەلێکن زۆر بێئەدەبن بەرامبەر بە پێغەمبەران -عليهم السلام-، زوو لە بەندایەتی گوێڕایەڵی خوای پەروەردگار هەڵدەگەڕێنەوە، دەستکاری شەرعی خوا دەکەن بە ئارەزووی خۆیان، جیاوازی شەرعی خوا دەکەن بە ئارەزووی خۆیان، جیاوازی بنەڕەتی دروست دەکەن لە زانستی ئایینەکەیاندا، سوپاسگوزاری کاری باشە نین، کوفر بە نیعمەتی خوا دەکەن، بەم دوو شێوە لە ئەرێنی و نەرێنی کە پارسەنگ بوو لای هاوەڵان وێنایان کێشرا و دید و تێڕوانینێکی هاوسەنگ لایانی دروست بوو، هیوایەکی باش و گەورە هەیە بۆ موسڵمان بوونیان، لە هەمانکاتدا دەبێت ئاگاداری پلان و فێڵی ئەم گەلەبیت وایە؟

نومێر: بەڵێ بەڕاستی وایە، هەر بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ ویستی بە جوانترین شێوە مامەڵەیان لەگەڵدا بکات تا زۆرێکیان ببنە موسڵمان.

**ماكوان: ئەرێ بەڕاستی پێغەمبەر ﷺ چۆن مامەڵەی لەگەڵدا کردن، یان بە پێچەوانەوە ئەوان چۆن مامەڵەیان لەگەڵ پێغەمبەری خوادا کرد کە تەشریفی هێنا بۆ شاری مەدینە.**

**نومێر: بەو پەڕی جوانی و ڕازی کردنی دڵیان پێغەمبەری خوا ﷺ مامەڵەی لەگەڵدا کردن، هەربەو ڕۆحەوە کاریکرد کە هەردوولا لەیەک گروپن ئەوانیش لە ئیمانداران هەژمار دەکرێن، بەڵام بە ئاڕاستەی وەحی خوای پەروەردگار.**



## هەوڵی پێغەمبەری خوا بۆ ڕاکێشانی دڵی یەهوود بۆ ئیسلام

نومێر: لە شاری مەدینەدا پێغەمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰٓ آلِهِۦ وَسَلَّمَ لە یەکەم ڕۆژی هاتنی بۆ ئەو شارە هەوڵی ئەوەی ئەدا دڵی یەهوود بەلای خۆیدا ڕابکێشێت، ئەوانیش وا هەستبکەن بەشێکن لە موسڵمانان و ئایینەکە لە یەک سەرچاوە هاتووە، پێغەمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰٓ آلِهِۦ وَسَلَّمَ هەڵسا بەچەند کارێک بە وەحی لەلایەن خوای پەروەردگار ئاڕاستە دەکرا.

کاری یەکەمی پێغەمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰٓ آلِهِۦ وَسَلَّمَ: موسڵمانان لەکاتی نوێژدا ڕوودەکەنە مزگەوتی قودس کەماوەی (١٦)مانگ یان (١٧) مانگ واتا ساڵێک و چەند مانگێک قیبلەی موسڵمانان و یەهوود وەکو یەک بوو تا نزیک بوونەوە لە جەنگی (بەدر) دوایی لەگەڵ ڕووداوەکاندا باسی دەکەم.

دەی کەواتە موسڵمان و یەهوود هەردووکیان ئەهلی کیتابن خاوەنی یەک ڕووگەن ئەمەش وای لێکردن کە خاوەنی یەک خوا و یەک ئایین و هەموو بڕوا و ئیمانیان هەیە بە پێغەمبەرانی ڕابردوو و خاوەن یەک ڕووگەشن!

لێرەدا یەک شتی زۆر سادە و ئاسایی دەمێنێتەوە ئەویش ئەوەیە یەهوود بڕوا بە پێغەمبەرایەتی (محمد) بهێنێت، لە کاتێکدا لە تەورات و ئینجیلەکەیاندا هاتووە نیشانە و دەرکەوتنەکانی هەمووی باسکراوە، هەر ئەم هۆکارەش بوو وای کرد پێغەمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰٓ آلِهِۦ وَسَلَّمَ سەرەتا قیبلە و ڕووگەیان لەگەڵدا یەکبخات بۆ ئەوەی بۆ جوولەکەکان ئاسان بێت بڕوا بە پەیامی ئیسلام بکەن ئەمەش بۆ لابردنی ململانێیە لە نێوان هەردوولادا و هیچ جۆرە ململانێیەک بۆ هەردوولا دروست نەبێت.

کاری دووەم: ڕۆژی عاشوورا بەڕۆژوو دەبوون، پێغەمبەر صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰٓ آلِهِۦ وَسَلَّمَ پرسی: ئەم ڕۆژە چییە وا ئێوە تێیدا بەڕۆژوو دەبن؟.

وتیان: ئەو ڕۆژەیە کە مووسا و گەلەکەی لەدەستی فیرعەون ڕزگاریان بوو، فیرعەون خنکا و نقوومی دەریا بوو، ئەم ڕۆژە زۆر گەورەیە لامان تێیدا بەڕۆژوو دەبین، سوپاسگوزاری خوای پەروەردگار دەکەین لە ڕزگاربوونمان لەدەستی فیرعەون.

پاشان پێغەمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰٓ آلِهِۦ وَسَلَّمَ فەرمووی: ئێمە لەپێشترین بۆ مووسا تاکو ئێوە، پێغەمبەری خوا بەڕۆژوو بوو، فەرمانیشی کرد بە موسڵمانان کە لەم ڕۆژەدا بەڕۆژوو بن، تا دوو ساڵ موسڵمانان و جوولەکە بەیەکەوە بەڕۆژوو دەبوون لە ساڵێکدا یەک ڕۆژ، ئەو ڕۆژەش



بۆ گەورە ڕاگرتنی پێغەمبەر مووسا بوو، بەڵکو لاسایی کردنەوەی مووسا پێغەمبەر بوو، هەموو ئەمانە بۆ ڕاکێشانی دڵی یەهوود بوو لەهەمانکاتدا بۆ ئیقامە حوجەت و نەهێشتنی هەنجەت بوو لە ڕۆژی قیامەت و لەدونیاشدا، بۆ ئەوەی بە یەهوود بڵێت ئێمە دوژمن نین بەڵکو هەموو یەک خودا دەپەرستین، ئیتر لێرەوە پێغەمبەری خوا ﷺ کەوتە بانگەشەی یەهوود بۆ ئایینی ئیسلام، چەند جار یەهوودی کۆ دەکردەوە بانگەوازی دەکردن لەناو گەل و هۆزی خۆیاندا، زۆرجار بەتەنها و بەگشتی و کۆمەڵ بانگی دەکردن بۆ ئیسلام، بەڵێ خەڵکانێک بەدەم بانگەوازەکەیەوە هاتن، لەناو هۆزەکانی جوولەکە لەهەرسێ بەشەکەی شاری مەدینە (قەینووقاع و نەزیر و قورەیزە)



## هەڵوێستی جوولەکە بەرامبەر بە ئیسلام

ماکوان: یەکەم کەس کێ بوو لە جوولەکەکانی شاری مەدینە موسڵمان بوو.

نومێر: یەکەم کەس کە موسڵمان بوو کەسێک بوو بەناوی حصەین بن سەلام[٤٤] دوای پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وعلى آله وسلم ناوی گۆڕی و ناوی نا (عبدالله کوڕی سەلام) کە گوێبیست بوو پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وعلى آله وسلم هاتۆتە شاری مەدینە، دەیزانی ناونیشانی پێغەمبەرێک هاتووە لەناو ئینجیل و تەورات دا، چونکە خۆی یەکێک بوو لە زانا ناودار و گەورەکانی ناو یەهوود، چوو بۆ لای پێغەمبەر صلى الله عليه وعلى آله وسلم بۆ ئەوەی تاقی بکاتەوە، ئایا ڕاستە پێغەمبەر صلى الله عليه وعلى آله وسلم خۆیەتی یان ڕاست نییە؟

چووە خزمەت پێغەمبەر صلى الله عليه وعلى آله وسلم و پێی فەرموو من سێ پرسیارت لێ دەکەم بێجگە لە پێغەمبەر صلى الله عليه وعلى آله وسلم هیچ جۆرە مرۆڤێکی تر نایزانێ وەڵامی بداتەوە، پرسیارەکانیش بریتین لە: یەکەم: پێم بڵێ یەکەم نیشانەی هاتنی ڕۆژی دوایی چییە؟

دووەم: یەکەم خواردنی خەڵکی ناو بەهەشت چییە؟

سێیەم: بەچیدا منداڵ دەچێتەوە سەر باوکی یان دەچێتەوە سەرماڵی خاڵوانی؟

پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وعلى آله وسلم فەرمووی: زوو جوبرەئیل وەڵامی پرسیارەکانتی پێ ڕاگەیاندووم، عبدالله وتی ئەم فریشتەیە دوژمنی یەهوودە، بەڵام پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وعلى آله وسلم بەردەوام بوو لە قسەکانی و فەرمووی: بە نیسبەت یەکەم نیشانەی قیامەت، ئاگرێکە لە ڕۆژهەڵاتەوە دەستپێدەکات بۆ ڕۆژئاوا و خەڵکی ڕاودەنێت لە ڕۆژئاوا، یان لە ناویان دەبات حەشریان دەکات.

بۆ پرسیاری دووەمت یەکەم خواردنی ئەهلی بەهەشت جگەری نەهەنگە، پاشان بۆ ئەوەی منداڵەکە بچێتەوە سەر ماڵی باوانی، ئاوی پیاو پێشگیر دەبێت لە ئاوی خێزانی، پێچەوانەکەی ئەگەر تۆ یاخود ئاوی ئافرەتەکە پێشگیر بوو لە تۆ و ئاوی پیاوەکەی منداڵ دەچێتەوە سەرماڵی خاڵوانی.

عبدالله کوڕی سەلام -ڕەزامەندی خوای لەسەر بێت- فەرمووی من شایەتمان دەهێنم تۆ پێغەمبەری خوایت صلى الله عليه وعلى آله وسلم، پاشان وتی ئەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وعلى آله وسلم

---

٤٤ ـ الحصين بن سلام.



یەهوود گەلێکی بوختانچین زۆر بەخراپ باسی خەڵکی دەکەن، دەمپیسن و لە ئاستی ئەوانەی کە ململانێیان دەکات، بەڵام پێش ئەوەی بزانن کە من موسڵمان بووم ئیسلامم هەڵبژاردووە، باسی منیان لێ بپرسە بزانە چۆن باسم دەکەن، دوای ئەوە من خۆم ئاشکرا دەکەم، پاشان یەهوود لە دەوری کۆبوونەوە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی کێ لە ئێوە ناوی عبدالله ی کوڕی سەلامە؟

ئەوانیش وتیان: ئەو کەسە زانا و زاناترینی ناو ئێمەیە و کوڕی زانای یەهوودە باشترین و چاکترینی خەڵکی ناو یەهوودە!

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی چی دەڵێن ئەگەر ئەو موسڵمان بێت و بڕوا بەمن بهێنێت؟!

وتیان: پەنا دەگرین بە خوا لەشتی وا.

عبداللەی کوڕی سەلام خۆی ئاشکرا کرد و فەرمووی: (أشهد أن لا اله الا الله وأشهد أن محمد رسول الله).

وتیان: خراپترین کەسی ناو یەهوودە!

پاشان چوو بەناو هەموو یەهوودا دەگەڕا و هاواری دەکرد ئەی گەلی یەهوود بۆ لەخوا ناترسن، سوێند بەخوای تاک و تەنها ئەوە پێغەمبەرە و هەمووتان باش دەزانن ئەوەی هێناویەتی و بانگەشەی بۆ دەکات حەقە و ڕاستییە.

لە وەڵامدا دەریان دەکرد و دەیانوت درۆ دەکەیت.[٤٥]

---

٤٥ ـ أَنَّ عَبْدَ ٱللَّهِ بْنَ سَلَامٍ ، بَلَغَهُ مُقْدَمُ ٱلنَّبِيِّ صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ٱلْمَدِينَةَ فَأَتَاهُ يَسْأَلُهُ عَنْ أَشْيَاءَ ، فَقَالَ : إِنِّي سَائِلُكَ عَنْ ثَلَاثٍ لَا يَعْلَمُهُنَّ إِلَّا نَبِيٌّ ، مَا أَوَّلُ أَشْرَاطِ ٱلسَّاعَةِ ؟ وَمَا أَوَّلُ طَعَامٍ يَأْكُلُهُ أَهْلُ ٱلْجَنَّةِ ؟ وَمَا بَالُ ٱلْوَلَدِ يَنْزِعُ إِلَى أَبِيهِ أَوْ إِلَى أُمِّهِ ؟ قَالَ : أَخْبَرَنِي بِهِ جِبْرِيلُ آنِفًا قَالَ ٱبْنُ سَلَامٍ : ذَاكَ عَدُوُّ ٱلْيَهُودِ مِنَ ٱلْمَلَائِكَةِ ، قَالَ : أَمَّا أَوَّلُ أَشْرَاطِ ٱلسَّاعَةِ فَنَارٌ تَحْشُرُهُمْ مِنَ ٱلْمَشْرِقِ إِلَى ٱلْمَغْرِبِ ، وَأَمَّا أَوَّلُ طَعَامٍ يَأْكُلُهُ أَهْلُ ٱلْجَنَّةِ فَزِيَادَةُ كَبِدِ ٱلْحُوتِ ، وَأَمَّا ٱلْوَلَدُ فَإِذَا سَبَقَ مَاءُ ٱلرَّجُلِ مَاءَ ٱلْمَرْأَةِ نَزَعَ ٱلْوَلَدَ ، وَإِذَا سَبَقَ مَاءُ ٱلْمَرْأَةِ مَاءَ ٱلرَّجُلِ نَزَعَتِ ٱلْوَلَدَ قَالَ : أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا ٱللَّهُ ، وَأَنَّكَ رَسُولُ ٱللَّهِ ، قَالَ يَا رَسُولَ ٱللَّهِ : إِنَّ ٱلْيَهُودَ قَوْمٌ بُهُتٌ فَاسْأَلْهُمْ عَنِّي ، قَبْلَ أَنْ يَعْلَمُوا بِإِسْلَامِي ، فَجَاءَتِ ٱلْيَهُودُ فَقَالَ ٱلنَّبِيُّ صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ : أَيُّ رَجُلٍ عَبْدُ ٱللَّهِ بْنُ سَلَامٍ فِيكُمْ ؟ قَالُوا : خَيْرُنَا وَابْنُ خَيْرِنَا ، وَأَفْضَلُنَا وَابْنُ أَفْضَلِنَا ، فَقَالَ ٱلنَّبِيُّ صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ : أَرَأَيْتُمْ أَنْ أَسْلَمَ عَبْدُ ٱللَّهِ بْنُ سَلَامٍ قَالُوا : أَعَاذَهُ ٱللَّهُ مِنْ ذَلِكَ ، فَأَعَادَ عَلَيْهِمْ ، فَقَالُوا : مِثْلَ ذَلِكَ ، فَخَرَجَ إِلَيْهِمْ عَبْدُ ٱللَّهِ فَقَالَ : أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا ٱللَّهُ وَأَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ ٱللَّهِ ، قَالُوا : شَرُّنَا وَابْنُ شَرِّنَا ، وَتَنَقَّصُوهُ ، قَالَ : هَذَا كُنْتُ أَخَافُ يَا رَسُولَ ٱللَّهِ. صحيح البخاري.



له یەکەم دەرکەوتنی موسڵمانبوونی جوولەکەیەک، ئیتر پێغەمبەری خوا ﷺ بۆی دەرکەوتن چەندە ئینکار و خراپەکار و قسە و باسیان دەگۆڕن لە چرکەساتدا!

لە ناو ئەو هەموو گەل و هۆزە کەمترین کەسیان لێ موسڵمان بوون، لە کاتێکدا چاوەڕوانی ئەوە دەکرا زۆریان لێ موسڵمان بێت، بەڵام زۆربەی یەهوود بەجوولەکەیی خۆیان مانەوە، لەکاتێکدا لە بەنوو قەینوقاع تەنها عبداللەی کوڕی سەلام موسڵمان بوو، دەڵێن چەند کەسێک بووە لە پەنجەی دەست تێپەڕ ناکات.

بەڵام بەنوو نەزیر هاتنە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ هەموو پیاو ماقوڵان و گەورە و زاناکانیان بریتی بوون لە: حوییەی کوڕی ئەخطەب[٤٦] و براکەی بە ناوی ئەبو یاسر کوڕی ئەخطەب[٤٧]، بەنوو نەزیر هۆزێکی بەهێز بوون، ناوداریان زۆر بوو لەوانە ئەبو رافعی سەلامی کوڕی ئەبی حوقەیق[٤٨]، سەلامی کوڕی موشکەم، کەعبی کوڕی ئەشرەف، ڕۆژێک هەندێک لە مانە چوونە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ خاتوو سەفییە دایکی ئیمانداران بۆمان دەگێڕێتەوە دەڵێت: باوکم و مامەم واتا حوییە و ئەبو یاسر چوون بۆ لای پێغەمبەر ﷺ و درەنگانێک گەڕانەوە، ماندوو تەمەڵ بوون لە شەودا هاتنەوە هەردووکیان لارە لار دەڕۆیشتن و بێزار و بێتاقەت بوون، ئەو دەمە زۆر منداڵ بووم، چووم بۆ لایان و هەندێک نازم کرد بەسەریاندا، ئەوەندە ماندوو بوون هەر ئاوڕیان لێنەدامەوە! ئەوەندە غەمبار و بێزاربوون ئەبو یاسری مامم بە باوکمی وت: ئەوە خۆیەتی؟! باوکم وتی: سوێند بەخوا خۆیەتی، مامەم وتی: خۆ دەیناسی و ئیسپاتی دەکەیت؟ وتی: بەڵێ دڵنیام کە خۆیەتی (واتا محمد پێغەمبەرە ﷺ) مامەم وتی: ئەی باشە چی بکەین چۆن هەڵسوکەوتی لەگەڵ بکەین؟

باوکم واتا (حوییە کوڕی ئەخطەب) وتی: تا لە ژیاندا مابم دژایەتی دەکەم!

ماکوان: مەنهەجەکەی زۆر ڕوون و ئاشکرا بوو، ئەوە مەنهەجی گشت یەهوودە دژی موسڵمان و ئیسلام بەگشتی، بەوپەڕی ڕاشکاوی دان بە دژایەتی ئەم دینە نوێیە دادەنێن، تا ئەم ڕۆژە ئەو مەنهەجە ڕوونە و پیادەی دەکەن، بەگشتی لای یەهوود ئەم دژایەتییە چەسپێنراوە، مەگەر زۆر کەم لە جوولەکە لەو بازنەیە دەرچووبێت.

ئەی لەو هۆزە کەس موسڵمان بوون نومێری برام؟

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

٤٦ ـ حي بن اخطب.

٤٧ ـ أبو ياسر بن أخطب.

٤٨ ـ رافع سلام بن أبي الحقيق، سلام بن مشكم، كعب بن أشرف.



نومێر: بەداخەوە لە گەل و هۆزی بەنوو نەزیر یەک کەس موسڵمان نەبوو! بۆ زانیاریتان حەتو بەنوو قورەیزەشدا یەک کەس موسڵمان نەبوو!

سبحان الله، هەڵوێستێکی زۆر عەجیبە لە چەندین جێگای تەورات دا باسی پێغەمبەر محمد صَلَّىٰ ٱللَّٰهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ کراوە، خۆیان دانیان پێیدا ناوە کەچی ئینکاری و ملهوڕی دەکەن، ئەم هەڵوێستە پێویستی بە شیکاری وردە بۆ باری دەروونی و باری سروشتی ئەم جۆرە مرۆڤانە و مامەڵەیان لەگەڵ پێغەمبەردا بەختیان هەیە پێغەمبەرە و ڕاستە و لای خوای پەروەردگارەوە هاتووە!

ماکوان: من بەلامەوە زۆر ئاساییە، ئەگەر تەماشای بەدواداچوونە قورئانییەکان بکەین لەسەر ژیانی یەهوود بەگشتی لەگەڵ پێغەمبەر مووسا -علیه السلام- زۆر بە ئاسایی وەری دەگرین.

تەماشای ئەم گەلە بکەیت جاری وا هەبوو سێ پێغەمبەر لە ناویاندابووە کەچی هەر لار و خوار و خێچ بوون مووسا -علیه السلام- پێغەمبەری ئولولعەزمە هاروونی برای، یوشەعی کوڕی نون، بێجگە لە پیاوچاکان و خواناسانیان، ئەو هەموو موعجیزەیان بینی لە کەرتبوونی دەریای سوور، لە باراندنی گەزۆ و باڵندەی برژاو بۆیان، گوێیان لە دەنگی خوای پەروەردگار بوو، بە فەرمانی خوا مردووی بۆ زیندووکردنەوە، ئاوی لە بەرد بۆ دەرهێنان و خواردیانەوە، کەچی چوون گوێرەکەیەکییان دروست کرد و پەرستیان، دەستکاری تەوراتیان کرد، تەنانەت پێغەمبەرەکانی خۆیان دەکوشت، ئیتر بۆچی لامان سەیربێت، سوور بزانن پێغەمبەری خوا محمد صَلَّىٰ ٱللَّٰهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ ڕاستە و حەقە، ئەی چۆن دژایەتی ناکەن، لە کاتێکدا شەریعەتی ئیسلام ڕێگانادات بە قۆرخ و ڕیبا و داوێنپیسی و خراپەکاری، ئەوانیش هەتا وەکو ئەمڕۆش لەسەر ئەم جۆرە کار و بازاڕانە دەژین.

بەڕاستی دەبێت شیکاری لەسەر ئەوە بکەین بزانین لەم ڕەوشە یەهوودی مەدینە چی دەکەن لە شاری مەدینەدا، لەکاتێکدا هەموو یەهوود ئیسلامیان ڕەت کردەوە، تەنها چەند کەسێک نەبێت نابنە ١٠ کەس، دەبێت ئەم یەهوودییانە چۆن مامەڵە لەگەڵ پێغەمبەر صَلَّىٰ ٱللَّٰهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ و دەوڵەتەکەیدا بکەن کە بەشەرعی خوا حوکم دەکات؟!

نومێر: لە ڕاستیدا چەند هۆکارێکیان گرتەبەر بۆ دژایەتی دەوڵەتی ئیسلامی لە مەدینەدا.



# دژایەتی یەهوود لە ناو دەوڵەتی ئیسلامیدا

نومێر: هۆکاری یەکەم دژی موسڵمانان بەکاریان دەهێنا بریتی بوو لە ورووژاندنی گومان: دەستیان کرد بەبڵاوکردنەوەی گومان و وروورژاندنی گومان بۆ تەڵخکردنی فیکری هاوەڵان لە شاری مەدینەدا، تەنانەت کاریگەریشیان لەسەر موشریکی مەدینە دانا ئەوانەی لە دەوریاندابوون، دەیانویست بێنە ناو ئایینی ئیسلام، ئەوەی موسڵمان بوو گومانیان بۆ دروست دەکردن، ئەوەش بەتەمای چوونە ناو ئیسلام بوو، هەر گومانیان بۆ دروست دەکردن پەشیمانیان دەکردنەوە، ڕاگەیاندنی یەهوود هەڵسا بەم کارانە، یەکێک لە گەورەترین کەرەستەکانی جەنگ یەهوود بەکاری دەهێنا دژی موسڵمانان ئەو گومانانە بوو بەکاریان هێنا بۆ نموونە: دەچوونە لای ئەنسار دەیانوت محمد ئەو پێغەمبەرە نییە کە ئێمە باسمان کردووە، ئەوە کتێبی خۆمانە و بەزمانی عیبری نووسراوە، عەرەب لێی تێناگات و ئێمە لەو کتێبەی خۆمان باشتر دەزانین.

وەرە بابڕۆین بۆ شاری مەدینە ئەمڕۆ موعازی کوڕی جەبەل[49] دەڕوات دیبەیتیان لەگەڵ دەکات.

بەپەلە کەوتینە ڕێ بۆ شاری مەدینە، نومێر بردمیە جێگایەک جێگای کۆبوونەوە و شوێنی زانا و پیاو ماقوڵانی یەهوود بوو کە چووین خەڵکێکی زۆر کۆبووینەوە، یەهوود ئەو گومانەیان بڵاودەکردەوە کە محمد ئەو پێغەمبەرە نییە پێشتر باسمان کردووە!

من و نومێر لەسەر تەپۆڵکەیەک دانیشتین و پیاوێکی گەنج یان بڵێم کوڕێکی گەنج و ئازا و چاو نەترسانە وتی: ئەی گەلی یەهوود، بۆچی لە خوا ناترسن و نابنە موسڵمان و ئیسلام بکەنە دینی خۆتان، مەگەر هەر خۆتان نەبوون بۆ ئێمەتان باس دەکرد بەم نزیکانە پێغەمبەرێک دێت پێغەمبەری کۆتا سەردەمە و دوای ئەو پێغەمبەرێکی تر نایەت! بە ئێمەتان دەوت لەگەڵ ئەو پێغەمبەرە لە گەڵتاندا دەجەنگین و دەتانووت هەروەک گەلی (عاد و ئیرەم).

هەر ئێوە بوون بەو پێغەمبەرە هەڕەشەتان لێ دەکردین، ئەوەتا خوای پەروەردگار ناردوویەتی، کەچی ئێوە بڕوای پێ ناکەن و کافرن پێی.

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

٤٩ ـ معاذ بن جبل.



من و نومێر هەر تەماشای ئەو کوڕە گەنجە هەڵکەوتەیە دەکەین بە ئازایەتی و مەردایەتی خۆی دەنگی زوڵاڵە و بە ئیسلام عەزیز بووە، یەک یەهوود نەیتوانی وەڵامی بداتەوە.

پاشان موعازی کوڕی جەبەل پێیانی فەرموو: هەر ئێوە بوون باسی سیفات و پێناسەی محمدتان بۆ دەکردین، ئەوەی ئێوە وتتان ڕاستە و وا هاتووە و لەناوماندایە، بۆ کافرن پێی؟ چی وای لێ کردوون گۆڕانکاریتان بەسەردا هاتووە؟

لە پڕ زانایەکی یەهوود دەرپەڕی بەناوی سەلامی کوڕی موشکەم، بە جلوبەرگی عەعبەدەکەیان و کڵاوێکی بچووکی لەسەردابوو، یەکێک بوو لە زاناکانی بەنوو نەزیر وتی: ئێمە شتی وا ناناسین، ئەمە ئەو کەسە نییە کە بۆتانمان باس دەکرد!

خوای پەروەردگار قورئانی دابەزاند بۆ پێغەمبەر ﷺ وەک ڕاگەیاندنێک دژ بە ڕاگەیاندنەکانی یەهوود و فەرمووی:

﴿وَلَمَّا جَآءَهُمْ كِتَـٰبٌ مِّنْ عِندِ ٱللَّهِ مُصَدِّقٌ لِّمَا مَعَهُمْ وَكَانُوا۟ مِن قَبْلُ يَسْتَفْتِحُونَ عَلَى ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ فَلَمَّا جَآءَهُم مَّا عَرَفُوا۟ كَفَرُوا۟ بِهِۦ ۚ فَلَعْنَةُ ٱللَّهِ عَلَى ٱلْكَـٰفِرِينَ ﴿٨٩﴾﴾

واتە: کاتێک کە لەلایەن خواوە کتێبێک (قورئان) هات بۆیان، کە: ئەو کتێبانەی ئەوانیش پەسەند دەکات و بەڕاستی دەزانی، بەمەرجێ پێشتر مژدەیان دەدا (بەهاتنی پێغەمبەر) بەو خەڵکەی کە خوانەناس و بێباوەڕ بوون، کەچی کاتێک (ئەو پێغەمبەرەیان) بۆ هات کە دەیناسن، بڕوایان پێ نەکرد، کەواتە با نەفرین و لەعنەتی خوا لەسەر کافران بێت.

پاشان موعاز بەجێی هێشتن و لەناوخۆیاندا بووە مقۆمقۆ، گوێمان لێیان بوو گەورە و زاناکانیان دەستیان کرد بە پیلانگێڕان و پیلانێکی زۆر پیس و ترسناکیان دانا، وتیان قسەیەکە و کردوومانە بۆ ئەوەی ڕووی خۆمان سپی بکەینەوە، هەندێکمان دەچینە ناو ئیسلام بەیانی موسڵمان دەبین و لە ئێوارەدا پەشیمان دەبینەوە، دەڵێین ئەمە ئەو دینە نەبووە کە باسمان کردووە، واز لە ئایینەکە دەهێنین و بۆ ئەوەی خەڵکیش واز لەم ئایینە بهێنێت، هەڵوێستی موسڵمانان لاواز دەکەین.

خوای پەروەردگار ڕاستەوخۆ ئایەتی ٧٢ی سورەتی آل عمران-ی دابەزاند و پیلانەکەی ئاشکراکردن:



﴿وَقَالَت طَّآئِفَةٞ مِّنۡ أَهۡلِ ٱلۡكِتَٰبِ ءَامِنُواْ بِٱلَّذِيٓ أُنزِلَ عَلَى ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَجۡهَ ٱلنَّهَارِ وَٱكۡفُرُوٓاْ ءَاخِرَهُۥ لَعَلَّهُمۡ يَرۡجِعُونَ﴾

واتە: دەستەیەک لە خاوەنانی کتێب (جووەکان) وتیان بە تاقمێکیان: ئێوە لە سەرەتای ڕۆژدا ئیمان و باوەڕ بێنن بەو (قورئانەی) کە بۆ ئیمانداران ڕەوانە کراوە، بەڵام لە کۆتایی ڕۆژدا و دەمەو ئێوارە پەشیمان ببنەوە (تا دوودڵی و فیتنەیان تیا دروست ببێ).

کاتێک کاتێک ئەو دەستەشیان ئاشکرا بوو، ئینجا هەوڵیاندا ئایەتەکان بە درۆبخەنەوە، لە قورئاندا خوای گەورە باسی بەهەشت دەکات بۆ ئیمانداران و دۆزەخیش بۆ ئەهلی کیتاب و ئەوانەی کە درۆدەکەن و کافرن، خوای پەروەردگار لە ئایەتی ٦ی سورەتی البینة دا دەفەرموویێت:

﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِنۡ أَهۡلِ ٱلۡكِتَٰبِ وَٱلۡمُشۡرِكِينَ فِي نَارِ جَهَنَّمَ خَٰلِدِينَ فِيهَآۚ أُوْلَٰٓئِكَ هُمۡ شَرُّ ٱلۡبَرِيَّةِ﴾

واتە: بەڕاستی ئەوانەی کە کافرن لە خاوەن کتێبەکان و موشریک و هاوەڵپەرستان دەخرێنە ناو ئاگری دۆزەخەوە و بە نەمریی تیایدا بۆ هەمیشە دەمێننەوە، چونکە ئەوانە تاوانبارترین کەس و خراپترینی خەڵکانی سەرزەوین.

ئینجا دەرحەق بەم سورەت و ئایەتە وتیان: ئێمە ناچینە ناو ئاگر مەگەر چەند ڕۆژێکی کەم وتیان(٧) ڕۆژ خوا سزامان دەدات و پاشان گەلی یەهوود دەچێتە بەهەشت، هەندێکی تریان وتیان نا تەنها (٤٠) ڕۆژ تاوانبارەکانمان لە ئاگردا دەمێننەوە، بەڵام ئاگری دۆزەخ بۆ موسڵمانانە و بەهەتا هەتایی لە ناو ئاگری دۆزەخ دا دەمێنینەوە، ئینجا خوای پەروەردگار وەڵامی دانەوە لە ڕێگای پێغەمبەرەوە لە سورەتی البقرةدا ئایەتی ٨٠-٨١ دەفەرموویێت:

﴿وَقَالُواْ لَن تَمَسَّنَا ٱلنَّارُ إِلَّآ أَيَّامٗا مَّعۡدُودَةٗۚ قُلۡ أَتَّخَذۡتُمۡ عِندَ ٱللَّهِ عَهۡدٗا فَلَن يُخۡلِفَ ٱللَّهُ عَهۡدَهُۥٓۖ أَمۡ تَقُولُونَ عَلَى ٱللَّهِ مَا لَا تَعۡلَمُونَ ۝ بَلَىٰۚ مَن كَسَبَ سَيِّئَةٗ وَأَحَٰطَتۡ بِهِۦ خَطِيٓـَٔتُهُۥ فَأُوْلَٰٓئِكَ أَصۡحَٰبُ ٱلنَّارِۖ هُمۡ فِيهَا خَٰلِدُونَ﴾

واتە: جولەکەکان دەڵێن: (چەندە گوناهبار بین) تەنها چەند ڕۆژێکی کەم لە دۆزەخدا دەمێنینەوە! پێیان بڵێ: باشە ئێوە پەیمانتان لەخوا وەرگرتووە تا خوای گەورە پەیمانەکەیتان بۆ بەرێتە سەر؟! یا هەر دەتانەوێت شتێک بڵێن بەدەم خواوە کە هیچ بناغەیەکی نییەو هەر نازانن (چی دەڵێن).



(چاک بزانن) ئەو کەسە گوناح و تاوان ئەنجام بدات و تاوانەکانی هەموو لایەکی دابگرێ (ئاشکرا و نادیاری) ئەو جۆرە کەسانە نیشتەجێی ئاگری دۆزەخن و بۆ هەمیشەیی تیایدا دەمێننەوە (لە هەر هۆز و تیرە و تایەفەیەک بن).

ئینجا پێغەمبەری خوا ﷺ تەشریفی هێنا و هەموویانی کۆکردەوە و فەرمووی ئەگەر ڕاست دەکەن و ئەم قسەیەتان ڕاستە وەرن هەردوو لامان لێرەدا داوای مردن دەکەین، ئەوەی درۆی کرد با خوای گەورە بیمرێنێت و بیخاتە بەهەشت یان ئاگری دۆزەخ؟!

یەهوود هەموویان بانگەوازەکەی پێغەمبەریان ڕەتکردەوە نەیانوێرا داوای مردن بکەن و تەمەنا بە مردن بخوازن، چونکە دەیانزانی محمد ﷺ پێغەمبەری حەقە و دەستبەجێ ئەوان دەمرن و دەچنە

دۆزەخ، خوای گەورە لە سورەتی البقرة دا دەفەرموویت:

﴿قُلْ إِن كَانَتْ لَكُمُ ٱلدَّارُ ٱلْءَاخِرَةُ عِندَ ٱللَّهِ خَالِصَةً مِّن دُونِ ٱلنَّاسِ فَتَمَنَّوُا۟ ٱلْمَوْتَ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ۝ وَلَن يَتَمَنَّوْهُ أَبَدًۢا بِمَا قَدَّمَتْ أَيْدِيهِمْ ۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌۢ بِٱلظَّٰلِمِينَ ۝﴾

واتە: (ئەی محمد ﷺ پێیان) بڵێ: ئەگەر ڕاست دەکەن و باوەڕتان وایە کە ماڵی ئەو دنیا (بەهەشت) لای خوا تایبەتی ئێوەیە نەک خەڵکی تر دە ئاواتی مردن بخوازن ئەگەر ڕاست دەکەن (تا زوو بچنە ناو بەهەشت)!

(بەڵام ئەوانە) بەهۆی ڕەفتاری نادروست و دەستپێشخەری ناپەسەندیانەوە هەرگیز ئاواتی مەرگ ناخوازن، خوایش چاک ئاگادارە لە حاڵی ستەمکاران.

داواکەی پێغەمبەری خوا پشت ڕاست دەکاتەوە.

چونکە دەیانزانی ئەگەر تەمەنای مردن بکەن دەستبەجێ دەمرن، پێغەمبەری خوا ﷺ سەردەکەوێ، ئەوەی کە دەمرێت درۆزنە، ئەوانیش باش دەیانزانی درۆ دەکەن، ئەمەش یەکەم کار نییە لەگەڵ پێغەمبەردا کردوویانە ﷺ، بەڵکو لەگەڵ پێغەمبەری خۆشیاندا هەمان کاریان دەکرد بۆ نموونە حەزرەتی سولەیمان عَلَيْهِ ٱلسَّلَامُ بە ساحیریان ناو دەبرد، داود عَلَيْهِ ٱلسَّلَامُ بە زیناکار، لوط عَلَيْهِ ٱلسَّلَامُ بەهەمان شێوە، ئەوەی لەگەڵ بەرژەوەندی خۆیاندا نەبوایە ڕەتی پێغەمبەرایەتیان دەکردەوە.

زۆر نەمانەوە، ئەوانیش مەجلیسی خۆیان داخست و بڵاوەیان پێکرد، ئێمەش وردە وردە گەڕاینەوە ژێر دەوارەکەمان (ڕەشماڵ) لە نزیک شاری مەدینە.



ماکوان: نومێر ئەی هۆکاری دووەمیان چی بوو؟ بۆ دژایەتی کردنی موسڵمانان لە شاری مەدینە؟

نومێر: هۆکاری دووەمیان جەنگی ئابووری بوو دژی موسڵمانان، توانایان نەما دژایەتی کردنی فیکر و بڵاوکردنەوەی گومان و شوبوهات، هەستان بەوەی ئاگرێکی تر خۆش بکەن بێجگە لە ئاگری گومان و ورووژاندنی شوبهات دژی موسڵمانان، ئەویش چوونە لای ئەنسار و دەیانوت بۆ پارە و سەروەت و سامانی خۆتان بۆ کەسێکی نەناسراو و غەریبە خەرج دەکەن، وازیان لێ بهێنن با بگەڕێنەوە بۆ جێگای خۆیان.

خوای گەورە لە سورەتی النساء دەفەرمووێت:

﴿ٱلَّذِينَ يَبۡخَلُونَ وَيَأۡمُرُونَ ٱلنَّاسَ بِٱلۡبُخۡلِ وَيَكۡتُمُونَ مَآ ءَاتَىٰهُمُ ٱللَّهُ مِن فَضۡلِهِۦۗ وَأَعۡتَدۡنَا لِلۡكَٰفِرِينَ عَذَابٗا مُّهِينٗا ٣٧﴾

واتە: ئەوانەی کە ڕەزیلی دەکەن و فەرمان دەدەن بە خەڵکی کە ڕەزیل بن، ئەو شتانەی کە خوا پێی بەخشیوون (لە ماڵ و سامان و زانستی) دەیشارنەوە و(نایەڵن کەس سوودی لێ وەرگرێت) (ئەوە بزانن) کە ئێمە بۆ خوانەناسان سزایەکی سەرشۆڕکەرمان ئامادە کردووە.

ئەم پلانەشی ئاشکراکردن و پێی ڕاگەیاندن ئەوان تەوراتی خۆیان دەشارنەوە و بەفێڵ و چرووک و ڕەزیلی بەهەمان چاوی خۆیان مامەڵەیان لەگەڵ ئەنساردا دەکرد.

ماکوان: هۆکاری تریان هەبوو بۆ دژایەتی کردنی موسڵمانان؟!

نومێر: بەڵێ هۆکاری سێیەمیان تەفرەقە و دەمی و دەمی گەل و هۆز و عەشیرەتگەرایی!

هەواڵی جیاوازی لێکترازانی ڕیزی موسڵمانانیان زۆر ئەدا، دەیانوویست ئەو پەیوەندییە بەهێزە لاواز بکەن کە پێغەمبەری خوا ﷺ لە ناو ئەو کۆمەڵگایەدا دروستی کردبوو.

کەسێک بەناوی (شاسی کوڕی قەیسی)[٥٠] لە پیاوە بەتەمەنە پیرەکانی یەهوود بوو، هەموو یەهوود گوێی بۆ دەگرێت، کۆبوونەوەیەکی کرد بە جوولەکەکان.

شاس وتی: ئەی گەل و هۆزەکانی یەهوود ئێوە باش دەزانن لەمەولا جێگا و شوێنی حەوانەوەتان زۆر ئەستەمە لە شاری (یەسریب)، بەڵکو هەر جێگاتان نەماوە لەم شارەدا،

---

٥٠ ـ شاس بن قيس اليهودي.



ئەگەر هاتوو نەوەکانی (قیلە) مەبەستی ئەوس و خەزرەج بوو یەکبگرن، چونکە دەیزانی ئەو هێزە کۆبێتەوە شان و شەوکەتی پێغەمبەر صَلَّىٰ ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰٓ ءَالِهِۦ وَسَلَّمَ بەو هۆکارەیە بەهێزبووە و دەوڵەتی دامەزراندووە، بۆیە وتەکەی زۆر واقیعی و ڕاست بوو، لێرە تێدەگەین ستراتیژی جوولەکە چەندە پیس و ترسناکە دەرحەق بە ئیمانداران، بە ئاشکرا وتی: ئەو کارە ئازاری ئێمەی جوولەکە ئەدات، هەر لەبەر ئەوەی دەیانزانی پێغەمبەری خوا صَلَّىٰ ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰٓ ءَالِهِۦ وَسَلَّمَ حەقە بەڵام ڕقیان لێبوو، هۆکارەکەش ئەوە بوو لە جوولەکە نەبوو بەڵکو عەرەب بوو!

هۆکاری تریشی زۆر لە پشتەوە بوو، هەڵبەت سەرەکیترینیان ئەمانە بوو، یەهوود پارە و سەروەت و سامانێکی زۆری هەبوو چەکیان دەفرۆشت بە ئەوس و خەزرەج، پێغەمبەر صَلَّىٰ ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰٓ ءَالِهِۦ وَسَلَّمَ کردنییە برا، ئەوان ئەو سەروەت و سامانەیان لەدەستدا بەشێکی گەورەی ئابووری یەهوود لاواز بوو.

شاس-ی کوڕی قەیس هەڵسا بە ناردنی دوو گەنج لە مەجلیسێکی ئەنساردا بریتیبوون لە ئەوس و خەزرەج، فێری کردن لەگەڵیاندا دابنیشێت بەدەنگی خۆش یەکەمیان سروودی جەنگی ئەوس بڵێت، گەنجە لاوەکەی تر وەڵامی بداتەوە سروودی جەنگی خەزرەج بڵێت و شانازی بەو مێژووە بکات و باسی ئازایەتی ئەو سەردەمە بکەن دژبەیەک، بیریان بخەنەوە ڕۆژی (بعاث) چی ڕوویداوە شیعر و دروشمەکانیان بڵێنەوە!

دوو گەنجە جوولەکەکە زۆر بەسەرکەوتوویی کارەکەیان ئەنجامدا لە ناخی هەردوولا ئەوس و خەزرەج، شەیتانی جوولەکە دەستی کرد بە جوڵاندنی سۆزی عەشیرەتگەرایی و دەمارگیری جاهیلییەت، هەردوو گەلەکە کەوتنە ململانێ و کێ ئازا بووە کێ شەڕی کردووە کێ زۆری لێ کوژراوە؟ دوو گەنجە جوولەکەکە ئاگرەکەیان خۆش کرد و لە هەمان کاتدا بە هێواشی ڕۆیشتن و ئەوان کەوتنە دەنگ بەرزکردنەوە لە یەکتری، پاشان شەیتان خودی خۆی کەوتە نێوان ئەوس و خەزرەج کە پایە بەرزەکانی ئیمان و هاوەڵان بوون، شەیتان بەناو دەمار و خوێنی مرۆڤدا دەڕوات، خوای پەروەردگار لە قورئانی پیرۆزدا یەهوود بەشەیتان ناویان دەبات:

﴿وَإِذَا لَقُوا۟ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ قَالُوٓا۟ ءَامَنَّا وَإِذَا خَلَوْا۟ إِلَىٰ شَيَـٰطِينِهِمْ قَالُوٓا۟ إِنَّا مَعَكُمْ إِنَّمَا نَحْنُ مُسْتَهْزِءُونَ ﴿١٤﴾﴾

واتە: کاتێکیش (دووڕووەکان) دەگەن بەوانەی باوەڕیان هێناوە دەڵێن: ئێمە ئیمانداریـن و باوەڕمان هێناوە! کەچی کاتێک بە تەنها دەمێننەوە لە لای شەیتانە گەورە و فێڵبازەکانیان



دەڵێن: بەڕاستی ئێمە لەگەڵ ئێوەین، بێگومان ئێمە تەنها گاڵتەیان پێدەکەین و پێیان ڕادەبوێرین!

دوو گەورە پیاوی ئەوس و خەزرەج هەڵسان شمشێریان لەیەک دەرهێنا و هەردوولا موسڵمان و هاوەڵ و ئەنسار بوون کەوتنە جەنگ، پاشان یەکێکیان وتی: ئەگەر ئەتانەوێت دەگەڕێینەوە بۆ جەنگ وەکو جاران، ڕۆژانی جاهیلەتیان بۆ کوشتنی یەکتر بەسەر دەبرد و یەهوود تەماشای دەکردن و پارە و سەروەت و سامانی ئەوانی دەبرد بۆ خۆیان.

ئەم جارە هەردوولا بە تەواوەتی تووڕە بوون و وتیان ڕازین و دەگەڕێینەوە بۆ جەنگ، پەیمان و کاتی جەنگ و شوێنمان با گەڕەک و جێگای (ئەلان) بێت، دیارە (ئەلان) جێگای جەنگیان بووە.

هەردوولا هاواریان کرد دەست بدەنە چەک خۆتان ئامادەکەن، شەیتان خۆشحاڵ بوو یاری بە دڵ و دەروونی ئەوان دەکرد و سەمای دەکرد بە هاوکاری برا جوولەکەکەی کارەکەی ئاسان بوو، چونکە دەیزانی چ کارەساتێک دەقەومێت.

لەوکاتەدا پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ لەناو مەجلیسێکی موهاجیرەکان بوو، هەواڵە ترسناکەکەی پێ گەیشت بە پەلە هەڵسا و وازی لەهەموو شتێک هێنا و چووە لای ئەنسار و کۆی کردنەوە، (جا ماکوان لێرەدا سەرنجت بۆ شتێک ڕادەکێشم جارێکی تر ئەم حاڵەتە دووبارە بوویەوە بەڵام بریتی نەبوون تەنها لە موسڵمانانی ئەوس و خەزرەج، بەڵکو قوڕەیش کارەکەی کرد موشریکی ئەوس و خەزرەجیان لەگەڵ بوو، سەرنج بدە پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ لەوێدا چۆن وتەی ئاراستەکردن و لێرەشدا چۆن وتە ئاڕاستە دەکات، جا ئەو فیقهی واقیعەی خستەوە بیرم، کە بەگوێرەی کات و شوێن جیاوازە ئەو دەمە عەبدوڵڵای کوڕی ئەبی سەلول ئەو کێشە و ئاژاوەیەی دروست کرد، ئەو دەمە بۆ چارەسەری ئەو کێشە پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ باسی عەشیرەت و هۆز و ئازایەتی و ڕۆحی بەرەنگاربوونەوەی بیرخستنەوە، چونکە هەردوولا موسڵمان و موشریکی تێدا بوون، بەڵام ئێستا تەنها خواناس و ئیمانداره‌کانن بۆتە جەنگیان).

هەر بۆیە پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ فەرمووی: ئەی موسڵمان و خواناسان، الله، الله ئەوە چ کارێکە داوای گەڕانەوە و بانگەواز بۆ جاهیلەت دەکەن، من لە نێوانتاندام و پێغەمبەرم و لەلایەن خواوە نێردراوم، کەچی بانگەشە بۆ جاهیلەت دەکەن.

واز لە نەتەوەپەرستی و هۆزگەرایی بهێنن، ئیتر دەڵێن ئەوس و خەزرەجی!؟ ئەم بانگەشەیە بانگەوازی جاهیلییە، لەکاتێکدا خوای گەورە هیدایەتی داون بۆ ئیسلام، بەڕێزی



کردوون بەم دینە، بەم دینە جاهیلیەتی لەناوتاندا نەهێشت، پاراستنی لە کوفر و دڵتانی پەیوەست کرد بەیەکەوە.

وتەکانی پێغەمبەر ﷺ لێرەدا بیرخستنەوەیە بەشەرعی خوا و ئیسلام و ئیمان، وتەکانی بە ئاراستەی بەهەشت و دۆزەخ.

پاشان دەستبەجێ هەردوولا زانیان چەندە هەڵەیەکی گەورە و ترسناکیان کردووە خێرا دڵ و دەروونیان لە شەیتان پاک کردەوە و گەڕانەوە بۆ لای خوای پەروەرگاریان و بە وتەکانی پێغەمبەر ﷺ کاریگەری تەواویان لەسەر دروست بوو، پەشیمان بوونەوە و باوەشیان بەیەکتردا کرد و پاشان هەموو لەگەڵ پێغەمبەر ڕۆیشتن بۆ مزگەوت.

هەر وەکو ئەوەی هیچ ڕووی نەدابێت، بەڵام ئەم کێشە و پڕۆژە شەیتانییەی شاس-ی کوڕی قەیس کە هەڵیگیرساندبوو لەناوجەرگەی موسڵماناندا، بۆمان دەردەکەوێت یەهوود چەندە ترسناکن، خوای پەروەردگار بۆ ئەوەی پڕۆژەی شەیتانی یەهوود لەبیر نەچێتەوە قورئانی دابەزاند لەسەر ئەو ڕووداوانە و چارەسەری بۆ کردن.

لەسەر شاس-ی کوڕی قەیس خوای پەروەردگار دەفەرمووێت:

﴿قُلْ يَـٰٓأَهْلَ ٱلْكِتَـٰبِ لِمَ تَكْفُرُونَ بِـَٔايَـٰتِ ٱللَّهِ وَٱللَّهُ شَهِيدٌ عَلَىٰ مَا تَعْمَلُونَ ﴿٩٨﴾ قُلْ يَـٰٓأَهْلَ ٱلْكِتَـٰبِ لِمَ تَصُدُّونَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ مَنْ ءَامَنَ تَبْغُونَهَا عِوَجًا وَأَنتُمْ شُهَدَآءُ ۗ وَمَا ٱللَّهُ بِغَـٰفِلٍ عَمَّا تَعْمَلُونَ ﴿٩٩﴾﴾

واتە: (هەروەها) بڵێ: ئەی خاوەنی کتێبی بۆچی دژایەتی ڕێبازی خوا دەکەن، دەتانەوێت ئەوەی باوەڕی هێناوە (پەشیمانی بکەنەوە) و ڕێبازەکەی بە پووچ بخەنە بەرچاو؟ خۆ خۆتان چاک دەزانن و شایەتن (کە من تەنها ئایینی ئیسلامم لا پەسەندە)(دڵنیاش بن) کە خوا غافڵ و بێ ئاگا نییە لەو شتانەی کە دەیکەن.

پاشان لەسەر ئەوس و خەزرەج خوای پەروەردگار دەفەرمووێت:



﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِن تُطِيعُواْ فَرِيقًا مِّنَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلْكِتَـٰبَ يَرُدُّوكُم بَعْدَ إِيمَـٰنِكُمْ كَـٰفِرِينَ ﴿١٠٠﴾ وَكَيْفَ تَكْفُرُونَ وَأَنتُمْ تُتْلَىٰ عَلَيْكُمْ ءَايَـٰتُ ٱللَّهِ وَفِيكُمْ رَسُولُهُۥ ۗ وَمَن يَعْتَصِم بِٱللَّهِ فَقَدْ هُدِىَ إِلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿١٠١﴾﴾

واتە: ئەی ئەوانەی کە باوەڕتان هێناوە ئەگەر گوێڕایەڵی هەندێک لەوانە بن کە کتێبی (ئاسمانییان) پێ دراوە دوای ئەوەی کە ئێوە باوەڕتان هێنابوو، دەتانخەنەوە سەر ڕێبازی کوفرو بێباوەڕی.

جا ئێوە چۆن کافر دەبن لە کاتێکدا کە ئایەتەکانی خواتان بەسەردا دەخوێنرێتەوە، پێغەمبەرەکەی لەناوتانایە (دوای وەفاتیشی سەلامی خوای لێ بێت بە سیرەتی پاک و بێگەردی هەر لە ناوماندایە) جا ئەوەی پشت بە خوا ببەستێت و پەیڕەوی لە بەرنامەکەی بکات، ئەوە بۆ ڕێگە و ڕێبازێکی ڕاست و دروست هیدایەت دراوە.

پاشان لەسەر چارەسەری کێشەکان خوای پەروەردگار دەفەرمووێت:

﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِۦ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسْلِمُونَ ﴿١٠٢﴾ وَٱعْتَصِمُواْ بِحَبْلِ ٱللَّهِ جَمِيعًا وَلَا تَفَرَّقُواْ ۚ وَٱذْكُرُواْ نِعْمَتَ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ إِذْ كُنتُمْ أَعْدَآءً فَأَلَّفَ بَيْنَ قُلُوبِكُمْ فَأَصْبَحْتُم بِنِعْمَتِهِۦٓ إِخْوَٰنًا وَكُنتُمْ عَلَىٰ شَفَا حُفْرَةٍ مِّنَ ٱلنَّارِ فَأَنقَذَكُم مِّنْهَا ۗ كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمْ ءَايَـٰتِهِۦ لَعَلَّكُمْ تَهْتَدُونَ ﴿١٠٣﴾﴾

واتە: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە لە خوا بترسن و پارێزکار بن بەشێوەیەکی وا کە شایستەی ئەو زاتەیە، (هەمیشە پابەند و دامەزراو بن لەسەر ئیسلامەتی، بۆ ئەوەیە هەرکاتێ مردن) بە ئیمان و ئیسلامەتی نەبێت نەمرن.

(هەوڵ بدەن) هەر هەمووتان بە توندی دەست بگرن بە ئایینی خواوە و پەرت و بڵاو مەبن، یادی نازو نیعمەتی خوا بکەنەوە لەسەرتان، (چونکە) کاتی خۆی دوژمنی یەکتر بوون، کەچی دڵەکانتانی بە هۆی نیعمەتی (ئیسلامەوە) پەیوەست کرد بە یەکەوە و هەموو بوونە برای یەکتر (هەروەها ئەو کاتە) ئێوە لەسەر لێواری چاڵێکی ئاگر وەستابوون و (خەریک بوو بکەونە ناوی)، بەڵام خوا (بەڕەحم و میهرەبانی خۆی) لەو ئاگرە ڕزگاری کردن، ئا بەو شێوەیە خوا ئایەتەکانی خۆیتان بۆ ڕوون دەکاتەوە، بەڵکو هیدایەت وەرگرن.



**ماکوان:** ئەگەر تەماشای سورەتی البقرة و آل عمران بکەین، هەردوو سورەتەکە لەیەک زەمەندا دابەزیبوون، هەموو بۆ وەڵامدانەوەی چارەسەری کێشەکانی ئەهلی کیتاب و موشریکەکان دەرحەق بە موسڵمانانە.

**نومێر:** بەڵێ بەدڵنیاییەوە یەهوود هەمیشە لە هەوڵی ئەوەدابوو لە ڕێگای گومان و ئابووری و جەنگی دەمارگیری ئاشووب و کێشە دروست بکات، خوای گەورە ئاراستەی دەکردن بە سورەتی البقرة، آل عمران و النساء ئایەت لەدوای ئایەت دابەزی، بەڵام موسڵمانان جەنگیان نەدەویست بەڵکو تورەبوونەکانی خۆیان دەشاردەوە دەیانویست هیچ پێداکێشانێک ڕوونەدات، خوای گەورە دەفەرمووێت:

﴿وَدَّ كَثِيرٌ مِّنْ أَهْلِ ٱلْكِتَـٰبِ لَوْ يَرُدُّونَكُم مِّنۢ بَعْدِ إِيمَـٰنِكُمْ كُفَّارًا حَسَدًا مِّنْ عِندِ أَنفُسِهِم مِّنۢ بَعْدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُمُ ٱلْحَقُّ ۖ فَٱعْفُوا۟ وَٱصْفَحُوا۟ حَتَّىٰ يَأْتِىَ ٱللَّهُ بِأَمْرِهِۦٓ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ﴿١٠٩﴾﴾

واتە: زۆرێک لە خاوەن کتێبەکان ئاواتەخوازن لەبەر حەسوودی و ناپاکی خۆیان ئەگەر بۆیان بکرێ بتانگێڕنەوە ڕیزی بێباوەڕان، ئەمەش دوای ئەوەی کە حەق و ڕاستییان بەتەواوی بۆ ڕوون بۆتەوە و (چوونەتە ڕیزی باوەڕدارانەوە)، بەڵام ئێوە هەر لێیان ببوورن و لێیان مەگرن و چاوپۆشییان لێ بکەن، تا خوا کاری خۆی ئەنجام دەدا و ویستی خۆی جێبەجێ دەکات، بێگومان خوا دەسەڵاتی بەسەر هەموو شتێکدا هەیە.

ئەگەر تەماشای ڕووداوەکان بکەین سەرپێچی یەهوود زۆر بوون، بەڵام سەرپێچییەکان نەگەیشتە ئاستی جەنگ و یەکتر لە ناوبردن، بەڵام کاتێک یەهوود هاوکاری دوژمنەکانی موسڵمانانی کرد سنووری تێپەڕاند، بووە هۆی دەرپەڕاندنیان لە شاری مەدینەوە و پەشیمان کردنەوەیان لە ئایینی ڕاستەقینەی خودای میهرەبان.

هەربۆیە تا ئەم ساتەوەختە، هەرداوا لە پێغەمبەر صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ دەکرێت لە ڕێگای وەحیەوە کە لێبووردە و لێخۆش بوو بێت، بۆ ئەوەی هەر بانگەواز بکەن، بانگەوازەکەیان بگاتە لای یەهوودی خیانەتکار و درۆزن و ئینکار، هەوڵی بانگەواز بەردەوام بوو موسڵمانان خۆیان بەدوور دەخستەوە لە ململانی و جەنگ و ئاشووبیان، چونکە پێغەمبەر صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ هێزی موسڵمانانی دەزانی، دەیزانی لە سەرەتادان و توانای هێزی سەربازیان کەمە. یەهوودیش هێزێکی زۆر گەورەیە، خۆ گلان لە جەنگێکی واو چوونە ناو جەنگی یەهوود لە ئێستادا لە بەرژەوەندی موسڵماناندا نییە، ئەمەش پێی دەوترێت فیقهی واقیع، موسڵمانان لە ئێستادا ئارامگر و خۆگربن باشترین چارەسەرە.



بەڵام بەداخەوە ئەو هەموو ئارامگری موسڵمانان هانی یەهوودیدا بۆ کاری قێزەون و خراپەکاری تر، زۆر لە کارەکانی تریان گەورەتر بوو.

ماکوان: زۆر ڕاستە، سبحان الله هەتا وەکو ئەمڕۆش واتا سەدەی ئێستامان یەهوود هەر ئەوسێ هۆکارە بەکار دەهێنێت کە هۆکاری نغرۆکردنی گەل و نەتەوەکانی ترە، ئابووری قۆرخکراو بەشی لێ جیا دەبێتەوە لە چەک و ڕیبا و بانک...هتد.

شوبهە و گومان کاری یەهوود و بەچکە یەهوودییەکانە بەناوی جۆرا و جۆرەوە لە شوعیەت و فرۆید و داروینزم و...هتد، بەشێکی زۆری لە ڕاگەیاندندا بەکار دەهێنێت وەکو تەلەفزیۆن و بەرنامەکان بەگشتی و هۆڵیود و بۆڵیود و پۆڕن و فیلم کە هەمووی یەهوود دەستی بەسەر داگرتووە.

دووبەرەکی نانەوە و ئاشووب و نەتەوەگەرایی و دامەزراندنی دەوڵەت، ئا ئەوانە هەمووی سەرچاوەکەی یەهوودە توانیان دونیا دابەش بکەن بەو پێکهاتەی خۆیان دەیانەوێت.

بەهەرحاڵ چیتر ڕوویدا لە نێوان جوولەکەکانی مەدینە و موسڵماناندا بۆم باس بکە نومێر.

نومێر: ئەم جارەی ئەوەی ڕوویدا لەگەڵ ئەبوبەکری صدیق ڕوویدا -ڕەزامەندی خوای لەسەر بێت- وەکو وتمان یەهوود خاوەنیماڵێکی زۆر گەورە بوو ناوی(میدراس) بوو، لەوێدا یەهوود فێری تەورات و زانستەکانی تەورات دەبوون، هەمیشە پڕبوو لە ئەحبار و زانا و حیبرییەکانیان، یەکێک لە حیبرییەکانی یەهوود ناوی (فینحاص) بوو لەگەڵ کەسێکی تر بە ناوی (ئەشیع)، ئەبوبەکر خۆی کرد بەناو میدراسەکەیان بۆ ئەوەی بانگەوازیان بکات، چونکە هاوەڵان هەموو ژیانیان بریتی بوو لە ئیسلام و بانگەوازەکەی، تەماشای کردن هەموو تەورات دەخوێنن بەڵام بەو شێوەیەی کە یەهوود دەستکاریان دەکرد و مانایان بۆ دادەتاشی و ساختەیان دەکرد، زۆرێک لە ڕاستییەکانیان دەشاردەوە لەبەر بەرژەوەندی ئابووری و دەسەڵاتی خۆیان، ئەبوبەکر داوای لێکردن تەورات نەشارنەوە بۆ خەڵکی بخوێننەوە کە باسی پێغەمبەر محمدی ﷺ تێدا هاتووە، زانی فینحاس دەیشارێتەوە ئەبوبەکر ڕووی کردە فینحاس و وتی لەخوا بترسە وەڵڵا تۆ دەزانیت محمد ﷺ نێردراوی خوای پەروەردگارە، ئەوەی هێناویەتی حەقە و لەناو تەوراتەکەتاندا نووسراوە، هەروەها لە ئینجیلیشا وا نووسراوە.

فینحاس وەڵامی دایەوە: جا تەماشای وەڵامەکەی بکە (١٤٠٠) ساڵ بەر لەئێستا چییان وتووە، جا ئاخۆ ئێستا چی بڵێن؟! چۆن مەوزوعەکە و باسەکە خێرا دەگۆڕن؟



وتی: ئەبوبەکر وازمان لێبهێنە ئێمە خوایەک ناپەرستین فەقیر بێت (حاشا لله) هەروەها دەتێت ئەو خوایەی ئێوە و موسڵمانان داوای پارە و سواڵ دەکات (پەنا بەخوا) لە ئێوەی بێ پارە و سامان، ئێمە خوای وامان ناوێت و دەوڵەمەندین، ئەو خوایەی ئێوە دەوڵەمەند نییە، خۆ ئەگەر دەوڵەمەند بوایە، داوای قەرزی لەئێوە نەدەکرد وەکو هاوڕێکەت محمد صلى الله عليه وعلى آله وسلم دەڵێت، ئەو ڕێگریتان لێ دەکات لە ڕیبا کەچی خواکەتان ڕیبا ئەدا.

﴿إِن تُقْرِضُواْ ٱللَّهَ قَرْضًا حَسَنًا يُضَٰعِفْهُ لَكُمْ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ۚ وَٱللَّهُ شَكُورٌ حَلِيمٌ ١٧﴾

واتە: ئەگەر قەرز بدەن بە خوا، بەشێوەیەکی چاک (مەبەست بەخشینی ماڵ و سامانە لەبەر خوا) چەند بەرانبەری دەکات بۆتان، هەروەها لێتان خۆش دەبێت، خوا زۆر سوپاسگوزارو خۆڕاگرە، (لەسەر بەخشین کە هەر بەخششی خۆیەتی سوپاسگوزارە، مۆڵەتی بەزیلەکانیش دەدات تا کاتی خۆی).

فینحاس: ئەمە جۆرێکە لە ڕیبا خوای گەورە بۆتان زیاد دەکات، چۆن لەکاتێکدا ئەو ڕێگرە لە ڕیبا و خۆی بۆتان زیاد دەکات، تەماشای ئەقڵی پووکاوەی بکە وای داناوە خوای گەورە پارەکە بۆ خۆی وەردەگرێت، نازانێت بۆ فەقیر و هەژارانە و خوای گەورە پاداشتەکەی بۆ چاکەی مرۆڤەکان زیاتر دەکات و هانیان ئەدات بۆ کاری چاکە و بەخشین و چاکەخوازی، بەڵام جوولەکە لەبەر ئەوەی پیسکە و پیسن، چونکە قسەکانی دەلالەتە لە سەر بۆگەنی ناخیان و پیسی دەروونیان ڕووخاوی نەفس و لەناوچوون و عیززەتیان، لەسەرێکی گەورە پڕ لە فێڵ و تەڵەکەبازی، بەڵام زۆر سادە و ساکار و درۆکانیان بۆ خەڵکی ئاقڵ زوو ئاشکرا دەبێت.

ماکوان: ئەی ئەبوبەکر چۆن وەڵامی دایەوە بەرامبەر ئەو قسە گەورە و کوفرە گەورەیەی کردی؟!

نومێر: لەڕاستیدا بە قسە وەڵامی نەداوە، ئەبوبەکر خۆی پێنەگیرا و کوفرەکانی فینحاس کاریگەری لەسەر ئیمان و دڵ و دەروونی ئەبوبەکر دانا و هەتا توانی کێشای بەدەمی فینحاس دا یان کێشای بەدەموچاویدا، بەگشتی بەڵام ئەوەندەی پێیدا کێشا کە لەبەر خوێن دەموچاوی ون کرد و نەدەبینرا ئەبوبەکر توانای نەما لە ئاستی کوفرە گەورەکەیدا وەڵامی نەداتەوە، بیکاتە گفتوگۆ و دەمە دەمێ، نا- لێرەدا جێگای دیبەیت نییە، بەڵکو ئەو ئیهانە و قسەی زفت بەرامبەر بەخوا دەکات، پێویستە بەدەست وەڵامی بدرێتەوە.

ماکوان: ئەی کەس پەلاماری ئەبوبەکری نەداوە؟!



نومێر: نا، جوولەکە ترسنۆکن، دوای ئەوەی کە لێیدا ئەبوبەکر جێی هێشت، بەڵام ئەو دوژمنی خوای پەروەردگارە، چوو لای پێغەمبەر ﷺ سکاڵای لە ئەبوبەکر کرد، بە پێغەمبەری خوا ﷺ ی وت تەماشاکە هاوەڵەکەت ئەبوبەکر چی لێکردووم، لەدوای ئەوەی پرسیاری کرد لە ئەبوبەکر زۆری لا سەیر بوو پێغەمبەری خوا ﷺ کە ئەبوبەکر بەو جۆرە لێیداوە، فەرمووی ئەوەچی وای لێکردوویت وا لێی بدەیت، ئەبوبەکر فەرمووی بە پێغەمبەری خوا ﷺ ئەم دوژمنی خوایە قسە و کوفرێکی زۆر گەورەی کردووە، دەڵێت خواکەتان فەقیرە و ئێمە دەوڵەمەندین، ئەو کوفرەی کرد خۆم پێ نەگیرا و لەبەر خوا کێشام بەدەموچاویدا.

فینحاس: شتی وام نەوتووە ئەبوبەکر شاهێدت هەیە؟!

خوای گەورە ئایەتی دابەزاند بۆ ڕاستگۆیی ئەبوبەکر:

﴿لَّقَدْ سَمِعَ ٱللَّهُ قَوْلَ ٱلَّذِينَ قَالُوٓا۟ إِنَّ ٱللَّهَ فَقِيرٌ وَنَحْنُ أَغْنِيَآءُ ۘ سَنَكْتُبُ مَا قَالُوا۟ وَقَتْلَهُمُ ٱلْأَنۢبِيَآءَ بِغَيْرِ حَقٍّ وَنَقُولُ ذُوقُوا۟ عَذَابَ ٱلْحَرِيقِ ﴿١٨١﴾﴾

واتە: بێگومان خوای پەروەردگار گوفتاری (نابەجێی) ئەو (جولەکانەی) بیست کە وتیان: خوا هەژارە و ئێمە دەوڵەمەندین! ئێمە ئەو گوفتارانە یاداشت و تۆمار دەکەین لەسەریان، هەروەها کوشتنی پێغەمبەران بە دەستی ئەوان بە ناحەق لەسەریان دەکەوێت، (لە دۆزەخیشدا) پێیان دەڵێین: بچێژن سزای ئاگری سوتێنەر.

بەم شێوەیە خوای پەروەردگار قسەکانی ئەبوبەکری بەرامبەر بە فینحاس پشت ڕاستکردەوە.

پاشان خوای پەروەردگار هەر دەرحەق بەکارەکەی ئەبوبەکر نرخاندی و باشی کارەکەی ئایەتێکی تری لەسەر دابەزاند:

﴿۞ لَتُبْلَوُنَّ فِىٓ أَمْوَٰلِكُمْ وَأَنفُسِكُمْ وَلَتَسْمَعُنَّ مِنَ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَـٰبَ مِن قَبْلِكُمْ وَمِنَ ٱلَّذِينَ أَشْرَكُوٓا۟ أَذًى كَثِيرًا ۚ وَإِن تَصْبِرُوا۟ وَتَتَّقُوا۟ فَإِنَّ ذَٰلِكَ مِنْ عَزْمِ ٱلْأُمُورِ ﴿١٨٦﴾﴾

واتە: بێگومان تاقی دەکرێنەوە لە ماڵ و دارایی و خۆیشتانا (زەرەر لە ساماندا دەکەن، خۆتان تووشی ناخۆشی و ئازار دەبن) هەروەها لە خاوەنانی کتێبی پێش خۆتان و لە موشریک و هاوەڵپەرستانەوە ئازارێکی زۆر دەبیسن (ئەوەندە بوختان و قسەی نابەجێتان بۆ هەڵدەبەستن، وەک ئازار بەرگوێتان بکەوێت وایە) بەڵام ئەگەر خۆ ڕاگر بن و پارێزکار بن و لە



خوا بترسن و (لە سنووری دەرنەچن) بەڕاستی ئەو هەڵوێستە لە کارە پەسەند و کردەوە بەدادەکانە.

ئەبوبەکر لەگەڵ ئەو تورەبوونەی ویستی بیکوژێت، بەڵام لەبەر ئەوەی پەیمان و یاسا و قانون لە نێوانیاندا بوو ڕێزی یاسا و دەستووری گرتو بە ئاشکرا بە فینحاسی وت: ئەگەر نێوانماندا پەیمان نەبوایە بە کوشتن کۆتایی دەهات، هەر بۆیە خوای گەورە ئایەتی (١٨٦) دابەزاند.

خۆ ئەگەر بیهێنایە و بیکوشتایە موسڵمان تووشی فیتنە و شەڕ و جەنگی ئاشووبی زۆر دەبوونەوە، ئەوەی باسی دەکەین هەمووی (٦) مانگی سەرەتا بۆ ساڵێک موسڵمان لە شاری مەدینەدا دەوڵەتیان دامەزراندووە و پێغەمبەر صَلَّىٰ ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰٓ آلِهِۦ وَسَلَّمَ تەشریفی هێناوە بۆ شاری مەدینە.

ماکوان: کەواتە ڕەوشەکە زۆر ترسناکە، هەمووی ساڵێک نابێت موسڵمانان دەوڵەتیان دامەزراندووە، ئەگەری هێرشی قورەیش زۆر زۆرە، پاشان ئەگەری مامەڵەی قورەیش لەگەڵ یەهوود دا، چونکە یەهوود هەڵوێستیان زۆر ڕوون و ئاشکرایە کە ئەوان ڕەتیان کردەوە ئیمان وەربگرن، ئەگەری ئەوە زۆر نزیکە کە قورەیش و یەهوود بەیەکەوە دەست تێکەڵ بکەن بۆ لێدانی موسڵمانان، یاخود ئەگەر بەچاوی گەورەتر تەماشای ڕەوشەکە بکەین موشریکی مەدینە لە هەردوولا یان ڕق ئەستوورترە، ئەو سێ هێزە گەورەی دونیا بە ئەعرابە دەشتەکییەکان لەو لاوە بوەستێت ژیانیان لەسەر چەتە و دزی بونیادناوە تا ئێستاش هەر بە موسڵمانان وتراوە خۆتان بپارێزن لە جەنگ و کوشتار، خوای گەورە دەفەرموێت: (وأعرض عن المشركين) زۆر سەختە کە موسڵمان لە بەرامبەر ئەم هەموو هێزەدا وەکو گورگ کەڵبەیان تیژ کردووە لە موسڵمانان دەبێت ئەم بنەمای خۆ پارێزییە بگۆڕێت بۆ پاریزگاری کردن لە خۆت، وایە؟

نومێر: بەڵی بەدڵنیاییەوە وایە پێشتر وەکو وتت هەر خۆ پاراستن بوو لە شەڕ و ڕووبەڕووبوونەوە، بەڵام وا لە هەموو لاوە تەنگیان پێ هەڵچنراوە، پێویستە بەرگری لەخۆیان بکەن، بۆ ئەم مەبەستە خوای گەورە ڕێگای پێدان پارێزگاری لە خۆیان بکەن تا دوژمنەکانیان زرتەبۆر نەبن بەسەریاندا و خوای گەورە لە سورەتی الممتحنة دەفەرموێت:



﴿لَّا يَنْهَىٰكُمُ ٱللَّهُ عَنِ ٱلَّذِينَ لَمْ يُقَٰتِلُوكُمْ فِي ٱلدِّينِ وَلَمْ يُخْرِجُوكُم مِّن دِيَٰرِكُمْ أَن تَبَرُّوهُمْ وَتُقْسِطُوٓاْ إِلَيْهِمْۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُقْسِطِينَ۝ إِنَّمَا يَنْهَىٰكُمُ ٱللَّهُ عَنِ ٱلَّذِينَ قَٰتَلُوكُمْ فِي ٱلدِّينِ وَأَخْرَجُوكُم مِّن دِيَٰرِكُمْ وَظَٰهَرُواْ عَلَىٰٓ إِخْرَاجِكُمْ أَن تَوَلَّوْهُمْۚ وَمَن يَتَوَلَّهُمْ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ۝﴾

واتە: (دڵنیاش بن) کە خوا جڵەوگیری ئەوەتان لێناکات کە چاک ڕەفتار و دادپەروەر بن لەگەڵ ئەو کەسانەدا کە جەنگیان دژ نەکردوون و دژایەتی ئاینیان نەکردوون و لە شوێنەکانتان دەریان نەکردوون، چونکە بە ڕاستیی خوا دادپەروەرانی خۆشدەوێت.

بەڵکو خوا تەنها قەدەغەی ئەوەتان لێدەکات کە پشتیوانی بکەن لەوانەی کە جەنگیان بەرپاکرد دژی ئاین و دەریانکردن لە شوێنەواری خۆتان، زۆر بە زەقیی دەوریان هەبوو لە دەرکردنتاندا، جا ئەوەی پشتیوانییان لێ بکات بەڕاستیی ئائەوانە لە ڕیزی ستەمکاراندان.

ئا لێرەدا قۆناغێکی نوێ دەست پێ دەکات، موسڵمانان دەتوانن چەک هەڵگرن دژی دوژمنەکانیان.



# پێکەوە ژیان لە نێوان موسڵمان و کۆمەڵگاکانی تردا

ماکوان: زانیمان پێغەمبەری نازدار ﷺ چۆن مامەڵەی لەگەڵ هەموو لاکاندا کرد و مامەڵەی جەنابیان و موسڵمانان لەگەڵ موشریک و ئەعراب و یەهوود دا لە ماوەی ساڵێکدا چۆن بوو! پێویستە بە وردی تەماشای پەیماننامەکان بکەین، بۆ ئەوەی لەگەڵ واقیعی ئێستاماندا بگونجێت و ئەو فیقهی واقیعە لەبیر نەکەین هەموو جارێک باسی دەکەم، هەر ئەو پەیماننامەیەی سەرەتا لەگەڵ یەهوود دا بەستی پێغەمبەری خوا ﷺ خۆی لێ دەپاراستن و پاشان هەر پێغەمبەر ﷺ بوو لە دواییدا بەنوو قەینووقاعی دەرکرد، پاشان بەنوو نەزیر و لەدواییدا هەموو پیاوانی بەنی قووریزەی کوشت.

خۆ پێغەمبەری خوا ﷺ هەمان پێغەمبەر بوو کەسایەتییەکە نەگۆڕا، بەڵام واقیعەکە گۆڕا و دوژمنەکان هێرشی زیاتریان بۆ موسڵمانان هێنا، بۆیە ژیانی پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ ئێمە ئەزموونێکی زۆر گەورەیە و شارەزابوونێکی زۆر واقعییە بۆ فێربوون و تێگەیشتن لە فیقهی واقیع.

کەواتە دەبێت بزانین کەی پەیمان دەبەستین و کەی شەڕ و جەنگ دەکەین، کەی قبوڵی هەندێک بەند دەکەین لە پەیماننامەکاندا، یاخود بە پێچەوانەوە کەی قبوڵی ناکەین، کەی دادەنیشین لەگەڵ دوژمن کەی ڕەتی دانیشتن و دانووستان دەکەین، وەکو پێغەمبەری خوا ﷺ نەیهێشت یەک ڕۆژی تر یەهوود لەمەدینە دابنیشن هەموو ئەم کارانە پێویستی بە لێکۆڵینەوە و لێوردبوونەوە هەیە.

ماوەی ساڵێک لە شاری مەدینە پێغەمبەر ﷺ و موسڵمانان خۆیان دوورخستەوە لە هەموو ململانێیەکی نەخوازراو و جەنگ و کوشتار، چونکە موسڵمانان کاتی ئەوەیان نەبوو، بەڵکو خۆیان بونیاد دەنا و خۆیان بینا کرد، ئەمەش مانای وانییە مرۆڤ هێزی بۆ دروست بوو دەبێت زوڵم بکات، کەسی تری پێ قبوڵ نەبێت نا بەڵکو لە شەریعەتی ئیسلامدا و یاسا و ڕێساکانی ئەهلی کیتاب باشترین ڕێزیان لێ گیراوە وەکو هاونیشتیمانی تەماشا کراون، پێویستە ڕێزی هەموو لایەک بگیرێت، لێرەدا باسەکەمان لەسەر ئەوە دامەزراوە موشریک و یەهوود بە ئاشکرا شەڕیان بە موسڵمانان دەفرۆشت، بەڵام موسڵمانان خۆیان دەپاراست لە شەڕ و فیتنە و ئاشووب، لەناو دەوڵەتی ئیسلامیدا حەق و مافی هەموو



لایەک دیارە، ئەوەندە ڕازییان دەکات توانای گلەیی کردنیان نەبێت، سەرەڕای دادپەروەری بۆ هەموولایەک...هتد.

بانگەوازی ئیسلام زۆر جوانتر و بەرزترە لە بانگەوازی ئێستای مافەکانی مرۆڤ و وڵاتانی ڕۆژئاوا، بۆ دەسەڵاتی کاپیتالیزمی خۆیان بانگەشەی ساختە و دووڕوویی دەکەن بۆ مرۆڤایەتی.

ئیسلام ئەم باسانەی تێپەڕ کردووە، ڕۆژئاوا و جیهان قسە لەسەر ئەوە دەکەن یەکتری قبوڵ بکەن، جیاوازی ڕەشپێست و سپیپێست و یابانی و چینی و ئاسیایی و ئەفریقی و ئەمریکی و ئەوروپی نەمێنێت.

بەڕاستی مرۆڤایەتی ئەمڕۆ زۆر لەسەرەتایی و منداڵی ژیانی شارستانییەتیانە دەژین، خوای پەروەردگار (١٤٠٠) ساڵ بەر لە ئێستا داوا دەکات چاکە لەگەڵ موسڵمان و غەیری موسڵماناندا بکرێت، بەڕاستی شارستانییەتی ئیسلامی زۆر گەورە و بەرزە بەڵام بەداخەوە لە ئێستادا قیادات و ئەوانەی کە موسڵمانان سەرکردایەتی دەکەن زۆر قەزەم و هیچ لەبارا نەبوودان.

هەروەکو ئەو ئایەتە دابەزی لەسەر دەستدانە چەک بۆ خۆپاراستن لە هێرشی یەهوود و موشریکەکان:

﴿لَّا يَنْهَىٰكُمُ ٱللَّهُ عَنِ ٱلَّذِينَ لَمْ يُقَٰتِلُوكُمْ فِى ٱلدِّينِ وَلَمْ يُخْرِجُوكُم مِّن دِيَٰرِكُمْ أَن تَبَرُّوهُمْ وَتُقْسِطُوٓا۟ إِلَيْهِمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُقْسِطِينَ ۝ إِنَّمَا يَنْهَىٰكُمُ ٱللَّهُ عَنِ ٱلَّذِينَ قَٰتَلُوكُمْ فِى ٱلدِّينِ وَأَخْرَجُوكُم مِّن دِيَٰرِكُمْ وَظَٰهَرُوا۟ عَلَىٰٓ إِخْرَاجِكُمْ أَن تَوَلَّوْهُمْ ۚ وَمَن يَتَوَلَّهُمْ فَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ ۝﴾

واتە: (دڵنیاش بن) کە خوا جڵەوگیری ئەوەتان لێناکات کە چاکرەفتارو دادپەروەر بن لەگەڵ ئەو کەسانەدا کە جەنگیان دژ نەکردوون و دژایەتی ئایینیان نەکردوون و لە شوێنەکانتان دەریان نەکردوون، چونکە بە ڕاستیی خوا دادپەروەرانی خۆشدەوێت.

بەڵکو خوا تەنها قەدەغەی ئەوەتان لێدەکات کە پشتیوانی بکەن لەوانەی کە جەنگیان بەرپاکرد دژی ئایین و دەریانکردن لە شوێنی خۆتان، زۆر بە زەقیی دەوریان هەبوو لە دەرکردنتاندا، جا ئەوەی پشتیوانییان لێ بکات بەڕاستیی ئا ئەوانە لە ڕیزی ستەمکاراندان.



خوای پەروەردگار داوا دەکات چاکە لەگەڵ خەڵکیدا بکرێت کە دژتان بێت جا گەر هەر دین و مەزهەب و کەسێک بێت.

هەموو غەمبار دەبین کە یەهوودی یان نەسرانی یان موشریک و خوانەناس و عەلمانی دەمرن و موسڵمان نابن دەچنە دۆزەخ، بەڵام ئێمە دەسەڵاتمان نییە بەزۆر ناتوانین ئایینی ئیسلام بدەین بەسەریاندا، خوای پەروەردگاری ئەرز و ئاسمان دەفەرمووێت: (لا إكراه في الدين)، زۆرکردن لە ئاییندا نییە و کەس بەزۆر ئایین و بیروباوەڕی وەرناگرێت، بۆ ئەمریکا ناڵێت ئەوەی دیموکراسی قبووڵ نەبێت دوژمنیانە، ئەوەی شوعی نەبووایە دوژمن بوو، باجی لە موسڵمانان دەسەند لەبەر ئەوەی نوێژ دەکەن.

بەڵام ئیسلام ئازادی لە بیروباوەڕ و تەنانەت لە بیروباوەڕە کە کوفری زۆر گەورەیە بەرامبەر ئێمەی موسڵمان، وەکو دەڵێن سێ خوا و کردنی عیسای کوڕی مەریەم بە خوا، کەچی ئێمە دەبێت وەکو ئەهلی کیتاب چاکەیان لەگەڵدا بکەین، بۆیە پێم وایە شارستانییەتی ئێستا زۆر لاوازە و لەسەرەتای (دارە دارە)ی منداڵییەتی، ئەگەر پێوەری بکەین بە ئیسلامی (١٤٠٠) بەر لە ئێستا، بەهەرحاڵ دوای ئەم قۆناغە کە موسڵمانان وا توانای چەک هەڵگرتنیان هەیە پێغەمبەری خوا ﷺ چی کرد و چۆن مامەڵەی کرد لەگەڵ یەهوود؟!

نومێر: پێغەمبەری خوا ﷺ بڕیاریدا لەگەڵ یەهوود پەیمان ببەستێت، چونکە ڕۆژانە کاری خراپ و شتی چاوەڕوان لێنەکراویان دەکرد و قسە و گفتوگۆی ناشرین لەدەمیان دەردەچوو، لەگەڵ ئەوەش ڕێگایان پێدا کە چەک دژی دوژمنەکانیان هەڵبگرن، بەڵام پێغەمبەری خوا ﷺ وایدەبینی کە هێشتا بواری بانگەواز ماوە لەناو یەهووددا، دەبێت جارێ لەناویاندا هەر بانگەواز بکرێت بەشێوەیەکی ئاشتیانە، چونکە لەو زەمەندا هیچ مێژوویەکی دوژمنکارانە دژی موسڵمانان نەبوو سەرەتا بوو، لەگەڵ ئەوەی یەهوود زۆر درۆزن و خراپەکار بوون، بەڵام پێغەمبەری خوا ﷺ هیوای نەبڕابوو بۆ بانگەوازییان، بەڵکو خوای پەروەردگار دڵیان بکاتەوە بۆ ئیمان و ئیسلام، پێغەمبەری خوا ﷺ هەرگیز تووشی یەئس و کۆتایی کێشەکان بیری نەدەکردەوە هەر هیوا بڕاو نەبوو بۆ داهاتوویان بەڵکو خوا هیدایەتیان بدات.

ماکوان: ئەو بەند و پەیماننامە چی بوون چی نووسراو و چی ئیمزاکرا و لە نێوانیاندا؟!



# پەیماننامە لەگەڵ یەهوود

نومێر: زۆر گرنگە بە چاوێکی پڕ بەها و گرنگ تەماشای ئەم پەیماننامە بکەین لەگەڵ یەهوود، دەبێت تەرکیزمان لەسەر خاڵ و بەندەکان بێت، بەڵام تەرکیزێکی زۆر زۆر بۆ ئەوەی ئەم پەیماننامەیە نەک لە مێشکماندا بچەسپێت، بەڵکو دەبێتە سەرچاوەی سەرەکی بۆ هەموو پەیماننامەکانی تر، تەماشای بەند و خاڵەکان بکە چەندە جیاوازە! دەبینین لەگەڵ پەیماننامەکانی ئێستادا لەگەڵ یەهوود لە وڵاتی فەلەستین جیاوازییەکە ئاسمان و ڕێسمانە؟!

ماکوان: ئەمەش مانای ئەوەیە لە دەوڵەتی ئیسلامیدا بیروباوەڕ ئازادە؟!

نومێر: بەڵێ، ئەم ئازادییەی بیروباوەڕ لەسەر بنەمای ئایەتی (لا اكراه في الدين).

ماکوان: ئەی بەندی دووەم چی بوو؟! ببوورە یەهوودی بەنی عەوف چییە؟!

نومێر: پێش ئەوەی باسی بەندی دووەم بکەم با بزانیت یەهوودی بەنی عەوف چییە، ناوی هەموو یەهوودییەکان لە پەیماننامەکەدا هاتووە، بەڵام من نموونەیەکم بۆ باس کردی دەنا ناوی یەهوودییەکانی ناو شاری مەدینە هاتووە، نموونەی یەهوودی بەنی نەججاڕ، بەنی حارس، یەهوودی بەنی سەعد، بەناوی گەڕەک و عەشیرەتەکانیانەوە ناویان هاتووە بەو شێوەیە.

بەندی دووەم: ئەم بەندە زۆر گرنگە: دەفەرمووێت لەسەر یەهوود پێویستە کە نەفەقەی خۆیان لەناو خۆیان بدەن، هەروەها موسڵمانان بەهەمان شێوە، واتا موڵک و ماڵی هەموو لایەک پارێزراوە خاوەندارێتی پارێزراوە.

چونکە سەرۆکی دەوڵەت بڕیار ئەدات، پێغەمبەری خوایە صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ مافیان پارێزراو دەکات.

ماکوان: پێموایە ئەم بەندە زیاتر جیاکار و ئیمتیاز ئەداتە موسڵمانان و یەهوود هەریەکە خاوەندارێتی و موڵکدارێتی پارێزراوە، مافی کەس ون ناکرێت بەڵام بەو واتایەنا ئابووری یەهوود و ئیسلام تێکەڵ بکرێت، بەڵکو دەبێت هەریەکە سەرقاڵی ژیانی خۆی بێت.

نومێر: بەندی سێیەم: بەڵام لەکاتی جەنگ مادام هاونیشتمانن و هەموو مافیان وەکو موسڵمانە، گۆڕانکاری دێ بەسەردا، هەر ڕووداوێک یاخود فشار و جەنگ تووشی شاری مەدینە بوو یان ئابڵووقەی ئابووری، هەموو بەشدار دەبن وەکو حەقی هاونیشتیمان بوون،



هەردوولا دەبێت یەکتری سەر بخەن، ئەگەر مەترسی ئەوە هەبوو ئاسایشی شاری مەدینە بکەوێتە خەتەر هەردوولا موسڵمان و جوولەکە دەبێت پارێزگاری لێ بکەن، چونکە هەردوولا بەیەکەوە دەژین، هەر هێزێکی دەرەکی هێرشی هێنا دەبێت شار و وڵات هەردوولا پارێزگاری نیکەن و نەفەقەی جەنگ دەکەوێتە سەر هەردوولا جا موسڵمان جەنگ بکات یان یەهوود، هەردوولا دەبێت خەرجییەکەی بگرنە ئەستۆ.

ماکوان: تەنانەت پێغەمبەری خوا ﷺ دەیەوێت ئینتیمای نیشتیمانی بۆ یەهوود دروست بکات تا بیرنەکەنەوە بڕۆنە پەنای دوژمن و دوژمنان بەگشتی، ئەگەر جەنگ هەڵگیرسا ئەوا هەردوولا خەرجی دەکەوێتە سەر شانیان، بەرگری لە شار و وڵات ئەرکە و ئامۆژگاری و یارمەتیدانی یەکتر بەهەمان شێوە ئەرکە و پێویستە.

لەسەر هەموولا واجبە هاوکاری مەزڵوم بەرامبەر زاڵم و ستەمکار، ئەگەرچی دەوڵەتەکە موسڵمان دەیبات بەڕێوە و سەرکردایەتی دەکات، بەڵام یەهوود هەمان ماف و توانای ئەوانیان هەیە و هەروەکو موسڵمان ماف و ئەرکیان پارێزراوە.

نومێر: زۆر ڕاستە، باسی بەندی چوارت بۆ بکەم، بەندێکی زۆر ترسناک و ڕوون و ئاشکرایە، لەوپەڕی هێز و تواناداا ئەم بەندە دەنووسرێت، پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمووێت، بەهەموو شێوەیەک بازرگانی و سەرخستنی قورەیش قەدەغەیە و یاساغە لەم دەوڵەتەدا.

ماکوان: لەڕاستیدا ئاساییە، ئەگەر بەندی سێیەم قبوڵ بکەن ئەم بەندە زیاتر بەندی پێش خۆی ڕوون دەکاتەوە، با قورەیش کێشەی لەگەڵ یەهوود نەبێت وەکو گەل و هۆز بەڵام کێشەی لەگەڵ دەوڵەتەکەدا هەیە، ئەوانیش هاونیشتیمانین دەبێت بەهەموو شێوەیەک پارێزگاری و بەرهەڵستی هەموو دوژمنێک بکەن.

بەڵام ئەوەی منی سەرسام کردووە هێزی پێغەمبەری خوایە ﷺ لەماوەی شەش مانگ بۆ ساڵێک ئەم بڕیارانە وەکو یاسا و ڕێسایەک لەدەوڵەتەکەیدا دەچەسپێنێت و یەهوود ڕازییە پێی، لەکاتێکدا یەهوود دەیتوانی بڵێت ئەو بەندە لەگەڵیدانین، چونکە پەیوەندییەکی زۆر باشمان لەگەڵ قورەیشدا هەیە بەڵام قبوڵیان کرد بەهەموو شێوەیەک دابڕێن لە قوورەیش، چونکە لە ئێستا دا قورەیش دوژمنی موسڵمانانە بەگشتی و ئەگەری ئەوەش هەبوو قورەیش هێرش بکاتە سەر شاری مەدینەی پێغەمبەری خوا ﷺ.

نومێر: نا، بەڵکو پێغەمبەر دەیزانی یەهوود بەگشتی خیانەتکار و ساختەچین بۆیە بە ڕوون و ئاشکرا ناوی قورەیشی هێنا بۆ ئەوەی هیچ هەنجەت و بەڵگەیان نەمێنێت، بۆ ئەوەی



ڕۆژێ لە ڕۆژان نەڵێین قوڕەیش لەم پەیماننامەیەدا نییە و بە ئارەزووی خۆیان وشە وەکو لاستیک بکێشن، ئەمەش ئەوەمان فێر دەکات لەگەڵ یەهوود و هەموو کەس و لایەنێک دەبێت وشەکان ئاشکرا و ڕاشکاوانە بنووسرێت و تا کەس بە ئارەزووی خۆی یاری بە وشە نەکات.

زۆر بەڕوونی و ئاشکرا بازرگانی و سەرخستی قوڕەیش قەدەغەیە، ئەگەر دوژمن هێرشی هێنایە سەر شاری مەدینە لەسەر یەهوود ئەرکە بەرگری بکات وەکو موسڵمانان یان بەلای کەمەوە هاوکاری موسڵمان بێت دژی قوڕەیش، بەڵام لە دواییدا دەبینین چۆن پەیماننامەکە دەشکێنن و بەتایبەت بەنوو قوورەیزە لە دواییدا بۆمان دەردەکەوێت بۆچی پێغەمبەری خوا ﷺ تورە دەبێت لە جوولەکەی بەنوو قوورەیزە، چونکە هاوکاری قوڕەیش دەکەن لە جەنگی ئەحزاب دژ بە موسڵمانان.

ماکوان: بەڵێ ڕاستە جا ئەگەر تەماشا بکەین زۆر بە ئاشکرا و جوانی دەبینین پێغەمبەری خوا ﷺ چەندە بەهێزە لە دانانی مەرج و ئاستەنگەکان لەو پەیماننامەیەدا، هەر جەنابیان مەرج و شەرتەکان فەرز دەکات بەسەر یەهوود دا کە سەرەتای دەوڵەتەکەشیەتی، ئەی بەندی پێنجەم چی دەڵێت؟!

نومێر: بەندی پێنجەم دەڵێت: پێغەمبەر ﷺ فەرزی کرد لەسەر یەهوود هیچ کەس بۆی نییە شاری مەدینە جێبهێڵت، دەبێت مۆڵەت لە پێغەمبەر ﷺ بخوازرێت.

ماکوان: ئەمەش وەکو سیستەمی جەواز و کۆنترۆڵی دەوڵەتەکەیە بۆ پاراستنی ئەمنی قەومی و دوورخستنەوەی هەر ئەگەرێکی نەخوازراو، بۆیە دانی ڤیزا و مۆڵەتی دەرچوون دەبێت لەلایەن دەوڵەتەوە بێت، ئەمەش پەیماننامەی یەهوود لە فەلەستین و فەلەستینەکان دەردەخات چەندە جیاوازە ڕێک پێچەوانەکەی دەبێت لە ئەمڕۆدا، ئەی بەندی شەشەم چییە؟

نومێر: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی لەم بەندەدا، ئەوەی دێتە ناو ئەم پەیماننامەیەوە ئەگەر ڕاجیایی و ڕاوبۆچوونێکی و جیاواز یان هەرکێشە و ناکۆکییەک دروست بوو دەگەڕێنەوە بۆلای خوا و هەروەها محمد ﷺ واتا هەر ڕووداوێک ڕوویدا سەرچاوەی دەستوور و یاسا شەریعەتی خوایە و پێغەمبەرەکەی یەکلا دەکاتەوە.

ماکوان: تەماشای ئەو هێز و توانا و سەرکەوتنە بکە پێغەمبەری خوا ﷺ بەدەستی هێناوە لەم پەیماننامەیەدا، بەرزی و جوانی و سەرکەوتنە بەسەر یەهوودا کە سەرچاوەی یەکلاکەرەوەی شەریعەتی ئیسلامە.



چی فێر دەبێت لەم پەیماننامەیەدا، بەڕاستی پڕ پڕە لەوانە و ئەزموون بۆ ئێستا و داهاتووشمان.



# چی فێردەبیت لەو پەیماننامەی یەهوود

ماکوان: یەکەم: ئیسلام ئەوەمان فێردەکات ئایینی ڕێکخستن و ئیدارەی دەوڵەت و ژیانە، هەر پێغەمبەری خوایە موسڵمانان فێر دەکات نوێژ بکەن، ڕۆژوو بگرن، شەونوێژ بکەن، قورئان بخوێنن، حەج بکەن، مزگەوت دروست بکەن، هەرجەنابییانە بەوپەڕی توانا و عیززەتەوە بەو پەڕی ئازایەتی و مەردایەتییەوە، بەو پەڕی حیکمەتی سیاسییەوە، بەو پەڕی هێزی ئەقڵی و توانای دیبلۆماسییەوە فێرمان دەکات چۆن پەیماننامە لەگەڵ یەهوود و دوژمنەکاندا ببەستێت، گومانی تێدانییە دەستی خوای پەروەردگار و وەحی تێدایە و بە جوبرەئیل ئاراستەی دەکات.

دووەم: موسڵمانان چییان دەستکەوت لەم خاڵی پەیماننامەیەدا؟!

بەڕاستی بۆ موسڵمانان دەستکەوتی گرنگ و خۆ پاراستن بوو لە شەڕ و فیتنە و پیلانی جوولەکە، ئەمە تەنها لەڕێی ڕازیبوونی سەرزارەکی و چاکە و ئیحسان نەبوو، بەڵکو یەهوود دانی پێدا نا و ئیعترافی پێکرد، ئەم قسەیەم بەهەند وەربگرە ئیعترافی یەهوود بوو بۆ دەوڵەتی ئیسلامی پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ با دەوڵەتەکەش سەرەتا بێت، بەڵام خاوەنی هێز و قسە ی خۆیەتی و ئیحترامی دەگرێت، خاوەنی عیزەتە و خاوەنی بڕیاری تایبەتی خۆیەتی و سەروەری هەیە و دەستی بەرزە بەسەر یەهوود دا.

پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ ڕەهەندە سیاسی و ئابووری و سەربازییەکانی دیاریکرد، حیزبی جوولەکە بەهیچ شێوەیەک هاوکاری حیزبی قوڕەیش ناکات، هەر کەسێک لە حیزبی جوولەکە ئەو کارەی کرد سزا دەدرێت و دەگەڕێتەوە بۆ لای پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ سەرۆکی دەوڵەتەکە، ئەمەش سەرکەوتنێکی گەورەیە بۆ موسڵمانان، لە کاتێکدا یەهوود لەشاری مەدینەدا تەمەنی هەزار ساڵەی هەیە، بەڵام پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ زەعیم و سەرۆکە، ئەمە چ عەزەمەت و فەزڵێکە خوای گەورە دەیبەخشێت! چ تەمکین و جێنشینکردنێکی پێغەمبەرە صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ بەرامبەر بە یەهوود.

لەنێوان پەیماننامەی ئەمڕۆدا جیاوازییەکی زۆر گەورە و فراوان دەبینیت بەهیچ شێوەیەک لە بەند و خاڵی پەیماننامەی پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ ناچێت کە فەڵەستینییەکان لەگەڵ یەهوود دا ئیمزایان کردووە.



لە پەیماننامەکە هاتووە نابێت دژی شەریعەتی خوا بێت، ئاخر بۆیە تواناMان نەماوە، هەموو پەیماننامەکانمان دژی شەریعەتی خوای پەروەردگارە، ئێمەی کورد بەدرێژایی (١٠٠) ساڵ زیاترە خەریکی شۆڕشین دژی عەلمانی و خوانەناسی و داگیرکەری کەچی لەکۆتاییدا وڵاتانی تری دونیا لە جیاتی ئێمە بڕیار ئەدەن، خۆ ئەگەر داوای مافی خۆمان بکەین دونیامان لێ دەهێننەوە یەک و نموونەی ڕیفراندۆم شتێکی باش بوو بۆ کورد، بەڵام چونکە لە ڕێگای شەریعەتەوە نەبوو بەناوی دیموکراتی و مافی مرۆڤەوە داواکرا، ئەنجامەکەی ئەوەبوو هیچ کەس گوێی بۆ نەگرت، وەکو حەکایەتی مێش دەبێت بڵێین منیش هاتمەوە هیچیان نەدامێ.

چونکە کورد هەموو ڕێگایەکی تاقی کردۆتەوە، بەڵام یەکدەنگ نەبوون لەسەر پیادەکردنی شەریعەتی خوا، ڕێگای سۆسیالیستی و دیموکراتی و شوعییەت و کۆمەڵەی لیبڕاڵی...هتد. تاقی کراوەتەوە ئەنجامەکەی تا ئەم ساتەوەختەش نەک هیچ بەڵکو کەمترە لە هیچ، نازانم چییان لە شەریعەتی خوا بینیوە! بۆ ئەو ڕێگایە تاقی ناکەنەوە لە کاتێکدا دەیان دەوڵەتی گەورەی کوردی ئیسلامی بەڕێگای شەریعەت دامەزراوە، بگرە ئیمپراتۆریەتی کوردی دامەزراوە، وەکو ئیمپراتۆریەتی ئەیووبی و دەوڵەتی هەزبانی و دەوڵەتی دینەوەری و ئیماراتی سۆران و ئەردەڵان و بابان و بادینان و بارزان، بەڵام ڕوویان نایە باسی بکەن، چونکە بەشەریعەت سەرکەوتن.

جوولەکە و بەچکە جوولەکە و ڕۆژئاوا بەگشتی خاکی موسڵمانانیان داگیرکردووە پاشان وەکو پارچە کێک بۆ بەرژەوەندی خۆیان دابەشیان کردووە، خۆیان زوڵم و زۆرداری دەکەن لە خەڵک و دراوسێ و بەچکەکانیان، جوجەڵە عەلمانیەکان بە وەکالەت لەسەر ئێمەی موسڵمان فەرمان دەکەن و بە ئارەزوو و ویستنی ئەوان حوکمڕانیمان دەکەن، بۆیە ڕێک لە ئێستادا پەیماننامەکان پێچەوانە بۆتەوە.

لە ئێستادا ئەوان خەریکی بەرەوپێشچوونی تەکنەلۆجیا سەربازی و سیاسی و ئابوورین، ئێمەش چاو لەوان دەکەین لە جل و بەرگ و خواردن و دانس و گۆرانی، لەکاتێکدا هەموو جیهان سەرسامە بە پێغەمبەرەکەی ئێمە و لاسایی دەکەنەوە، ئێمەش نەوەی ئیسلامین لاسایی ئەوان دەکەینەوە.

پێغەمبەر ﷺ مەرجی بەسەر یەهوود دانا کە مافی دراوسێ و مەزڵوم بپارێزن و دەست درێژی نەکرێتە سەر دراوسێ لە شاری مەدینە، لە ئێستادا جوولەکە دەستدرێژی دەکاتە سەرخاکی موسڵمانان لە لیبیا و سووریا و عیراق و کوردستان و فەلەستین بەئارەزووی خۆیان زوڵم دەکەن.



پێغەمبەر صلى الله عليه وعلى آله وسلم فەرزی کرد لەسەریان هاوکاری قوڕەیش نەکرێت، تەنانەت موسڵمانان نەیانتوانی مەرجێک دابنێن بۆ لادانی عیراق و سووریا و گەڕاندنەوەی مافی کورد و کوردستان.

چاوەڕوانی نەتەوە یەکگرتووەکانن مافمان بدەنێ لە کاتێکدا هەر ئەوان بوون دابەشیان کردین، بەهیچ شێوەیەک لەگەڵ واقیعی ئێستاماندا پێوەر ناکرێت، بەڵام پێویستە بپرسین بۆچی یەهوود بەم شێوە سەرشۆڕییە ئەو پەیماننامەیەیان قبوڵ کرد لە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وعلى آله وسلم ؟ لە کاتێکدا خاوەن چەک و نفوز و قەڵا و هێزی سەربازی بوون؟!



## هەڵوەستەیەک لەسەر باری دەروونی جوولەکە

نومێر: خۆشحاڵ دەبم باسێکی دەروونی جوولەکەم بۆ بکەیت و ئەوە زۆر گرنگە بزانین.

ماکوان: یەهوود خاوەنی چەک و جبەخانەی گەورە بوون، بەڕاستی پێوەر ناکرێت لەگەڵ دەوڵەتی نوێی پێغەمبەر ﷺ خاوەن قەڵا و هێز و مێژوو و پارە و زۆر شتی تر بوون، خاوەن هۆز و عەشیرەتی بەهێزبوون، دەوڵەتی ئیسلامی لاواز و سەرەتایی بوو، کەس دانی نەنابوو بە دەوڵەتەکەدا، ئەی بۆ بەم شێوە سەرشۆڕییە ئەو پەیماننامەیان بەزۆر کرد و پێی ڕازی بوون؟ ئەی چۆن گەردەنی خۆیان ئاوا خستە بەر شمشێری موسڵمانان؟!

لەوەڵامدا دەڵێم: بەچەند هۆکارێک.

یەکەم: یەهوود لە ناخ و دەروونیاندا ترسنۆک و ڕووخاون، ئەگەر موسڵمانی خواناس بە شەریعەت کاری کرد بەڕاستی ئەوان بۆی گەردەن کەچ دەبن، ئەمەش قسەی ماکوان نییە، بەڵکو فەرموودەی خوای پەروەردگار لە سورەتی الحشردا دەفەرمووێت:

﴿لَأَنتُمْ أَشَدُّ رَهْبَةً فِي صُدُورِهِم مِّنَ اللَّهِ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ قَوْمٌ لَّا يَفْقَهُونَ ۝﴾

واتە: بەڕاستی ئێوەی (ئیماندار) ترستان زیاترە لە دڵ و دەروونیاندا تا خوای گەورە، چونکە ئەوانە کەسانێکی ناحاڵی و تێنەگەیشتوون (هەمیشە لە دڵەڕاوکێدان).

بەهەمان شێوە لە سورەتی البقرةدا:

﴿وَلَتَجِدَنَّهُمْ أَحْرَصَ النَّاسِ عَلَىٰ حَيَاةٍ وَمِنَ الَّذِينَ أَشْرَكُوا يَوَدُّ أَحَدُهُمْ لَوْ يُعَمَّرُ أَلْفَ سَنَةٍ وَمَا هُوَ بِمُزَحْزِحِهِ مِنَ الْعَذَابِ أَن يُعَمَّرَ وَاللَّهُ بَصِيرٌ بِمَا يَعْمَلُونَ ۝﴾

واتە: بەردەوام ئەو جولەکانە دەبینیت کە لە هەموو خەڵکی زیاتر بە تەنگ دنیا و ژیانی دنیاوە دێن هەتا بگرە لە هاوەڵپەرست و موشریکەکانیش. (جا ئەگەر ڕاستیان بکردایە) ئاواتیان نەدەخواست کە: هەزار ساڵ هەریەکەیان تەمەنی ببوایە، هەرچەندە وەنەبێ ئەو تەمەنە درێژە لە سزا ڕزگاریان بکا، خوایش زۆر بینایە بەو کردەوانەی کە ئەنجامی دەدەن.

ئەوە هۆکاری یەکەمە یەهوود بە سرووشت و زگماکی ترسنۆک و جەبانە، دەبێت هەموو لایەک ئەوە بزانیت کە مامەڵەی لەگەڵ جوولەکەدا کرد، تەنانەت لە کوردەواری ئێمەدا ئەگەر کەسێک زۆر ترسنۆک بێت پێی دەڵێی جوولەکەیە ئەوەندە ئەترسێت.



هۆکاری دووەم: موسڵمانان هەموو یەکڕیز و یەکدەست بوون وەکو دیواری پۆڵایین لەبەردەم هەموو لاکاندا وەستابوون، لە قسەی سەرکردەکەیان دەرنەدەچوون، پێغەمبەری خۆیان خۆشدەویست لە خۆشی و ناخۆشیدا بەدەمییەوە بوون، ئەویش یەکڕیزی و یەکبوونی پاراستبوون بە ئاڕاستەی وەحی و قورئانی پیرۆز، هەموو خاوەن مەبدەئو پرەنسیپ و بیروباوەڕی دامەزراو بوون، موهاجیر و ئەنسار گوێڕایەڵی پێغەمبەر ﷺ بوون چونکە سەرکردەی گشتی بوو، ئەم کۆدەنگی یەکبوونی یەک هەڵوێستییە توانا و هێزێکی زۆری دا بە ئیمانداران، کاریگەری زۆری کردبووە سەر دڵ و دەروونی یەهوود و ترسی خستبووە دڵیان.

هۆکاری سێیەم: جیاوازی و ڕای جیاواز و دووڕوویی یەکجار زۆرە لەناو جوولەکەدا هەرگیز کۆک نین لەسەر ڕایەک هەمیشە ڕای جیاواز لە نێوانیاندا هەیە، ئێمە کە باسی یەهوود دەکەین وادەزانین هەموو یەک دەنگ و یەک ڕیزن؟ نەخێر وانین، بەڵکو دوژمنایەتی لە نێوانی بەنوو قووڕەیزە و بەنوو قەینووقاع و بەنوو نەزیر، لەدێر زەمانەوە ڕەگی داکوتاوە، دوژمنایەتییەکەیان زۆر گەورەیە تەنانەت خوای گەورە بۆمان باس دەکات دەفەرمووێت:

﴿لَا يُقَٰتِلُونَكُمْ جَمِيعًا إِلَّا فِى قُرًى مُّحَصَّنَةٍ أَوْ مِن وَرَآءِ جُدُرٍۭ ۚ بَأْسُهُم بَيْنَهُمْ شَدِيدٌ ۚ تَحْسَبُهُمْ جَمِيعًا وَقُلُوبُهُمْ شَتَّىٰ ۚ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ قَوْمٌ لَّا يَعْقِلُونَ﴾

واتە: هۆزی جولەکە هەرگیز بە یەکپارچەیی ناوێرن دژی ئێوەی (ئیماندار) بجەنگن مەگەر لە شوێنی قایم و قەڵای سەختا بن، یا لە پشتی دیواری بەرزو قایمەوە، (ئەو جووانە) نێوانیان زۆر ناخۆشە و چارەی یەکتریان ناوێت، وا دەزانیت یەکپارچەن، بەڵام لە ڕاستیدا دڵەکانیان (هەریەکەی لە دۆڵێکدایە) دوورن لە یەکەوە، چونکە ئەوانە ژیرو هۆشمەند نین.

(یەهوود لە دەوڵەتی ئیسرائیل دا دەیان خەت و ختوتی جیاوازی تێدایە، هەر لە (ئەشکەناز و شەباک و مووساد و خەڵکی سڤیل و یەهوودی ڕەسەن...هتد)

بەنوو قووڕەیزە لەگەڵ ئەوس دا هاوپەیمان بوون، بەنوو قەینووقاع و بەنوو نەزیر هاوپەیمانی خەزرەج بوون، کاتێک جەنگ هەڵدەگیرسا لە نێوان ئەوس و خەزرەج لە نێوان جوولەکەکانیش دەبوو بە جەنگ، لەسەر پارە و فرۆشنی چەک...هتد.

بەم شێوەیە جیاوازی زۆر لە نێوانیاندا بوو پێغەمبەری خوا ﷺ باش درکی بەم کێشانەیان کردبوو، دەیانزانی هەرگیز یەهوود یەک ناگرن چونکە خوای پەروەردگار فەرموویەتی.



هۆکاری چوارەم: یەهوود بۆیە زۆر دایشکاند و تەنازوولی زۆری کرد بە هۆکاری پاراستنی بەرژەوەندییەکانی، ئەمە شتێکی زۆر گرنگە بیزانین، ئەوان نەیاندەویست بەهیچ جۆرێک ڕووبەڕووی ئەوس و خەزرەج ببنەوە، لەبەر ئەوەی ئەگەر کێشە دروست ببێت لەگەڵیاندا ئەی کێ شتومەکیان لێ بکڕێت؟ ئەوەی کە کڕیارە لە شاری مەدینە ئەوس و خەزرەجن، خۆ ئەگەر جەنگ لە نێوانیاندا ڕوویدا ئەوا بازرگانی یەهوود کۆتایی دێت، پارە و بازرگانی شادەماری جوولەکەیە، ئەوان کتێبی خوا دەستکاری دەکەن بۆ خاتری بازرگانی و پارە، خیانەت لە پەیماننامە دەکەن بۆ خاتری پارە، هەرچی بەند و خاڵە دەیگۆڕن بۆ پارە، خوای گەورە لە سورەتی النساء دەفەرموێت:

﴿وَأَخْذِهِمُ ٱلرِّبَوٰاْ وَقَدْ نُهُواْ عَنْهُ وَأَكْلِهِمْ أَمْوَٰلَ ٱلنَّاسِ بِٱلْبَٰطِلِ ۚ وَأَعْتَدْنَا لِلْكَٰفِرِينَ مِنْهُمْ عَذَابًا أَلِيمًا﴿١٦١﴾﴾

واتە: هەروەها بەهۆی سووخۆریانەوە (هەندێک شتی تری حەڵاڵمان لێ حەڕام کردن) هەروەها بەهۆی ئەوەشەوە کە ماڵی خەڵکی بە ناحەق دەخۆن، بێگومان بۆ ئەوانەیان کە کافرن سزایەکی بەئێشمان ئامادە کردووە.

کەواتە یەهوود بۆ خاتری پارە و سامان بەردەوامبوونی ئابوورییان و بەردەوامی کاریان لەبەرهەم هێنان و فرۆشتن، ئامادەن هەموو سەرشۆڕییەک قبوڵ بکەن پێغەمبەری خوا ﷺ باش زانی کە هەموو بەرژەوەندی یەهوود لە دەستی موسڵماناندایە.

هۆکاری پێنجەم: ئەگەر موسڵمانان یەک دەنگ و یەکڕیزبن، ترسێکی گەورە دەکەوێتە دڵی کافرەکان بەگشتی و یەهوودیش بەتایبەتی، چونکە وەعدی خوای پەروەردگار ئەو سەربازانەی دەنێرێت ترس بخاتە دڵی کافران و ملهوڕان:

﴿هُوَ ٱلَّذِىٓ أَخْرَجَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِنْ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ مِن دِيَٰرِهِمْ لِأَوَّلِ ٱلْحَشْرِ ۚ مَا ظَنَنتُمْ أَن يَخْرُجُواْ ۖ وَظَنُّوٓاْ أَنَّهُم مَّانِعَتُهُمْ حُصُونُهُم مِّنَ ٱللَّهِ فَأَتَىٰهُمُ ٱللَّهُ مِنْ حَيْثُ لَمْ يَحْتَسِبُواْ ۖ وَقَذَفَ فِى قُلُوبِهِمُ ٱلرُّعْبَ ۚ يُخْرِبُونَ بُيُوتَهُم بِأَيْدِيهِمْ وَأَيْدِى ٱلْمُؤْمِنِينَ فَٱعْتَبِرُواْ يَٰٓأُوْلِى ٱلْأَبْصَٰرِ ﴿٢﴾﴾

واتە: هەر ئەو زاتە، ئەوانەی بێباوەڕ بوون لە خاوەنانی کتێب (واتە: جووەکان) هەڵیکەندن لە شوێنەواریان و ناچاری کۆچی کردن لە سەرەتای دەستپێکردنی کۆکردنەوە و دەرکردنیاندا، ئێوە هەرگیز بە تەما نەبوون و گومانتان نەدەبرد ئاوا بەئاسانی بڕۆن، ئەوانیش گومانیان وابوو کە قەڵاکانیان بەرگری دەکات (لە ویست و فەرمانی) خوا، ئەوسا ئیتر لەلایەکەوە، (بەناچاریی) دەستیانکرد بە کاولکردنی خانووبەرە و ماڵەکانیان بەدەستی خۆیان



و دەستی ئیمانداران، کەواتە: ئەی خاوەن بیروهۆش و دووربینەکان دەرس و پەندو ئامۆژگاری وەرگرن ( دڵنیا بن کە ستەمکاران هەروا بۆیان ناچیتە سەر).

بە بێ هیچ هۆکارێکی ماددی ئەو ترسە دروست دەبێت لە دڵی کافراندا، بەڵام ئەویش مەرجی تایبەتی هەیە، بەڕاستی دەبێت ئیماندار بیت و ڕاستگۆبیت لە کار و بانگەوازی ئیسلامیدا:

﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِن تَنصُرُواْ ٱللَّهَ يَنصُرْكُمْ وَيُثَبِّتْ أَقْدَامَكُمْ ۝٧﴾

واتە: ئەی ئەو کەسانەی کە ئیمان و باوەڕتان هێناوە، ئەگەر ئێوە پشتیوانی لە ئایینی خوا بکەن و هەوڵی سەرکەوتنی بدەن، خوایش پشتیوانی لە ئێوە دەکات و سەرتان دەخات، پایەدار و جێگیرتان دەکات.

تەنانەت پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وعلى آله وسلم دەفەرمووێت: (نصرت بالرعب مسيره شهر) واتا ترس و بیم و دڵەڕاوکێ دەچێتە دڵی کافرانەوە، ئەگەر مانگە ڕێگایەکیش لێیان دووربم، ئەم موعجیزەیە بۆ هەموو موسڵمانانە، دوژمن خاوەنی هێز و چەک و جبەخانە و قەڵای بەهێز بێت، بەڵام خوای گەورە ترسیان بۆ دەنێرێت کە سەربازی خۆیەتی و موسڵمانان دەترسن، لەم حاڵەتە یەهوود لەسەر مێزی گفتوگۆ لەگەڵ پێغەمبەر صلى الله عليه وعلى آله وسلم دانیشتن ترس لەدڵیاندا چەسپیبوو بۆیە بە هەموو مەرجەکانی پێغەمبەر صلى الله عليه وعلى آله وسلم ڕازی بوون.



## سیفات و پێناسەی یەهوود لە قورئاندا

**ماکوان: لەناو خەڵکیدا حەزیان بە ئاژاوە و دووبەرەکییە، هەمیشە حەز بە شەڕەنگێزی و ئاشووب نانەوە دەکەن، گێچەڵ بەخەڵکی لاواز دەکەن، خەڵکی گومڕا دەکەن لەسەر بیروباوەڕیان، خوای گەورە لە سورەتی آل عمران دەفەرمووێت:**

﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ إِن تُطِيعُوا۟ فَرِيقًا مِّنَ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَـٰبَ يَرُدُّوكُم بَعْدَ إِيمَـٰنِكُمْ كَـٰفِرِينَ ۝ وَكَيْفَ تَكْفُرُونَ وَأَنتُمْ تُتْلَىٰ عَلَيْكُمْ ءَايَـٰتُ ٱللَّهِ وَفِيكُمْ رَسُولُهُۥ ۗ وَمَن يَعْتَصِم بِٱللَّهِ فَقَدْ هُدِىَ إِلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ۝ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِۦ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسْلِمُونَ ۝ وَٱعْتَصِمُوا۟ بِحَبْلِ ٱللَّهِ جَمِيعًا وَلَا تَفَرَّقُوا۟ ۚ وَٱذْكُرُوا۟ نِعْمَتَ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ إِذْ كُنتُمْ أَعْدَآءً فَأَلَّفَ بَيْنَ قُلُوبِكُمْ فَأَصْبَحْتُم بِنِعْمَتِهِۦٓ إِخْوَٰنًا وَكُنتُمْ عَلَىٰ شَفَا حُفْرَةٍ مِّنَ ٱلنَّارِ فَأَنقَذَكُم مِّنْهَا ۗ كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمْ ءَايَـٰتِهِۦ لَعَلَّكُمْ تَهْتَدُونَ ۝ وَلْتَكُن مِّنكُمْ أُمَّةٌ يَدْعُونَ إِلَى ٱلْخَيْرِ وَيَأْمُرُونَ بِٱلْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ ٱلْمُنكَرِ ۚ وَأُو۟لَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ ۝ وَلَا تَكُونُوا۟ كَٱلَّذِينَ تَفَرَّقُوا۟ وَٱخْتَلَفُوا۟ مِنۢ بَعْدِ مَا جَآءَهُمُ ٱلْبَيِّنَـٰتُ ۚ وَأُو۟لَـٰٓئِكَ لَهُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ ۝﴾

**واتە: ئەی ئەوانەی کە باوەڕتان هێناوە ئەگەر گوێڕایەڵی هەندێک لەوانە بن کە کتێبی (ئاسمانییان) پێ دراوە دوای ئەوەی کە ئێوە باوەڕتان هێنابوو، دەتانخەنەوە سەر ڕێبازی کوفر و بێباوەڕی.**

**جا ئێوە چۆن کافر دەبن لە کاتێکدا کە ئایەتەکانی خواتان بەسەردا دەخوێنرێتەوە، پێغەمبەرەکەی لەناوتانایە (دوای وەفاتیشی سەلامی خوای لێ بێت بە سیرەتی پاک و بێگەردی هەر لە ناوماندایە) جا ئەوەی پشت بە خوا ببەستێت و پەیڕەوی لە بەرنامەکەی بکات، ئەوە بۆ ڕێگە و ڕێبازێکی ڕاست و دروست هیدایەت دراوە.**

**ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە لە خوا بترسن و پارێزکار بن بەشێوەیەکی وا کە شایستەی ئەو زاتەیە، (وە هەمیشە پابەندو دامەزراو بن لەسەر ئیسلامەتی، بۆ ئەوەیە هەرکاتێ مردن) بە ئیمان و ئیسلامەتی نەبێت نەمرن.**

**(هەوڵ بدەن) هەر هەمووتان بەتوندی دەست بگرن بە ئایینی خواوە و پەرت و بڵاو مەبن، یادی ناز و نیعمەتی خوا بکەنەوە لەسەرتان، (چونکە) کاتی خۆی دوژمنی یەکتر بوون**



کەچی دڵەکانتانی بە هۆی نیعمەتی (ئیسلامەوە) پەیوەست کرد بە یەکەوە و هەموو بوونە برای یەکتر (هەروەها ئەو کاتە) ئێوە لەسەر لێواری چاڵێکی ئاگر وەستابوون و (خەریک بوو بکەونە ناوی)، بەڵام خوا (بەڕەحم و میهرەبانی خۆی) لەو ئاگرە ڕزگاری کردن، ئا بەو شێوەیە خوا ئایەتەکانی خۆیتان بۆ ڕوون دەکاتەوە، بەڵکو هیدایەت وەرگرن.

دەبێت لە ئێوە ئوممەتێک پێک بێت، یاخود با هەمووتان ئوممەتێک بن کە بانگەواز بکەن بۆ خێر و چاکە، فەرمان بدەن بە هەموو کارێکی دروست، قەدەغەی هەموو نادروستییەک بکەن، هەر ئەوانەشن سەرفرازان.

نەکەن وەکو ئەو کەسانە بن کە ناکۆکی و دووبەرەکیان لەناودا بەرپا بوو، لەیەک دابڕان، دوای ئەوەی بەڵگە نیشانەشیان پێگەیشتبوو (کە سەرکەوتن لە یەکریزیدایە)، ئەوانە سزایەکی گەورە و سەخت چاوەڕێیانە.

دووەم: هەمیشە بێئەدەبی دەکەن بەرامبەر خوای گەورە و ئایینەکانی و بە گاڵتەوگەپ باسی پەروەردگار دەکەن، خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا لە سورەتی آل عمران دەفەرمووێت:

﴿لَّقَدْ سَمِعَ ٱللَّهُ قَوْلَ ٱلَّذِينَ قَالُوٓا۟ إِنَّ ٱللَّهَ فَقِيرٌ وَنَحْنُ أَغْنِيَآءُ ۘ سَنَكْتُبُ مَا قَالُوا۟ وَقَتْلَهُمُ ٱلْأَنۢبِيَآءَ بِغَيْرِ حَقٍّ وَنَقُولُ ذُوقُوا۟ عَذَابَ ٱلْحَرِيقِ ١٨١﴾

واتە: بێگومان خوای پەروەردگار گوفتاری (نابەجێی) ئەو (جوولەکانەی) بیست کە وتیان: خوا هەژارە و ئێمە دەوڵەمەندین! ئێمە ئەو گوفتارانە یاداشت و تۆمار دەکەین لەسەریان، هەروەها کوشتنی پێغەمبەران بە دەستی ئەوان بە ناحەق لەسەریان دەکەوێت، (لە دۆزەخیشدا) پێیان دەڵێین: بچێژن سزای ئاگری سووتێنەر.

سێیەم: بێئەدەبی کردن بەرامبەر بە پێغەمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ و هەموو پێغەمبەران و تەنانەت کوشتنی پێغەمبەران پیشەیان بووە، خوای گەورە لە سورەتی المجادلة دەفەرمووێت:

﴿أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ نُهُوا۟ عَنِ ٱلنَّجْوَىٰ ثُمَّ يَعُودُونَ لِمَا نُهُوا۟ عَنْهُ وَيَتَنَٰجَوْنَ بِٱلْإِثْمِ وَٱلْعُدْوَٰنِ وَمَعْصِيَتِ ٱلرَّسُولِ وَإِذَا جَآءُوكَ حَيَّوْكَ بِمَا لَمْ يُحَيِّكَ بِهِ ٱللَّهُ وَيَقُولُونَ فِىٓ أَنفُسِهِمْ لَوْلَا يُعَذِّبُنَا ٱللَّهُ بِمَا نَقُولُ ۚ حَسْبُهُمْ جَهَنَّمُ يَصْلَوْنَهَا ۖ فَبِئْسَ ٱلْمَصِيرُ ٨﴾

واتە: ئایا نابینی ئەوانەی قەدەغەی چپەیان لێکراوە، کەچی لەوەودوا هەر دەگەڕێنەوە سەر ئەو ڕەفتارەی کە لێیان قەدەغەکراوە، بەردەوام خەریکی چپەیەکن کە هەمووی گوناح و



دوژمنایەتی و نافەرمانی پێغەمبەرە، کاتێکیش دێن بۆلات بەجۆرێک سڵاوت لێ دەکەن، کە خوا بەو شێوەیە سڵاوی لێنەکردوویت! لە دڵی خۆیاندا دەڵێن: باشە کێ دەڵێت خوا سزمان نادات لە سەر گوفتارمان، ئەوانە شوێنیان دۆزەخە کە دەگەیەنرێنە ناوی بێگومان ناخۆشترین جێگەشە.

﴿وَإِذْ قُلْتُمْ يَٰمُوسَىٰ لَن نَّصْبِرَ عَلَىٰ طَعَامٍ وَٰحِدٍ فَٱدْعُ لَنَا رَبَّكَ يُخْرِجْ لَنَا مِمَّا تُنۢبِتُ ٱلْأَرْضُ مِنۢ بَقْلِهَا وَقِثَّآئِهَا وَفُومِهَا وَعَدَسِهَا وَبَصَلِهَا ۖ قَالَ أَتَسْتَبْدِلُونَ ٱلَّذِى هُوَ أَدْنَىٰ بِٱلَّذِى هُوَ خَيْرٌ ۚ ٱهْبِطُوا۟ مِصْرًا فَإِنَّ لَكُم مَّا سَأَلْتُمْ ۗ وَضُرِبَتْ عَلَيْهِمُ ٱلذِّلَّةُ وَٱلْمَسْكَنَةُ وَبَآءُو بِغَضَبٍ مِّنَ ٱللَّهِ ۗ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ كَانُوا۟ يَكْفُرُونَ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ وَيَقْتُلُونَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ بِغَيْرِ ٱلْحَقِّ ۗ ذَٰلِكَ بِمَا عَصَوا۟ وَّكَانُوا۟ يَعْتَدُونَ ﴿٦١﴾﴾ [البقرة]

واتە: یادی ئەو نیعمەتە بکەنەوە کاتێک بە مووساتان وت: ئێمە هەرگیز لەسەر یەک جۆر خۆراک ئۆقرە ناگرین و بەتەنها جۆرێک خواردەمەنی ڕازی نین، لەبەرئەوە داوا لە پەروەردگارت بکە لە ڕزق و ڕۆزی و بەروبوومی زەویمان بۆ بەرهەم بهێنێت لە ڕووەکی پاقلەیی و خەیار و سیرو نیسک و پیاز، مووسا پێی وتن: باشە چۆن ئێوە شتی کەم و ئایەخ و ناتەواو وەردەگرن لەجیاتی شتی لەو چاکتر و باشتر؟ دە دابەزن بۆ شارێک (بیابانی سینا جێبهێڵن) ئینجا بەڕاستی ئەوەی داوای دەکەن دەستتان دەکەوێت. (جا بەهۆی ئەو بیروباوەڕ و بیانوو گرتن و لاسارییەیانەوە) سوکیی و ڕیسوایی و لاتی و زەبوونی درا بەسەریاندا و شایانی خەشم و قینی خوایش بوون، چونکە ئەوان بەڕاستی باوەڕیان نەدەکرد بەئایەتەکانی خوا، پێغەمبەرەکانیان بەناحەق دەکوشت، ئەوەش بەهۆی ڕۆچوونیانەوە لەیاخی بوون و نافەرمانیدا، هەمیشە دەستدرێژیان دەکرد (ئێستەش بەردەوامن لەسەر بەرنامەی باو و باپیرانی خوانەناسیان) .

چوارەم: هەمیشە هاوکاری حزبی مونافیقکاران و جاسوسی دەکەن بۆ ئاژاوە گێڕی:

﴿وَإِذَا لَقُوا۟ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ قَالُوٓا۟ ءَامَنَّا وَإِذَا خَلَوْا۟ إِلَىٰ شَيَٰطِينِهِمْ قَالُوٓا۟ إِنَّا مَعَكُمْ إِنَّمَا نَحْنُ مُسْتَهْزِءُونَ ﴿١٤﴾﴾ [البقرة]

واتە: کاتێکیش (دووڕووەکان) دەگەن بەوانەی باوەڕیان هێناوە دەڵێن: ئێمە ئیمانداریــن و باوەڕمان هێناوە، کەچی کاتێک بە تەنها دەمێننەوە لە لای شەیتانە گەورە و فێڵبازەکانیان دەڵێن: بەڕاستی ئێمە لەگەڵ ئێوەین، بێگومان ئێمە تەنها گاڵتەیان پێدەکەین و پێیان ڕادەبوێرین!



﴿بَشِّرِ ٱلْمُنَٰفِقِينَ بِأَنَّ لَهُمْ عَذَابًا أَلِيمًا ﴿١٣٨﴾ ٱلَّذِينَ يَتَّخِذُونَ ٱلْكَٰفِرِينَ أَوْلِيَآءَ مِن دُونِ ٱلْمُؤْمِنِينَ ۚ أَيَبْتَغُونَ عِندَهُمُ ٱلْعِزَّةَ فَإِنَّ ٱلْعِزَّةَ لِلَّهِ جَمِيعًا ﴿١٣٩﴾﴾ [النساء]

واتە: ئەی پێغەمبەر صلى الله عليه وعلى آله وسلم مژدە بە دوو ڕووەکان بدە کە سزایەکی بە ئێش بۆیان ئامادە کراوە!

ئەوانەی کە کافرەکان دەکەن پشتیوان و یارو یاوەری خۆیان لە جیاتی ئیمانداران، ئایا دەیانەوێت عیززەت و سەربەرزیان لای ئەوان دەست بکەوێت؟ (ئەوانە بە هەڵەدا چوون، چونکە) عیززەت و سەربەرزی هەر هەمووی بەدەست خوایە و لای ئەوە.

پێنجەم: تانە و تەشەر لە پیاوچاکانی ناوخۆیان، نموونەی عەبدوڵلای کوڕی سەلام و حوقەیق، خوای پەروەردگار دەفەرمووێت:

﴿۞ لَيْسُوا۟ سَوَآءً ۗ مِّنْ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ أُمَّةٌ قَآئِمَةٌ يَتْلُونَ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ ءَانَآءَ ٱلَّيْلِ وَهُمْ يَسْجُدُونَ ﴿١١٣﴾ يُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِ وَيَأْمُرُونَ بِٱلْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ ٱلْمُنكَرِ وَيُسَٰرِعُونَ فِى ٱلْخَيْرَٰتِ وَأُو۟لَٰٓئِكَ مِنَ ٱلصَّٰلِحِينَ ﴿١١٤﴾ وَمَا يَفْعَلُوا۟ مِنْ خَيْرٍ فَلَن يُكْفَرُوهُ ۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌۢ بِٱلْمُتَّقِينَ ﴿١١٥﴾﴾ [آل عمران]

واتە: (گاور و جوو) هەموویان یەکسان و چوون یەک نین، بەڵکو لە خاوەنانی کتێب دەستەیەکی ئیماندار نییە، کە ئایەتەکانی خوا لەناخی شەوگاردا دەور دەکەنەوە و نوێژ دەکەن و سوژدە دەبەن و (موسڵمانن بە هەموو واتایەک).

ئەوانە ئیمان و باوەڕیان بە ڕۆژی دوایی هەیە، فەرمان دەدەن بە چاکە و قەدەغەی خراپە دەکەن و بە پەلەو تاڵوکەن بۆ ئەنجامدانی هەموو خێر و چاکەیەک، بێگومان ئەوانە لە ڕیزی چاکەکار و چاکەخوازاندان.

(ئەو ئیماندارانە) هەر چاکەیەک ئەنجام بدەن بەفیڕۆ ناچێت، خوایش زانایە بە پارێزکار و دینداران.

شەشەم: حەزیان بەهاوبەشدانان هەیە بۆ خوای پەروەردگار، ئارەزوویانە بێجگە لە خوا شتی تریش بپەرستن:



﴿ٱتَّخَذُوٓاْ أَحْبَارَهُمْ وَرُهْبَٰنَهُمْ أَرْبَابًا مِّن دُونِ ٱللَّهِ وَٱلْمَسِيحَ ٱبْنَ مَرْيَمَ وَمَآ أُمِرُوٓاْ إِلَّا لِيَعْبُدُوٓاْ إِلَٰهًا وَٰحِدًا لَّآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ سُبْحَٰنَهُۥ عَمَّا يُشْرِكُونَ ٣١﴾ [التوبة]

واتە: جولەکە وتیان: عوزەیر کوڕی خوایە، گاورەکانیش وتیان: مەسیح کوڕی خوایە! ئا ئەو بوختانە (نابەجێیانە) قسەی ئەوانە و بەدەم دەیڵێن و لێی تێناگەن (بیرێک ناکەنەوە، تیافکرن) ئەو گوفتارەیان لاسایی کردنەوەی ئەوانەیە کە پێشتر بێ باوەڕ بوون (لەوەدا کە دەیانووت فریشتەکان کچی خوان)، دەک بەکوشتچن و خوا لەناویان بەرێت، ئاخر ئەم بوختانە ناڕەوایانە چۆن هەڵدەبەستن.

(گاور و جوو) حاخام و قەشەکانی خۆیان کردۆتە پەروەردگاری خۆیان لە جیاتی خوا (ملکەچ و فەرمانبەرداریانن، ئەوانیش بەئارەزووی خۆیان شتیان بۆ حەڵاڵ یان حەرام دەکەن) هەروەها مەسیحی کوڕی مەریەمیش (بەکوڕی خوا دەزانن) لەکاتێکدا کە فەرمانیان پێنەدراوە جگە لە پەرستنی تاکە خوایەک، بێگومان جگە لەو زاتە خوایەکی تر نییە، پاکی و بێگەردی و ستایش بۆ ئەو زاتەیە، کە (ئەو نەفامانە) هاوەڵی بۆ بڕیار دەدەن.

حەوتەم: شاردنەوەی ڕاستی و زانست و ساختەکردنی حەق، خوای پەروەردگار دەفەرمووێت:

﴿قُلْ يَٰٓأَهْلَ ٱلْكِتَٰبِ لَسْتُمْ عَلَىٰ شَىْءٍ حَتَّىٰ تُقِيمُواْ ٱلتَّوْرَىٰةَ وَٱلْإِنجِيلَ وَمَآ أُنزِلَ إِلَيْكُم مِّن رَّبِّكُمْ وَلَيَزِيدَنَّ كَثِيرًا مِّنْهُم مَّآ أُنزِلَ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ طُغْيَٰنًا وَكُفْرًا فَلَا تَأْسَ عَلَى ٱلْقَوْمِ ٱلْكَٰفِرِينَ ٦٨﴾ [المائدة]

واتە: (ئەی محمد ﷺ) بڵێ: ئەی خاوەنانی کتێب، ئێوە لەسەر هیچ بەرنامە و پەیڕەو و پرۆگرامێک نین، هەتا بە چاکی تەورات و ئینجیل و ئەوەی (لەم دواییەدا، کە قورئانە) لەلایەن پەروەردگارتانەوە بۆتان ڕەوانە کراوە جێبەجێ نەکەن. (کەچی لەجیاتی گوێڕایەڵی و ملکەچی) زۆربەیان هەوڵ دەدەن شت هەڵبەستن بۆ ئەو قورئانەی کە بۆمان ڕەوانە کردوویت، (ئەو هەموو خورافیات و ئیسرائیلیاتەی کە لە هەندێ تەفسیرە کۆنەکاندا هەیە ئاماژەیە بۆ ئەو کارەیان، مەبەستیشیان) لادان و سەر لێشێوانی خەڵکی یە (جا ئیتر کە ئاوایە) خەفەت و پەژارە داتنەگرێت بۆ قەومی کافران، کاتێ کە باوەڕ ناهێنن، کاتێ کە تۆڵەیان لێ دەکەینەوە لە دنیادا پێش قیامەت.

هەشتەم: هەرگیز لەناو خۆشیاندا بەیەکەوە ناگونجێن و کۆنابنەوە:



﴿لَا يُقَٰتِلُونَكُمْ جَمِيعًا إِلَّا فِى قُرًى مُّحَصَّنَةٍ أَوْ مِن وَرَآءِ جُدُرٍۭ ۚ بَأْسُهُم بَيْنَهُمْ شَدِيدٌ ۚ تَحْسَبُهُمْ جَمِيعًا وَقُلُوبُهُمْ شَتَّىٰ ۚ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ قَوْمٌ لَّا يَعْقِلُونَ﴾ [الحشر]

واتە: هۆزی جوولەکە هەرگیز بە یەکپارچەیی ناتوانن دژی ئێوەی (ئیماندار) بجەنگن مەگەر لە شوێنی قایم و قەڵای سەختا بن، یا لە پشتی دیواری بەرز و قایمەوە، (ئەو جووانە) نێوانیان زۆر ناخۆشە و چارەی یەکتریان ناوێت وا دەزانیت یەکپارچەن، بەڵام لە ڕاستیدا دڵەکانیان (هەریەکەی لە دۆڵێکدایە) دوورن لە یەکەوە، چونکە ئەوانە ژیرو هۆشمەند نین.

نۆیەم: حەزیان بەدانی ڕەشوەیە، درۆکردن پیشەی یەهوودە:

﴿سَمَّٰعُونَ لِلْكَذِبِ أَكَّٰلُونَ لِلسُّحْتِ ۚ فَإِن جَآءُوكَ فَٱحْكُم بَيْنَهُمْ أَوْ أَعْرِضْ عَنْهُمْ ۖ وَإِن تُعْرِضْ عَنْهُمْ فَلَن يَضُرُّوكَ شَيْـًٔا ۖ وَإِنْ حَكَمْتَ فَٱحْكُم بَيْنَهُم بِٱلْقِسْطِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُقْسِطِينَ﴾ [المائدة]

واتە: ئەو (جوولەکە) بەدڵگەرمی گوێ بۆ درۆ دەگرن و کەسایەتیان ناپوختە و حەڕام خۆر و سووخۆرن، ئەگەر کێشەیەکیان هەبوو، هاتن بۆ لات (تۆ سەربەستی) دادوەری بکەی لە نێوانیاندا یا گوێیان پێ نەدەی، خۆ ئەگەر گوێیان نەدەیتێ هەرگیز ناتوانن هیچ جۆرە زیانێکت پێبگەیەنن، خۆ ئەگەر دادپەروەریت کرد لە نێوانیاندا دادپەروەرانە ئەنجامی بدە، چونکە بەڕاستی خوا دادپەروەر و ماڤپەروەرانی خۆش دەوێت.

دەیەم: هەرگیز فەرمان بەچاکە و ڕێگری لە خراپە ناکەن، هەر بەو هۆکارەیە خوای گەورە لەعنەتی لێ کردوون، دووری خستونەتەوە لە ڕەحمەتی خۆی:

﴿لُعِنَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مِنۢ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ عَلَىٰ لِسَانِ دَاوُۥدَ وَعِيسَى ٱبْنِ مَرْيَمَ ۚ ذَٰلِكَ بِمَا عَصَوا۟ وَّكَانُوا۟ يَعْتَدُونَ ۝ كَانُوا۟ لَا يَتَنَاهَوْنَ عَن مُّنكَرٍ فَعَلُوهُ ۚ لَبِئْسَ مَا كَانُوا۟ يَفْعَلُونَ﴾ [المائدة]

واتە: نەفرین کراوە لەوانەی کە کافر بوون لە نەوەی ئیسرائیل لەسەر زمانی داوود و عیسای کوڕی مەریەم ئەمەش لەبەر ئەوەی کە ئەوانە یاخیی و سەرکەشن و دەستدرێژی دەکەن.

ئەوانە لەنێوان یەکتردا قەدەغەی خراپە و تاوانیان نەدەکرد کاتێک کە ئەنجامیان دەدا، ئای کە چەندە کار و کردەوەی خراپیان دەکرد.



یازدەم: سوود لە زانستی تەورات و زانستە ئایینییەکان وەرناگرن، بەڵکو بۆ پارە پەیداکردن خۆناساندن بەکاری دەهێنن:

﴿مَثَلُ ٱلَّذِينَ حُمِّلُواْ ٱلتَّوْرَىٰةَ ثُمَّ لَمْ يَحْمِلُوهَا كَمَثَلِ ٱلْحِمَارِ يَحْمِلُ أَسْفَارًۢا ۚ بِئْسَ مَثَلُ ٱلْقَوْمِ ٱلَّذِينَ كَذَّبُواْ بِـَٔايَـٰتِ ٱللَّهِ ۚ وَٱللَّهُ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلظَّـٰلِمِينَ ۝﴾ [الجمعة]

واتە: نموونەی ئەوانەی کە تەوراتیان بۆ ڕەوانە کرا تا پەیڕەوی بکەن، کەچی پەیڕەویان نەکرد، وەک: گوێدرێژێک وان کە بارە کتێبی هەڵگرتبێت، (ئای کە) چەندە ناشرینە نموونەی ئەوانەی کە ئایەتەکانی خوا بە درۆ دەخەنەوە و بڕوایان پێی نییە، بێگومان خوا هیدایەت و ڕێنموونی ستەمکاران ناکات.

دوانزە: دڵ ڕکینە و بوغزاوین:

﴿لَيْسَ عَلَى ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّـٰلِحَـٰتِ جُنَاحٌ فِيمَا طَعِمُوٓاْ إِذَا مَا ٱتَّقَواْ وَّءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّـٰلِحَـٰتِ ثُمَّ ٱتَّقَواْ وَّءَامَنُواْ ثُمَّ ٱتَّقَواْ وَّأَحْسَنُواْ ۗ وَٱللَّهُ يُحِبُّ ٱلْمُحْسِنِينَ ۝﴾ [المائدة]

واتە: ئەوانەی (پێش حەرامکردنی عەرەق) خواردوویانەتەوە لە ئیمانداران، کار و کردەوەی چاکیان هەبووە ئەوە لێیان ناگیرێت و چاوپۆشییان لێ دەکرێت ئەگەر لەمەوودوا تەقوا و خواپەرستییان زیاد بکەن و باوەڕیان پتەوتر بکەن و کار و کردەوەی چاکەی زیاتر ئەنجام بدەن، لەوەودوا هەر پلەی تەقواو ئیمان و باوەڕیان بەرزتر و باڵاتر بکەن ئەوجا هەر تەقوایان زیاتر بکەن و چاکە و چاکەکاری ئەنجام بدەن، بێگومان خوای گەورە چاکەکارانی خۆش دەوێت و ڕێزی تایبەتی هەیە بۆیان و (چاپۆشی لە ڕابردوویان دەکات).

سێزدەیەم: ئیرەیی و حەسوودی:

﴿وَدَّ كَثِيرٌ مِّنْ أَهْلِ ٱلْكِتَـٰبِ لَوْ يَرُدُّونَكُم مِّنۢ بَعْدِ إِيمَـٰنِكُمْ كُفَّارًا حَسَدًا مِّنْ عِندِ أَنفُسِهِم مِّنۢ بَعْدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُمُ ٱلْحَقُّ ۖ فَٱعْفُواْ وَٱصْفَحُواْ حَتَّىٰ يَأْتِىَ ٱللَّهُ بِأَمْرِهِۦٓ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ۝﴾ [البقرة]

واتە: زۆرێک لە خاوەن کتێبەکان ئاواتەخوازن لەبەر حەسوودی و ناپاکی خۆیان ئەگەر بۆیان بکرێ بتانگێڕنەوە ڕیزی بێباوەڕان، ئەمەش دوای ئەوەی کە حەق و ڕاستییان بەتەواوی بۆ ڕوون بۆتەوە (چوونەتە ڕیزی باوەڕدارانەوە)، بەڵام ئێوە هەر لێیان ببورن و لێیان مەگرن و چاوپۆشییان لێ بکەن، تا خوا کاری خۆی ئەنجام دەدا و ویستی خۆی جێبەجێ دەکات، بێگومان خوا دەسەڵاتی بەسەر هەموو شتێکدا هەیە.



چواردەیەم: لووتبەرزی و خۆ بەزلزانن:

﴿وَقَالُواْ لَن يَدْخُلَ ٱلْجَنَّةَ إِلَّا مَن كَانَ هُودًا أَوْ نَصَٰرَىٰ ۗ تِلْكَ أَمَانِيُّهُمْ ۗ قُلْ هَاتُواْ بُرْهَٰنَكُمْ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴾ [البقرة]

واتە: (جوولەکە و گاورەکان) دەڵێن: کەس ناچێتە بەهەشتەوە جگە لەوانەی کە جوولەکەن یا گاورن، جا ئەوە ئاوات و خەیاڵی خۆیانە (تۆش ئەی محمد ﷺ، ئەی ئیماندار پێیان بڵێ): ئەگەر ڕاست دەکەن، بەڵگەتان لەسەر ئەم قسەیە بهێننە مەیدانەوە.

﴿وَقَالَتِ ٱلْيَهُودُ وَٱلنَّصَٰرَىٰ نَحْنُ أَبْنَٰٓؤُاْ ٱللَّهِ وَأَحِبَّٰٓؤُهُۥ ۚ قُلْ فَلِمَ يُعَذِّبُكُم بِذُنُوبِكُم ۖ بَلْ أَنتُم بَشَرٌ مِّمَّنْ خَلَقَ ۚ يَغْفِرُ لِمَن يَشَآءُ وَيُعَذِّبُ مَن يَشَآءُ ۚ وَلِلَّهِ مُلْكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَمَا بَيْنَهُمَا ۖ وَإِلَيْهِ ٱلْمَصِيرُ ﴾ [المائدة]

واتە: جوولەکە و گاور دەڵێن: ئێمە ڕۆڵەی خوا و خۆشەویستی ئەوین، پێیان بڵێ: کەواتە بۆچی لەسەر گوناح و تاوانتان سزاتان دەدات (لە دنیادا بە ئاشکرا بەڵا و ناخۆشیتان بۆ پێش دێنێ، سزای قیامەتیش لەولاوە بوەستێ، ئێوە خۆتان ئاوا بەگەورە و نازدار دامەنێن و ئاوا خۆتان جیامەکەنەوە)، ئێوەش بەشەر و ئادەمیزادێکن وەکو ئەو هەموو خەڵکەی کە دروستکراون، ئەوەی خوا بیەوێ لێی خۆش ببێت لێیخۆش دەبێت، ئەوەش بیەوێت سزای بدات سزای دەدات (ئەڵبەتە لەچوارچێوەی دادپەروەریدا) هەرچیش لە ئاسمانەکان و زەویدا هەیە هەر خوا خاوەنیانە، گەڕانەوە و سەرئەنجامیش بۆ لای ئەو زاتەیە.

پانزەیەم: چاوچنۆکی و بەخیلی:

﴿ٱلَّذِينَ يَبْخَلُونَ وَيَأْمُرُونَ ٱلنَّاسَ بِٱلْبُخْلِ وَيَكْتُمُونَ مَآ ءَاتَىٰهُمُ ٱللَّهُ مِن فَضْلِهِۦ ۗ وَأَعْتَدْنَا لِلْكَٰفِرِينَ عَذَابًا مُّهِينًا ﴾ [النساء]

واتە: ئەوانەی کە ڕەزیلی دەکەن و فەرمان دەدەن بە خەڵکی کە ڕەزیل بن، ئەو شتانەی کە خوا پێی بەخشیوون (لە ماڵ و سامان و زانستی) دەیشارنەوە و(نایەڵن کەس سوودی لێ وەرگرێت) (ئەوە بزانن) کە ئێمە بۆ خوانەناسان سزایەکی سەرشۆڕکەرمان ئامادە کردووە.



﴿وَمَاذَا عَلَيْهِمْ لَوْ ءَامَنُواْ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْآخِرِ وَأَنفَقُواْ مِمَّا رَزَقَهُمُ ٱللَّهُۚ وَكَانَ ٱللَّهُ بِهِمْ عَلِيمًا﴾ [النساء]

واتە: چی دەبوو؟ چیان بەسەر دەهات؟ (ئەو خەڵکە) ئەگەر باوەڕیان بەخوا و ڕۆژی دوایی بهێنایە و لەو ڕزق و ڕۆزییەی کە خوا پێی بەخشیون بیانبەخشیایە (جگە لە سوودو قازانجی بێ سنوور لە هەردوو دنیادا) خۆ خوا هەمیشە و بەردەوام ئاگای لێیانە و زانیاری هەیە دەربارەیان.

شانزەیەم: ئینکار و عینادن بۆ سەرخستنی قسەی خۆیان، خوای گەورە دەفەرمووێت:

﴿وَلَئِنْ أَتَيْتَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلْكِتَٰبَ بِكُلِّ ءَايَةٍ مَّا تَبِعُواْ قِبْلَتَكَۚ وَمَآ أَنتَ بِتَابِعٍ قِبْلَتَهُمْۚ وَمَا بَعْضُهُم بِتَابِعٍ قِبْلَةَ بَعْضٍۚ وَلَئِنِ ٱتَّبَعْتَ أَهْوَآءَهُم مِّنۢ بَعْدِ مَا جَآءَكَ مِنَ ٱلْعِلْمِ إِنَّكَ إِذًا لَّمِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ﴾ [البقرة]

واتە: بەڕاستی تۆ ئەگەر بچیت بۆلای ئەوانەی کتێبیان بۆ هاتووە، هەر بەڵگەیەک بتەوێ شوێنی ڕاستی بکەون و ڕووبکەنە ڕووگەی تۆ، ڕووی تێ ناکەن و بەقسەت ناکەن، وەنەبێ تۆش (کە دڵنیای ڕووگەی تۆ ڕەسەن و دێرینترە) دەستهەڵگری و ڕووبکەیتە ڕووگەی ئەوان، ئەوانیش ڕوو ناکەنە ڕووگەیەکی تر، ئەگەر تۆ شوێن هەوا و ئارەزووی ئەوان بکەویت، دوای ئەوەی کە زانیاری تەواوت لە هەموو ڕوویەکەوە پێ ڕاگەیەنراوە، ئەوا تۆ لە ڕیزی ستەمکاران دا دەبیت (بێگومان ئەستەمە تۆ وا بیت، ئەی فرستادەی خوا).

ئەمەی باسمان کرد بەگشتی باس و خواسی یەهوود بوو، هیوام وایە سوودت لێ وەرگرتبێت.

نومێر: بەڕاستی سوودم لێوەرگرت دەستخۆش و دڵ و مێشکت فراوان بیت عەموو ماکوان.

ماکوان: بابگەڕێینەوە بۆ شاری مەدینە نزیکەی شەش مانگ بۆ ساڵێک ئەم ڕووداوانە ڕوویانداوە چیتر ڕوویداوە بۆم باسکە، نەوەکو لە زیندانەوە بانگم بکەن فریا نەکەوم.

نومێر: بەڵێ ئەم ماوەیە تا ڕادەیەک هێمنی و ئاسایش لە شاری مەدینە بەرقەرار بوو، بەڵام هێمنییەک لەسەر بووڕکانە و لە تەقینەوەدایە! ئەم ماوەیە موسڵمانان بەگشتی حکومڕانی مەدینە دەکەن، جارێ خەتەر و ترسناکی موشریکی مەدینە لە ئارادایە بە سەرۆکایەتی عەبدوڵلای کوڕی سەلول، هێرشی قوڕەیش و ترسی یەهوود و چەتەکانی ئەعراب، خوای گەورە فەرمانی پێنەکردبوون بە جەنگ و چەک هەڵگرتن.



به‌ڵام له‌دوای ئه‌م ماوه‌یه خوای گه‌وره فه‌رمانی پێكردن بۆ خۆپاراستن و هه‌ڵگرتنی چه‌ك و به‌رگری كردن له خۆیان ڕێگایان پێدرا و ئیزن وه‌رگیرا:

﴿أُذِنَ لِلَّذِينَ يُقَٰتَلُونَ بِأَنَّهُمۡ ظُلِمُواْۚ وَإِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ نَصۡرِهِمۡ لَقَدِيرٌ۝٣٩﴾ [الحج]

واته‌: مۆڵه‌ت دراوه به‌و ئیماندارانه‌ی شه‌ڕیان پێده‌گێرن، كه بجه‌نگن و به‌رهه‌ڵستی بكه‌ن چونكه به‌ڕاستی سته‌ملێكراون، بێگومان خوا ده‌سه‌ڵاتی هه‌یه كه سه‌ریان بخات و سه‌ركه‌وتنیان پێببه‌خشێت...



## ڕێگەدان بە جەنگ و پارێزگاریکردن لە خۆیان

نومێر: ئەم قۆناغە زۆر گرنگە ماکوان، چونکە خوای پەروەردگار ڕێگایدا بە موسڵمانان بەرگری لە خۆیان بکەن، گۆڕانکارییەکی زۆر گرنگ بوو، چونکە هاوەڵان بە گشتی ڕق ئەستوور بوون پێغەمبەری خوا ﷺ بەردەوام دەیفەرموو خۆتان بپارێزن، تووشی جەنگ و ئاشووب و قین مەبن، زۆربەیان دەهاتنە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ داوای بەرگری کردنیان لە خۆیان، خوای پەروەردگار ئاواتەکەی هێنانەدی و فەرمووی دەتوانن و ڕێگا پێدراون بۆ جەنگ لەگەل ئەوانەی دەیانەوێت لەگەڵتان بجەنگن.[51]

مۆڵەت دراوە بەو ئیماندارانەی شەڕیان پێدەگێرن، کە بجەنگن و بەرهەڵستی بکەن چونکە بەڕاستی ستەم لێکراون، بێگومان خوا دەسەڵاتی هەیە کە سەریان بخات و سەرکەوتنیان پێببەخشێت...

ماکوان: تەشریعی ئیسلامی یاسا و ڕێساکانی، هەروا شتێکی هەڕەمەکی نییە بەڵکو هەموو بەگوێرەی قۆناغ دادەبەزێت، چەندە گرنگە لە زانستی فقهی واقیع بزانین، ئەوەندەش گرنگە لە زانستی فقهی قۆناغکاری بزانین.

قۆناغی مەککە لە ڕابردوودا موسڵمانانی پەیوەست کرد بە خۆپاراستن و دوورکەوتنەوە لە شەڕی موشریکەکان، بەڵام ئەم قۆناغە ڕێگا دەدات بە جەنگ کردن لەگەڵ ئەو کەسانەی جەنگیان پێدەفرۆشن، بەڵام ڕێگا پێدان و پەیوەست بوون لەگەڵ فەرزبوون لەسەریان دوو شتی زۆر لەیەک جیاوازن.

ڕێگادان بەواتای ئەوەی دەتوانی جەنگ بکەیت یاخود دەتوانیت جەنگ نەکەیت، بەگوێرەی توانا و زانینی هێزی خۆت لێکدانەوە دەکەیت، بەڵام پێویست و فەرز هیچ هەڵبژاردەیەکت نییە، تەنها جەنگ و گوێڕایەڵییە.

چونکە ئەم قۆناغە خۆئامادەکردنە بۆ قۆناغی دوای خۆی کە جەنگ لەسەر موسڵمانان فەرز دەبێت وەکو نوێژ و ڕۆژوو، بەڵام خوای پەروەردگار قۆناغ بە قۆناغ موسڵمانان پەروەردە دەکات، چونکە فەرزبوونی جەنگ بە گشتی زۆر قورسە و مرۆڤ حەزی پێی نییە، خوای گەورە دەفەرمووێت:

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

٥١ ـ سورەتی الحج، ئایەتی ٣٩.



﴿كُتِبَ عَلَيْكُمُ ٱلْقِتَالُ وَهُوَ كُرْهٌ لَّكُمْ وَعَسَىٰٓ أَن تَكْرَهُوا۟ شَيْـًٔا وَهُوَ خَيْرٌ لَّكُمْ وَعَسَىٰٓ أَن تُحِبُّوا۟ شَيْـًٔا وَهُوَ شَرٌّ لَّكُمْ وَٱللَّهُ يَعْلَمُ وَأَنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ﴾ [البقرة]

ئەم ڕێگادانە بە جەنگ سەرەتای ستراتیجییەکی زۆر گەورە و ترسناکە لە گۆڕانکاری شاری مەدینە دا، ئیتر موسڵمانان دەتوانن ئەو مافانە بگەڕێننەوە بۆ خۆیان کە لێیان زەوت کراوە، بە گوێرەی هێز و توانای خۆیان، ئەوەی کە مافی خواردوون و زوڵمی لێکردوون بە پلەی یەکەم ملهوڕانی شاری مەککەن.

بەڵێ بەڕاستی وایە ئەوەی زوڵم و خراپەکاری کردووە بەرامبەریان لە ئێستادا تەنها کافرانی مەککەن، تەنها زوڵمێکیش نەبووە، بەڵکو جۆرەها زوڵمیان لێ کراوە و بەخەستی زوڵمیان خواردووە.

لە ئازاری لاشە و ئەشکەنجە و سووتان و کوشتن و زوڵم لە ماڵ و سامان و داگیرکردنی خانوو جێگای نیشتەجێبوون، بەبێ هیچ تاوانێک داگیرکردنی هەموو شتێکیان بەهێز پاشان دەربەدەرکردنیان لە زێد و مەڵبەندی خۆیان و ڕاوەدوونانیان، ئەوانیان کرد بە کۆیلە و فرۆشتنیان، خواردنی پارە و ماڵ و سامانیان بە زوڵم، ستەم و زوڵم لە نەفس و سوومعە و جنێودان، قسەی ناشرین و ئیهانە و زوڵم کردن لە ئازادییەکانیان بە زیندانی کردن و دابڕانیان لە ناو کۆمەڵگا دا...هتد.

ئەی ئەگەر ئەم هەموو ناڕەحەتییە بەسەریان هاتووە پێویستە موسڵمانان چی بکەن؟

خۆ ناتوانن هێرش بەرنە سەر شاری مەککە، چونکە سوپایەکی وایان نییە کاری واش هیچ حەکیمانە نییە و لە پێغەمبەر ﷺ ناوەشێتەوە لەو سەرەتایەدا، چونکە موسڵمان لەسەرەتای نەشوونمادان، جارێ لە ڕووی ژمارەوە هەر زۆر کەمن، هەروەها چواردەوریان پڕە لە دوژمن، لە موشریکی مەدینە و یەهوود و گومڕاکان.

ماکوام: ئەی چی بکەن باشە؟

نومێر: تاکە ڕێگاچارە ئەوەیە بازرگانی قوڕەییش بخەنە ژێر مەترسی و هێرش بەرنە سەر قافڵە و کەرستە زەبەلاحەکانیان، ئەو قافڵە و کەرستانە هێزێکی سەبازی کەم پاسەوانی دەکات، هێزی موسڵمانان لە ئێستادا توانای ئەوەی هەیە.

- هەروەها ئەو قافڵانە لە نزیک شاری مەدینەوە تێپەڕ دەبن، پێویست ناکات موسڵمانان توانای زۆری بۆ بەکار بهێنێت.



- پاشان دەتوانن بە خێرایی بگەڕێنەوە بۆ جێگا و مەنزڵگەی خۆیان، گەڕانەوە بۆ شاری مەدینە زۆر ئاسانە.

- لە هەمان کاتدا بەو کارە دەتوانن شتێکی کەم لە ماڵ و سامانی داگیرکراویان بۆ خۆیان بگەڕێننەوە کە بە زۆر لێیان داگیرکراوە.

- دەشتوانن ترس و دڵەڕاوکێ بخەنە ناو ماڵی دوژمن و بەرژەوەندییەکانیان بخەنە ژێر مەترسی.

ئەمەش بۆ موسڵمانان باشترین بیرۆکە بوو، تۆزێک ئەو زوڵم و زۆرەی لەسەریانە هەڵیبگرن بە هێرش بردنە سەر قافڵەکانی قوڕەیش.

ماکوان: لە ڕاستی دا ئەمەش بواری جەنگە، مولحید و عەلمانی و موشریکەکان ناتوانن تانە و تەشەر بدەن لە موسڵمانان، لە بەرامبەر زوڵم و زۆری قوڕەیش کردی بەرامبەر بە موسڵمانان.

نومێر: بەڵی بەدڵنیاییەوە، ئەمە جەنگە و بەئاشکرا قوڕەیش بانگەوازی جەنگی کردووە لە نێوان دوو دەوڵەت دا، دەوڵەتی موسڵمانان و دەوڵەتی کافران، هەردوولا خوێنی یەکتریان حەلاڵ کردووە، تەنانەت ماڵی موسڵمانان داگیرکراوە هەردوو لا لە بەرژەوەندی یەکتر ئەدەن، ئەمەش سروشتی جەنگە.

لە هەموو جێگا و شوێنێک دا ئیسلام ئایینێکی واقعییە، هێز بە هێز دەگەڕێنیتەوە، شمشێر بەکاردەهێنێت بەرامبەر ئەوەی شمشێر بەکاردەهێنێت بۆی، خوای گەورە دەفەرمووێت:

﴿وَلَمَنِ ٱنتَصَرَ بَعْدَ ظُلْمِهِۦ فَأُو۟لَـٰٓئِكَ مَا عَلَيْهِم مِّن سَبِيلٍ ۝ إِنَّمَا ٱلسَّبِيلُ عَلَى ٱلَّذِينَ يَظْلِمُونَ ٱلنَّاسَ وَيَبْغُونَ فِى ٱلْأَرْضِ بِغَيْرِ ٱلْحَقِّ ۚ أُو۟لَـٰٓئِكَ لَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ۝﴾ [الشورى]

لە ڕاستیدا ئەوەی حەقی خۆی دەسێنێ دوای ئەوەی کە ستەمی لێکراوە، ئەوانە لێپرسراو نابن (ئەگەر لە سنوور لانەدەن)

بەڵکو تەنها ئەوانە بەرپرس دەبن کە ستەم لە خەڵکی دەکەن و دەستدرێژیی دەکەن بەناحەق لە زەویدا، ئا ئەوانە سزا و ئازاری بە ئێشیان بۆ هەیە.

ماکوان: لۆمەی موسڵمانان دەکەن بەوەی کەمێکی کەم لە سەروەت و سامانیان بگەڕێننەوە بۆخۆیان، بەڵام تا ڕۆژئاوا و موستەشریق و عەلمانییەکان باسی لەناوچوونی



گەل و نەتەوەکان ناکەم کە لەناویان بردن، دووڕوون ئەو عەلمانییە ڕۆژئاواییانە دووڕوویێکی بێ مۆراڵ، باسی ئەو هەموو قومبەلە و ناپاڵم و چەکی ئەتۆمە ناکەن کە وڵات و شار و خەڵکی وێران کرد و لەناووی بردن.

نومێر: بێگومان ئەوان خۆ حوکم بە شەرعی خوا ناکەن تا دادپەروەربن، ئەوان حوکم بە هەوا و ئارەزووی خۆیان دەکەن چاوەڕوانی چییان لێدەکەیت، بەڵام ئەوە بزانە ماکوان؛ پێغەمبەری خوا ﷺ نایەوێت چەتە و مافیا و پیاو کوژ دروست بکات، خۆ هەروا ڕێگەی نەدا خەڵک چەک هەڵگرن و وابزانن چەتە و مافیان و بۆ دزی ئەچنە سەر ڕێگای قافڵە و بازرگانەکانی قوڕەیش بخەنە ژێر ڕکێفی خۆیان، نا پێغەمبەری خوا ﷺ هەموویانی لەسەر ئیمان پەروەردە کردبوو، لەسەر دەستپاکی و داوێنپاکی پەروەردە کردبوو، بۆیە پێش جەنگ و ڕووبەروو بوونەوە فێری ڕەوشتی کردن.



# پێش جەنگ و کوشتار پەروەردەی کردن و فێری ڕەوشتی کردن

نومێر: پێش ئەوەی پێغەمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ پلانی سەبازی دابڕێژێت و هێرش بکاتە سەر قورەیش زۆر بەپێویستی زانی موسڵمانان پەروەردە بکات لەسەر ڕەوشتی جەنگ و خواناسی، نەبنە مافیا و چەتە و ڕێگر.

چونکە ئەو یاسا و ڕیسا نوێیانەی لە ئاسمانەوە هاتوونەتە خوارەوە ڕێگا بە جەنگ ئەدات، دەبێت بزانن بۆچی جەنگ دەکەن؟ لەبەرچی خەڵک دەکوژن؟ یان ئەگەر کوژرا بۆچی دەکوژرێت؟ ئەی ئەگەر سەرکەوت بۆچی سەردەکەوێت؟ هەموو ئەم پرسیارانە هاوەڵان سەرەتا نەیاندەزانی، لەبەر ئەوەی ئەم تەشریعە نوێ و قانونە لەکات و جێگا و شوێنی نوێ دابەزیوە.

بۆیە پێغەمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ وەکو کرداری هەمیشەیی موسڵمانان لەسەر ئەم یاسا و قانونە نوێیە پەروەردە دەکات، بەوەندە واز ناهێنێت کە یاساکە دابەزییەوە ئیتر بەسە، چونکە دەیەوێت موسڵمانان لەسەر ڕەوشتی قیامەتی پەروەردە بکات، خەونی موسڵمانان بەهەشتە نەک دونیا و دەستکەوتەکانی و پارە و سەروەت و سامان، هەموو کارێک دەبێت بسپێردرێت بە خوای پەروەردگاری، خواناسی لەپشت هەموو کارێکی موسڵمانانەوە بێت.

جەنگ و کوشتار لە ئیسلام دا کاری مافیا و ڕێگر و چەتە لەبەر خاتری حیزب و دەسەڵات و نەتەوە نییە یان لە پێناوی نەفس و سەرکردە و دنیا بێت بەگشتی، بەڵکو لەپێناو خودایە (في سبيل الله)، زۆربەی کات خوای گەورە باسی جیهاد و جەنگی کردووە، هەمیشە لە دواییدا و لە سیاقی باسەکە دا بەستوویەتییەوە بە لە پێناوی خودا (في سبيل الله) لەم بارەیەوە لە قورئاندا دەفەرمووێت:

﴿إِنَّ ٱللَّهَ ٱشْتَرَىٰ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ أَنفُسَهُمْ وَأَمْوَٰلَهُم بِأَنَّ لَهُمُ ٱلْجَنَّةَ يُقَٰتِلُونَ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ فَيَقْتُلُونَ وَيُقْتَلُونَ وَعْدًا عَلَيْهِ حَقًّا فِى ٱلتَّوْرَىٰةِ وَٱلْإِنجِيلِ وَٱلْقُرْءَانِ وَمَنْ أَوْفَىٰ بِعَهْدِهِۦ مِنَ ٱللَّهِ فَٱسْتَبْشِرُوا۟ بِبَيْعِكُمُ ٱلَّذِى بَايَعْتُم بِهِۦ وَذَٰلِكَ هُوَ ٱلْفَوْزُ ٱلْعَظِيمُ﴾ [التوبة]

واتە: بەڕاستی خوا گیان و ماڵی لە ئیمانداران کڕیوە بەوەی کە بەهەشت بۆ ئەوانە و بەشیانە (بەڕاستی پەروەردگارێکی بەخشندەیە، هەر خۆی بەخشێنەری گیان و ماڵ و



سامانە، کەچی ئاوا مامەڵە دەکات لەگەڵ ئیمانداراندا و نرخێکی نەبڕاوە، نرخێکی زۆر گەورەی بۆ بڕیارداوە، کاتێک لە پێناوی ئەودا دەیبەخشن) ئەوانە دەجەنگن لە پێناوی ئایینی خوادا، دوژمنانی ئایینی خوا دەکوژن (لە گۆڕەپانی جەنگدا)، یان دەکوژرێن و (شەهید دەکرێن)، ئەو پاداشت و بەڵێنە بەڕاستی لەسەر خوایە و باس کراوە لە تەورات و ئینجیل و قورئاندا، جا کێ هەیە بە قەدەر خوا بەوەفا و بەئەمەک بێت بۆ جێبەجێکردنی بەڵێنەکانی، کەواتە زۆر دڵخۆش و کامەران بن بەو مامەڵەیەی کە ئەنجامتانداوە و بەو فرۆشتن و کڕینەی کە لەسەری ڕێککەوتوون، بێگومان هەر ئەوەشە سەرفرازی و سەرکەوتنی نەبڕاوە و بێ سنوور.

ماکوان: ڕاستە پێغەمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ دەفەرموویت:[٥٢]

واتە: سوێند بەو کەسەی گیانی منی بەدەستە ئارەزوومە لە پێناو خوای گەورە دا کوشتار بکەم و بجەنگم، کوشتار بکەم و بجەنگم.

جا ئەگەر تەماشا بکەیت جەنگی پێغەمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ و موسڵمانان بۆ مەبەستێکە کە خوای گەورە ڕازی بکات لەبەر خاتری قیامەت، ڕێک پێچەوانەی جەنگی مولحید و عەلمانییەکانە، ئەوان بۆ ڕەغبەتی ماڵ و سامان و دەستکەوتی دونیایی و سوڵتە و موڵکداری دەجەنگن یان هەیانە لە ترسی سەرکردە و سەرۆکەکەی ئەجەنگێت، لەبەر ئەوەی خاوەنی پرنسیپ و مەبدئو نییە، یان خاوەنی مەنهەج و قەزیەیەک نییە تا لەپێناوی دا بجەنگێت، جا کە دەجەنگن بێئەوەی هیچ ورە و حەماسێکی هەبێت، یان خاوەنی هیچ ئامانجێک نییە، بۆیە لە کاتی جەنگ دا هیچ بەربەستێک نییە بۆ ڕاکردن و پشت تێکردن، جا ئەو کات ڕاکردن و هەڵهاتن دەبێتە قارەمانی و خۆڕزگارکردن.

نومێر: ڕاستە ئامانج نەبوو لە جەنگدا ئەوا چەتەیی و مافیاییە، بەڵام جیهاد و جەنگ و کوشتار لە ئیسلام دا لە پێناوی زاتێکدایە کە ئەو نامرێت و باقییە، لە پێناوی ئەودا دەجەنگن ڕۆحێکی بەرز و ئازایەتییەکی بێوێنە ئەداتە موسڵمانان، ئەوەی لە پێناوی خوا بجەنگێت ناتوانێت لەبەر ئارەزوو و نەفسی خۆی جەنگ بکات.

بەڕاستی پێغەمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ هەڵسا بە جوانترین پەروەردەی ئیمانداران لە ئاستێکی زۆر بەرزدا.

---

[٥٢] - (وَٱلَّذِي نَفْسِيٌ بِيَدِهِ لَوْلَا أَنَّ أَشَقَّ عَلَى ٱلْمُسْلِمِينَ مَا قَعَدَتْ خِلَافَ سِرِّيَّةٍ تَخْرُجُ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ أَبَدًا وَلَكِنْ لَا أَجِدُ سِعَةً فَأَحْمَلَهُمْ وَلَا يَجِدُونَ سِعَةً فَيَتَّبَعُونِي وَلَا تَطِيبُ أَنْفُسُهُمْ فَيَتَخَلَّفُونَ بَعْدِي وَٱلَّذِي نَفْسِ مُحَمَّدٌ بِيَدِهِ لَوَدِدْتَ أَنْ أَغْزُوَ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ فَأَقْتَل ثُمَّ أَغْزُو فَأَقْتَلُ ثُمَّ أَغْزُو فَأَقْتُلُ). صیح ابن حبان وابن ماجة.



ئێستا دێری ئیسلامی ئامادەیە بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەیەکی ترسناک لەگەڵ قوڕەیش، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دەرچوونی موسڵمانان هەروا هەڕەمەکی نەبوو مەفرەزە و سریەکانی ئامادەکرد بە پلان و زانیاری تەواو دەردەچوون، چونکە پێغەمبەر صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ خۆی گۆڕەپانی ئۆپەراسیۆنەکانی بە گوێرەی زانیاری ئامادە دەکرد، خەڵکی بڵاو کردەوە و چاو و دەزگای زانیاری سەربازی دروست کرد، لەگەڵ هۆز و عەشیرەتەکانی ڕۆژئاوای وڵاتەکەی یاخود شاری مەدینە پەیماننامەی مۆر کرد کە هەردوولا بەرگری لەیەکتری بکەن، بەلایکەمەوە بەهۆکاری ئەم پەیماننامانە توانی هاوپەیمانی و دراوسێیەتی دروست بکات، ئەو ڕێگایەش هەموو کاروان و قافڵەی قوڕەیشی پێیدا تێپەر دەبوو، بەم کارە دڵنیابوو لەگەڵ ڕووبەڕووبوونەوەی قوڕەیش لە پشتەوە خەنجەری لێنادرێت، چەند پەیماننامەیەکی تریشی مۆر کرد لەگەڵ هۆزەکانی تردا، بەڵام ئەوان لە کاتی خۆیاندا باسی دەکەین، بەهەمان شێوە بۆ هەمان ئامانج و مەبەست بوو.

ماکوان: ئەگەر تەماشای کاری پێغەمبەری صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ بکەین، هەموو کارەکانی و هۆکارە ماددییەکانی دەگرتەبەر، هەموو هۆکارەکانی جێبەجێ دەکرد، خۆی باش ئامادە دەکرد، ئەوەی لە توانایدا بوایە دەیکرد، پاشان ڕووی دەکردە خوای پەروەردگار و نزا و تەوەکولی تەواوی بە پەروەردگاری بوو، ئەمەش ڕێگای هەموو سەرکردەیەکی ئیماندارە بۆ سەرکەوتن.

ئەی پێغەمبەری خوا مەفرەزە و سریە سەرەتاییەکانی چۆن دامەزراند ؟!



# دامەزراندنی مەفرەزە سەرەتاییەکان لەلایەن موهاجیرەکانەوە

**نومێر: دەرچوون و گەڕانی مەفرەزەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ دەستی پێکرد، دەورییەیان دەردەچوون بۆ گەڕان بەدوای قافڵەی قوڕەیشدا کە بەرەو شام دەڕۆشتن، جا لێرەدا ئەگەر بە وردی سەرنج بدەیت، ئەم مەفرەزە و سرییانە هەموو پێکهاتوون لە موهاجیرەکان، بێجگە لەوان پێغەمبەر ﷺ کەسی تری هەڵنەدەبژارد ئەمەش جێگەی ڕامانە، وایە؟!**

**ماکوان: نا، کارێکی زۆر ئاساییە، دەبوو پێغەمبەری خوا ﷺ هەروا بکات، چونکە چەند هۆکارێکی لە پشتەوەیە؟!**

هۆکاری یەکەم: چونکە هەر موهاجیرەکانن تووشی زوڵم و ستەم بوون بە دەستی قوڕەیش، جەنگکردنی موهاجیرەکان لەگەڵ قوڕەیش دا سۆز و عاطیفەی نیوەدوورگەی عەرەبی ڕاناکێشێت بەلای قوڕەیش دا، بەڵکو هەموو لایەک دەزانن جەنگەکە هۆکاری چییە و لە جەنگی نێوانیان تێدەگەن، لە هەمانکاتدا هەق ئەدەنە دەستەی موهاجیرەکان کە بۆ گەڕانەوەی مافی خۆیان دەجەنگن و هیچ کەس ناتوانێت لۆمەیان بکات.

هۆکاری دووەم: سوپای موهاجیر زیاتر چالاکتر و حەزی جەنگیان زیاترە، چونکە هێزێک بۆ ئەوە دروست بوو مافەکانی لێی زەوت کراوە بیگەڕێننەوە، واتا زیاتر تایبەتە بە خودی موهاجیرەکان، ئەگەری سەرکەوتن بە دەستی ئەوان زیاترە تا سوپایەکی تێکەڵ لە موهاجیر و ئەنساری.

هۆکاری سێیەم: موهاجیرەکان باشتر ئاگادارن بەجەنگ و جۆری کاری سەربازی قوڕەیش تا وەکو لاکانی تر، ئەوان دەزانن چۆن لەگەڵیاندا بجەنگن، چونکە ساڵانێک بەیەکەوە ژیاون، یەکتری باش دەناسن و موهاجیرەکان ڕێگاکانی قوڕەیش باش دەناسن.

هۆکاری چوارەم: لە هەمانکاتدا بەرزکردنەوەی ڕۆحی دەروونی موهاجیرەکانە کەماڵ و سامانیان داگیرکراوە ڕاوەدوونراون لە خاک و مەڵبەند و زێدی خۆیان دوور خراونەتەوە، هەموو یادگارییەکانیان جێهێشتووە، ئەم کارەی پێغەمبەر ﷺ قەرە بوویەکە بۆ ئەوان تا لە ڕووی ماددی و مەعنەوییەوە هەڵیان بێنێتەوە.



هۆکاری پێنجەم: لەوانەیە سەرەکیترین هۆکاربێت لای من ئەویش پێغەمبەری خوا ﷺ لەکاتی پەیماننامەی عەقەبەی یەکەم و دووەم دا لەگەڵ ئەنسار دا وا ڕێنەکەوتن لەدەرەوەی شاری مەدینە بیانپارێزن، پێغەمبەر ﷺ داوای لێکردن لەناو شاری مەدینە دا پارێزگاری لێبکەن و سەری بخەن، ئەمەش لە جەنگی بەدردا زیاتر ئەو حاڵەتەمان بۆ دەردەکەوێت پێغەمبەری خوا ﷺ تا ڕادەیەک لە دوودڵی دایە لە بەرامبەر ئەنساردا، تا وەکو گوێی لە ڕاکانی ئەوس و خەزرەج دەبێت، خۆ پێغەمبەر ﷺ دەیتوانی فەرمان بکات، بێگومان لە زمانی پێغەمەبەر ﷺ دەرنەدەچوو، بەڵام پێغەمەبەر ﷺ خاوەن وەفا و پەیمانە خەڵکی وا لێناکات کە بەزۆر داوایان لەسەر بکات و ئەوانیش لە توانایاندا نەبێت.

نومێر: دەست و دەمت خۆش بۆ ڕوونکردنەوەی هۆکارەکان، ئەی پێم بڵێ حیکمەت چی بوو لە دانانی چوار سەرکردەی جیاواز لە جێگەی خۆیدا لە کاتی دەرچوونی مەفرەزە و سریەکانیان.



# حیکمەت لە دانانی چوار ئەمیرەکە

ماکوان: بەدڵنیاییەوە ئەویش وەک باسی ڕابردوو هۆکاری خۆی هەیە، لەباسی ڕابردوو هەڵوەستەمان کرد لەسەر جۆری جەنگاوەرەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ لە یەکەم جەنگی موسڵمانان دا هەڵبژێراوون، هەروەها ئەم باسەش پێویستی بە هەڵوەستەیەک دەبێت، چونکە خۆی سەرکردایەتی سریەکان دەکات لە جێگای خۆی دەردەچێت، لە چوار جاردا چوار کەسی جیاواز دادەنێت.

لە ماوەی ساڵێک دا واتا لە ڕەمەزانی ساڵی یەکەمی کۆچی تا ڕەمەزانی ساڵی دووەمی کۆچی پێغەمبەری خوا ﷺ خۆی کە تەشریفی دەبرد، مێژووناسان ناویان ناوە غەزوەی ڕەسوڵ، بەڵام ئەگەر خۆی نەڕۆشتایە، ئەوە بە سریە و مەفرەزە ناو دەبرا، جا لەماوەی ساڵێک کەمتر (٨) دەرچوون ڕوویدا (٤) یان بەسەرکردایەتی پێغەمبەرەکەی ﷺ دەوترێت غەزوەت، (٤) بەسەرکردایەتی هاوەڵانی بەڕێز، ئەگەر ماوەی ساڵێک دابنێین بۆ ئەو (٨) دەرچوونە بە هەمیشە لە مانگ و نیوێک دا موسڵمانان دەردەچوون بۆ جەنگ، خۆی کە تەشریفی برد (٤) جارەکە لە شوێنی خۆی (٤) کەسی دانا لەسەر شاری مەدینە، ئەم چوار هاوەڵە بەڕێزە لە کۆمەڵە و هۆزی جیاواز بوون بریتی بوون لە: (سەعدی کوڕی عبادە) گەورەی خەزرەج بوو، (سەعدی کوڕی موعاز) گەورەی ئەوس بوو، (زەیدی کوڕی حارس و ئەبوسەلەمەی کوڕی ئەسەد)[٥٣] ڕەزامەندی خوا لەهەموویان بێت، ئەم دوانەی کۆتایی لە موهاجیرەکان بوون.

ئەم جۆراوجۆرییە مەشق و ڕاهێنانێکی هاوەڵان بوو بۆ ئەوەی فێربن و تێبگەن جیاوازی لە نێوانیاندا نییە، هەموو یەکگیانی یەکگرتوون، هەموو دوژمنەکانیان بەیەک چاو سەیریان دەکات، ئیتر جیاوازی لە نێوان ئەنسار و موهاجیردا نییە، تەنانەت عەرەب بووە مقۆمقۆیان ئەو سێ کەسەی تر هەموو ئازاد و ناسراو بوون، بەڵام (زەیدی کوڕی حارس) یەکێک بوو لە کوڕی کۆمەڵەکانی شاری مەککە، ئێستا بووە بەسەرکردەی ئەنسار و موهاجیر، بەڵام بە ویلایەتی ئیسلام حوکمڕانی دەکات، عەرەب بەگشتی لەوە تێگەیشتن کە لەمەودوا ئیسلام حوکمڕانی و فەرمانڕەوایی دەکات، نەک هۆز و عەشیرەت و پیاوی ناودار، ئەوەی موسڵمانە

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

٥٣ ـ سعد بن عباده، سعد بن معاذ، زید بن حارث، أبو سلمه بن اسد.



خاوەنی توانایە بۆ بەڕێوەبردن، پێغەمبەری خوا صَلَّىٰ اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ بە دڵنیاییەوە هەموو ملکەچی دەبن و گوێڕایەڵی دەکەن.

لە هەمووی جوانتر ئەو گۆڕانکارییە بنەڕەتییە بوو لە ناو عەرەبدا کردی، بەدرێژایی سەدە و ساڵانی تولانی خۆیان بیریان لە شتی وا نەکردبووەوە، بەڵام (زەیدی کوڕی حارس) بۆ ماوەیەک دەبێتە ئەمیری شاری مەدینە پێغەمبەر صَلَّىٰ اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ لەساڵی (٢) کۆچی مانگی ڕەبیعی ئەوەل تەشریفی برد بۆ غەزوەی سەفوان، لە ماوەی (٢٢) مانگ بزانە پێغەمبەر صَلَّىٰ اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ چ گۆڕانکارییەکی بنەڕەتی کرد لە سروشتی ناووچەکە و عەرەبیش بەتایبەت.

نومێر: دەستخۆش زۆر باشە.

ماکوان: ئەی ڕیزبەندی سەرەکییان و مەفرەزە و غەزاواتەکانی پێغەمبەری خوا صَلَّىٰ اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ چۆن بوو دەتوانی بەڕێزبەندی ساڵ پێم بڵێیت لەگەڵ مانگەکەیدا؟!

نومێر: بەسەرچاو هەرچەندە هەندێک لە جێگاکان دوو ناو یا سێ ناویان هەیە بەڵام بەگشتی بریتییە لە:






غەزوە و سریەکان لەکاتی هاتنی پێغەمبەر ﷺ بۆ مەدینە تا غەزوەی بەنو قەینووقاع

# ڕیزبەندی دەرچوونی سەریە و مەفرەزەکان

١. سریەی سیف البحر: لە مانگی ڕەمەزانی ساڵی یەکەمی کۆچی، بەسەرکردایەتی مامی پێغەمبەر صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ ی خوا حەمزەی کوڕی عبدوالمطەلیب -ڕەزامەندی خوای لێ بێت-.

٢. سریەی رابغ: لە شەواڵی ساڵی یەکەمی کۆچی بەسەرکردایەتی ئامۆزایەکی پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ بە ناوی عوبەیدەی کوڕی حارثی کوڕی عەبدوالموطەلیب -ڕەزامەندی خوای لەسەر بێت-.

٣. مەفرەزەی الخرار: لە مانگی ذی القعدەی ساڵی یەکەمی کۆچی بەسەرکردایەتی پورزایەکی پێغەمبەر ی خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ سەعدی کوڕی نەبی وەقاص.

٤. غەزوەی الابواء ودان: لە مانگی سەفەری ساڵی(٢) کۆچی بەسەرکردایەتی خودی پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ.

٥. غەزوەی بواط: لە مانگی ڕەبیعولئەوەلی ساڵی (٢) کۆچی بەسەرکردایەتی خودی پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ.

٦. غەزوەی سەفوان: لە مانگی ڕەبیعلئەوەلی ساڵی دووی کۆچی بەسەرکردایەتی خودی پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ لەیەک مانگدا دەرچوون.

٧. غەزوەی العشيرة: لە جەمادی یەکەمی ساڵی (٢) کۆچی بەسەرکردایەتی پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ.

٨. مەفرەزەی نەخلە: لە ڕەجەبی ساڵی (٢) کۆچی بەسەرکردایەتی کوڕی پووری پێغەمبەر صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ عبداللە کوڕی جەحش -ڕەزامەندی خوای لێ بێت-.

ئەگەر تەماشای ئەو مەفرەزانەی سەرەوە بکەین، هەموو کەسوکاری پێغەمبەر صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ و خودی پێغەمبەرە صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ. پێغەمبەر صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ لەهەمووان زیاتر دەرچووە، وەکو سەرکردەی تر نەبووە کە لەناو جێگای گەرمدا بێت و کوڕی خەڵکی بەکوشت بدات، بەڵکو لە هەمووان زیاتر لە بەرەی پێشەوەی جەنگەکاندا بووە، ئەوەش وادەکا سەرکردە ببێتە جێگای بڕوای خەڵکی و جەنگاوەرەکانی متمانەی پێ بکەن.



## سوودی ئەم سریە و مەفرەزە و غەزاواتانە چی بووە؟

نومێر: بەگشتی بە چاوێکی سەربازیانە تەماشای ئەم مەفرەزە و سەربازانە و دەرچوونی پێغەمبەر ﷺ بکەین، هیچ جەنگ ڕووی نەداوە تەنها لەکۆتاییاندا نەبێت، واتا هیچ ڕووبەڕووبوونەوەیەک ڕووی نەداوە لەگەڵ دوژمندا، لەگەڵ ئەوەش گرنگی و کاریگەری خۆی بەجێهێشتووە، سوود و قازانجێکی یەکجار زۆریان لێ دەستکەوتووە، سوودەکانیش بریتین لە:

سوودی یەکەم: پێغەمبەر ی خوا ﷺ ئەو دیوارەی شکاند و ڕووخاندی کە ماوەی (١٤) ساڵە هاوەڵان لە نارەحەتی و ئەشکەنجەدا دەژین، پێشتر موسڵمانان ئەمریان پێکرابوو بەهیچ جۆرێک چەک هەڵنەگرن بەرامبەر ئەوانەی زوڵمیان لێ دەکەن، تەنها بەرگری لەخۆکردن و خۆپاراستن لە دەست زاڵمان، ئەو ماوەیەش شکستێکی دەروونی بوو بۆ هاوەڵان، بەڵام ئێستا بە دروستکردنی ئەم سریە و غەزواتانە و بەرزبوونەوەی حاڵەتی دەروونی هاوەڵانە، بەرخودان و ڕاپەڕینە دژی ستەمکاران. پێشتر خەڵکێکی دەرکراو لە زێد و مەڵبەندی خۆیاندا، بەڵام ئێستا کۆمەڵێک خاوەن سوپا و دەوڵەت و هێز و پاراستنی ئاساییشی ناوچەکە و خەڵکەکە کەوتۆتە ئەستۆیان، ئەمەش گۆڕانکارییەکی زۆر گەورە بوو بۆ هاوەڵان و سوودی دەروونی بۆیان هەبوو.

سوودی دووەم: لەهەمان کاتدا مەشقی سەربازییە و هونەری جەنگە بۆ هاوڵان، بەکارهێنانی شمشێر و تیر و ڕم و ئەسپ و وشتر...هتد، لەگەڵ شارەزابوونی ڕێگاوبان و پلان و مناوەرە و جوڵەی سەربازی، چاودێری و زۆر شتی تر.

ڕاستە ئەوانە پێشتر هەر سوارچاکی عەرەب بوون، بەڵام کاری سەربازی هەمیشە پێویستی بە مەشق و ڕاهێنانە، ئەمەش تەنها یاری و پێشبڕکێ نییە، بەڵکو یاری مەرگ و ژیانە لەگەڵ دوژمنەکاندا، کارەکە پەیوەندی بە مانەوە و سەرکەوتن! یان لەناوچوون و ئاوابوون هەیە.

سوودی سێیەم: ئەو دەرچوونانە شارەزایی دەکردن لە ڕێگاوبان و ناساندنی خەڵکی ناوچەکە و جوان شارەزابوونی دۆڵ و بان و شاخەکان، چونکە موهاجیرەکان شارەزای ئەو ناوچانە نەبوون، (٥٠٠) کلم دوور بوون لە مەدینە، ئێستا تەنها موهاجیرەکان شادەماری سوپای موسڵمانانن، دەبێت ناوچەکە شارەزابن.



سوودی چوارەم: هەستکردنی هۆز و عەشیرەتەکانی چواردەوری شاری مەدینە بەوەی موسڵمانان خاوەن هێزی سەربازین و مانگانە و هەفتانە دەردەچن، ئەمەش ترس و تۆقاندنی دەخستە دڵی گەل و هۆزەکانی چواردەوریان، بۆ ئەوەی هەرگیز بیر لەوە نەکەنەوە هاوکاری قورەیش بکەن و پەیماننامەیان لەگەڵ ببەستن، بەتایبەت ئەعرابە دەشتەکییە چەتەکان، جا بۆیە ئەم دەرچوونانە سوودێکی یەکجار زۆری هەبوو بۆ موسڵمانان و چاوترسێنەری هۆزەکانی تریش بوون، درکیان بەوە کرد کە پارسەنگی هێز گۆڕاوە، هێز تەنها لای قورەیش نییە! گۆڕانکاری بەسەردا هاتووە.

سوودی پێنجەم: ئەنجامی دەرچوونەکانیان و دەرکەوتنی هێزی موسڵمانان و تواناى سەربازیان، پێغەمبەر ی خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ چەندین پەیماننامەی دراوسێیەتی و ئاسایشی هاوبەشی بەست لەگەڵ زۆرێک لە هۆزەکان، بۆ نموونە لەگەڵ عەشیرەت و هۆزی (ضمرة) ئەمەش لە غەزوەی (الابواء)، هەوەها لەگەڵ عەشیرەتی (کوڕانی مدلج) ئەویش لە غەزوەی (ذي العشيرة)، جا ئەم پەیماننامە و ڕێکەوتننامانە هەمووی هێز بوو بۆ موسڵمانان، زیاتر جێ پێی خۆیان لە ناوچەکەدا قاییم کرد.

سوودی شەشەم: ئەم دەرچوون و دەوریاتانەی موسڵمانان هەموو کاری سەربازی بوو دژی قورەیش و ئابووری قورەیش، بە ئاشکرا بانگەوازی جەنگیان کرد دژی زوڵم و زۆر، ئەم جەنگە ئاشکرا و ڕاشکاوانە دژی کافری مەککە و وەڵامدانەوەی ئەو جەنگە ستەمکارانە بوو ماوەی (١٤) ساڵ قورەیش دژی موسڵمانان دەیکرد و ئەنجامی ئەدات، ئیتر ئەوە پەیوەندی زاڵمە بە مەزڵومەوە نامێنێت، لەمەودوا پەیوەندی دەوڵەت بە دەوڵەتەوە دەبێت، بەدڵنیاییەوە کاریگەری زۆری دەبێت لەسەر دەروونی سەرکردەکانی مەککە و زاڵمان و خەڵکەکەی بە گشتی، دەبینن ڕۆژ بە ڕۆژ هێزی موسڵمانان لە زیاد بووندایە و نەشونما دەکات و توانا و چەکی باشیان لە بەر دەستدایە، خاوەن دەوڵەتێکی سەربەخۆن، ئەم سوودە باشترین و گرنگترین سوود بوو بۆ موسڵمانان، هەرچەندە وەکو وتم هیچ جەنگ و کوشتارێک ڕووی نەدا، تەنها لە مەفرەزەی نەخلە نەبێت.



# شیکارییەک بۆ مەفرەزەی نەخلە

ماکوان: چی ڕوویدا لەو مەفرەزەیە کە دەرچوون بە ناونیشانی نەخلە؟!

نومێر: بەڕاستی ئەم سریە یاخود وەکو تۆ دەڵێیت مەفرەزە، پێویستی بە شیکارییەکی ورد هەیە بەتایبەتی لەبەر ئەوەی کوشتار و دیل تێیدا ڕووی داوە؟!

ئەم مەفرەزەیە لە مانگی ڕەجەبی ساڵی (٢)ی کۆچی دەرچوو زانیاری بە دەستیان گەیشتبوو کەوا کاروانێکی قوڕەیش بە ناوچەکەدا تێپەر دەبێت بەناوی (نەخلە) لەنێوان مەککە و طائیف دایە، جا دوو کێشەی گەورە ڕووبەڕووی ئەو مەفرەزەیە بوویەوە.

کێشەی یەکەم: شوێنەکە ناوجەرگەی کافران بوو.

کیشەی دووەم: کات و مانگەکە بوو.

بۆ شوێنەکە؛ ناوچەی نەخلە (٤٨٠)کم دوور بوو لە شاری مەدینەوە، ئەمەش بۆ خۆی ڕێگایەکی زۆر دوور و درێژە چەند شەو و ڕۆژ ڕێگا بڕینە، لەگەڵ ئەوەش دا مەفرەزە و سریەکان زۆر بچووک بوون، تێپەڕی نەدەکرد لە (١٢) کەس، خۆ ئەگەر سوپای مەککە پێیان بزانیایە زۆر ئاسان دەبوو دەستگرتن بەسەریان یاخود کوشتنیان، چونکە زۆر نزیک بوون لە شاری مەککە، خودی مەفرەزەکە دوو دڵبوون لە جەنگ کردن لەو ناوچەیە دا، چونکە زۆر دوورەدەستە لە جێگای خۆیان و هیچیان پێناکرێت.

با لەسەرەتاوە چۆنیەتی ئەم مەفرەزەیەت بۆ باس بکەم! چۆن و بە چ شێوەیەک گەیشتنە ئەو جێگایە.

بۆ یەکەم جار لە کرداری سەربازی شتی وا ڕوویدات، پێغەمبەر ی خوا ﷺ بەڕێگای زانیاری لە شاری مەککەوە دەیزانی ئەو کاروانە بەکوێدا تێپەڕ دەبێت، نامەیەک دەنووسێت حوزەیفەی یەمانی بەناوی پێغەمبەرەوە ﷺ نووسی، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی ئەوانیش نووسیان. لە نامەکەدا پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمووێت: بەڵام پێش باسی نامەکە با شتێکت بۆ باس بکەم لە بیرم نەچێت ئەم مەفرەزەیە بە سەرکردایەتی عەبدوڵلای کوڕی جەحشە پێی دەفەرمووێت: دوو ڕۆژ ڕێگا ببڕە بەرەو مەککە، دوای دوو ڕۆژ نامەکە بکەرەوە.

عەبدوڵڵا و مەفرەزەکەی دەکەونە ڕێ و دوای دوو ڕۆژ لەسەر فەرمانی پێغەمبەر صَلَّىٰ اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ نامەکە دەکەنەوە لەناو نامەکە نووسراوە:

نومێر خەریک بوو باسەکەم بۆ تەواو بکات، ئەبویەحیا هات و بەخەبەری هێنام وتی ئەبو ئانا مریشکت هەیە بەقەرز!؟

مانگی ڕەمەزان بوو کاتژمێر (٩)ی بەیانی زوو لە خەو هەڵنەدەساین، بەڵام ئیتر ئەبویەحیایە بەخۆشی و ناخۆشی خەبەرت دەکاتەوە تا کاری خۆی ئەنجام بدات، منیش مریشکێکم دا بەو و خۆم گۆڕی چوومە حەوشەی زیندانەکە، کاتژمێر (١٠ بۆ ١١) کاتی چوونە دەرەوەمان بوو، لەگەڵ کوڕێکی هاوڕێم پیاسەمان دەکرد بەناوی سەمیر خەڵکی مەغریب و کوڕێکی تری مەغریبی ناوی مەهدی بوو، لە پەنجەرەکەوە هاواری لێکردم ئەبو ئانا ئێستا کەسێکی کوردیان هێنا بۆ ئێرە ئیتر باشە لەمەودوا بەتەنیا نابیت!

منیش وا هەستم کرد کەسێکی نوێ بێت کاتی هەوا هەڵمژین و پیاسەمان تەواو کرد وتم هەرچی پێویست بوو هاوکاری دەکەین.

چوومە بەردەم ژوورەکەی تەماشام کرد مامۆستا کرێکاریان هێناوە، سڵاوم لێکرد و ئەولا و ئەولای یەکترمان ماچ کرد، من زۆر خۆشحاڵ بووم لەدوای یەک ساڵ و (٧) مانگ لە زیندانی من و نزیکەی (٢) ساڵ و (٧) مانگ لە زیندانی ئەو، ئینجا خستیانینەوە لای یەکتری، پێشتر باسی جەنابیانم کردبوو کە کەسێکی زانا و عالمێکی پڕ عیلم و زانیارییە، هەموو زیندانیان حورمەتێکی تەواو خۆشەویستییان بۆ دەربڕی، بڕیارمان دا بۆ بەربانگ من خواردن دروست بکەم و بەیەکەوە بەربانگ بکەینەوە.

سەمیر بۆ لام هات و وتی ئەبو ئانا تۆ بەزووترین کات دەگەڕێیتەوە بۆ نەرویج.

ماکوان: تۆ چوزانیت لەسەر چ بنەمایەک، خوێندنەوەت چییە و بۆ وادەڵێیت؟ من بڕوا ناکەم، ئەوا مامۆستا کرێکاریشیان هێنا تەواو تا حوکمەکەم تەواو نەکەم نامگەڕێننەوە.

سەمیر: سوێند بەخوا من لە ئیتاڵیا لە دایک بووم، ئەم سیستەمە لە خۆم باشتر دەناسم، ئیتاڵییەکان هەرگیز بە سوتفە کارناکەن، هاتنی مامۆستا کرێکار واتا گەڕانەوەی تۆ بۆ نەرویج.

هەرچەندە قسەکەیم بەهەند وەرنەگرت، بەڵام لە دوای دوو ڕۆژ قسەکەی هاتە دی مەحکەمە کرام بۆ گەڕانەوەم بۆ نەرویج، بەهەر حاڵ زۆر خۆشحاڵ بووین، (٧)کارتۆنی گەورە کتێبی پێ بوو، ئیتر لە مریشک کڕین کەوتین بۆ ئەبویەحیا، مامۆستا کۆنترۆڵی لەسەر نەبوو چونکە نەیاندەگەڕاندەوە بۆ نەرویج و کۆنترۆڵی لەسەر هەڵگیرابوو، بەڵام من تا ئەو ڕۆژەی



گەڕاندمیانەوە بۆ نەرویج کۆنترۆڵم لەسەر بوو تەنانەت نەمدەتوانی نە هیچ بنێرم و نە هیچیشم بەدەست دەگەیشت.

بەهەرحاڵ سێ ڕۆژ یان باشتر بڵێین دوو ڕۆژ یەکترمان بینی، من تووشی کۆرۆنا بووم ناردمیان بۆ کەرەنتینە و نزیکەی (١٧)ی ڕەمەزان بوو، ماوەی (٢٤) ڕۆژ لە ناو زیندانی ئیتاڵیا دا دیسان زیندانی کرام، واتا لە ناو زیندان زیندانی تر کرام کە کەرەنتینە بوو.

هەموو شەوان سەرقاڵی خوێندنەوە بووم بە کتێبەکەی فەرغەلی، لە شەوی یەکەم گەڕاندمیانەوە، بەڵام کە گەڕامەوە نیوەی شەو بوو ئەستێرە ئاسمانی داگیر کردبوو هەموو جریوەی ئەدا، هەڵسام بڕۆم لە کوندەیەکدا ئاو بخۆمەوە، لە دواوە نومێر دەستی خستە سەرشانم وتی: حاڵ و گوزەرانی ئەولاو چۆنە؟!

ماکوان: باش نییە زۆر نەخۆشم، لە ناو زینداندا تووشی دەردێکی بێ چارەسەر بووم، ئیتاڵیاش سەنتەری مردنی ئەو نەخۆشیەیە.

نومێر: لە ڕۆحت دەترسێیت لە دەستی بدەیت؟!

ماکوان: هەر ئەوەم ماوە کە لەدەستم نەداوە، جارێ نامەوێت لەدەستی بدەم، لەو ژیانەدا کارم ماوە با تەواویان بکەم، بەڵکو ئەوکات کە تەواوبووم خوای پەروەردگار لێم وەربگرێتەوە، هەرچەندە مردن و ژیان خوای گەورە دەیبەخشێت و ڕازیم بە هەموو شتێک.

نومێر: بۆ خۆشی وام وت ماکوان-ی برام یاخوا تەمەن درێژبیت.

ماکوان: باسی نامەکەم بۆ بکە چی ڕوویداوە لەو نامەیەدا چی نووسراوە؟!

نومێر: لە نامەکەدا نووسراوە ( ئەگەر نامەکەت کردەوە ڕووە و ناوچەی نەخلە بکەوە ڕێ، لە نێوانی مەکە و طائیف دایە، لە کەمیندابە بۆ کاروانی قورەیش و زانیاریمان بۆ بهێنەرەوە).

دیارە ئەو کاروانە بەرەو جێگای تریش دەڕۆیشت، بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ تەنها زانیاری دەوێت، نەک گرتنی قافڵەکە.

پاشان لە نامەکەدا نووسراوە بۆ ئەمیری مەفرەزەکە (هیچ کام لە هاوەڵاکانت زۆر لێناکەیت بۆ ئەوەی بێن لەگەڵتا، تەنها پرسیاریان لێ دەکەیت، ئەوەی هات لەگەڵتا بەویست و ئارەزووی خۆی دێت) ئەمەش فەرمان و ئەمری پێغەمبەری خوایە ﷺ بۆ سەرۆکی مەفرەزەکە.

کە نامەکەی خوێندەوە عبدوڵلای کوڕی جەحش پێی ڕاگەیاندن کێ حەزی بەشەهید بوونە با لەگەڵمدا بێت، کێش ئەیەوێت بگەڕێتەوە ئەوە ئازادە، بەڵام من وا هەڵدەستم دەڕۆم بۆ ئەو جێگایەی کە پێغەمبەری خوا باسی کردووە بەناوی (نەخلە)، هەموو لەگەڵیدا هەڵسان و کەوتنە ڕێ بەرەو ناوچەی نەخلە.

هۆکاری ئەوەی پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ بەو شێوەیە بەرخود بکات کێ دەگەڕێتەوە بۆ ئەو کارە زۆر سەخت بووە، ئاڕاستەی مەفرەزەیەک بۆ ئەو ناوچەیە ئەگەر لە سەرەتاوە باسی بکردایە، لەوانەبوو زۆرێک لە هاوەڵان توانای ڕۆشتنیان نەبوایە، چونکە ڕێگا یەکجار دوورە و نزیک دوو شارە هەردوو شارەکەش دوژمنی پێغەمبەر و صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ موسڵمانان بە گشتی، پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ حەزی بەوە نەبوو کە سەرباز و موهاجیرەکان لەناو بچن و بەهیلاکەت بڕۆن، حەزی نەکرد کاری سەخت فەرز بکا بەسەریان، بەڵام بە ئارەزووی خۆیان و هەڵبژاردەی خۆیان کارەکەیان ئەنجامدا، هەروەها نیوەی ڕێگاکەشیان بڕیوە، هاندانێکە بۆ تەواوکردنی ئۆپەڕاسیۆنەکەیان، بەڵام لەگەڵ ئەوەش دا ئازادی هەڵبژاردن لەدەستی خۆیان دایە، عەبدوڵلای کوڕی جەحش یەک کەسی بەزۆر نەبرد بەڵکو هەڵبژاردەی دانێ یان گەڕانەوە بۆ مەدینە یان دەرچوون لەگەڵیدا بۆ ناوچەی نەخلە.

ئەمەش وانەیەکی وای فێرکردن پشت بەخۆ ببەستن و بێگومان دوای تەوەکول بەخوای پەروەردگار، فێری ڕۆحی بەرەنگاری و جیهاد و ئازایەتی لە سەر پێ خۆ وەستانی کردن، ئەوەی باسمان کرد کێشەی جێگاکە بوو کە دوور بوو و لەناوجەرگەی دوژمن دا بوو.

کێشەی دووەم: کێشەیەکی زۆر ترسناکترە لەوەی یەکەم بەتایبەت لەناو عەرەبی قورەیش و ناوچەکە بەگشتی، ئەمان لە کۆتایی مانگی ڕەجەب دەرچوون، مانگی ڕەجەبیش لە چوار مانگەیە کە عەرەب جەنگ و کوشتاری تێدا حەڕام کردبوو، لەو سەردەمەش دا کافر و موشریک و ئیماندار لەسەر ئەو چوار مانگە کۆک بوون کە مانگی حەڕامکردنی جەنگە.

هەرچەندە کۆمەڵێک لە زانا و فیقهناسەکان دەفەرموون لە دوای ئەو ڕووداوە ئەو چوار مانگە نەسخ بۆتەوە.

بەهەرحاڵ ئاڕاستەی قسەی پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ زۆر ڕوون و ئاشکرابوو جەنابیان فەرموویان: تەنها لە کەمیندابن و بزانن کاروان و قافڵەکەی قورەیش چەندە و هەواڵمان بۆ بێنن (فترصد بها عير قريش و تعلم لنا من أخبارهم).

پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ باسی کوشتار و جەنگی نەکردووە، چونکە لای هەمووان زانراوە ئەو مانگە کەس جەنگی تێدا ناکات و پێویست بە باسکردن ناکات.



دوایی لە کاتی گفتوگۆی هاوەڵان لە ناوچەی نەخلە کە قافڵەکە دەبینن دەبێتە مقۆمقۆیان لەسەر ئەو باسە، ئەمەش ئەوە دەردەخات هیچ فەرمانێکیان لای پێغەمبەرەوە صلى الله عليه وعلى آله وسلم بۆ جەنگ پێنەدراوە.

مەفرەزەکە گەیشتە ئەو جێگایە، هاوەڵان بینییان قافڵە و کاروانەکە لەو جێگایە دایە و بەرەو مەککە دەگەڕێتەوە، ئەو شەوەش کۆتا شەوی مانگی حەڕامکراوەکانە، هەربەو شەوەش قافڵەکە دەگەڕێتەوە ناو شاری مەککە، ئەگەر وازی لێبهێنن ئەوە دەگەڕێتەوە ناو حەڕەمی مەککە و لە دەستیان دەردەچێت.

ماکوان: بەڵام لە دەستیان دەردەچێت زۆر خەتەر و ترسناکە، لەبەر چەند هۆکارێک.

یەکەم: ئەم لێدانە یەکەم لێدان دەبێت لە قوڕەیش لەناو ماڵی خۆیدا و تا ئێستا موسڵمانان هیچ سەرکەوتن و دەستکەوتێکیان لە جەنگدا تۆمار نەکردووە، نابێ بهێڵن لەدەستیان دەربچێت!

دووەم: ئەم لێدانە گرنگییەکەی لەوە دایە جورئەت و هێز و توانا ئەدات بە موسڵمانان و ترس و دڵەڕاوکێش دەخاتە ناو قوڕەیش، لە ناو ماڵی خۆیاندا لێیان دەدرێت، چونکە بەگشتی کاریگەری زۆر خراپ بۆ موشریکەکان جێ دەهێڵێت.

سێیەم: مادام نزیکە لە ناوچەی قوڕەیش حەتمەن سوپا و پاسەوانەکانی لەگەڵ نییە لە چوار پێنج کەس تێپەڕ ناکات، موسڵمانەکانیش (١٢) کەسن!

چوارەم: ئەو مەفرەزەیەی موسڵمانان هەمووی لە موهاجیرەکان بوون، ئەوانە بوون کە ماڵ و سەروەت و سامانیان داگیرکرابوو، خودی سەرکردەی مەفرەزەکە عەبدوڵڵای کوڕی جەحش ماڵەکەی بەدەست ئەبو سوفیان فرۆشرابوو و پارەکەشی خواردبوو و هەڵی گرتبوو بۆخۆی.

نومێر: ڕاستە هەموو ئەو هۆکارانەی باستکرد وایکرد ئەو سریە لە دەستیان دەرنەچێت، دەست بگرن بەسەر قافڵەکە دا، بەڵام کێشەکە ئەوەیە کە کۆتا شەوی مانگی ڕەجەبە و کوشتار تێیدا قەدەغەیە.

ماکوان: تۆ بڵێیت هاوەڵان بیر لەوە نەکەنەوە هەربەو یاسا و قانوونانەی قوڕەیش باسی دەکات چەندین جار پێشێلیان کردووە، سەروەت و سامانی ئەوانیان داگیر کردووە و لەمانگە حەڕامەکانیان نەپرسیوەتەوە، ئێستا بۆ دەبێت موسڵمانان پابەند بن بەو یاسا و ڕێسایانەی عەرەب، یان دەبێت بیر لەوە بکەنەوە ئەو زوڵمەی لەسەریان بووە هەڵیگرن و ئەم هەلەی کە ئێستا بۆیان هەڵکەوتووە ئەستەمە هەلی وا هەڵکەوێتەوە، لەبەر ئەوەی کۆتا شەوی



مانگی حەڕامە، دەبێت ئیحترامی قوڕەیش بگرن، لە کاتێکدا قوڕەیش موسڵمانان دەکوژێت و ئەشکەنجەی ئەدان و دەیفرۆشتن و سەروەت و سامانی لەناو شاری مەککە داگیر دەکردن، کە هەموو ڕۆژێک لەم شارەدا ئەو کارانە حەڕامە، ناسراوە بەماڵی خواو و حەڕەم- تەنانەت ڕاو و شکاندنی دارێک حەڕامە چ جای ئەوەی کە بەرامبەر موسڵمانان ئەو هەموو کارە قێزەونەیان کردووە.

ئەو قافڵە خاوەنەکەی ئەو کەسانەن کە ئەو کارەیان ئەنجام داوە.

نومێر: هەموو ئەو پرسیارانەی کە تۆ کردت و وەڵامت داوە، مێشکی هاوەڵانی مەفرەزەکەی سەرقاڵ کردبوو، بۆیە هەموو دانیشتن و مەجلیسێکی ڕاوێژیان بەست و شوورایان پێکهێنا و بڕیاریان دا بەوەی کەمێک لەو زوڵم و ستەمە زۆرەی لەسەریان بووە هەڵیگرن، هەر ئەمشەو هێرش بکەنە سەر کاروانەکە، ئەگەر چی شەوی کۆتایی ڕەجەبە.

بەڵی مەفرەزەکە هێرشی برد و هاوەڵان دەستیان گرت بەسەر کاروانەکەدا و یەکێک لە موشریکەکان کوژرا بەناوی (عەمری کوڕی حەزرەمی)، دووانیان بە دیل گیران بەناوی (عوسمانی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی موغیرە) و (الحکمی کوڕی کیسان) ئەم کاروانە چوار کەسی لەگەڵ بوو، چوارەمیان هەڵهات و ڕای کرد، بەناوی (نەوفەلی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی موغیرە)، موسڵمانانیش ساغ و سەلامەت گەڕانەوە بۆ شاری مەدینە بە کاروان و دوو دیلکراوەکە، ئەمەش یەکەم کوشتار بوو لە ئیسلامدا کرا و ئەو دوو دیلەش یەکەم دیلی ئیسلام بوون کە گیران، یەکەم دەستکەوتی موسڵمانان بوو ئەم دەستکەوتەش یاخود یەکەم غەنیمە بوو.

ئەمەش بووە ڕۆژێکی زۆر جیاواز بۆ موسڵمانان و ناوچەی نیوەدوورگەی عەرەب.



# دوژمنانی ئیسلام و باسی ئەو کاروانەی نەخلە

نومێر: لە دوای ئەوەی هەواڵ بڵاو بوویەوە کاروانەکەی قوڕەیش بەدەست موسڵمانان کەوتووە و دوو کەسیشیان لێ بەدیل گرتوون، هەواڵیان بە دوورگەی عەرەبی دا ڕاگەیاند کە گوایە موسڵمانان گوێ بە هیچ ڕێسا و یاسایەک نادەن، دید و بۆچوونی خەڵک ئاشکرا بوو بۆ موسڵمانان.

قوڕەیش بەرگی شەریف و پیاوەتی پۆشی، لەگەڵ ئەو هەموو کوفر و خراپەکارییە دەرهەق بە موسڵمانان کردی وا بەرگی ڕەشی لەبەر کردووە، ئەو باسی عورف و ئەخلاق و عادات و قانوونەکان دەکات!

ماکوان: سبحان الله، ئەوە کێ قسەدەکات! قوڕەیش؟!

خۆی لە شاری مەککە هەموو کارێکی تێدا حەڕامە تەنها بەندایەتی نەبێت، ئەوە باسی ڕەوشت و یاسا و عورف و شەرەف دەفرۆشێتەوە بەموسڵمانان، ئەی کەسێک نەبوو پێیان بڵێت ئێوە کوڕ و خزم و هاونیشتیمانەکانی خۆتان ڕاوەدوونا، ئەوەی لە ناوتاندا بوو خۆتان ناوتان نابوو بە ڕاستگۆ و دەست پاک (الصادق الأمين) خوێنیشتان حەڵاڵ کرد، لە ناو زێد و عەشیرەت ماڵ و منداڵی خۆی دەربەدەرتان کرد.

ئەی لە یاسای مەککە دا نەبوو نابێت زوڵم و ستەم لە خەڵکی بکرێت!؟ ئەی لاشەی موسڵمانان حەڕام و پارێزراو نەبوو لە ناوتاندا کوا کەس قسەی کرد؟ مەگەر لە مەککە حەڕام نەبوو کوشتن و کوشتار و لێدان بە قامچی و سووتاندن و برسیکردنی پیاوان و ئافرەتانی موسڵمانان ئەی ئەو هەموو خوێنڕشتنانە حەڕام نەبوو؟!

کوا ڕێزی یاساکان؟ لە کوێیە پاراستنی حورمەتی خەڵکی؟ کەی پابەند دەبێت بە عورف و عاداتەوە؟!

بەخوا ئێستا و سەردەمی پێغەمبەر صلى الله عليه وعلى آله وسلم هەمووی وەکو یەک وایە، هەر وەکو باسەکانی مافی مرۆڤە کە بۆ هەموو کەس هەیە بەس موسڵمانان ناگرێتەوە، خوێنی هەموو کەس پارێزراوە بەس کوشتنی موسڵمانان و گۆڕی بە کۆمەڵ و ڕووخاندنی ماڵ و حاڵیان زۆر ئاساییە! بەناوی تیرۆرست و توندڕەو و ئیرهاب، هەمیشە تاوانبارکردنی موسڵمانان ئامادەیە و خەڵک بەئارەزووی خۆیان پۆلێن دەکەن ئەوەی لە خۆیان نەبوو لە پڕۆژەی خۆیان دا کاری



ئەکرد دەبێت بکوژرێت لەناو بچێت و زیندان جێگای بێت، ئەوەش ڕۆژئاوا و کلکەکانی لە ئەمرۆدا ئەنجامی ئەدەن، قورەیش بۆ دەبێت یاسا بەسەر موسڵمانان بسەپێنێت هەڵەیەکیان ئەگەر کردبێت، بەڵام خۆیان سەدان هەڵە و کاری قێزەونیان کرد کە بۆت نییە پێیان بڵێیت بەرچاوت کلی پێوەیە!

ڕۆژئاواش بەگشتی و کلکە عەلمانی و مولحیدەکانی هەمان پێوەریان هەیە، هەرچی چەکی ئەتۆم و ناوەکی و کیمیایی هەیە بەکاری دەهێنن، بەڵام بۆ موسڵمانان قەدەغەیە، ڕۆژئاوا قورئانی موسڵمانان دەسووتێنێت و ئیهانەیان دەکات، تەنانەت سەرپۆش و نیقاب قەدەغە دەکات، بۆ ئەوان ئاساییە پێشکەوتنە، بەڵام سەدانی وەکو ئێمەومانان بانگەواز دەکەین لە زیندانەکان دا خزێندراوین یان ناو و ناتۆرەمان بۆ ئەدۆزنەوە، ئەرێ بەڕاست کێ تیرۆرست و پێشێلکەری یاسا و ڕێسا و عورفە؟!

بەڕاستی پێوانەکەیان زۆر هەڵە و نادادپەروەرانەیە، بەداخەوە خەڵکانێکیش دەبینین بە زوڕنای ئەوان هەڵدەپەڕن، پشتیان کردۆتە میللەتی موسڵمانانی خۆیان بۆ خاتری ئافەرین و چەن دەفتەر دۆلارێک دنیا و قیامەت و شەرەف و کەرامەت و ئەخلاقیان لەدەست داوە بۆ ماڵی دونیا.

ڕۆژئاوا لەسەر ئەو مەبدەئە دەژی پرەنسیپی فاسد و خراپەکارییە، ئەوەی حەڵاڵە بۆ خۆیان بۆ ئێمەی موسڵمانان حەرامە، لێرەدا تەنها بە مەنتیقی هێز دەتواندرێت ئەو پێوەرانە ڕاست بکرێتەوە.

خوای پەروەردگار لە سورەتی المطففين دا دەفەرموێت:

﴿وَيۡلٞ لِّلۡمُطَفِّفِينَ ۝١ ٱلَّذِينَ إِذَا ٱكۡتَالُواْ عَلَى ٱلنَّاسِ يَسۡتَوۡفُونَ ۝٢ وَإِذَا كَالُوهُمۡ أَو وَّزَنُوهُمۡ يُخۡسِرُونَ ۝٣﴾ [المطففين]

واتە: هاوار و ئاهو ناڵە بۆ تەرازوو بازەکان، بۆ ئەوانەی لە کێشان و پێواندا، لە کڕین و فرۆشتندا تەرازووبازیی و فێڵ دەکەن.

ئەوانەی کاتێک شت لە خەڵکی دەکڕن بە تەواویی و بە زیادەوە لێیان وەردەگرن.

بەڵام کاتێک کە شتیان پێ دەفرۆشن، یا دەکێشن، یا دەپێون لێی دەدزنەوە و کەمیان دەدەنێ و فێڵیان لێ دەکەن.

بەڕاست ئەی پێغەمبەر صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيۡهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ چۆن هەلسوکەوتی لەگەڵیان کرد؟!



نومێر: دەمخۆش دەی بەڕاستی ئەوە هەڵوێستی قوڕەیش و عەرەبەكانی نیوەدوورگەی عەرەبی بوون، بەڵام پێغەمەبەری خوا ﷺ زۆر ئیحراج و شەرمەندە بوو لەو كارەی ئەنجام دراوە، هیچ ئاڕاستەیەكی وەحی نەبوو لەو بارەیەوە، چونكە ئەو ئەمری نەكردبوو بە بەزاندنی یاساكان و كوشتن و بەدیلگرتنی خەڵكی لەمانگی حەڕامەكان، بۆیە هیچ دڵخۆش نەبوو بەو كارەی زۆر دڵتەنگ و غەمگین بوو، ئەگەر چی خۆی و موسڵمانان چەندە ئازاریان بەدەست قوڕەیش كێشاوە، بەڵام ئەم جۆرە كارانە هەمووی دەگەڕێتەوە بواری مەبدەئو پرنسیپەوە.

پێغەمبەری خوا ﷺ توڕەبوو بە هاوەڵانی فەرموو من فەرمانم پێ نەكردوون بە كوشتار و هەڵكووتانە سەر قافڵەكە لە مانگە حەڕامەكان دا.

لە دواییدا بەوە نەوەستا، هەڵسا بەوەی كە نابێ دەستكاری كاروانەكە بكرێت هیچ جۆرە بەكارهێنانێكی لەگەڵ دیل و كاروانەكەدا نەكرد، تا وەحی بۆ دێت بەوەحی ئاڕاستە دەكرێت.

هاوەڵانی مەفرەزەی نەخلە كارەكەیان لەدەست دەرچووبوو قەومابوو، بەڵام لە هەمووی ناخۆشتر ئەوە بوو هاوەڵانیتر لۆمەیان دەكردن، پێیان دەوتن سەرپێچیتان كردووە، لەوانەیە بە بۆنەی ئەوكارەی ئێوەوە هەموو تووشی كارەساتێكی گەورە و جەنگێكی گەورە ببینەوە.

ئیتر ئەوەی ڕووی دا هەمووی خرایە سەر ئەم مەفرەزە ئیسلامییەوە لەناو نیوەدوورگەی عەرەبدا.

ماكوان: ئەی وەحی دانەبەزی لەم بارەیەوە؟

نومێر: بەڵێ وەحی دابەزی و هەموو پێوەرەكانی گۆڕی.



## گۆڕانکاری و پێوەر بە قورئان

نومێر: قورئانی پیرۆز لەم بارەیەوە دابەزی ڕوونی دەکاتەوە بۆ گشت خەڵکی لە موسڵمانان و موشریکەکان، ئەوەی کە ڕاست و دروستە ڕایدەگەیەنێت، دابەزینەکە گەیشت بۆ ڕوونکردنەوەی تایبەت بەو یاسا و کێشەیەوە، ئەوەی کە ڕای جیاوازی لەسەر دروست بوو خوای پەروەردگار بۆیان ساغ دەکاتەوە، موسڵمانان لە میسالیەت و نموونەییانەوە دەیان بات بەرەو واقیعێکی تەواو، خێری فیقهی واقیعی و فیقهی پێوەرسازی و فیقعی لە پێشتریان دەکات، ئەوەی خۆی بە تەواو ماسکی شەرەف و ئەخلاقی پۆشی بوو، خوای پەروەردگار ڕووی درۆ و ساختەچییەتی هەڵدەماڵێت، کافر و ملهوڕان سەرشۆڕدەکات و ئەو موسڵمانان و مەفرەزەیەش بە سەرکەوتوو باس دەکات و کارەکەیان دەنرخێنێت.

خوای گەورە لە سورەتی البقرة دا دەفەرمووێت:

﴿يَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلشَّهْرِ ٱلْحَرَامِ قِتَالٍ فِيهِ ۖ قُلْ قِتَالٌ فِيهِ كَبِيرٌ ۖ وَصَدٌّ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ وَكُفْرٌۢ بِهِۦ وَٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ وَإِخْرَاجُ أَهْلِهِۦ مِنْهُ أَكْبَرُ عِندَ ٱللَّهِ ۚ وَٱلْفِتْنَةُ أَكْبَرُ مِنَ ٱلْقَتْلِ ۗ وَلَا يَزَالُونَ يُقَـٰتِلُونَكُمْ حَتَّىٰ يَرُدُّوكُمْ عَن دِينِكُمْ إِنِ ٱسْتَطَـٰعُوا۟ ۚ وَمَن يَرْتَدِدْ مِنكُمْ عَن دِينِهِۦ فَيَمُتْ وَهُوَ كَافِرٌ فَأُو۟لَـٰٓئِكَ حَبِطَتْ أَعْمَـٰلُهُمْ فِى ٱلدُّنْيَا وَٱلْـَٔاخِرَةِ ۖ وَأُو۟لَـٰٓئِكَ أَصْحَـٰبُ ٱلنَّارِ ۖ هُمْ فِيهَا خَـٰلِدُونَ﴿٢١٧﴾﴾ [البقرة]

واتە: پرسیارت لێ دەکەن دەربارەی جەنگ لە مانگی حەڕامدا (کە بریتین لە ذوالقعدة و ذوالحجة و موحەڕەم و ڕەجەب) بڵێ: جەنگ لەو جۆرە مانگانەدا کارەساتێکی گەورە و هەڵەیەکی گەورەیە، بەرهەڵستی ڕێبازی خواو بێباوەڕییە پێی و (تاوانێکی گەورەیە) و (جەنگ) لە مزگەوتی حەڕام دا، دەربەدەرکردنی خەڵکەکەی زۆر گەورەترە لای خوا (لە کوشتنی کەسێک یا چەند کەسێک) زۆر هێنان بۆ ئیمانداران تا پاشگەز بکرێنەوە تاوانێکە لە کوشتن گەورەترە، (بێگومان بێ باوەڕان) بەردەوام دژتان دەجەنگن هەتا واتان لێ بکەن کە لە دین و ئایین تان پاشگەز ببنەوە، ئەگەر بۆیان بکرێت، جا ئەوەی لە ئایینەکەی پەشیمان ببێتەوە بە کافری بمرێت، ئەو جۆرە کەسانە کارەکانیان پووچ دەبێت لە دنیا و لە قیامەتدا، ئەوانە جێنشینی ناو ئاگری دۆزەخن و ژیانی هەمیشەیی تیایدا دەبەنە سەر.



ئەمەش خوای پەروەردگار دەفەرموویت: پێویست بەو هاتوو هاوارە ناکات بۆ وا خۆتان تێکداوە بەسەر یەکدا، ئەو داماو و تەمسیلە کۆمیدییە چییە دروستتان کردووە ئەی کافرەکانی قورەیش، لەو سەردەمەدا جەنگ و شەڕ قەدەغە بوو حەڕام کراو بوو، بەڵام ئەوە ڕێگای پێدرا، هەر چەندە کۆمەڵێک لە زانایان هەربەم ڕایەی دەزانن تا ئێستاش.

بەڵام گەورەتر لەو مانگە حەڕامانە کوشتنی موسڵمانان و ئامادەکردنی ئاشووب و فیتنە و پلانە، لە هەمووی گەورەتر ئەو هەموو بت و پەیکەرەیە دانراوە لە ماڵی خودا و دەیپەرستن، ئەمانە هەموو گەورەترن لە مانگی حەڕامکراودا کە ئێوەی قورەیش ئەنجامی ئەدەن، قەدەغەکردنی موسڵمان لە تەواف و دەرکردنیان لە ماڵی خوا لە مانگە حەڕامەکان زۆر گەورەترە، ئازار و ئەشکەنجە و شکاندنی کەرامەتی موسڵمانان لە مانگە حەڕامەکان گەورەترە، هەموو ئەمانە وەکو خوای پەروەردگار بۆی باسکردین گەورەترە لە مانگە حەڕامەکانی و ئەوەی وا قورەیش خۆی پێوە با ئەدات شانۆگەریەکی زۆر بێتام و هیچە ئەکتەرەکانی سەرکردەکانی قورەیشن.

نومێر: بەڕاستی وایە وەکو تۆ دەیڵێیت دراماکەی لە شێوەی دراماکەی فیرعەون بۆ پێغەمبەر مووسا

عليه السلام فیرعەون بانگەوازی دژی فەساد و خراپەکاری دەکات، خوای گەورە لە سورەتی غافر دەفەرموویت:

﴿وَقَالَ فِرْعَوْنُ ذَرُونِيٓ أَقْتُلْ مُوسَىٰ وَلْيَدْعُ رَبَّهُۥٓ إِنِّيٓ أَخَافُ أَن يُبَدِّلَ دِينَكُمْ أَوْ أَن يُظْهِرَ فِي ٱلْأَرْضِ ٱلْفَسَادَ ۝﴾

واتە: ئینجا فیرعەون وتی: وازم لێ بێنن با مووسا بکوژم، با هەر هاوار لە پەروەردگاری بکات، چونکە من دەترسم کە دین و ئایینتان بگۆڕێت! یاخود دووبەرەکی و خراپە و شەڕ و شۆڕ (لە وڵات) و سەرزەویدا بەرپا بکات!

بانگەوازەکەی زۆر کۆمیدی و پێکەنیناوییە، هەروەکو ئەو بانگەشە و ڕیکلامەی کە قورەیش بۆ خۆی دەیکات، گوایە موسڵمانان سنووریان بەزاندووە گوێ بە عورف و عادات نادەن.

ماکوان: بەڕاستی قورئان موسڵمانانی وا فێرکرد چاو لەسەر فیقهی واقیعدا بنێن، ئاخر ناکرێت و نابێت لە ڕەوش و واقیعی ژیاندا هەموو شتێک بە شێوەی فیقهی میسالی و تێگەیشتنی نموونەیی بێت، زۆر جار دەبێ هەندێ سنوور ببەزێنیت، لێرەوە ئەم بنەمایە

سەری هەڵداوە کە بنەمای سەرەکی فیقهی ئیسلامیە (دفع أكبر الضرين وجلب أكبر المنفعتين).

ئەوەش بە واتای ئەوەی من زەرەرێکی بچووک قبوڵ بکەم بۆ دوورخستنەوەی زەرەر و زیانێکی گەورە.

فیقهی نموونەیی و میسالی دەڵێت دەبێت هەموو زەرەر و زیانێک لەخۆت دووربخەیتەوە، ئەمەش ئەستەمە و زۆر ناواقعییە، بەڵام حیکمەت لەوەدایە تووشی زەرەر و زیانێک دەبیت، دەبێت بزانیت و کەمترین زەرەر هەڵبژێریت.

موسڵمانان گەورەترین زیان و زەرەریان بەرکەوتووە لە کوشتن و ئەشکەنجەدان لەسەر ئایینەکەیان ڕێگریان لە چوونە ناو حەرام و مزگەوتی حەرەم ئەوە هەڵە نییە، بەڵکو گەڕانەوەی مافی خۆیانە کە دەستیان گرتووە بەسەر کاروانی قورەیشدا بەلای کەمەوە گەڕانەوەی هەندێک سوودی کەمە لەسەر ئەو هەموو زەرەر و زیانەی لێیکەوتوە، لە لایەکی تر موسڵمانان بە ترسنۆکی کارەکەیان نەکردووە بەڵکو خوازیار بوون لە مانگی شەعبان کارەکەیان ئەنجام بدایە نەک مانگی ڕەجەب کە لەمانگە حەڕامەکانە، بەڵام قافڵەکەیان لەدەست دەردەچوو بۆیە ناچار بوون.

نومێر: بەڵێ وایە هەر بۆیە خوای پەروەردگار ئایەتی لەسەر دابەزاندن، بەوە وازی لێ نەهێنان کە تاوانیان کردووە، بەڵکو ئەوەی لە مەفرەزەی نەخلە بوو، خوای پەروەردگار ئەجر و پاداشتی موجاهیدی لە پێناوی خوادا پێدان.

﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَٱلَّذِينَ هَاجَرُواْ وَجَٰهَدُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ أُوْلَٰٓئِكَ يَرۡجُونَ رَحۡمَتَ ٱللَّهِۚ وَٱللَّهُ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ٢١٨﴾ [البقرة]

واتە: بەڕاستی ئەوانەی کە باوەڕیان هێناوە و ئەوانەی کە کۆچ و جیهاد و تێکۆشانیان کردووە لە پێناوی خوادا، ئا ئەوانە بە هیوای ڕەحمەت و میهرەبانی خواوەندن، بێگومان خوایش لێخۆشبوو و دلۆڤانە.

خوای گەورە ئاشکرای دەکات کە نییەت و نیازیان تەنها لەبەر خوا بوو دەفەرمووێت:

﴿... أُوْلَٰٓئِكَ يَرۡجُونَ رَحۡمَتَ ...﴾ [البقرة] هەروەها بۆ ئەوەی کەس لۆمەیان نەکات لەو مانگەدا کارە سەربازییەکەیان ئەنجام داوە خوای پەروەردگار دەفەرمووێت: ﴿... وَٱللَّهُ غَفُورٞ رَّحِيمٞ﴾ [آل عمران] لێیان خۆش بووە.



بەم شێوەیە خوای پەروەردگار هەڵوێست و کاری هاوەڵانی پشتڕاست کردەوە و بەرز نرخاندی و بەموجاهید باسی کردن، دیدڕوونی بۆ موسڵمانان دروست بوو و خەڵکەکە هێور بوونەوە دڵەکان ئارام بوونەوە.

ماکوان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ چۆن مامەڵەی کرد لەگەڵ کاروان و دوو دیلەکە؟!

نومێر: بەو پەڕی حیکمەت و سیاسەت لەگەڵ ڕەوش و کاروانەکە دا و هەروەها دیلەکان هەلسوکەوتی کرد، لە نێوانی هێز و سەربەرزی دا لە لایەکەوە لەلایەکی تریشەوە لە ڕووی گفتوگۆ و تێگەیشتنەوە کاری دەکرد، ڕەسول الله هەموو کاروانەکەی بە غەنیمەت وەرگرت، وایدانا کە بەشێکی زۆر کەم ئەو زەرەر و زیانانەی لێیان کەوتووە، بەشێکی کەمە لە ماڵ و سەروەتی موسڵمانان بەهێز وەریان گرتۆتەوە، بە تەواوەتی ڕەتی کردەوە کاروانەکە بداتەوە بە قوڕەیش بۆ دوو دیلەکە زۆر قورسی نەکرد، تەنها وتی دەتوانن بە فیدیە و پارە خۆیان بکڕنەوە، بەڵام دوو کەسمان دیار نین لە مەفرەزەکە تا ئەوان نەیەنەوە ئەمان فیدیەشیان لێ قبووڵ ناکرێت، پێغەمبەر ﷺ ئەترسا دوو کەسەکە دەست قوڕەیش کەوتبن، ئەویش دوو هاوەڵی بەڕێزی پێغەمبەری خوا بوون ﷺ بەناوی (عوتبەی کوڕی غەزوان و سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص) لە کاتی گەڕانەوەیان دا دوو وشتریان لێ ون ببوو بەدوایدا دەگەڕان لە مەفرەزەکە دابڕابوون، دوای چەند ڕۆژێک ئەوانیش بەسەلامەتی گەڕانەوە ناو شاری مەدینە، لێرەدا پێغەمبەر ﷺ بڕیاری دا تا ئەو دوو هاوەڵە نەگەڕێننەوە فیدیە لەو دوو دیلە وەرناگرێت، درەنگی خستن تا هاوەڵەکان گەڕانەوە پاشان ئەویش بە فیدیە ئازادی کردن.

چونکە پێغەمبەر ﷺ سەرکردەیەک بوو خۆشەویستی و ئاگا لێبوونی تەواوەتی هەبوو بۆ سەربازەکانی، هەمیشە لە هەوڵی ئەوە دابوو لە کەناڵی سیاسی ڕووبەڕووی دوژمنی دانەخات، پەیوەندی سیاسی لەگەڵ دوژمنەکانی دا هەبێت، بۆیە فیدیەی قبوڵکرد لە دیلەکان و پێغەمبەری خوا ﷺ هەقی کوژراوەکەشی دا واتا خوێنبایی(دییەی) کوژراوەکەی دا، تا دوژمن بەهەمان شێوە مامەڵە بکات ئەگەر ڕۆژێک لە ڕۆژان دیل و کوژراوی موسڵمانان هەبوو.

لێرەدا ئەم ڕووداوە کۆتایی هات و تا ڕاددەیەک ئەم لاپەڕەیە داخرا و سەری نرایەوە، ئەمەش هەڵوێست و کارێکی سەربازی زۆر گەورەبوو لە بەرژەوەندی موسڵمانان هاتەوە، ئێستا لە گۆڕەپاندا تەنها دوو هێز لە ملمانێ و جەنگی سەخت و دژواردان ئەویش دەوڵەتی



مەدینە و مەککەیە، تا ڕادەیەک مەککە هەموو شتەکانی تێدا ڕوونە و هەموو کافرن بەڵام مەدینە زۆر ترسناکە! موشریک و یەهوود و ئەعراب دەوری موسڵمانانیان داوە.



## دوای ڕوودانی مەفرەزەی نەخلە

نومێر: لە دوای کارە گەورەکەی مەفرەزەی نەخلە کە چوونە ناو ماڵی قورەیش و ترس و دڵە ڕاوکێی زۆری خستە ناو ڕێزەکانی کافران بەگشتی و قورەیش بەتایبەتی لەناو جەرگەی دوژمندا چالاکیان کرد و سەرکەوتن، ئەمەش بەڕاستی تەحەددایەکی زۆر گەورەی موسڵمانان بوو بۆ کافران.

بێگومان قورەیش هەروا دانانیشێت دەبێت چاوێک بە حسابات و کار و ئەمنییەتی خۆیدا بخشێنێتەوە، سەرلەنوێ خۆی ڕێکبخاتەوە و کار و باری ڕێکبخاتەوە، چونکە موسڵمانان گەیشتوونەتە جێگایەک ئەوان هەرگیز بیریان بۆی نەدەچوو، توانیان دەست بەسەر کاروانێک بگرن کە پڕیەتی لە کەرستە بۆ شاری مەککە، ئەمە ئازایەتییەکی بێوێنەیە، بۆیە حەتمەن قورەیش بە دووری نازانێت ئەم کارە چەند جاری تر دووبارە نەبێتەوە، یاخود هێرش بکەنە سەر شاری مەککە و لە پڕدا بدەن بەسەر قورەیش.

هەموو ئەم گومانانە وادەکەن خەڵکی مەککە دژی موسڵمانان، ئاسایش و هێزی خۆیان ڕێک بخەن و پارێزگاری لە خۆیان بکەن یان بیر لەوە بکەنەوە هەڵکوتنە سەر شاری مەدینە، چونکە پێشتر ئەم کارەیان ئەنجام دابوو لە ڕێگەی (کەرزی کوڕی جابری فەهری)[٥٤] هەوڵیان داوە لەوانەیە جارێکی تر هەوڵەکە دووبارە بکەنەوە بەخەستی و چڕی بکەنەوە سەر موسڵمانان، یاخود موشریکەکان بیر لەوە بکەنەوە ڕێگری لە کاروانی موسڵمانان بکەن و قافڵەی ئەوان دەست بەسەر دابگرن، یان هێرش بکەنە سەر ئەو عەشیرەت و هۆزانەی کە موسڵمان بوون لە دووری شاری مەدینەدا.

هەموو ئەو هەوڵانەی باسم کرد ئەگەری زۆری هەیە ڕووبدات، لەم نزیکانە دا هێزی موشریکی قورەیش لەگەڵ هاوپەیمانەکانی دژی موسڵمانان ڕووبەڕوو بنەوە.

---

٥٤ ـ كرز بن جابر الفهري.



# هەڵوێستی جوولەکە لە دوای ڕووداوی نەخلە

نومێر: لە ئێستادا کاری زۆر ترسناك لە یەهوود چاوەڕوان دەکرێت، جوولەکە بە گشتی هیچ سۆز و عاتیفەیەکییان دەرنەبڕی بۆ ئیسلام، تەنها چەند کەسێک موسڵمان بوون لە پەنجەی دەست تێپەڕ ناکات، هەمیشە لە قسەی ناشرین و پلان و خراپەکاریدان دژی پێغەمبەر صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ و موسڵمانان، دوای مەفرەزەی نەخلە زیاتر ڕوویان ئاشکرا بوو بەتەواوی پشتگیری قورەیشیان دەکرد و بەدەنگی بەرز نەیاندەشاردەوە کە قورەیش مەزڵوومە و موسڵمانان زوڵمیان کردووە، قورەیشیان بەسەر موسڵمانان سەردەخست، بە ئاشکرا و ڕاشکاوانە دەیانوت خۆشحاڵ دەبین بەهاتنی قورەیش بۆ لەناو بردنتان!

ئینجا یارییان بە وشە دەکرد و وەکو فاڵگرتنەوە جۆرە فاڵێکیان دەگرتەوە دەیانوت ئەو کەسەی کە کوژراوە ناوی (عەمر کوڕی حەضرەمی)یە واتا ناوەکەیان لێک ئەداوە دەیان وت گۆشتی عەمر ئاوەدانی جەنگی داهێنا و (حضرة)ی دەیانوت جەنگ ئامادە بوو واتا حازر بووە، ئەو هاوەڵە بەڕێزەی کە عەمری کوشت ناوی (واحیدی کوڕی عبدالله) ئەوانیش نموونەی ناوەکەیان دەهێنا و دەیان وت (أوحدالعرب) واتا عەرەبی یەکخست و جەنگی هەڵگیرساند.[٥٥]

بەم شێوەیە گرنگی زۆریان دا بەڕیکلام کردن و بازاڕ گەرم کردنی جەنگ دژی موسڵمانان و هاوکاری قورەیشیان دەکرد لە ڕووی میدیاییەوە، لە هەمان کاتدا قسەی ناشرین و جنێودان بە موسڵمانان لە کاتێکدا موسڵمانان لەوان نزیکترن.

ماکوان: ئەی هەڵوێستی پێغەمبەر صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ چی بوو لەسەر ئەم کارە چەپەڵانەی یەهوود؟!

نومێر: پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ هەر نەیدەویست هیچ جۆرە ڕووبەڕوو بوونەوەیەک لە ناو شاری مەدینە ڕووبدات، هەر موسڵمانانی هێور دەکردەوە.

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

٥٥ ـ (وَقَالَتْ يَهُود - تَتَفَاءَلَ بِذَلِكَ عَلَى رَسُولِ اَللَّهِ صَلَّى اَللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ - عَمْروْ بْنُ اَلْحَضْرَمِي قَتَلَهُ وَاقِدْ بْنُ عَبْدِ اَللَّهْ ، عَمْروْ : عَمَّرَتْ اَلْحَرْبُ ، وَالْحَضْرَمِي : حَضَرَتْ اَلْحَرْبُ ، وَوَاقِدْ بْنُ عَبْدِ اَللَّهْ : وَقُدْتُ اَلْحَرْبَ . فَجَعَلَ اَللَّهُ ذَلِكَ عَلَيْهِمْ لَا لَهُمْ).



بەڵام قۆناغێکی نوێ دێتە پێشەوە بۆ موسڵمانان خۆیان ئامادە دەکرد بۆ قۆناغی ڕووبەڕووبوونەوەی قوڕەیش و وا دوو ساڵ موسڵمانان هیجرەتیان کردووە.

لەمانگی شەعبانی ساڵی دووی کۆچی قۆناغێک دێتە پێشەوە پێویستی بە شیکاری و هەڵوەستەکردن هەیە لەسەری، ئەویش جیهاد لەسەر موسڵمانان فەرز دەبێت وەک نوێژ و زەکات.

وەکو خوای پەروەردگار لەسەرەتا دا تەنها ڕێگەی بەرگری کردنی لەخۆیان پێدابوون

﴿وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يُجَـٰدِلُ فِى ٱللَّهِ بِغَيْرِ عِلْمٍ وَيَتَّبِعُ كُلَّ شَيْطَـٰنٍ مَّرِيدٍ ۝٣﴾ [الحج]

مۆڵەت دراوە بەو ئیماندارانەی شەڕیان پێدەگیرن، کە بجەنگن و بەرهەڵستی بکەن چونکە بەڕاستی ستەم لێکراون، بێگومان خوا دەسەڵاتی هەیە کە سەریان بخات و سەرکەوتنیان پێببەخشێت...

بەڵام لە مەودوا ڕەوشەکە زۆر جیاواز تر دەبێت، ڕێگادان واتە ئەگەری جەنگ هەیە یاخود نا، ئێستا جەنگ نەک چاوەڕوان کراوە، بەڵکو پێویستە و لەسەر موسڵمانان دادەنرێت.

ماکوان: هەر دەبێت وا بێت، چونکە قوڕەیش کەرامەتی شکاوە و بریندارە، سەروەری و گەورەیی و تەکەبووری لەلایەن موسڵمانانەوە ورد و خاشکراوە، لەم لاشەوە یەهوود دژی موسڵمانان خەریکی پیلان و غەدر و فێڵ(دەسیسە) و چالاکی میدیاییە، هەڵوێستەکە زۆر ڕەق و خراپ دەردەکەون، نابێت تەنها ڕێگە درابێت بە جەنگ، دەبێت جەنگ پێویست بکرێت و موسڵمانان خۆیان بپارێزن و بەرگری لە خۆیان بکەن.

دەرگای شەڕیان لێدەکرێتەوە، لێرەوە بۆ ترسنۆک و لاوازەکان کە حەز بە جەنگ ناکەن بەدڵنیاییەوە بۆیان چونکە قورسە، ئەگەر پێشتر پێغەمبەر ﷺ تەنها موهاجیرەکانی کردە سەرباز ئێستا هەموو ناچارن ببنە سەرباز، چونکە فەرمانی خوایە و هیچ هەڵبژاردەیەکی تر نییە وەکو نوێژ و زەکات فەرز بوو لەسەر موسڵمانان.

نومێر: بەدڵنیاییەوە ڕێک ڕەوشەکە ئەوەیە کە تۆ باسی ئەکەیت.

ماکوان: ئەی سەرئەنجام لەو ڕووداوە نوێیانە چی ڕوویدا؟



## یاسای نوێ و پێویستبوونی سەربازیی لەسەر موسڵمانان

نومێر: لە ئەنجامی ئەم ڕەوشە و کات و زرووفە تەشریع و یاسای نوێ دابەزی بۆ قۆناغی داهاتوو، ئەویش فەرزبوونی جیهادە لەسەر موسڵمانان، موسڵمانان هیچ هەڵبژاردەیەکیان نییە بێجگە لەوەی کە فەرمانەکە جێبەجێ بکەن، ئەگەر هێرش لەلایەن موشریکەکانەوە کرایە سەریان ئەوە پێویستە لەسەریان بەرگری بکەن تاکو مردن لەبەر ئەوەی خوای پەروەردگار ئایەتی دابەزاند و دەفەرمووێت

﴿كُتِبَ عَلَيْكُمُ ٱلْقِتَالُ وَهُوَ كُرْهٌ لَّكُمْ وَعَسَىٰٓ أَن تَكْرَهُوا۟ شَيْـًٔا وَهُوَ خَيْرٌ لَّكُمْ وَعَسَىٰٓ أَن تُحِبُّوا۟ شَيْـًٔا وَهُوَ شَرٌّ لَّكُمْ وَٱللَّهُ يَعْلَمُ وَأَنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ﴾ [البقرة]

واتە: جەنگ لەسەرتان بڕیار دراوە کە شتێکی ناخۆشە بۆتان، بەڵام لەوانەیە شتێکتان لا ناخۆش بێت کەچی خێر لەوەدا بێت، هەروەها لەوانەیە شتێکتان پێخۆش بێت کەچی شەڕ لەوەدا بێت، بێگومان هەر خوا خۆی دەزانێت (خێر لەچی دایە)، ئێوە نایزانن.

تەواو جەنگ و کوشتاری کافران لە مەودوا ڕێگاپێدراو نییە، بەڵکو لەسەر موسڵمانان پێویستە و فەرزکراوە، هەروەرها خوای پەروەردگار زیاتر ڕوونکردنەوەیدا بۆ موسڵمانان کە هۆکاری فەرزبوونی جیهاد بوو لەم قۆناغەدا، هەروەها هەندێک ئەحکامی تایبەت بەجەنگ، مادام جیهاد فەرز بوو بە بەندایەتی و لە پێناوی خوادایە، بەدڵنیاییەوە ئاکار و ڕەوشت و ئەدای تایبەتی خۆیەتی هەروا هەڕەمەکی و تەتار و مەغۆلانە موسڵمان ناچنە جەنگەوە.

خوای پەروەردگار لەسەر ئەو ڕێسایانە دەفەرمووێت:



﴿وَقَٰتِلُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ ٱلَّذِينَ يُقَٰتِلُونَكُمۡ وَلَا تَعۡتَدُوٓاْۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلۡمُعۡتَدِينَ ۝ وَٱقۡتُلُوهُمۡ حَيۡثُ ثَقِفۡتُمُوهُمۡ وَأَخۡرِجُوهُم مِّنۡ حَيۡثُ أَخۡرَجُوكُمۡۚ وَٱلۡفِتۡنَةُ أَشَدُّ مِنَ ٱلۡقَتۡلِۚ وَلَا تُقَٰتِلُوهُمۡ عِندَ ٱلۡمَسۡجِدِ ٱلۡحَرَامِ حَتَّىٰ يُقَٰتِلُوكُمۡ فِيهِۖ فَإِن قَٰتَلُوكُمۡ فَٱقۡتُلُوهُمۡۗ كَذَٰلِكَ جَزَآءُ ٱلۡكَٰفِرِينَ ۝ فَإِنِ ٱنتَهَوۡاْ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ۝ وَقَٰتِلُوهُمۡ حَتَّىٰ لَا تَكُونَ فِتۡنَةٞ وَيَكُونَ ٱلدِّينُ لِلَّهِۖ فَإِنِ ٱنتَهَوۡاْ فَلَا عُدۡوَٰنَ إِلَّا عَلَى ٱلظَّٰلِمِينَ ۝﴾ [البقرة]

واتە: بجەنگن لە پێناوی خوادا دژی ئەوانەی کە دژتان دەجەنگن، نەکەن دەستدرێژی بکەن (دژی ژن و مناڵ و ماڵات و ڕووەک...هتد) چونکە بەڕاستی خوا دەستدرێژکەرانی خۆش ناوێت.

(دەست درێژکاران) بکوژن لە هەرکوێدا دەستان بەسەریاندا ڕۆیشت، دەریان بکەن لەو شوێنەی کە دەریان کردن لێی (کە شاری مەککە بوو)، بێگومان زۆرکردن لە ئیماندار تا پاشگەز ببێتەوە لە ئایینەکەی لە کوشتن خراپترە، یاخود ئاشووبگێڕان و قسە هێنان و بردن (کە جاری وا هەیە دەبێتە هۆی کوشتنی چەندەها کەس) لە کوشتن خراپترە، مەجەنگن دژی کافران لە سنووری مزگەوتی حەڕام و (کەعبە)دا هەتا ئەوان شەڕتان پێنەفرۆشن و نەجەنگن دژتان، خۆ ئەگەر شەڕیان پێفرۆشتن و جەنگان دژتان ئێوەش بجەنگن دژیان، چونکە هەر ئەوەیە پاداشتی بێباوەڕان.

خۆ ئەگەر ئەوانە کۆڵیان دا و شەڕیان وەستان، ئەوە خوا لێخۆش بوو و میهرەبانە (بەڵکو باوەڕ بێنن).

(خۆ ئەگەر کافران کۆڵیان نەدا و هەر جەنگان و پیلانیان گێڕا) ئێوەش بجەنگن دژیان تاوەکو نەبنە هۆی فیتنە و ئاشووب و ناخۆشی (بۆ خەڵکی بەگشتی و ئیمانداران بەتایبەتی) هەروەها تا دین و ئایین و بەرنامە و فەرمانڕەوایی بۆ خوای گەورە بێت، خۆ ئەگەر کۆڵیان داو وازیان هێنا، دژایەتی تەنها ئەو کەسانە دەکرێت کە زاڵم و ستەمکارن.

پێویستە هەڵوەستەیەک بکەین و زیاتر شیکاری لەسەر ئەم ڕەوشە بکەین، بزانین حاڵ و گوزەرانی موسڵمان و بێجگە موسڵمانیش لە دوای پێویستبوونی جیهاد چی ڕوویداوە، لە هەمان کاتدا پەیامەکە بۆ موسڵمانان و موشریکەکانی مەککە و ئەوانەش خۆیان بە دوژمنی موسڵمانان دەزانن.



وەرە با بەیانی بڕۆین بۆ شاری مەدینە و بزانین حاڵ و گوزەرانی موسڵمانان چییە و هەڵوێست و هەڵسوکەوتیان چۆنە لەگەڵ دابەزینی ئەم یاسا نوێیە و دابەزینی ئایەتی خوای پەروەردگار لەسەر جیهاد.

شەو خەوتین و بۆ بەیانی چووینە ناو شاری مەدینە، شار زۆر قەرەباڵغە هەندێک خۆشحاڵە، چەک دەکڕێت و هەندێک لە خەڵکی لە موسڵمانان هەر بەچەکەوە دەگەڕێت، هێز و توانای موسڵمانان نیشان ئەدات وەکو حەمزەی مامی پێغەمبەر ﷺ عومەری کوڕی خەطاب و سەعدی کوڕی ئەبی وەققاس، هەست بە ئیمان و هێزێکی زۆری تاقگە ئاسا دەکەیت لەناو شاری مەدینەدا لە ئەنجامی چووڼمان بۆ شاری مەدینە چەند خاڵێکم بەدیکرد حەز دەکەم بۆت باس بکەم نومێر؟! فەرموو خۆشحاڵ دەبم.

ماکوان: دەمەوێت بڵێم ئەم کارە چەند جەمسەرە لە چەند خاڵێک کۆدەبێتەوە؟!

خاڵی یەکەم: خەڵکی بەشێوەیەکی گشتی حەزی بە جەنگ و کوشتار و ڕووبەڕووبوونەوە نییە، جەنگ هۆکاری ماڵوێرانی و لەناو چوونی ئازیزان و دۆستانە، ئەمەش هۆکاری درووستکردنی ڕق و کینە و بوغز و دەمارگیرییە.

تەنانەت پێغەمبەری خوا ﷺ و هاوەڵان هەر دەیانویست خۆیان لە جەنگ لابدەن بەڵام شەڕە ئیتر یەخەت دەگرێت ئەگەر نەیکەیت کەرامەتت دەشکێت.

ئیسلام دانی بەوە داناوە جەنگ بێزراو و مەکروهە، بە واتای ئەوە نییە کە فەرزکراوە ئیتر خۆشەویست بووە، نەخێر بەڵکو بەردەوام هەر مەکروهو بێزراوە لای خەڵکی بەگشتی و موسڵمانانیش بەتایبەتی.

بەڵام کە جەنگ هات ناچارین ئەو مەکروهە ئەنجام بدرێت بۆ پاراستنی خۆشەویستانیان، پاشانیش بەندایەتی خوای پەروەردگارە فەرمان و تەکلیفەکان بەشێک لە قورسی و مەشەقەتییان پێوەیە، ئەگەر چی فەرمانی خواش بێت. بەڵام کە وترا فەرزە و پێویستە بارگران و قورس تەکلیف مەشەقەتیش بێت هەر دەبێت ئەنجام بدرێت وەکو نوێژ و ڕۆژوو و زەکات و جیهاد و بەخشین و خواردنەوەی ڕق و توڕەبوون لەبەر خوا، ئەمەی باسم کرد بەگشتی وایە، بەڵام لەهەموو هاوکێشەیەکدا جیاوازییەک هەیە، یان لەهەموو قاعیدە و بنەمایەکدا جیاواز و جیاکارییەک هەیە.

بەڵام لای هەندێک لە موسڵمانان لە ناڕەحەتی و مەشەقە و مەکروهەوە دەگۆڕێت بۆ خۆشی و شادی و ڕەغبەت لێوەرگرتن، ئەویش تەنها بۆ ئەوەی ڕەزامەندی خوای گەورە



بەدەست بهێنن، جا مرۆڤی خواناس کە نزیک بوو لە خوای پەروەردگار هەرچی کاری قورس و ئەمر و فەرمانە لای خۆشەویست دەبێت، ئەم گۆڕانکارییە تەنها ئیمان دەتوانێت بیکات، هەر بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ لە بارەی نوێژەوە دەفەرموێت: (نوێژ بۆتە بینایی چاوم) (وجعلت قرة عيني في الصلاة)، جا با نوێژ بەشێک لە قورسی و تەکلیفی تێدابێت، بەڵام لەپێناوی خوای پەروەردگاردا خۆشەویست دەبێت.

یاخود لەبارەی جیهاد و قیتالەوە دەفەرموێت؛ حەزدەکەم لە پێناوی خوای گەورەدا جیهاد و قیتال بکەم بکوژرێم و زیندووببمەوە و بکوژرێم و زیندووببمەوە بکوژرێم و زیندووببمەوە (٣)جار فەرمووی، لەڕاستیدا مرۆڤ حەزی بە مردن نییە، بەڵام ئەگەر مردنەکە ئیمان گۆڕانکاری تێدا کرد بۆ شەهیدی، ئەوکات لە دڵی موسڵماندا خۆشەویست دەبێت و لە پێناوی خوای گەورە هەوڵی بۆ ئەدات. [٥٦]

یان وەکو خالیدی کوڕی وەلید دەڵێت: بە پیاوانێکەوە هاتوومەتە جەنگ مردنیان خۆش دەوێت، ئەوەندەی ئێوە دونیاتان خۆش دەوێت، لەبەرامبەر دوژمنانێدا کە فارسەکان بوون، مردن کارێکی مەکروهە و خەڵکی حەزی پێ نییە.

خاتوو عائیشە دەفەرموێت: هەموو ڕقمان لە مردنە (كلنا نكره الموت) بەڵام سوپاکەی خالید حەزیان لە مردن بوو، مردنیان خۆش دەویست لەبەر ئەوەی ئیمان لە پێناوی خوادا گۆڕانکاری تێدا کردبوو، کەواتە ئەو مەکروهە خۆشەویست دەبێت لە جێگای خۆیدا، ئیتر با قورس و مەشەقەت بێت بەڵام موسڵمانان لە پێناوی خوای گەورەدا خۆشیان دەوێت.

خاڵی دووەم: تەنانەت ئایەتە قورئانییەکە کە باسی کەراهەتی جەنگ دەکات بەڵام دەفەرموێت:

﴿... وَعَسَىٰٓ أَن تَكۡرَهُواْ شَيۡـٔٗا وَهُوَ خَيۡرٞ لَّكُمۡۖ﴾ تۆ شتێک دەبینی بە خراپە لە ڕاستیدا پڕیەتی لە خێر و چاکە، پێچەوانەکەی ﴿وَعَسَىٰٓ أَن تُحِبُّواْ شَيۡـٔٗا وَهُوَ شَرّٞ لَّكُمۡۚ ...٢١٦﴾ ئەمەش لای خەڵکی سادە و نەزان و بێئاگا لە ئایین شتێکی زۆر قورس و ئاستەنگە و تێگەیشتنی ئەستەمە، بەڵام خاوەن ئیمان و خواناس ڕاستەوخۆ لێی تێدەگات کە ئەم کەونە و ژیانە لەسەر بنەمای قەدەری خوای پەروەردگارە، خوای گەورە لە دایک دڵسۆزترە بۆ منداڵەکەی، ئەوەی

---

٥٦ـ (وَالَّذِي نَفْسِيٍّ بِيَدِهِ لَوْلَا أَنْ أَشَقَّ عَلَى الْمُسْلِمِينَ مَا قَعَدْتُ خَلَفَ سِرِّيَّةٍ تَغْزُو فِي سَبِيلِ اللَّهِ أَبَدًا وَلَكِنْ لَا أَجِدُ سِعَةً فَأَحْمَلَهُمْ وَلَا يَجِدُونَ سِعَةً فَيُخْرَجُونَ وَيَشُقُّ عَلَيْهِمْ أَنْ يَتَخَلَّفُوا بَعْدِي وَالَّذِي نَفْس مُحَمَّدْ بِيَدِهِ لَوَدِدْتَ أَنِّي أَغْزُو فِي سَبِيلِ اللَّهِ فَأُقْتَل ثُمَّ أَحْيَاء فَأَقْتُل).



باشە و چاکە بێت بۆ بەندەکانی دەخوازێت و ئەمریان پێدەکات، جا هەر ئوممەتێک لە پێناوی پرەنسیپ و مەبدەئیدا جەنگا ئەوا سەری بەرزە لەناو گەلانی دونیادا، موسڵمانان ئەگەر جیهاد بکەن ئاسان نییە و قورسە، بەڵام سەربەرز و بەعیززەت و ئازا و جێگای ڕێز و ئەقدیرن لەناو گەلان و ئومەتانی دنیا، کوشتار لە پێناوی خوا عیززەت دەبەخشێت بە خاوەنەکەی، پێچەوانەکەی وازهێنان لێی تووشی زەلیلی و سەرشۆڕی دەبێت، هەر گەلێک لە خەبات و جیهاد دا بێت، ئەوا ماف و حەقی خۆی دەپارێزێت و ناهێڵێت لێی زەوت بکرێت، کەواتە جیهاد و کۆشش کردن لە پێناوی خوادا هێز و توانا و سەربەرزی دەبەخشێت، ئەوە قسەی خوای پەروەردگارە خێر و چاکە لەوەدایە خوای پەروەردگار هەڵی دەبژێرێت، لەگەڵ ئەوەشدا زۆر جار بە شیکاری دۆزینەوەی ناوەخنی بابەتەکان حیکمەتەکان دەرناکەون، چونکە لە دوای هەموو تەکلیفێکی خوای پەروەردگار هەر حیکمەتی زیاتر هەیە، ئەگەر چی لە ناوەخن و باتنیدا چاکە هەبێت لە مەکروهەکاندا، هێشتا درکی ئێمەی مرۆڤ ناگاتە ستراتیژی قەزا و قەدەری خوای پەروەردگار، ئیماندار دڵنیایە لەوەی کە خوای پەروەردگار باشترینی بۆ داناوە ئەگەر چی حیکمەتەکەش نەدۆزێتەوە، چونکە هەر لەکۆتایی ئایەتی فەرزبوونی جیهاد و خوای گەورە دەفەرموێت: خوای گەورە زاناتر و باشتر دەزانێت لە ئێوە زانیاری ئێوە لەچاو خوای پەروەردگاردا هەرگیز پێوەر ناکرێت و مرۆڤ هیچ نازانێت ﴿وَاللَّهُ يَعْلَمُ وَأَنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ﴾ [البقرة].

خاڵی سێیەم: لە خاڵی دووەمدا دوو جۆرە ئیماندار دەرکەوت جۆرێکیان تەکلیفی جیهاد و جەنگ و کوشتاری پێ قورس و ناڕەحەتە، بەڵام مادام خوای پەروەردگار ئەمری کردووە فەرزە لەسەرمان با قورسیش بێت هەر دەیکەین، جۆری دووەم لە ئیمانداران ئەم قورس و ناڕەحەتییە و تەکلیفە لایان بوو بە خۆشی و شادی، ئەگەر لە پێناوی خوای پەروەردگاردا پارچە پارچە بکرێن ئینجا دڵخۆش و ئارام و هێمن دەبنەوە، گومانی تێدانییە ئەم جۆرە بەرزترین پلەی ئیمانیان هەیە ئاواتیان شەهید بوونە، جۆرێکی تر لە ئیمانداران هەر لە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ، پێیان وایە ئێستا کاتی نییە و قورسە و چەکیان نییە و بەگوێرەی پێویست ژمارەی سەربازیان نییە و تەکلیفەکە هەر زۆر قورس دەبێت، ئەوانیش لەکاتی لاوازی ئیماندان، تەنها مەکروهی خراپیان دەبینی و هیچ خێر و چاکەیەکیان لە ناوەخن و باتیندا نەدەبینی، ئیمانیان ئەوەندە بەهێز نەبوو تا پاڵیان پێوە بنێت بۆ ئەو کارە، ئەگەر چی ناڕەحەتیشە.

ئەم کۆمەڵە خۆ مونافیق نەبوون هەر هاوەڵ و ئیمانداری ڕاستەقینە بوون، بەڵام لە چرکەساتی لاوازی ئیماندا دەژیان و ترس داگیری کردبوون، بەڵێ کۆمەڵێک لە هاوەڵان بەم



شێوەیە بوون لە کاتی فەرز بوونی جەنگ و کوشتار و جیهاد دا تووشی دڵەڕاوکێ بوو بوون، ئەوەندە ترسان کە تەمەنا و هیوایان دەخواست ئەم کارە لەسەریان هەڵبگیرێ و یاخود دوابخرێت بۆ کاتێکی تر، ئەوەتا من لە شاری مەدینەدا دەیانبینم، ئەگەرچی زۆر سەیرە بەلامەوە زۆر غەریبیشە، بەڵام هاوەڵان باشترین ڕەوەند و جیلن لەهەموو سەدەکاندا بێگومان دوای پێغەمبەران، ئەم ڕووداوە لە ڕاستیدا پێویستە سوپاسی خوای گەورەی لەسەر بکەین کە لەناو ئەو ڕەوەند و جیلە نایابەدا حاڵەتی وا ڕوویداوە، بۆ ئەوەی نەوەکان تووشی بارێکی لەو شێوەیە بوون، بزانن چۆن پێغەمبەری خوا ﷺ چارەسەری کردووە و هەروەها چۆن مامەڵەی لەگەڵدا کردووە، لێرەدا هەموو کەس دەبێت ئەوە بزانێت کە باسی مرۆڤ دەکەین، ئیسلام ئاینێکی زۆر واقیعییە بەچاوێکی زۆر ئاسایی تەماشای جۆری مرۆڤەکان دەکات، داخۆ چی بێت ئەو کەرەستانەی چارەسەری چرکەساتەکانی لاوازبوونی ئیمان دەکات؟!

بڕوا بکە نومێری برام تەماشایان بکە ئەو کۆمەڵە کە ئێستا ئاوا دەترسن لە جیهاد و کوشتن، هەر ئەوانە بوون لە شاری مەککەدا داوای جیهاد و قیتالیان لە پێغەمبەر ﷺ دەکرد و ئەوان فشاریان دەهێنا کە بڕۆن ئەبوجەهل و سەرانی قوڕەیش بکوژن، بەڵام لێرەدا هاوکێشەکە ڕێک پێچەوانە بۆتەوە، ئێستا حاڵەتەکەم بۆ دەرکەوت کاتێک لە مەککەش داوای جیهادیان دەکرد لە پێغەمبەر ﷺ لەتاو بێئارامی و سەبریان بوو، هیچ سەبریان نەمابوو، لە کاتێکدا تەنها داوایان لێکرابوو خۆیان بپارێزن، ئێستا بەرامبەر ئەو زاڵمانە داوایان لێدەکرێت جیهاد بکەن لەکاتێکدا داوای خۆیانە، کەچی ترس دایگرتوون، دووبارەی دەکەمەوە لە ئارامگرتن و دان بەخۆداگرتندا لاواز بوون.

پاشان جارێکی تر پێت دەڵێم ئەمانە مونافیق نەبوون، بەڵکو باشترین بوون لە جیلەکانی ژیان، قوسووریان تەنها لەکاتی ئیماندا هەبوو، زۆرێک لەوانە زۆر ئازا و چاونەترس بوون، کەچی لەو کاتەدا ئەو ترسە دایگرتن چاونەترسیش بوون بۆ نموونە یەکێک لەوانە سەعدی کوڕی ئەبی وەقاس بوو، پاشان ئایەت لەسەری دابەزی بۆ چارەسەری کێشەی ئەو کۆمەڵانە.

خوای گەورە دەفەرمووێت:



﴿ذَٰلِكَ ٱلْكِتَٰبُ لَا رَيْبَ فِيهِ هُدًى لِّلْمُتَّقِينَ ۝ ٱلَّذِينَ يُؤْمِنُونَ بِٱلْغَيْبِ وَيُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ وَمِمَّا رَزَقْنَٰهُمْ يُنفِقُونَ ۝ وَٱلَّذِينَ يُؤْمِنُونَ بِمَآ أُنزِلَ إِلَيْكَ وَمَآ أُنزِلَ مِن قَبْلِكَ وَبِٱلْءَاخِرَةِ هُمْ يُوقِنُونَ ۝﴾ [البقرة]

**واته: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە بۆچی شتێک دەڵێن و ئەنجامی نادەن؟ بۆچی گوفتارتان دژی کردارتانە؟**

**گوناهێکی گەورە و هەڵەیەکی مەزنە لای خوا ئەگەر شتێک بڵێن و جۆرێکی تر ڕەفتار بکەن**

**بەڕاستی خوا ئەو کەسانەی خۆش دەوێت کە دەجەنگن لە پێناویدا بە یەکڕیز و یەکپارچە و یەک دڵ، هەروەک دیوارێکی بەرزی قایمی تێهەڵکێش و ڕێکوپێک پاشان دوای سەرزەنشت و دانەوەی پاداشت، چارەسەرێکی تری هێنایە پێشەوە قورئانی پیرۆز لە وەسفی ئەم جۆرانەدا بۆ ئەوەی ناخیان ئاشکرا بێت و چارەسەری ترسەکەیان بکەن خوای گەورە دەفەرمووێت:**

﴿أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ قِيلَ لَهُمْ كُفُّوٓا۟ أَيْدِيَكُمْ وَأَقِيمُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتُوا۟ ٱلزَّكَوٰةَ فَلَمَّا كُتِبَ عَلَيْهِمُ ٱلْقِتَالُ إِذَا فَرِيقٌ مِّنْهُمْ يَخْشَوْنَ ٱلنَّاسَ كَخَشْيَةِ ٱللَّهِ أَوْ أَشَدَّ خَشْيَةً ۚ وَقَالُوا۟ رَبَّنَا لِمَ كَتَبْتَ عَلَيْنَا ٱلْقِتَالَ لَوْلَآ أَخَّرْتَنَآ إِلَىٰٓ أَجَلٍ قَرِيبٍ ۗ قُلْ مَتَٰعُ ٱلدُّنْيَا قَلِيلٌ وَٱلْءَاخِرَةُ خَيْرٌ لِّمَنِ ٱتَّقَىٰ وَلَا تُظْلَمُونَ فَتِيلًا ۝٧٧﴾ [النساء]

**واتە: ئایا نەتبینی ئەوانەی کە پێیان دەوترێت دەست بپارێزن کاتی جەنگ نییە، هەر نوێژ بکەن و زەکات بدەن، کەچی کاتێ کە جەنگیان بۆ بڕیار درا، دەستەیەکیان لە خەڵکی دەترسان بە قەدەر ئەوەی کە لە خوا دەترسن یاخود زیاتریش دەیانوت: خوایە تۆ بۆچی جەنگت لەسەر فەرز کردین، خۆزگە بۆ ماوەیەک دوات دەخستین، بەوانە بڵێ: ڕابواردنی ژیانی دنیا زۆر کەم و کورتە، ژیانی قیامەت چاکتر و خۆشتر و نەبڕاوەیە بۆ ئەوانەی کە لە خوا دەترسن و پارێزکارن، بە قەدەر تاڵی ناوکی خورمایەک ستەمیان لێ ناکرێت.**

**خۆ ئەوان یەقینیان بەخوا هەبوو، بەڵام ترس لەو حاڵەتەدا تەنگی پێهەڵچنی بوون، ئەمەش ئەوە دەردەخات خەڵکی بەگشتی دەبێت ئازابێت، بەڵکو پێویستیان بە وەرزش و ڕاهێنان هەیە بۆ ئازایەتی، هەروەکو ئەوەی کەسێ لە تاریکی دەترسێت بەڵام کە وردە وردە ڕاهێنانت پێکرد لە شوێنی تاریکیدا و چاوی بە تارمایی ئاشنا بوو ئیتر ترسەکەی نامێنێت، جەنگیش هەروایە. ئەو ترسەی کە سواری مل و شانی موسڵمانان بوو بوو کاریگەری خستبووە سەر دڵ**



و دەروونیان، لەبەر ئەوە بوو کە یەقینیان بە خوای پەروەردگار نەبوو سەریان دەخات و سەرکەوتوو دەبن، حاشا لەو هاوەڵە بەڕێزانە ئەم بیرکردنەوەیان بووبێت، چونکە ئەوان باشترین ئیماندارن.

هۆکاری ترسەکە دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی ژیان و دونیا بەسەر دڵ و دەروونیاندا زاڵ ببوو، پاشان بەردەوام بوون لەسەر پاراستنی دینیان، ئەترسان لەوەی پەیدایان کردووە لەدەستی بدەن، ئەو بیرکردنەوە ساتەوەختانە چرکەساتی لاوازی ئیمانە، نەبوو دید و تێڕوانینی ڕاست و تەندروستەوە، لەبیریان چووبووەوە لەهەر جێگا و شوێنێکدابن هەردەبێت بمرن- جا مردنەکە بە مردنی ئاسایی بێت یان کوشتن بێت، چونکە مرۆڤ هەر دەبێت بمرێت، نیعمەتی ئاخیرەت بەسەریاندا لەبیرکردبوو، دونیا و خۆشییەکانی بەسەریاندا زاڵ بوو بوون لەنیعمەتەکانی دونیاوە دەستیان پێکردبوو، هیچ ئیماندارێک لەبەر خاتری دونیا، ئاخیرەتی لەبیر ناکات ئەگەر ببێتە خاوەنی هەموو دونیاش.

دیسان چارەسەری خوای پەروەردگار دابەزییەوە بۆ ئیمانداران لەسەر ئەو بنەمایەی کە پێغەمبەری خوا ﷺ پێشتر پەروەردەی کردبوون، گەڕاندنییەوە بۆ سەرچاوە و مامۆستاکەیان لەشاری مەککە ڕاهێنابوون لەسەری پەروەردە بوون خوای گەورە دەفەرموویت:

﴿أَيْنَمَا تَكُونُوا يُدْرِككُّمُ الْمَوْتُ وَلَوْ كُنتُمْ فِي بُرُوجٍ مُّشَيَّدَةٍ وَإِن تُصِبْهُمْ حَسَنَةٌ يَقُولُوا هَٰذِهِ مِنْ عِندِ اللَّهِ وَإِن تُصِبْهُمْ سَيِّئَةٌ يَقُولُوا هَٰذِهِ مِنْ عِندِكَ قُلْ كُلٌّ مِّنْ عِندِ اللَّهِ فَمَالِ هَٰؤُلَاءِ الْقَوْمِ لَا يَكَادُونَ يَفْقَهُونَ حَدِيثًا﴾ [النساء]

(دڵنیا بن) لە هەرکوێ بن مردن یەختان پێ دەگرێت هەتا ئەگەر لە قەڵا و شوێنی سەخت و قایم دا بن، (دووڕووەکان) ئەگەر خێریان بێتە ڕێ دەڵێن: ئەمە لەلایەن خواوەیە، وە ئەگەر تووشی ناخۆشی و زەرەرێک بێن (بە پێغەمبەر ﷺ) دەڵێن: ئەمەیان بەهۆی تۆوەیە، پێیان بڵێ: هەر هەمووی (هەرچی پێش دێت) لەلایەن خواوەیە و (بۆ تاقی کردنەوەیە) ئەوە بۆچی ئەو خەڵکە (باوەڕ لاوازە) هیچ شتێک تێناگەن و لە ڕاستییەکان حاڵی نابن.

خاڵی چوارەم: کۆمەڵی موسڵمانان دیارە بەگشتی لەسەر ئەوە جێگیر بوون دەبێت بجەنگن و فەرز بووە لەسەریان، بەڵام دەبێت بزانن لەگەڵ کێ دەجەنگن، بۆ ئەوەی بجەنگن دەبێت بزانن دوژمنەکانیان کێن (شەڵم کوێرم ناپارێزم) لە ئیسلامدا نییە، هەموو کارێک بەتایبەتی جەنگ ڕێکخستنی خۆی هەیە و ئەو چەک و شمشێرەی دراوەتە دەست، دەبێت



بزانیت بەرامبەر کێ بەکاری دەهێنیت، ئیسلام هێزی مافیا و شەڕەنگێز و دوور لە ڕەحمەتی ناوێت، هەر لەبەر ئەوەیە خوای گەورە ئەحکام و یاسای سەربازی جەنگی بۆ دابەزاندن بۆ ئەوەی بزانن جەنگ کردن بەندایەتییە، هەموو بەندایەتییەکیش موبارەکە، هەموو موبارەکیش لە تەفسیردا واتا خزمەتکردنە بەخەڵکی، هەرچی موبارەک بوو یان بەدەق موبارەک کرابوو، دڵنیابن لەخزمەتە بەخەڵکی بەگشتی، جەنگ لە ئیسلامدا و لە پێناوی خوادا موبارەکە، خوای پەوەردگار دەفەرمووێت:

﴿وَقَٰتِلُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ ٱلَّذِينَ يُقَٰتِلُونَكُمۡ وَلَا تَعۡتَدُوٓاْۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلۡمُعۡتَدِينَ ۝﴾ [البقرة]

واتە: بجەنگن لە پێناوی ڕێبازی خوادا دژی ئەوانەی کە دژتان دەجەنگن نەکەن دەستدرێژی بکەن (دژی ژن و مناڵ و ماڵات و....هتد) چونکە بەڕاستی خوا ئەو دەستدرێژیکەرانەی خۆش ناوێت.

لەم قۆناغەدا موسڵمانان تەنها لەگەڵ ئەوانە دەجەنگن کە هێرش دەکەنە سەریان، ئەوان دەست بە جەنگ دەکەن، مەبەستم دوژمنەکەیانە، ئەم جۆرە جیهاد و جەنگە ناسراوە لە ئیسلامدا بە (جیهادی دەفع) یاخود تەنها جیهادی بەرگریکردن لە خۆیان.

جیهاد بۆ بڵاوکردنەوەی ناوی خوای پەروەردگار و شەریعەتەکەیەتی هەرکەس لەبەردەمیاندا وەستاوە، بەدڵنیاییەوە دەبێت جیهادی لەگەڵدا بکرێت ئەم قۆناغە قۆناغی فەتح کردن و بڵاوکردنەوەی ئایین نییە لە هەموو جیهاندا، بەڵکو تەنها بەرگری کردنە لە خودی ئیسلامەکە لەشاری مەدینە و دەروویشتی.

هەربۆیە موسڵمان دەبێت لە فیقهی واقیعەکەی بزانێت و بیناسێت تا بزانیت هێزی چەندە و چۆنە، پەلاماری هەموو جێگایەک نەدات دوژمن بۆخۆی دروست بکات، بەڵکو لەم قۆناغەدا تەنها هەوڵی پاراستنی دەوڵەتەکەیە و چاوی تەماع نییە بۆ کوتانە سەر دەوڵەتی فارس و ڕۆم (جیهادی تەڵەب و فەتح لەم قۆناغەدا نییە، بەڵکو زۆر دوورە بۆ ئەم قۆناغە).

کەواتە موسڵمانان ئەگەرچی دوژمنەکەیان کاتی جەنگیان بۆ دیاری دەکات ئەوان دەبێت بەرگری لەخۆیان بکەن و نییەتی خۆیان تەنها لەبەر خوا بێت، پاشان لە پێناوی مانەوەی



نەفس و خاک و سامان و بەرژەوەندییەکانیان بێت، سەرەتا دەبێت جەنگ لەگەڵ ئەوانە بێت کە لەگەڵتان دەجەنگن و لە پێناوی خوای گەورەدا بێت.[٥٧]

خاڵی پێنجەم: شەهوەتی تۆڵەسەندنەوە لە دڵ و دەروونماندا چەکەرە بکات و ئەوەی بەرامبەرمان کراوە، ئێمەش هەمان کار ئەنجام بدەینەوە، جا کەوابوو جیاوازی زاڵم لەگەڵیاندا نابێت ئەوانیش دەسەڵاتیان هەبێت وەکو زاڵم بکەن، خوای پەروەردگار و شەریعەت ئەم کارە بەهیچ شێوەیەک قبوڵ ناکات، یاسای جەنگ گۆڕانکاری بەسەردا نایەت لەهیچ کات و زەمەن و جێگا و شوێنێکدا، لە ئیسلامدا بەهیچ شێوەیەک دەستدرێژی جێگای قبوڵ نییە، ئەوانەی دەستدرێژی دەکەنە سەر خەڵکی خوای گەورە خۆشی ناوێن و ڕقیانی لێدەبێتەوە.[٥٨]

دادپەروەری بەدەستدرێژی دروست نابێت، ئیسلام دادپەروەری دەوێت یاسا و ڕێسا و شەریعەت دەچەسپێنێت، ئاسایش و هێمنی بۆ خەڵکی دەوێت، دادپەروەری لەگەڵ هەموو لایەکدا دەبێت ئەنجام بدریت بە کافر و موسڵمانەوە:

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تُحِلُّواْ شَعَٰٓئِرَ ٱللَّهِ وَلَا ٱلشَّهْرَ ٱلْحَرَامَ وَلَا ٱلْهَدْىَ وَلَا ٱلْقَلَٰٓئِدَ وَلَآ ءَآمِّينَ ٱلْبَيْتَ ٱلْحَرَامَ يَبْتَغُونَ فَضْلًا مِّن رَّبِّهِمْ وَرِضْوَٰنًا ۚ وَإِذَا حَلَلْتُمْ فَٱصْطَادُواْ ۚ وَلَا يَجْرِمَنَّكُمْ شَنَـَٔانُ قَوْمٍ أَن صَدُّوكُمْ عَنِ ٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ أَن تَعْتَدُواْ ۘ وَتَعَاوَنُواْ عَلَى ٱلْبِرِّ وَٱلتَّقْوَىٰ ۖ وَلَا تَعَاوَنُواْ عَلَى ٱلْإِثْمِ وَٱلْعُدْوَٰنِ ۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ۖ إِنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلْعِقَابِ ۝٢﴾ [المائدة].

ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە دەستکاری دروشمەکانی خوا مەکەن و هەڵی مەوەشێننەوە (بە تایبەت دروشمەکانی حەج و عومرە) هەروەها مانگەکانی حەڕام کە: (رجب و ذوالقعدة و ذوالحجە و محرم)ە تێکی مەدەن، ئەو قوربانیانەش کە دەکرێت (مەرجەکانی مەشێوێنن) ئەو ملکوانکە و شتانەی (کە دەکرێتە ملی ئاژەڵ) کە نیشانەیە بۆ ئەوەی کە خاوەنیان بڕیاری داوە کە بکرێن بە قوربانی) لێی مەکەنەوە، ڕێگە لەوانە مەگرن کە دێن بۆ زیارەت و (طواف)ی کەعبە بە ئومێدی فەزڵ و ڕەزامەندی خوا، کاتێ کە ئیحرام دەشکێنن بۆتان هەیە ڕاو بکەن. دوژمنایەتی و ڕقەبەرایەتی کەسانێک، کە نەیان هێشت کاتی خۆی زیارەتی کەعبە بکەن، مەکەن هۆی دەستدرێژی و بەرپاکردنی ناخۆشی، یارمەتی و کۆمەکی یەکتری بکەن لەسەر چاکەو خواناسی، نەکەن یارمەتی و کۆمەکی یەکتر بکەن لەسەر گوناهو دەست درێژی، لەخوا بترسن و پارێزکار بن چونکە بەڕاستی خوا تۆڵەسێنەرێکی زۆر بەهێزە.

---

٥٧ ـ هەمان ئایەتی پێشووتر ١٩٠ البقرة.

٥٨ ـ هەمان ئایەتی پێشووتر.



هەموو دەستدرێژییەک قەدەغە و حەرام کراوە لە ئیسلامدا بە تایبەت لە یاسای جەنگدا، غەدر و خیانەت حەرامە، ئازار و ئەشکەنجەی خەڵکی و ئەسیر تاوانە و حەرامە یاری کردن بە لاشەی دوژمن و شێواندنی حەرامە و یاساغە لە ئیسلامدا کوشتن لە پێناو حەزی مرۆڤ، بەدڵنیاییەوە تاوان و حەرامە، وێرانکردن و ڕووخاندن و شکاندن نییە لە ئیسلامدا، زوڵم و زۆرکردن نییە لە هیچ مرۆڤێک هەر بیروباوەڕێکی هەبێت، هەروەها زوڵم لە ئاژەڵ و نەباتیش هەر حەرامە لە ئیسلامدا.

ئەمەش قسەی ماکوان نییە، بەڵکو پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمووێت و هەموو تەعلیماتی یاسای شەریعەتە و پێغەمبەری خوا ﷺ بە وەحی پێی ڕاگەیاندووین، جەنگ لە ئیسلامدا بەرامبەر بە دوژمن ڕێکخراوە نابێت زوڵم و زۆری و دەست درێژیکردنی تێدابێت.

ئەی گوێت لێ نەبوو پێغەمبەری خوا ﷺ چی فەرمووە؟!

فەرمووی: بڕۆنە جەنگ دەرچن بەناوی خوای پەروەردگار، بە پشتیوانی خوای و لەسەر میللەت و ئوممەتی پێغەمبەری خوا ﷺ پیر مەکوژن، منداڵ مەکوژن، ژن مەکوژن، زیادەڕۆیی و دەستدرێژی مەکەن، دەست کەوتەکانتان کۆبکەنەوە بە دادپەروەرانە دابەشی بکەن، چاکەخواز بن، چاکەکاربن لەگەڵ خەڵکیدا، چونکە خوای گەورە چاکەکارانی خۆشدەوێت.[٥٩]

هەروا ئەو هاوەڵە بەڕێزە بەناوی بورەیدە بۆی گێراینەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی بڕۆن بجەنگن لەپێناوی خوادا، لەگەڵ ئەوان بجەنگن کە کوفر بەخوای گەورە دەکەن، بەڵام زیادەڕۆیی و دەستدرێژی مەکەن، غەدر مەکەن و یاری بەلاشەی مردووی دوژمن مەکەن، لاشەیان مەشێوێنن، منداڵی بچووک مەکوژن، ئەوانە مەکوژن کە خۆیان بۆ دینداری ساغ کردۆتەوە لە جێگای بەندایەتیاندا وەکو (صەوامع)؛ وەکو کەپرێکی بچووک وایە).[٦٠]

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

٥٩ ـ اِنْطَلَقُوا بِاسْمِ اَللَّهِ وَعَلَى مِلَّةِ رَسُولِ اَللَّهِ لَا تَقْتُلُوا شَيْخًا فَانِيًا وَلَا طِفْلاً وَلَا صَغِيرًا وَلَا اِمْرَأَةً وَلَا تَغُلُّوا وَضَمُّوا غَنَائِمَكُمْ وَأَصْلِحُوا وَأَحْسِنُوا إِنَّ اَللَّهَ يُحِبُّ اَلْمُحْسِنِينَ.

٦٠ ـ (كَانَ رَسُولُ اَللَّهِ صَلَّى اَللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِذَا بَعَثَ سَرِيَّةً قَالَ اُغْزُوا بِسْمِ اَللَّهِ وَفِي سَبِيلِ اَللَّهِ فَقَاتِلُوا مَنْ كَفَرَ بِاَللَّهِ لَا تَغُلُّوا وَلَا تَغْدِرُوا وَلَا تُمَثِّلُوا وَلَا تَقْتُلُوا وَلِيدًا وَلَا اِمْرَأَةً وَلَا شَيْخًا ولا أَصحَاب الصَّوَامِعَ).



هەروەها کە وەزیرەکەی واتە: ئەبوبکری صدیق دەبێتە خەلیفە و سوپا ئامادە دەکات دەفەرمووێت: خیانەت مەکەن، زیادەڕۆیی مەکەن، غەدر مەکەن، یاری بەلاشەی مردوو مەکەن، منداڵی بچوک مەکوژن و پیاوی پیری بەساڵاچوو مەکوژن، ژن مەکوژن، دارخورما مەشکێنن، هیچ دارێکی بەردار مەسووتێنن و مەبڕنەوە، هیچ مەڕ و ماڵاتێک لەناومەبەن تەنها مەگەر بۆ خواردن نەبێت، ئەگەر بەلای خەڵکانێکدا تێپەڕبوون خۆیان بۆ بەندایەتی تەرخان کردبوو وازیان لێبهێنین و ئەوانە خۆیان بۆ بەندایەتی خواکەیان تەرخان کردووە.[٦١]

ئەوە ڕەوشتی جەنگی ئیسلام و موسڵمانانە، لە جەنگی موسڵماناندا کوشتنی خەڵکی سیڤیل و مەدەنی نییە، یان ئەوەی جەنگی لەگەڵ نەکردی تۆ پەلاماری نادەیت، لەناوبردن و کۆمەڵکووژی نییە و لە ناوبردنی گشتی نییە، شتێک نییە لە ئیسلامدا هاوشێوەی هێرۆشیما و ناکازاکی و لەناوبردنی موسڵمانان بەدەست تەتار و مەغۆل و لەناوبردنی ٨٠ ملیۆن هیندە سوورەکانی ئەمریکا و لەناوبردنی خەڵکی ئوستراليا و کەنەدا، خەڵکی تر بهێنێتە جێگایان، لە ئیسلامدا دوور و نزیک شتی وانییە و ڕووی نەداوە.

لە جوانی و بەدواداچوونی جەنگەکانی ئیسلام ئەوەیە بەیاسا ڕێکخراوە، جەنگی ئیسلام و موسڵمانان خاوەنی ڕەوشتە و بەدرێژایی شارستانیەتی ئیسلامی جەنگی موسڵمانان نموونە بووە، لە کاتی ڕووبەڕووبوونەوەیاندا خاوەنی ڕەوشت بوون.

لەبەر ئەوە خاوەنی مەنهەجی ڕەبانییە و لە بەرزەکان بەرزتر و جوانتر و مەزن ترە.

ئەمەش ئەوەمان نیشان ئەدات یاساکانی مرۆڤ ناتەواو و نوقسانن، بەڵام یاسای خوای پەروەردگار یاسای ئاسمانییە و هەموو دادپەروەرییەکی تێدا بەرجەستە دەبێت، یاسای جاهیلی و قانوونی وەضعی نییە لە هەموو بەند و تەعلیماتێکدا تەواو بێت، خوای گەورە دەفەرمووێت:

﴿أَفَحُكْمَ ٱلْجَٰهِلِيَّةِ يَبْغُونَ ۚ وَمَنْ أَحْسَنُ مِنَ ٱللَّهِ حُكْمًا لِّقَوْمٍ يُوقِنُونَ ۝﴾ [المائدة]

ئایا ئەوانە حوکم و فەرمانڕەوایی جاهیلیەت و نەفامییان دەوێت و ئەویان لاپەسەندە؟! (ئاخر بۆ بیرناکەنەوە) کێ هەیە بەقەدەر خوا حوکمی جوان و چاک و بەجێ بێت، (بەتایبەتی) لای ئەو کەسانەی کە بەوردیی سەرنج دەدەن و ویژدان و هەستی زیندوویان هەیە.

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

٦١ ـ (لاتخونوا ولا تغلوا ولا تغدروا ولا تمثلوا، ولا تقتلوا طفلا صغيرا، ولا شيخا كبيرا، ولا تعقروا نخلا ولا تحرقوا ولا تقطعوا شجرة مثمرة ولا تذبحوا شاة ولابقرة ولابحيرا إلا المكملة، وسوف تمرون بأقوام قد فرغوا أنفسم فى الصوامع (إي الرهبان) فدعوهم وما فرغوا أنفسهم له) الطبري.



خاڵی شەشەم: خوای پەروەردگار هێز و توانای دا بەموسڵمانان و ترس و دڵەڕاوکێی خستە دڵی کافران بە ئایەتی (١٩١) سورەتی البقرة دەفەرمووێت:-

﴿وَٱقۡتُلُوهُمۡ حَيۡثُ ثَقِفۡتُمُوهُمۡ...١٩١﴾

(دەستدرێژکاران) بکوژن لە هەرکوێدا دەستان بەسەریاندا ڕۆشت، دەریان بکەن لەو شوێنەی کە دەریان کردن لێی (کە شاری مککە بوو)،...

بە ئاشکرا بانگەشەی جەنگی بەرگوێی ملهوڕانی قوڕەیشدا، ئەوانەش کە هاوکاریان دەکات لە ئەمڕۆوە هەموو جەنگاوەرێکی قوڕەیش ئامانجە بۆ موسڵمانان و جەنگیان لەگەڵدا دەکەن، جاران هەموو موسڵمانێک ئامانجی قوڕەیش بوو ئێستا بەهەمان شێوە موسڵمانان لە کەمین و مەتەرێزدان و بەتەواوەتی سەنگەریان گرتووە لەکافرانی قوڕەیش، جا لە هەرکوێیەکدابن لەناو شاری مەککە لە مەدینە لە ناو کاروان و قافڵەکانیان...هتد.

هەموو ئەم جورئەت و ئازایەتییە کە دروست بوو بۆ موسڵمان، دوژمنانیان ترسیان لێنیشت و تەنها بەسێ وشە ﴿وَٱقۡتُلُوهُمۡ حَيۡثُ ثَقِفۡتُمُوهُمۡ...١٩١﴾ ئیتر ئەم دەقە لە ئایەتی قورئانی بووە بانگەشەی ئاشکرای جەنگ دژی قوڕەیش، ئەوەی پێشتر ڕوویدا لە مەفرەزەی نەخلە ئەوا ئەمجارە دەیان جاری تر لەو جۆرە کارانە دووبارە دەکەنەوە، ئیتر دەبێت قوڕەیش باجی ئەو هەموو زوڵمەی بدات پێشتر ئەنجامی داوە دژی موسڵمانان.

خاڵی حەوتەم: خوای گەورە لەو ئایەتەدا لە سورەتی البقرة ١٩١ دەفەرمووێت:

﴿... وَأَخۡرِجُوهُم مِّنۡ حَيۡثُ أَخۡرَجُوكُمۡۚ...١٩١﴾

دەریان بکەن لەو شوێنەی کە دەریان کردن لێی (کە شاری مەککە بوو)،..

ئەم هەڕەشەیە زۆر گەورەیە و بەرزبوونەوەیەکی زۆر سەختە بەسەر قوڕەیشدا زۆر ڕوون و ئاشکراشە، ئایەتەکە دەفەرمووێت مادام ئێوەیان دەرکرد لە شاری مەککە، ئینجا ئێوەش دەتوانن دەریان بکەن لە شاری مەککەدا، ئینجا ئایینەکە بانگەشەی ئەوە دەکات دەبێت ئەم جارە موسڵمانان و کافران دوورکەونە لەشاری مەککە ﴿... وَأَخۡرِجُوهُم مِّنۡ حَيۡثُ أَخۡرَجُوكُمۡۚ...١٩١﴾ قوڕەیش باشتر لەوە گەیشتبوو کە ئایەتی قورئانی واتا پیادەکردن لەلایان موسڵمانانەوە، لە هەموو ساتێکدا موسڵمانان ئەگەری ئەوەیان هەیە هەڵبکوتنە سەر شاری مەککە، باش درکیان بەوەکرد کە ڕەوشەکە زۆر ترسناکە و خەتەرناکە وەکو ساڵانی ڕابردوو نییە، ئەوانەی لەناو مزگەوتی حەرەم دا ئازار و ئەشکەنجە ئەدران ئێستا خاوەنی هێز و شان



و شەوکەتن و هێز و توانا و ژمارەیان لە زیاد بووندایە و بە تەواوی هەڕەشەن لەسەر شاری مەککەی پیرۆز.

لەهەمان کاتدا موسڵمانان دەبێت بەوە بزانن کە خاوەن بەرپرسیاریەتییەکی زۆر گەورەن، لە هەمانکاتیشدا بەرپرسیاریەتییەکی نوێ کەوتۆتە سەر شانیان، دەبێت بزانن چۆن مامەڵەی لەگەڵدا دەکەن، دەبێت باش لەوە تێبگەن موسڵمانان تەنها بەرگری لە دین و ژینیان دەکەن، دەبێت کاری یەکەم و کۆتایی موسڵمانان بانگەوازبێت بۆ ئایینی ئیسلام و بڵاوکردنەوەی خودی ئایینەکە، ئەم ئایینە هیوا و هێز و توانای بەخشییە موسڵمانان و خەوێکی هیوا پێخواستنێکی بۆ دەستەبەر کردن، گەیشتە پلەیەکی وا کە موسڵمانان هەرگیز بە خەیاڵیشیاندا نەهاتووە، لە ڕۆژانی داهاتووەوە دەردەکەوێت.

خاڵی هەشتەم: ئەگەر تەماشای کۆتایی ئایینەکە بکەین دەبینین موسڵمانان فێری فیقهی پێوەریان دەکات، چۆن لەسەر چ بنەمایەک پێوانە دەکەن لەباسی مەفرەزەی نەخلەدا، خوای گەورە لە ئایەتێکدا دەفەرمووێت:

﴿... وَٱلْفِتْنَةُ أَكْبَرُ مِنَ ٱلْقَتْلِ...﴾ [البقرة]

...کارەساتێکی گەورە و هەڵەیەکی گەورەیە، بەرهەڵستی ڕێبازی خوا و بێباوەڕیە پێی و (تاوانێکی گەورەیە) و (جەنگ) لە مزگەوتی حەرام دا...

لەهەمان کاتدا لێرەدا دووبارە بۆتەوە:

﴿... وَٱلْفِتْنَةُ أَشَدُّ مِنَ ٱلْقَتْلِ...﴾ [البقرة]

بەهەمان شێوە لەکۆتایی ئایەتی ١٩٣ البقرة دەفەرمووێت:

(خۆ ئەگەر کافران کۆڵیان نەداو هەر جەنگان و پیلانیان گێڕا) ئێوەش بجەنگن دژیان تاوەکو نەبنە هۆی فیتنە و ئاشووب و ناخۆشی (بۆ خەڵکی بەگشتی و ئیمانداران بەتایبەتی) هەروەها تا دین و

ئایین و بەرنامە و فەرمانڕەوایی بۆ خوای گەورە بێت، خۆ ئەگەر کۆڵیان داو وازیان هێنا، دژایەتی تەنها ئەو کەسانە دەکرێت کە زاڵم و ستەمکارن.

کەواتە فیتنە و هەڵگەڕانەوە و هەڵخەڵەتاندنی خەڵکی و پەشیمان کردنەوەیان لە دین پیسترین تاوان و خراپترین تاوانە!



واتە وازهێنان لە دین و گۆڕینی ئیمانە، یاخود نەهێشتنی خەڵکی بۆ چوونە ناو ئایینەکە ئەوپەڕی تاوانە، چونکە قیامەتی لە کیس دەچێت و لە کۆتاییدا دۆڕاو و لە ئاگردایە!

ئەوەی لە پێناو ئایینەکەدا دەکوژرێت لە بەرزترین پلەی بەهەشت دایە، زانراویشە کە ژیانی ئاخیرەت و ئەو دونیا بە هیچ شێوەیەک پێوەر ناکرێت بە ژیانی دونیای فانی، هەر کەس قیامەتی لەدەست دا لە دۆڕا و سەرگەردانەکانە، هیچ شتێک فریای ناکەوێت بۆ ئیسلاح و چاکسازی، کەواتە تاوانی فیتنەی دین بەهیچ جۆرێک لێخۆشبوونی نییە، لە کوشتن و بڕین و هەموو تاوانەکانی تر گەورەترە و ترسناک ترە، هەر لەبەر ئەم هۆکارە بوو زیاتر منیش بواری بانگەوازم هەڵبژارد دژی مولحید و بێدینەکانی کورد، چونکە دەمزانی خەڵکی چۆن سەرگەردان دەکەن.

بەم شێوەیە دەبێت موسڵمانان باش لە فیتنەی دین و هەڵگەڕانەوەی تێبگەن و واقیعی کارەکە بزانن و جیل لەدوای جیل دەبێت بەردەوام بین تا ڕۆژی قیامەت، کەواتە فیقهی پێوەر بۆ کارکردن بزانین و ئاڕاستەی ژیانی خەڵکی بکەین و هەموو موسڵمانان لەو تاوانە ئاگادار بکەینەوە چۆن خوای گەورە هاوەڵان و پێغەمبەر ﷺ ی فێر کرد لە هەمانکاتدا فێری ئەوەمان دەکات و هاوار و یارمەتی دەرمان دەبێت فیقهی پێوەر لە ئەحکام بڕیار لە کات و زەمەنی جیاوازدا بەکار بهێنیت.

خاڵی نۆیەم: هەر لە ئایەتەکەدا تەشریعی زۆر نوێی تێدا دابەزی کە زۆر خەیاڵ بوو لای هاوەڵان لە پێشدا، ئەویش ئەحکامی جەنگ لەناو شاری مەککە و مزگەوتی حەرەمدا، خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿وَٱقۡتُلُوهُمۡ حَيۡثُ ثَقِفۡتُمُوهُمۡ وَأَخۡرِجُوهُم مِّنۡ حَيۡثُ أَخۡرَجُوكُمۡۚ وَٱلۡفِتۡنَةُ أَشَدُّ مِنَ ٱلۡقَتۡلِۚ وَلَا تُقَٰتِلُوهُمۡ عِندَ ٱلۡمَسۡجِدِ ٱلۡحَرَامِ حَتَّىٰ يُقَٰتِلُوكُمۡ فِيهِۖ فَإِن قَٰتَلُوكُمۡ فَٱقۡتُلُوهُمۡۗ كَذَٰلِكَ جَزَآءُ ٱلۡكَٰفِرِينَ ١٩١﴾ [البقرة]

واتە: (دەست درێژکاران) بکوژن لە هەرکوێدا دەستان بەسەریاندا ڕۆیشت، دەریان بکەن لەو شوێنەی کە دەریان کردن لێی (کە شاری مەککە بوو)، بێگومان زۆرکردن لە ئیماندار تا پاشگەز ببێتەوە لە ئایینەکەی لە کوشتن خراپترە، یاخود ئاشووبگێڕان و قسە هێنان و بردن (کە جاری وا هەیە دەبێتە هۆی کوشتنی چەندەها کەس) لە کوشتن خراپترە، مەجەنگن دژی کافران لە سنووری مزگەوتی حەڕام و (کەعبە)دا هەتا ئەوان شەڕتان پێنەفرۆشن و نەجەنگن



دژتان، خۆ ئەگەر شەڕیان پێفرۆشتن و جەنگان دژتان ئێوەش بجەنگن دژیان، چونکە هەر ئەوەیە پاداشتی بێباوەڕان.

کۆتایی ئەم ئایەتە هەڕەشەیەکی زۆر ترسناکی تێدایە بۆ قورەیش، باسی جەنگ دەکات لەناو شاری مەککەدا، وای لێهاتووە گرتنی شاری مەککە بووە بەشتێکی واقیعی نەک هەڕەشە یاخود تەنها بیرۆکەیەکە، بەڵکو زۆر نزیکە و واقیعییە گرتنی شاری مەککە، چونکە ئەمەتا ئەحکامی بۆ دابەزی و یاسا و ڕێسای بۆ ڕێکخرا، ئەم ئایینە بێ شکو گومان ئەم کارەش ترس و لەرزی خستە دڵی کافرەکان بەگشتی و دڵ و ئارامی و چەسپاندنی دایە موسڵمانان، دڵنیابوونی ئەوان کە قسەی خوای پەروەردگار حەقە، ئەمەش زۆر گەورە بوو لای هاوەڵان، بیهێننە بەر چاوی خۆت دەوڵەتێکی نوێ کە زۆر سەرەتایە، باس لەوە دەکات و ئەحکام و یاسا و ڕێسا و تەعلیماتی بۆ پایتەختی دەوڵەتی دوژمن دائەنێت، گومانی تێدا نییە ئەمەش ئەوە دەردەخات کە بڕوا بەخۆیەتی زۆر بە موسڵمانان دەردەکەوێت، عەزیمەت و هێز و گوڕێکی یەکجار زۆر لە بەدیهێنانی ئامانجەکاندا هەیە. ئەگەر چی موسڵمانان لە مانگی حەڕامکراوەکاندا جەنگیان کرد، بەڵام ئایینەکە دڵنیایی ئەوە ئەداتەوە بە خەڵکی بەگشتی کە موسڵمانان ئیحترامی شتە حەڕامکراوەکان دەگرن. دینەکەمان نەگۆڕاوە، بەڵکو لەناو مزگەوتی حەڕامدا جەنگ ناکەن، مەگەر کەسێک جەنگیان لەگەڵدا بکات، ئەم حوکمە زۆربەی زانایان لەسەر ئەو ڕایەن کە ئەم ئایەتە مەنسوخ نییە، بەدڵنیاییەوە موسڵمانان جەنگ دەکەن ئەگەر جەنگیان پێبفرۆشن لەناو شاری مەککە، ئەمەش کاریگەری زۆر چاکی هەبوو لەسەر دڵ و دەروونی موسڵمانان و پێچەوانەکەشی کاریگەری زۆر خراپی کردە سەر قورەیش.

خاڵی دەیەم: ئەگەر چی موسڵمانان بەڕاشکاوانە جەنگیان ڕاگەیاندووە دژی قورەیش لە هەمان کاتدا ڕاگەیاندنی ئەم جەنگە بۆ خاتری شەهوەت و حەزیان و تۆڵە سەندنەوە و سەرکەوتنی ئەمنی و دڵ و دەروونیان نییە، بەڵکو خوای گەورە فێریان دەکات کە ئامانج و غایەت لەم جەنگەدا تەنها بۆ هیدایەتی خەڵکی بەگشتی بۆ وەرگرتنی ئیمانە بۆ ئەو کافرە ملهوڕە تاوانبارانە، هەرچی کاری خراپە دەرحەق بە خوا و پێغەمبەر ﷺ و موسڵمانان ئەنجامیان داوە، گەڕانەوە و تۆبەیان کرد ئەوا خوای گەورە بە بەزەییەوە لێیان خۆش دەبێت تەنانەت موسڵمانیشیان کوشتبێت، نادرێتەوە بەناوچاوانیاندا و ڕابردوویان دادەخرێت و پەڕەیەکی نوێیان بۆ هەڵدەدەنەوە، لەگەڵ ئەو هەموو هەڕەشە و ترساندنی کافران و ملهوڕان، خوای گەورە لێخۆشبوونی گشتی بۆ دەرکردن، لەگەڵ ئەو هەموو زوڵم و ستەمەی کردیان، هێشتا دەرەنگ نییە بۆ گەڕانەوە بۆ ناو ئیمان، ئەمەش گەورەیی و بەرزی ئیسلام و ئەخلاقی ئیسلامی نیشان ئەدات، بەڵکو بەرزترین پلەی ڕەحمەت و سۆز و میهرەبانی ئیسلام دەردەکەوێت:



﴿فَإِنِ ٱنتَهَوْاْ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾ [البقرة]

خۆ ئەگەر ئەوانە کۆڵیان دا و شەڕیان وەستان، ئەوە خوا لێخۆش بوو میهرەبانە (بەڵکو باوەڕ بێنن).

لەگەڵ ئەو هەموو ئازار و ئەشکەنجەی لەلایان کافرانەوە ڕوویداوە دژی ئیمانداران بەڵکو دژی خودی پێغەمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ، لەگەڵ ئەوەی بتپەرستن و ڕێگری لە بڵاوبوونەوەی دینی خوای گەورە، لەگەڵ ئەو هەموو خراپەیەیان خوای گەورە لێخۆشبووە و ئەگەر تۆبە بکەن و نەگەڕێنەوە و کرداری باش و چاک و جوان بکەن خوای گەورە لەسورەتی الأنفال دەفەرمووێت

﴿قُل لِّلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ إِن يَنتَهُواْ يُغْفَرْ لَهُم مَّا قَدْ سَلَفَ...﴾ [الأنفال]

ئەی محمد صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ بەکافران بڵێ: ئەگەر کۆڵ بدەن و واز بهێنن و(باوەڕبهێنن)، ئەوە بێگومان چاوپۆشی لە گوناهی ڕابردوویان دەکرێت، خۆ ئەگەر بگەڕێنەوە و بەبەردەوامی دژایەتی (ئایینی خوا) بکەن، جا ئەوە بەڕاستی یاسای نەتەوە یاخی بووە پێشینەکانیان بەسەردا دەسەپێنرێت.

ئەمە ئەو ڕەوشەی مەدینە بوو کە بینیم لەدوای فەرزبوونی جیهاد لەم ١٠ خاڵەدا بۆم کۆ کردیتەوە نومێر نازانم هیچ تێبینیت هەیە، من ڕەوشەکەم بەم شێوەیە بینی.

نومێر: جا بۆ کاکە هیچت تێدا هێشتەوە، ئەوەندەی سێ دەزگای ڕاگەیاندن شیکاریت بۆ ڕەوشەکە کرد، دەستخۆش خوای گەورە بیکاتە تێشوی قیامەتت، امین.

ماکوان: ئەو ماوەیە لە شاری مەدینەدا چاوم دەگێڕا و ورد دەبوومەوە لە ڕەوشەکە، ڕۆژانە لەگەڵ نومێردا هاتووچۆمان دەکرد، قەرەباڵغێکی زۆر شاری مەدینەی تەنی بوو هاوەڵان هەمیشە بە چەکەوە دەگەڕان، ساڵی ٢ی کۆچی بوو لە ناوەڕاستی مانگی شەعباندان و لە سەرەتای ئەو مانگە جیهاد فەرز بوو، موسڵمانان هەموو خۆیان ئامادەکرد بوو بۆ جەنگ، هەموو پێیان وابوو کە ڕووبەڕوونەوەیەکی ترسناک لەگەڵ موشریکی مەککە ڕوودەدات، ئەم پێداکێشانە ترسناکە لە چرکەساتی تەقینەوەدایە گرووپی ئیمانداران لە دەوڵەتی ئیمانداران لە دەوڵەتی مەدینە کە نوێنەرایەتی حەق و ڕاستی دەکەن، لەبەرامبەردا موشریکی شاری مەککە، دەوڵەتی قورەیش کە نوێنەرایەتی باتڵ و کافر دەکەن.



## تاقیکردنەوە و چاککردنەوەی ڕیزەکانی ئیمانداران

**ماکوان: سوننەتی خوای پەروەردگار پێش هەموو ڕووبەڕوونەوەیەک لەگەڵ دوژمندا، ئوممەتی ئیسلامی و سوپاکەی و خەڵکەکە بەگشتی، تووشی هەندێک قورسی و ناڕەحەتی و کێشە دەکاتەوە بۆ ئەوەی دەرکەوێت کێ لە تاقیکردنەوەکەدا توانای سەرکەوتن و دەرچوونی هەیە.**

**چونکە قسەکردن و خۆبادان ئاسانە خوای گەورە دەفەرموێت:**

﴿۞ قَالَتِ ٱلْأَعْرَابُ ءَامَنَّا ۖ قُل لَّمْ تُؤْمِنُوا۟ وَلَـٰكِن قُولُوٓا۟ أَسْلَمْنَا وَلَمَّا يَدْخُلِ ٱلْإِيمَـٰنُ فِى قُلُوبِكُمْ ۖ وَإِن تُطِيعُوا۟ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ لَا يَلِتْكُم مِّنْ أَعْمَـٰلِكُمْ شَيْـًٔا ۚ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿١٤﴾﴾ [الحجرات].

**واتە: بیابانشینە عەرەبەکان دەڵێن: باوەڕمان هێناوە و موسڵمانین، پێیان بڵێ: نەخێر، باوەڕتان نەهێناوە، بەڵکو تەسلیم بوون، چونکە هێشتا باوەڕ نەچۆتە ناو دڵەکانتانەوە و تیایدا جێگیر نەبووە، خۆ ئەگەر بەڕاستیی ئێوە گوێڕایەڵی فەرمانی خواو پێغەمبەری خوا ﷺ بن، خوای گەورە لە (پاداشتی) چاکەکانتان کەم ناکاتەوە، چونکە بەڕاستی خوا لێخۆشبوو و میهرەبانە.**

**بۆ قسەکەت پێویستە کردارت هەبێت، یا خەڵک بڵێن هەموو ئیسلام دین و پێغەمبەر ﷺ مان خۆشدەوێت، بەڵام بەڵگە چییە بۆ ئەو خۆشەویستییە لەڕاستیدا پێویستی بە کردارە کرداریش لەکاتی موسیبەت و ناڕەحەتی و ئازاردا دەردەکەوێت، کە مرۆڤ هەڵوێستی چۆنە مادام دەبێتە تەرەفی خوای پەروەردگار، خوای گەورە خەڵکی دڵساغ و دەروونپاکی دەوێت و ئازا و چاونەترس و چاپوکی دەوێت، لە ڕووبەڕووبوونەوەی یەکەمدا، خێرا ڕانەکات و هەڵبێت و ببێتە هۆکاری شکستی ئەوانی تریش لەگەڵیدان، جا پێش هەموو شتێک خوای گەورە لە ڕیزی ئیمانداران پاک دەکاتەوە تاقییان دەکاتەوە و پاشان جیاکاری پێدەبەخشێت (جیاکاری و ئیمتاز) بۆ ئەوەی ئازا و ترسنۆک لەیەک جیا بکرێنەوە و ئیمان بەرز و لاواز جیاکاریان بۆ بکرێت، یان هەیە موسڵمانە و لەخۆشی و شادی لەگەڵتایە، کە تووشی فیتنە و ناڕەحەتی دەبێت خێرا دەست بە هات و هاوار دەکات، گلەیی لەخوا دەکات پەنا بەخوا، زۆرجار دینەکەشی دەدۆڕێنێت.**



یاخود هەیە زۆر لاوازە لە ئارامگرتن و ئازایەتی...هتد. بۆ ئەوەی ڕیزی موسڵمانان ئەو جیاکارییەی تیدا بکریت کە ڕووبەڕووی دوژمن بوویەوە ڕیزەکان هیچ کەلێنێکی تێنەکەوێت، خوای گەورە لەم بارەیەوە دەفەرمووێت:

﴿لَوْ خَرَجُوا۟ فِيكُم مَّا زَادُوكُمْ إِلَّا خَبَالًا وَلَأَوْضَعُوا۟ خِلَـٰلَكُمْ يَبْغُونَكُمُ ٱلْفِتْنَةَ وَفِيكُمْ سَمَّـٰعُونَ لَهُمْ ۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌۢ بِٱلظَّـٰلِمِينَ ۝﴾ [التوبة]

واتە: ئەوانە ئەگەر دەرچوونایە و لەناوتاندا بوونایە هیچیان بۆ ئێوە زیاد نەدەکرد بێجگە لە سستی نەبێت (لە ئاشووب و گێرەشێوێنی زیاتریان لە دەست نەدەهات) و دەستیان دەکرد بە چرپ و چاپ لەناوتاندا و دەگەڕان بۆ دۆزینەوەی کەلێنێک، بەئاواتی ئاشووب هەڵگیرساندن لە نێوانتاندا، کەسانێکیش هەن لەنێو ئێوەدا، گوێیان بۆ دەگرن، خوایش چاک ئاگادارە بە کار و کردەوەی ستەمکاران.

ئەتوانین بڵێین خوای پەروەردگار موسڵمانان ڕادەهێنێت لەسەر موسیبەت و ناڕەحەتی و فیتنە کاتێک تووشی ڕووبەڕووبوونەوە گەورەکە بوون، بتوانن خۆیان بگرن و ئارام گربن. ئەوەش لە ڕاستیدا ڕەحمەتی خوای پەوەردگارە بەسەر ئومەت ی موسڵمانەوە بەم کردارە پاک لەپیس جیادەبێتەوە ڕاستگۆ لە درۆزن و هەروەها، کەواتە ئەوەی دەمێنێتەوە ئیمانداری ڕاست و دروست و خاوەن ئیخلاصە.

ئەوەی باسم کرد لەم ماوەدا کە زیاتر باس و خواسەکانی فەرزبوونی جیهاد بوو و جەنگکردن و کوشتار بوو لەسەر موسڵمانان، هەر لەو مانگەدا سێ گۆڕانکاری تر ڕوویدا کە زۆر گرنگ بوون هەموو بۆ جیاکاری و پەروەردە و پاککردنەوەی ڕیزی موسڵمانان، لەم سێ خاڵە گرنگە پێش هەموو جەنگ و جیهادێک دەبێت لەناو موسڵماناندا ڕوویداوە ئینجا سەرکەوتنی خوایی ڕوو دەدات، ئەگەر ئەو سێ خاڵە نەبوو زۆر ئەستەمە سەرکەتووبن، خۆ ئەگەر سەرکەوتنیش ڕوویدا ئەوە سەرکەوتنێکی زۆر کورت و کاتییە.

ئەوەی لە کۆتایی مانگی شەعباندا ڕوویدا:

یەکەم: فەرزبوونی جیهاد.

دووەم: فەرزبوونی زەکات.

سێیەم: فەرزبوونی ڕۆژووی ڕەمەزان.

چوارەم: گۆڕانی قیبلە.



بەم چوار بنەما سەرەکییەی لە ئایینی ئیسلامدا خوای پەروەردگار ئەو سێ خاڵەی لە موسڵمانانە هێنایەدی ١- جیاکاری و ئیمتیاز، ٢- پەروەردە لەسەر ڕەوشتی ئیسلام، ٣- پاککردنەوە و پاڵفتەکردنی ڕیزی موسڵمانان.

فەرزبوونی زەکات:

زەکات لەشاری مەککەوە لەسەر موسڵمانان فەرزکرا بوو، بەڵام ڕێژەی بۆ دانەنراوە و بەجێهێڵرا بوو بۆ موسڵمانان بە گوێرە و توانا و هێزی خۆی سەرەتا دەبەخشی، بەڵام لەمەودوا ٢.٥٪ فەرزکرا لەسەر ئیمانداران، ئەگەر چی دانانی ئەو ڕێژەیە کەمە، بەڵام لەڕاستیدا مرۆڤ بە سروشتی پارەی خۆش دەوێت حەز بە سەروەت و سامان دەکات، خوای پەروەردگاریش لە سورەتی الحجر دەفەرمووێت:

﴿وَتُحِبُّونَ ٱلْمَالَ حُبًّا جَمًّا﴾ [الفجر]

واتە: ما ل و سامان و دارایشیان زۆر خۆشدەوێت.

ئەمەش حیکمەتی تێدایە بۆچی خوای گەورە لە دڵ و دەروونی مرۆڤدا پارەی خۆشەویست کردووە، بۆ ئەوەی بزانێت کێ لە پێناوی خوادا دەبەخشێت، مرۆڤ ئەگەر ئامادە نەبوو لە سەروەت و سامانی ببەخشێت هەرگیز پەروەردە نابێت بۆ جیهاد تا ڕۆحی ببەخشێت لە پێناوی خوادا.

کەواتە زەکات بۆ جیاکارییە لە ناوخەڵکیدا بۆ پەروەردەکردنە و تا ئەوەی کە حەز لەبەخشین دەکات، لە ڕیزی موسڵماناندا ئاماژەی بۆ دەکرێت ڕیزی خواناسان پێکدەهێنێت.

فەرزبوونی ڕۆژوی مانگی ڕەمەزان:

بەهەمان شێوە موسڵمانان بەڕۆژوو دەبوون لە شاری مەککە، بەڵام بە ئارەزووی خۆیان بوو پاشان لە شاری مەدینە ڕەمەزان فەرزکرا لە ساڵێک دا یەک ڕۆژ ئەویش عاشوورا بوو، بەڵام ئێستا ڕۆژوو فەرزکراوە لەسەر موسڵمانان یەک مانگ لەسەر یەک لە مانگی ڕەمەزاندا، لە دوای مانگی شەعبان ڕاستەوخۆ مانگی ڕەمەزانە، ڕەمەزانیش مانگێک ڕۆژووگرتن، خۆگرتنەوە لە خواردن و خواردنەوە تا ماوەیەکی دیاریکراوە لە ڕاستیدا زۆر ئەرکێکی قورسە، ئەمەش بەهەمان شێوە بۆ پەروەردە و جیاکاری و پاڵفتەی ڕیزی موسڵمانان بوو.

چونکە سروشتی مرۆڤ وا هەڵکەوتووە حەزی بە تێرکردنی شەهوەتە، ڕۆژووش ڕێگرە لە هەموو شەهوەتەکان، لە خواردن و خواردنەوە، لەسەرجێگایی لەگەڵ خێزانی خۆت، دەمگرتن و خۆگرتنەوە لە قسە و خەڵکی و چاو گرتنەوە لەکاری حەرام و...هتد.



هەموو ئەم کارانە مرۆڤ پەروەردە دەکات لەسەر دەستپاکی و چاوپاکی و ڕاستگۆیی و دەمپاکی، ئەگەر موسڵمانان بڕۆنە جەنگ دەبێت خاوەنی ڕەوشتی ئیسلامی بن، کە پارە و سەروەت و سامان و ئافرەت کەوتۆتە بەردەستیان دەبێت بیپارێزن، ئەمەش ڕەمەزان فێری ئەو ڕاهێنانەیان دەکات و ڕۆژ و وەرزش بە موسڵمانان دەکات بۆ دەستبەسەرداگرتنی شەهوەتەکان، لە ناو ئەو گەرما و بێ نانی و فەقیرییە تەنها ئیمانداری ڕاستەقینە توانای ڕۆژووگرتنی هەیە، بەم کارە موسڵمانان زیاتر دەتوانن جیاکار و پەروەردە و ڕیزەکانیان پاڵفتە بکەن.





# گۆڕینی ڕووگە (قیبلە)

لە دوای ئەو سێ تاقیکردنەوە گەورەیە، تاقی کردنەوەی چوارەم ڕوویدا ئەویش گۆڕینی قیبلە بوو لە قودسەوە بۆ مەککە، ئەمەش مانایەکی زۆر گەورەی هەیە، ئەوەندەی تر ترس و دڵەڕاوکێی خستە دڵی کافر و موشریک و یەهوود و نەسارا.

سەرەتا ڕووگەی موسڵمانان قودس بوو، دەبێت ڕۆژێک لە ڕۆژان ئەو جێگایە بکەوێتە دەستی موسڵمانان، هەروەها مزگەوتی حەڕام و مەککە نابێت لە دەستی کافر دابێت، تەواو ڕووگەی موسڵمانانە، ناشکرێت موسڵمانان ڕووبکەنە جێگایەک خواپەرستی لێبکەن پڕبێت لە شەریک بۆ خوا دانان و بت و پەیکەر، سەرەتا ئەم واتا گرنگەی دایە دەستەوە، پاشان لە هەمووی گرنگتر خوای پەروەردگار جیاکاری تەواوی دا بە موسڵمانان، نابێت لە هیچ شتێکدا لە کەسانی تر بچن، پێشتر لە عاشووورادا بەڕۆژوو دەبوون خوای پەروەردگار گۆڕی بۆ ڕەمەزان، سیستەمی تایبەتی ئابووری بۆ دامەزراندن کە فەرزبوونی زەکات بوو بە ڕێژەی ٢.٥٪، قیبلەی تایبەت بەخۆیان هەیە کە کەعبەی پیرۆزە، هەموو ئەمانە ئیمتیاز بوون بۆ موسڵمانان دەبێت لەخۆیان بچن و ئیتر ئینەرجی کەسی تر بەکارنەهێنن، ئیتر خوای پەروەردگار ئیمتیاز لە دوای ئیمتیازی ئەدایە ئیمانداران و زیاتر ڕۆحی جیهاد و کارکاردنیان بەرزتر دەبوو، ئینجا خوای پەروەردگار خەیر و چاکەی ئومەتی دایە دەست موسڵمانان، پێشتر یەهوود بەهۆکاری پێغەمبەرانیان باشترین ئومەت بوون ئەفزەڵیەتیان درایە، بەڵام خوای گەورە لەوانی سەندەوە دایە موسڵمانان، نەك بەناوی باشترین ئوممەت لەمەش نابێت لە یەهوود بچن بەڵکو بەناوی خەیری ئومەت.

خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿كُنتُمْ خَيْرَ أُمَّةٍ أُخْرِجَتْ لِلنَّاسِ تَأْمُرُونَ بِٱلْمَعْرُوفِ وَتَنْهَوْنَ عَنِ ٱلْمُنكَرِ وَتُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ وَلَوْ ءَامَنَ أَهْلُ ٱلْكِتَٰبِ لَكَانَ خَيْرًا لَّهُم مِّنْهُمُ ٱلْمُؤْمِنُونَ وَأَكْثَرُهُمُ ٱلْفَٰسِقُونَ ١١٠﴾ [آل عمران]

واتە: (بەڕاستی) ئێتر ئێوە چاکترین ئوممەتێکن کە (بۆ سوودی) خەڵکی هێنراونەتە مەیدانەوە، چونکە فەرمان بە چاکە دەدەن و قەدەغەی خراپە دەکەن و باوەڕی دامەزراوتان بە خوا هەیە، خۆ ئەگەر خاوەنانی کتێب باوەڕیان بێنایە (بە ئایینی ئیسلام) چاکتر بوو بۆیان، هەیانە ئیماندارن بەڵام زۆربەیان گوناحکارو تاوانبارن.



لەهەمووی گرنگتر خوای پەروەردگار دادپەروەری دایە دەستی موسڵمانان بە ئوممەتی دادپەروەری تەندروست دوور لە پەڕگیری دایە دەستی موسڵمانان کە تەنها ئیمان و خۆشەویستیان بۆ خوا و پێغەمبەر و دینەکەیان هەیە خوای گەورە دەفەرمووێت:

﴿وَكَذَٰلِكَ جَعَلْنَـٰكُمْ أُمَّةً وَسَطًا لِّتَكُونُوا۟ شُهَدَآءَ عَلَى ٱلنَّاسِ وَيَكُونَ ٱلرَّسُولُ عَلَيْكُمْ شَهِيدًا ۗ وَمَا جَعَلْنَا ٱلْقِبْلَةَ ٱلَّتِى كُنتَ عَلَيْهَآ إِلَّا لِنَعْلَمَ مَن يَتَّبِعُ ٱلرَّسُولَ مِمَّن يَنقَلِبُ عَلَىٰ عَقِبَيْهِ ۚ وَإِن كَانَتْ لَكَبِيرَةً إِلَّا عَلَى ٱلَّذِينَ هَدَى ٱللَّهُ ۗ وَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيُضِيعَ إِيمَـٰنَكُمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ بِٱلنَّاسِ لَرَءُوفٌ رَّحِيمٌ ١٤٣﴾ [البقرة]

واتە: بەو شێوەیە ئێوەمان بە گەلێکی میانەڕەو گێڕاوە (لە هەموو ڕوویەکەوە، لە ڕووی عیبادەت و خواپەرستییەوە، لەڕووی دنیاو قیامەتەوە، لە ڕووی داخوازییەکانی ڕۆح و نەفسەوە...هتد) تا ببنە شایەت بەسەر خەڵکییەوە (تا بزانن ئەم ئایین و بەرنامەیە هەمووی مایەی خێرو سەربەرزیە بۆ تاک و کۆمەڵ لە هەموو سەردەمێکدا، لە هەموو بوارەکانی ژیاندا)، پێغەمبەریش (لە هەموو ئەو بوارانەدا مامۆستا و ڕابەری ئێوەیە لە ڕۆژی قیامەتدا) شایەتی دەدا (بۆ دڵسۆزانی ئوممەتی لەسەر ئەوەی کە بە ئەرکی سەرشانی خۆیان هەستاون)، ئەو قیبلە و ڕووگەیەش کە ڕووتتێکردبوو (ئەی محمد ﷺ) بۆ ئەوە بوو کە بزانین و دەربکەوێ کێ شوێن کەوتەی پێغەمبەر ﷺ دەبێ و کێش هەڵدەگەڕێتەوە، هەرچەندە (گۆڕینی قیبلە) بوو بەهۆی ناڕەحەتییەکی گەورە بۆ هەندێک، جگە لەوانەی کە خوا دڵیانی دامەزراندبوو، ڕێنمویی کردبوون (کە ئیماندار دەبێ فەرمانبەردار بێ) و خوا ئیمان و باوەڕداریی ئێوە زایە ناکات، چونکە بەڕاستی خوا بۆ خەڵکی بەسۆزو بە بەزەییە.

ئینجا یەهوود کەوتە غیرە و مەلاسکێ لە موسڵمانان و گومان و شوبهەی زۆریان بڵاوکردەوە، لە سەر گۆڕینی قیبلە دەیانوت: ئەگەر قیبلەی یەکەم جار هەڵە بووە کەواتە نوێژەکانتان دروست نییە، ئەگەر ڕاست بووە ئەی بۆ دەیگۆڕن، هەروەها هەندێک لە هاوەڵان کۆچی دواییان کرد وەکو (ئەسعەدی کوڕی زیرارە و بەڕائی کوڕی مەعرور)[٦٢] هەندێکی تر لە هاوەڵان دەیانوت داخۆ نوێژ و عیبادەتیان دروست بووە ئەوانیش چۆن مامەڵەیان لەگەڵ دەکرێت؟!

خوای گەورە وەڵامی دانەوە:

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-
٦٢ ـ أسعد بن زرارة، البراء بن معرور.



﴿۞ سَيَقُولُ ٱلسُّفَهَآءُ مِنَ ٱلنَّاسِ مَا وَلَّىٰهُمْ عَن قِبْلَتِهِمُ ٱلَّتِي كَانُوا۟ عَلَيْهَا ۚ قُل لِّلَّهِ ٱلْمَشْرِقُ وَٱلْمَغْرِبُ ۚ يَهْدِى مَن يَشَآءُ إِلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ﴾ [البقرة]

بێئاوەز و دەم بەتاڵەکان لە خەڵکی (دوای دوای گۆڕینی ڕووگە، لە قودسەوە بۆ کەعبە) دەڵێن: باشە چی وای لێکردن کە واز لە ڕووگە پێشووەکە بێنن؟! کە جاران ڕوویان تێدەکرد، پێیان بڵێ: ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا (هەموو لایەک) خوا خاوەنیەتی، هەر کەسێکی بوێ و هەرکەس بیەوێ ڕێنموونی دەکا بۆ ڕێگە و ڕێبازی ڕاست و ڕەوان.

پاشان لە کۆتایی ئایەتی (١٤٣) خوای گەورە موسڵمانان دڵئارام دەکاتەوە کە نوێژ و بەندایەتیان دروستە و خوای گەورە قبوڵی کردووە

﴿... وَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيُضِيعَ إِيمَـٰنَكُمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ بِٱلنَّاسِ لَرَءُوفٌ رَّحِيمٌ﴾ [البقرة]

پاشان خوای پەروەردگار ڕوونی کردەوە بۆ موسڵمانان یەهوود گەلێکی خۆبەزلزان و جاهیلن، لەدوای پێغەمبەرانیان سەرەڕۆ و ملهوڕ بوون، تەنانەت لەگەڵ پێغەمبەران ئیشیان بێئەدەب و سەرەڕۆ بوون، هەمیشە بەدوای بەڵگە و دەلیلی بێمانا و گوماناوی دەگەڕێن، خوای پەروەردگار دید و تێروانینی پێشوی بۆ باسکردن و بۆی ڕۆشنکردنەوە کە یەهوود دڵڕەق و مێشک پووتن، ناگەڕێنەوە بۆ هیدایەت ئەگەر چی ڕووگەیان بەکار دەهێنا، ماوەیەک پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ بە ئاشکرا ڕایگەیاند کە هەموو پێغەمبەرانی بەنی ئیسرائیل برامن و لەیەک سەرچاوە هاتووین، بەڵام لەگەڵ یەهوود هیچ سوودی نییە، خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿وَلَئِنْ أَتَيْتَ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَـٰبَ بِكُلِّ ءَايَةٍ مَّا تَبِعُوا۟ قِبْلَتَكَ ۚ وَمَآ أَنتَ بِتَابِعٍ قِبْلَتَهُمْ ۚ وَمَا بَعْضُهُم بِتَابِعٍ قِبْلَةَ بَعْضٍ ۚ وَلَئِنِ ٱتَّبَعْتَ أَهْوَآءَهُم مِّنۢ بَعْدِ مَا جَآءَكَ مِنَ ٱلْعِلْمِ ۙ إِنَّكَ إِذًا لَّمِنَ ٱلظَّـٰلِمِينَ﴾ [البقرة]

واتە: بەڕاستی تۆ ئەگەر بچیت بۆ لای ئەوانەی کتێبیان بۆ هاتووە، بەهەر بەڵگەیەک بتەوێ شوێنی ڕاستی بکەون و ڕووبکەنە ڕووگەی تۆ، ڕووی تێناکەن و بەقسەت ناکەن، وەنەبێ تۆش (کە دڵنیای ڕووگەی تۆ ڕەسەن و دێرینترە) دەستهەڵگری و ڕووبکەیتە ڕووگەی ئەوان، ئەوانیش ڕوو ناکەنە ڕووگەیەکی تر، ئەگەر تۆ شوێن هەوا و ئارەزووی ئەوان بکەویت، دوای ئەوەی کە زانیاری تەواوت لە هەموو ڕوویەکەوە پێڕاگەیەنراوە، ئەوا تۆ لە ڕیزی ستەمکاران دا دەبیت (بێگومان ئەستەمە تۆ، وا بیت ئەی فرستادەی خوا).



ئینجا له ئایەتی (٤٠-١٢٣) سورەتی البقرة خوای گەورە هەموو ئاواتەکانی یەهوودی کۆکردەوە، وەکو فلاش باکێکی فیلمی سینەمایی خستییەوە بەر دیدی موسڵمانان بەوەحی لە قورئانەکەیدا بەم شێوە و بە ئوسلوبێکی ناوازە، لەگەڵ هەر ئایەتێکدا چرکەساتی تاوانەکانیان دێتەوە بەرچاوی هەموو کەس، بۆ ئەوەی هاوەڵان لەمەولاوە باشتر بیانناسن و خۆیان دوورە پەرێز بگرن لە یەهوود چونکە ئەهلی فیتنەن.



# تاوان و سەرپێچییەکانی یەهوود بەگشتی لە سوورەتی البقرةدا

﴿يَٰبَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ ٱذۡكُرُواْ نِعۡمَتِيَ ٱلَّتِيٓ أَنۡعَمۡتُ عَلَيۡكُمۡ وَأَوۡفُواْ بِعَهۡدِيٓ أُوفِ بِعَهۡدِكُمۡ وَإِيَّٰيَ فَٱرۡهَبُونِ۝﴾

**واتە: ئەی نەوەی ئیسرائیل (نەوەی حەزرەتی یەعقوب سەلامی خوای لەسەر بێت) یادی نازو نیعمەتی من بکەنەوە کە بە سەرتانا ڕژاندوومە، بە وەفاو بە ئەمەک بن بۆ پەیمانەکەم (کە ئیمان و کردەوەی چاک و باوەڕکردنە بە هەموو پێغەمبەران بەبێ جیاوازی) منیش بەوەفا و بە ئەمەک دەبم بەو پەیمانەی کە پێم داون (کە جێنشین کردنە لە دنیادا و بەهەشتی بەرینە لە قیامەتدا) تەنها بە ترس و بیمتان لە من دەبێت.**

﴿وَءَامِنُواْ بِمَآ أَنزَلۡتُ مُصَدِّقٗا لِّمَا مَعَكُمۡ وَلَا تَكُونُوٓاْ أَوَّلَ كَافِرِۭ بِهِۦۖ وَلَا تَشۡتَرُواْ بِـَٔايَٰتِي ثَمَنٗا قَلِيلٗا وَإِيَّٰيَ فَٱتَّقُونِ۝﴾

**واتە: هەروەها ئیمان بهێنن بەو قورئانەی کە ناردوومەتە خوارەوە کە پاڵپشتی پەیامەکەی لای ئێوەیە (تەورات و ئینجیلی دەستکاری نەکراو) مەبنە یەکەم بێبڕوا پێی ( لە جیاتی یەکەم باوەڕدار) و ئایەتەکانم بەنرخێکی کەم مەگۆڕنەوە ( لەپێناوی بەدەستهێنانی هەندێ مەرامی کەم نرخی دنیادا)، تەنها لە من بترسن و خۆتان لە خەشمی من بپارێزن.**

﴿وَلَا تَلۡبِسُواْ ٱلۡحَقَّ بِٱلۡبَٰطِلِ وَتَكۡتُمُواْ ٱلۡحَقَّ وَأَنتُمۡ تَعۡلَمُونَ۝﴾

**واتە: نەکەن ڕاستی و بەتاڵ، حەق و ناحەق بە یەکەوە بئاڵێنن و حەق مەشارنەوە، درۆ دامەپۆشن بەڕاست، لەکاتێکدا خۆشتان حەق و ڕاستی دەزانن کامەیە.**

﴿وَأَقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتُواْ ٱلزَّكَوٰةَ وَٱرۡكَعُواْ مَعَ ٱلرَّٰكِعِينَ۝﴾

**واتە: نوێژەکانتان بەچاکی ئەنجام بدەن بەدرووشمەکانییەوە و زەکاتیش بدەن، لەگەڵ کڕنووش بەراندا کڕنووش ببەن (بۆ پەروەردگارتان).**



﴿ أَتَأْمُرُونَ ٱلنَّاسَ بِٱلْبِرِّ وَتَنسَوْنَ أَنفُسَكُمْ وَأَنتُمْ تَتْلُونَ ٱلْكِتَٰبَ أَفَلَا تَعْقِلُونَ ﴿٤٤﴾﴾

واتە: (کەی ئەوە ڕاستە) فەرمانی چاکە بەخەڵکی بدەن و خۆتان فەرامۆش بکەن؟! لەکاتێکدا خۆ ئێوە کتێبی خوا ـ تەورات ـ دەخوێننەوە، (دەزانن سزای گوفتاری بێرەفتار چۆنە) جا ئایا ژیریتان ڕێتان لێناگرێت لەو هەڵوێستە ناشرینە؟!

﴿وَٱسْتَعِينُوا۟ بِٱلصَّبْرِ وَٱلصَّلَوٰةِ ۚ وَإِنَّهَا لَكَبِيرَةٌ إِلَّا عَلَى ٱلْخَٰشِعِينَ ﴿٤٥﴾﴾

واتە: (ئێوە هەوڵ بدەن) پشت ببەستن بە ئارامگرتن و نوێژکردن (بۆ گەیشتن بەئامانج) بەڕاستی نوێژ ئەرکێکی گەورەو گرانە، مەگەر لەسەر ئەو کەسانەی کە بەخۆشەویستی و سۆزەوە خواپەرستی ئەنجام دەدەن و (باوەڕی دامەزراویان هەیە).

﴿ٱلَّذِينَ يَظُنُّونَ أَنَّهُم مُّلَٰقُوا۟ رَبِّهِمْ وَأَنَّهُمْ إِلَيْهِ رَٰجِعُونَ ﴿٤٦﴾﴾

واتە: ئەوانەی دەزانن بێگومان بەدیداری پەروەردگاریان شاد دەبن و باوەڕی پتەویان هەیە کە بۆ لای ئەو دەگەڕێنەوە.

﴿يَٰبَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ٱذْكُرُوا۟ نِعْمَتِىَ ٱلَّتِىٓ أَنْعَمْتُ عَلَيْكُمْ وَأَنِّى فَضَّلْتُكُمْ عَلَى ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٤٧﴾﴾ [البقرة]

واتە: ئەی نەوەی ئیسرائیل: یادی ناز و نیعمەتەکانم بکەنەوە کە ڕشتوومە بەسەرتاندا بێگومان من گرنگی زۆرم پێداون و نازونیعمەتی زۆرم پێبەخشیون (لە خواردن و خواردنەوە لە موعجیزەی جۆراوجۆر، لە چارەسەرکردنی کێشەکانیان... هتد ) من زیادەڕێزی ئێوەم داوە بەسەر هەموو خەڵکیدا (ئەڵبەتە لەسەردەمی خۆیاندا و ئەوانەی کە پابەندی ئایینی خوا بوون، بە تایبەتی پێغەمبەران و پیاوچاکان)

﴿وَٱتَّقُوا۟ يَوْمًا لَّا تَجْزِى نَفْسٌ عَن نَّفْسٍ شَيْـًٔا وَلَا يُقْبَلُ مِنْهَا شَفَٰعَةٌ وَلَا يُؤْخَذُ مِنْهَا عَدْلٌ وَلَا هُمْ يُنصَرُونَ ﴿٤٨﴾﴾

واتە: خۆتان بپارێزن لە ڕۆژێک کە کەس فریای کەس ناکەوێت و کەس هیچی لە دەست نایەت و تکاکاریی کەسیش وەرناگیرێت و بارمتە و گۆڕانکاری تیایدا ئەنجام نادرێت و ئەو کەسانەی خوانەناسن یارمەتی نادرێن و سەرناخرێن.



﴿وَإِذْ نَجَّيْنَٰكُم مِّنْ ءَالِ فِرْعَوْنَ يَسُومُونَكُمْ سُوٓءَ ٱلْعَذَابِ يُذَبِّحُونَ أَبْنَآءَكُمْ وَيَسْتَحْيُونَ نِسَآءَكُمْ ۚ وَفِى ذَٰلِكُم بَلَآءٌ مِّن رَّبِّكُمْ عَظِيمٌ ﴿٤٩﴾﴾

واتە: بیری نیعمەتی ڕزگار بوونیشتان بکەنەوە کاتێک ڕزگارمان کردن لە دەست دارودەستەی فیرعەون کە خراپترین سزاو ئازاریان دەدان، کوڕەکانتانیان سەردەبڕین و ئافرەتەکانتانیان دەهێشتەوە (بۆ کارەکەری و خزمەت) ئەوەش بۆ ئێوە تووش هات و تاقیکردنەوەیەکی گەورە بوو بۆتان لەلایەن پەروەردگارتانەوە (تا پشت بەو زاتە ببەستن و بڕوای تەواوتان پێی هەبێت).

﴿وَإِذْ فَرَقْنَا بِكُمُ ٱلْبَحْرَ فَأَنجَيْنَٰكُمْ وَأَغْرَقْنَآ ءَالَ فِرْعَوْنَ وَأَنتُمْ تَنظُرُونَ ﴿٥٠﴾﴾

واتە: یادی ئەو نیعمەتە بکەنەوە کە لەبەر خاتری ئێوە دەریاکەمان لەت کرد، ئینجا ڕزگارمان کردن، دار و دەستەی فیرعەونمان نغرۆ کرد، لەکاتێکدا ئێوە بەچاوی خۆتان بینیتان و تەماشاتان دەکردن.

﴿وَإِذْ وَٰعَدْنَا مُوسَىٰٓ أَرْبَعِينَ لَيْلَةً ثُمَّ ٱتَّخَذْتُمُ ٱلْعِجْلَ مِنۢ بَعْدِهِۦ وَأَنتُمْ ظَٰلِمُونَ ﴿٥١﴾﴾

واتە: یادی ئەو (نیعمەتە) بکەنەوە کاتێک چل شەو وادەمان دانا بۆ مووسا (بۆ پاڕانەوەو نزا) پاشان گوێرەکەکەتان کردە خواتان، بێگومان ئێوە ستەمکار بوون.

﴿ثُمَّ عَفَوْنَا عَنكُم مِّنۢ بَعْدِ ذَٰلِكَ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ ﴿٥٢﴾﴾

واتە: پاشان (لەو هەموو هەڵانەتان) خۆشبووین بۆ ئەوەی سوپاسگوزاریی بکەن.

﴿وَإِذْ ءَاتَيْنَا مُوسَى ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْفُرْقَانَ لَعَلَّكُمْ تَهْتَدُونَ ﴿٥٣﴾﴾

یادی ئەو نیعمەتە بکەنەوە کاتێک کتێبی (تەورات) و جیاکەرەوەی (ڕەوا و ناڕەوامان) بەخشی بە مووسا بۆ ئەوەی ڕێبازی هیدایەت بگرنەبەر (لە گومڕایی ڕزگارتان ببێت).

﴿وَإِذْ قَالَ مُوسَىٰ لِقَوْمِهِۦ يَٰقَوْمِ إِنَّكُمْ ظَلَمْتُمْ أَنفُسَكُم بِٱتِّخَاذِكُمُ ٱلْعِجْلَ فَتُوبُوٓا۟ إِلَىٰ بَارِئِكُمْ فَٱقْتُلُوٓا۟ أَنفُسَكُمْ ذَٰلِكُمْ خَيْرٌ لَّكُمْ عِندَ بَارِئِكُمْ فَتَابَ عَلَيْكُمْ ۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلتَّوَّابُ ٱلرَّحِيمُ ﴿٥٤﴾﴾

واتە: یادی ئەو نیعمەتە بکەنەوە کاتێک مووسا بە قەوم و هۆزی خۆی وت: ئەی قەوم و هۆزەکەم بەڕاستی ئێوە بەو گوێرەکە پەرستییە ستەمتان لە خۆتان کردووە، دەی بگەڕێنەوە بۆ



لای بەدیهێنەرتان و تەوبە بکەن و ئینجا خۆتان بکوژن (بێ تاوان تاوانبار بکوژێت)، ئەوە باشترە بۆتان (چونکە تاوانەکەتان زۆر گەورەیە) پاشان ئەویش (واتە خوا دوای لەناو بردنی هەندێک لە تاوانباران) تۆبەی وەرگرت (لەوانەی مابوون)، لە ڕاستیدا تەنها ئەو زاتە ئێجگار تەوبە وەرگرو بە ڕەحم و دلۆڤانە.

﴿وَإِذْ قُلْتُمْ يَٰمُوسَىٰ لَن نُّؤْمِنَ لَكَ حَتَّىٰ نَرَى ٱللَّهَ جَهْرَةً فَأَخَذَتْكُمُ ٱلصَّٰعِقَةُ وَأَنتُمْ تَنظُرُونَ﴿٥٥﴾﴾

واتە: یادی ئەو نیعمەتە بکەنەوە کە وتتان: ئەی مووسا هەرگیز باوەڕت پێناهێنین تا وەکو بە ئاشکراو بە چاوی خۆمان خوا نەبینین، ئیتر یەکسەر هەورە بروسکەکە لێی دان، لە کاتێکدا کە تەماشاتان دەکرد و بە دەووروبەری خۆتاندا دەتانڕوانی (بەسەرسامیەوە بیرتان دەکردەوە).

﴿ثُمَّ بَعَثْنَٰكُم مِّنۢ بَعْدِ مَوْتِكُمْ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ﴿٥٦﴾﴾

واتە: پاشان زیندوومان کردنەوە و ژیانمان پێبەخشینەوە لە دوای ئەو مەرگەتان بۆ ئەوەی سوپاسگوزاری بکەن.

﴿وَظَلَّلْنَا عَلَيْكُمُ ٱلْغَمَامَ وَأَنزَلْنَا عَلَيْكُمُ ٱلْمَنَّ وَٱلسَّلْوَىٰ ۖ كُلُوا۟ مِن طَيِّبَٰتِ مَا رَزَقْنَٰكُمْ ۖ وَمَا ظَلَمُونَا وَلَٰكِن كَانُوٓا۟ أَنفُسَهُمْ يَظْلِمُونَ﴿٥٧﴾﴾

واتە: (هەروەها) لە نازونیعمەتەکانی خوا بۆتان ئەوەیە: ئێمە هەوورمان بۆ کردن بەسێبەر و گەزۆمان بۆ باراندن و پەلەوەری شەلاقەمان بۆ ناردن، دە بخۆن لەو ڕزق و ڕۆزییە چاکانەی کە پێمان بەخشیوون (بەڵام لەبەر بێ دینی و ستەمیان تۆڵەمان لێسەندن)، جا وە نەبێت ئەوانە ستەمیان لە ئێمە کردبێت بەڵکو هەر ستەمیان لە خۆیان دەکرد.

﴿وَإِذْ قُلْنَا ٱدْخُلُوا۟ هَٰذِهِ ٱلْقَرْيَةَ فَكُلُوا۟ مِنْهَا حَيْثُ شِئْتُمْ رَغَدًا وَٱدْخُلُوا۟ ٱلْبَابَ سُجَّدًا وَقُولُوا۟ حِطَّةٌ نَّغْفِرْ لَكُمْ خَطَٰيَٰكُمْ ۚ وَسَنَزِيدُ ٱلْمُحْسِنِينَ﴿٥٨﴾﴾

واتە: یادی ئەو نیعمەتە بکەنەوە کاتێک وتمان: بچنە ئەم شارەوە (کە قودسە)، جا هەرچی حەزی لێدەکەن لەوێ لە هەر جێگەیەکی بە فراوانی و خۆشی بیخۆن، لە دەروازەی شارەکە بەرێز و کڕنووشی (پێزانینەوە) بچنە ژورەوە و بڵێن: خوایە لە تاوانەکانمان ببوورە، ئەو کاتە ئێمەش لە هەڵە و تاوانەکانتان دەبوورین، ئێمە پاداشتی چاکەکاران لە ئاییندەدا زۆر بە زیادەوە دەدەینەوە.



﴿فَبَدَّلَ ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ قَوْلًا غَيْرَ ٱلَّذِى قِيلَ لَهُمْ فَأَنزَلْنَا عَلَى ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ رِجْزًا مِّنَ ٱلسَّمَآءِ بِمَا كَانُواْ يَفْسُقُونَ ﴿٥٩﴾﴾

واتە: کەچی ئەوانەی ستەمیان کردبوو یەکسەر گوفتارەکەیان گۆڕی بەشتێک بێجگە لەوەی پێیان وترا بوو (واتە بە لوتبەرزیەوە چوونە ژوورەوە)، جا ئێمەش لە ئاسمانەوە سزایەکمان دابەزاندە سەر ئەوانەی ستەمیان کرد بەهۆی ئەوەی لە فەرمانی خوا دەردەچوون.

﴿۞ وَإِذِ ٱسْتَسْقَىٰ مُوسَىٰ لِقَوْمِهِۦ فَقُلْنَا ٱضْرِب بِّعَصَاكَ ٱلْحَجَرَ ۖ فَٱنفَجَرَتْ مِنْهُ ٱثْنَتَا عَشْرَةَ عَيْنًا ۖ قَدْ عَلِمَ كُلُّ أُنَاسٍ مَّشْرَبَهُمْ ۖ كُلُواْ وَٱشْرَبُواْ مِن رِّزْقِ ٱللَّهِ وَلَا تَعْثَوْاْ فِى ٱلْأَرْضِ مُفْسِدِينَ ﴿٦٠﴾﴾

واتە: یادی ئەو نیعمەتە بکەنەوە کاتێک مووسا بۆ قەوم و گەلەکەی خۆی داوای بارینی بارانی کرد، ئێمەش پێمان وت: بە گۆچانەکەت بدە بە (تاشە) بەردەکەدا (جا هەر کە ئەو کارەی ئەنجامدا) بەردەکە دوانزە کانی لێهەڵقولا، بێگومان هەر هۆزێک چاوگەی خۆی ناسی (ئینجا پێمان وتن) دە بخۆن و بخۆنەوە لە ڕزق و ڕۆزی و بەخششی خوا و تاوان و خراپە مەکەن لەسەر زەویدا لە کاتێکدا کە بەچاندنی تۆوی خراپەوە خەریکن.

﴿وَإِذْ قُلْتُمْ يَـٰمُوسَىٰ لَن نَّصْبِرَ عَلَىٰ طَعَامٍ وَٰحِدٍ فَٱدْعُ لَنَا رَبَّكَ يُخْرِجْ لَنَا مِمَّا تُنۢبِتُ ٱلْأَرْضُ مِنۢ بَقْلِهَا وَقِثَّآئِهَا وَفُومِهَا وَعَدَسِهَا وَبَصَلِهَا ۖ قَالَ أَتَسْتَبْدِلُونَ ٱلَّذِى هُوَ أَدْنَىٰ بِٱلَّذِى هُوَ خَيْرٌ ۚ ٱهْبِطُواْ مِصْرًا فَإِنَّ لَكُم مَّا سَأَلْتُمْ ۗ وَضُرِبَتْ عَلَيْهِمُ ٱلذِّلَّةُ وَٱلْمَسْكَنَةُ وَبَآءُو بِغَضَبٍ مِّنَ ٱللَّهِ ۗ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ كَانُواْ يَكْفُرُونَ بِـَٔايَـٰتِ ٱللَّهِ وَيَقْتُلُونَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ بِغَيْرِ ٱلْحَقِّ ۗ ذَٰلِكَ بِمَا عَصَواْ وَّكَانُواْ يَعْتَدُونَ ﴿٦١﴾﴾

واتە: یادی ئەو نیعمەتە بکەنەوە کاتێک بە مووساتان وت: ئێمە هەرگیز لەسەر یەک جۆر خۆراک ئۆقرە ناگرین و بەتەنها جۆرێک خواردەمەنی ڕازی نین، لەبەرئەوە داوا لە پەروەردگارت بکە لە ڕزق و ڕۆزی و بەروبوومی زەویمان بۆ بەرهەم بهێنێت لە ڕووەکی پاقلەیی و خەیار و سیرو نیسک و پیاز، مووسا پێی وتن: باشە چۆن ئێوە شتی کەم و ئایەخ و ناتەواو وەردەگرن لەجیاتی شتی لەو چاکتر و باشتر؟ دە دابەزن بۆ شارێک (بیابانی سینا، بەجێبهێڵن) ئینجا بەڕاستی ئەوەی داوای دەکەن دەستتان دەکەوێت. (جا بەهۆی ئەو بیروباوەڕو بیانوو گرتن و لاسارییەیانەوە) سووکیی و ڕیسوایی و لاتی و زەبوونی درا بەسەریاندا و شایانی خەشم و قینی خوایش بوون، چونکە ئەوان بەڕاستی باوەڕیان نەدەکرد



بەئایەتەکانی خوا و پێغەمبەرەکانیان بەناحەق دەکوشت، ئەوەش بەهۆی ڕۆچوونیانەوە لەیاخی بوون و نافەرمانیدا، هەمیشە دەستدرێژیان دەکرد (ئێستەش بەردەوامن لەسەر بەرنامەی باو و باپیرانی خوانەناسیان).

﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَٱلَّذِينَ هَادُواْ وَٱلنَّصَٰرَىٰ وَٱلصَّٰبِـِٔينَ مَنْ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِ وَعَمِلَ صَٰلِحًا فَلَهُمْ أَجْرُهُمْ عِندَ رَبِّهِمْ وَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ۝﴾

واتە: بێگومان ئەوانەی باوەڕیان هێناوە (لە ئوممەتی محمد)، ئەوانەش بوونەتە جوولەکە (شوێنکەوتەی ڕاستەقینەی مووسان)، گاورەکانیش (کە شوێنکەوتەی ڕاستەقینەی عیسان)، (صابئە)ش (کە شوێنکەوتەی ڕاستەقینەی داودن)، ئەوانە هەر دەستەیەکیان باوەڕی دامەزراوی هێنا بێت بەخوا و ڕۆژی دوایی و کار و کردەوەی چاکەی ئەنجام دابێت، جا ئەوانە پاداشتیان لای پەروەردگاریانە، نە ترس و بیمیان دەبێت، نەغەم و پەژارەش ڕوویان تێدەکات.

﴿وَإِذْ أَخَذْنَا مِيثَٰقَكُمْ وَرَفَعْنَا فَوْقَكُمُ ٱلطُّورَ خُذُواْ مَآ ءَاتَيْنَٰكُم بِقُوَّةٍ وَٱذْكُرُواْ مَا فِيهِ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ۝﴾

واتە: یادی ئەو نیعمەتەش بکەنەوە کاتێک پەیمانمان لێوەرگرتن (کە پەیڕەوی تەورات بکەن) و کێوی طورمان بەڕاسەرتانەوە ڕاگرت و پێمان وتن: ئەو بەرنامەیەی پێمانداون بە توند بیگرن (ئەگینا ئەم چیایە دەدەین بەسەرتاندا)، هەمیشەش با لە بیرتان بێت چی تێدایە و چیتان لێدەخوازێت، بۆ ئەوەی لە خوا ترس و پارێزکاربن.

﴿ثُمَّ تَوَلَّيْتُم مِّنۢ بَعْدِ ذَٰلِكَ فَلَوْلَا فَضْلُ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَتُهُۥ لَكُنتُم مِّنَ ٱلْخَٰسِرِينَ۝﴾

واتە: کەچی پاش هەموو ئەوانە ڕووتان وەرچەرخاند لە ڕێبازی خوا، (پەیمانەکەتان شکاند)، ئەو کاتە ئەگەر بەزەیی و یارمەتی و فەزڵی خوا نەبوایە لە سەرتان، ئەوە دەچوونە ڕیزی خەسارەتمەندانەوە.

﴿وَلَقَدْ عَلِمْتُمُ ٱلَّذِينَ ٱعْتَدَوْاْ مِنكُمْ فِى ٱلسَّبْتِ فَقُلْنَا لَهُمْ كُونُواْ قِرَدَةً خَٰسِـِٔينَ۝﴾

واتە: سوێند بەخوا بێگومان زانیوتانە و ئاگادارن چیمان بەسەر ئەوانەتاندا هێنا ڕۆژانی شەممە دەستدرێژییان دەکرد و لە سنوور دەردەچوون، (لەبەر ئەوە بڕیارماندا)و وتمان: ببنە مەیموونی دوورخراوە لە ڕەحمەتی خوا (بڕیار بوو جوولەکەکانی شارەکەی قەراغ دەریا - ئیلیە - ڕۆژانی شەممە تەرخان بکەن بۆ خواپەرستی و ڕاوەماسی تیادا نەکەن، دیارە ماسییەکانیش هەستیان بەوە کردووە، بۆیە لەو ڕۆژەدا خۆیان نواندووە، جوولەکەش



بەسروشت زۆر بەتەماعن، بیریان کردەوە لە تەگبیر و فێڵێک، ئەویش بەوەی کە لە ڕۆژی هەینیدا داو و تۆڕیان بۆ بنێنەوە تا لە شەممەدا تێی بکەون، ڕۆژی یەکشەممە چی کەوتۆتە داو و تۆڕەکانەوە دەری بهێنن (لە تەفسیری ئایەتی ١٦٣ تا ١٦٦، لە سورەتی الأعراف دا ئەم ڕووداوە باسکراوە.

﴿فَجَعَلْنَـٰهَا نَكَـٰلًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهَا وَمَا خَلْفَهَا وَمَوْعِظَةً لِّلْمُتَّقِينَ﴿٦٦﴾﴾

واتە: ئینجا ئەو بە مەیموون کردنەمان گێڕا بە پەندو عیبرەت بۆ ئەوانەی کە: هاوچەرخی ڕووداوەکە بوون و بۆ ئەوانەش لەدوای ئەوان دێن، هەروەها کردمانە ئامۆژگاری بۆ خواناس و پارێزکاران.

﴿وَإِذْ قَالَ مُوسَىٰ لِقَوْمِهِۦٓ إِنَّ ٱللَّهَ يَأْمُرُكُمْ أَن تَذْبَحُوا۟ بَقَرَةً ۖ قَالُوٓا۟ أَتَتَّخِذُنَا هُزُوًا ۖ قَالَ أَعُوذُ بِٱللَّهِ أَنْ أَكُونَ مِنَ ٱلْجَـٰهِلِينَ﴿٦٧﴾﴾

واتە: یادی ئەو نیعمەتە بکەنەوە کاتێک مووسا بە قەومەکەی وت: بێگومان خوا فەرمانتان پێدەدات کە مانگایەک سەر ببڕن (کاتێک یەکێکیان لێ کوژرا بوو، بکوژەکەش لای زۆربەیان نادیاربوو، هانا و هاواریان برد بۆ مووسا) وتیان: ئایا دەمانکەیتە گاڵتەجاڕی خۆت؟ مووسا وتی: پەنا دەگرم بە خوا بچمە ڕیزی نەفامانەوە (گاڵتە بە خەڵکی بکەم).

﴿قَالُوا۟ ٱدْعُ لَنَا رَبَّكَ يُبَيِّن لَّنَا مَا هِىَ ۚ قَالَ إِنَّهُۥ يَقُولُ إِنَّهَا بَقَرَةٌ لَّا فَارِضٌ وَلَا بِكْرٌ عَوَانٌۢ بَيْنَ ذَٰلِكَ ۖ فَٱفْعَلُوا۟ مَا تُؤْمَرُونَ﴿٦٨﴾﴾

واتە: ئینجا وتیان: (جا کەوایە) لە پەروەردگارت داوا بکە بۆمان ڕوون بکاتەوە ئەو مانگایە کامەیە؟ مووسا وتی: بەڕاستی خوا دەفەرموێت: ئەو مانگایە نە پیرە و نە پارێنە بەڵکو میانە ساڵە، (ئیتر ئەوەندە قووڵی مەکەنەوە و لەسەری مەڕۆن) چ فەرمانێکتان پێدراوە جێبەجێی بکەن.

﴿قَالُوا۟ ٱدْعُ لَنَا رَبَّكَ يُبَيِّن لَّنَا مَا لَوْنُهَا ۚ قَالَ إِنَّهُۥ يَقُولُ إِنَّهَا بَقَرَةٌ صَفْرَآءُ فَاقِعٌ لَّوْنُهَا تَسُرُّ ٱلنَّـٰظِرِينَ﴿٦٩﴾﴾

واتە: کەچی وتیان: لە پەروەردگارت داوا بکە بزانین ڕەنگی چۆنە؟ مووسا وتی: بێگومان خوا دەفەرموێت: ئەو مانگایە مانگایەکی ڕەنگ زەردی تۆخە، تەماشاکەرانی دڵخۆش دەکات.



﴿قَالُواْ ٱدْعُ لَنَا رَبَّكَ يُبَيِّن لَّنَا مَا هِيَ إِنَّ ٱلْبَقَرَ تَشَٰبَهَ عَلَيْنَا وَإِنَّآ إِن شَآءَ ٱللَّهُ لَمُهْتَدُونَ ٧٠﴾

**واتە: کەچی هەر وتیان: لە پەروەردگارت داوا بکە تا بەتەواوی بۆمان ڕوون بکاتەوە بزانین ئەم مانگایە چۆن مانگایەکە؟! چونکە بەڕاستی ئەو مانگایەمان بۆ نادۆزرێتەوە، ئەگەر خوا ویستی لەسەر بێت دەیدۆزینەوە و ڕێمان لێی دەکەوێت.**

﴿قَالَ إِنَّهُۥ يَقُولُ إِنَّهَا بَقَرَةٌ لَّا ذَلُولٌ تُثِيرُ ٱلْأَرْضَ وَلَا تَسْقِى ٱلْحَرْثَ مُسَلَّمَةٌ لَّا شِيَةَ فِيهَا قَالُواْ ٱلْـَٰٔنَ جِئْتَ بِٱلْحَقِّ فَذَبَحُوهَا وَمَا كَادُواْ يَفْعَلُونَ ٧١﴾

**واتە: مووسا وتی: خوا دەفەرموویت: ئەو مانگایە هێشتا ڕانەهێنراوە، بۆ جووت کردن و زەوی کێڵان، وە ئاو دێری کشتووکاڵی پێنەکراوە، یەک ڕەنگە و پەڵە پەڵە نییە، ئەوسا وتیان: ئایا ئێستە ئیتر هەواڵی ڕاستەقینەت پێداین، (ئیتر دوای هەوڵ و کۆششێکی زۆر بەدەستیان هێنا) و سەریان بڕی، هەرچەندە خەریک بوو ئەو کارە نەکەن.**

﴿وَإِذْ قَتَلْتُمْ نَفْسًا فَٱدَّٰرَْٰٔتُمْ فِيهَا وَٱللَّهُ مُخْرِجٌ مَّا كُنتُمْ تَكْتُمُونَ ٧٢﴾

**واتە: (بیرتانە) چۆن کەسێکتان کوشت و ئاژاوە لە نێوانتانا بەرپا بوو، خوایش ئەوەی دەتانشاردەوە دەریخست پێتان و ئاشکرای کرد (کە بکوژ کێیە).**

﴿فَقُلْنَا ٱضْرِبُوهُ بِبَعْضِهَا كَذَٰلِكَ يُحْيِ ٱللَّهُ ٱلْمَوْتَىٰ وَيُرِيكُمْ ءَايَٰتِهِۦ لَعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ ٧٣﴾

**واتە: ئەوجا وتمان: پارچەیەک لەو مانگا سەربڕاوە بدەن بە لاشەی کوژراوەکەدا (دیارە بە ویستی خوا کوژراوەکە زیندووبۆتەوە و ڕاستی بکوژەکەی خۆی وتووە)، جا ئابەو شێوەیە خوا بەئاسانی مردوان زیندو دەکاتەوە و دەسەڵاتی خۆیتان نیشان دەدات بەڵکو تێبگەن و ژیر بن.**

﴿ثُمَّ قَسَتْ قُلُوبُكُم مِّنۢ بَعْدِ ذَٰلِكَ فَهِيَ كَٱلْحِجَارَةِ أَوْ أَشَدُّ قَسْوَةً وَإِنَّ مِنَ ٱلْحِجَارَةِ لَمَا يَتَفَجَّرُ مِنْهُ ٱلْأَنْهَٰرُ وَإِنَّ مِنْهَا لَمَا يَشَّقَّقُ فَيَخْرُجُ مِنْهُ ٱلْمَآءُ وَإِنَّ مِنْهَا لَمَا يَهْبِطُ مِنْ خَشْيَةِ ٱللَّهِ وَمَا ٱللَّهُ بِغَٰفِلٍ عَمَّا تَعْمَلُونَ ٧٤﴾

**کەچی لەوەو دوا دڵەکانتان ڕەق بوو (ئەی جولەکەکان) هەروەک بەرد، بەڵکو ڕەقتریش (چونکە) بەڕاستی بەرد هەیە کە ڕووباری لێهەڵدەقوڵێ، هەشیانە لەت لەت دەبێ و ئاوی لێ دێتە دەرەوە، هەشیانە لە ترسی خوا لوتکەی شاخەکان بەردەبێتەوە، خوایش بێئاگا نییە لەو کار و کردەوانەی ئەنجامی دەدەن.**



﴿۞ أَفَتَطْمَعُونَ أَن يُؤْمِنُواْ لَكُمْ وَقَدْ كَانَ فَرِيقٌ مِّنْهُمْ يَسْمَعُونَ كَلَـٰمَ ٱللَّهِ ثُمَّ يُحَرِّفُونَهُۥ مِنۢ بَعْدِ مَا عَقَلُوهُ وَهُمْ يَعْلَمُونَ ﴿٧٥﴾﴾

واتە:ئایا ئێوە (ئەی گرۆی ئیمانداران) بەتەمان و ئومێدەوارن کە جوولەکە ئیمان و باوەڕ بێنن بە ئایینەکەی ئێوە، لە کاتێکدا کە دەستەیەک لە شارەزاکانیان گوفتاری خوایان دەبیست لە (تەورات)دا، لەوەودوا دەستکاریان دەکرد دوای ئەوەی کە تێیگەیشتبوون و دەیانزانی ڕاستییەکەی چییە.

﴿وَإِذَا لَقُواْ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ قَالُوٓاْ ءَامَنَّا وَإِذَا خَلَا بَعْضُهُمْ إِلَىٰ بَعْضٍ قَالُوٓاْ أَتُحَدِّثُونَهُم بِمَا فَتَحَ ٱللَّهُ عَلَيْكُمْ لِيُحَآجُّوكُم بِهِۦ عِندَ رَبِّكُمْ أَفَلَا تَعْقِلُونَ ﴿٧٦﴾﴾

واتە: هەرکاتێ (جووەکان) تووشی ئیمانداران دەهاتن دەیانوت: ئێمەش ئیمانمان هێناوە و (موسڵمان بووین)، بەڵام کاتێک کە پێکەوە کۆدەبوونەوە (ئەوانەی کە لە سەر ئایینی خۆیان مابوونەوە) بەوانی تریان دەوت ئەرێ ئەوە بۆ ئێوە ئەو شتانەیان بۆ باس دەکەن کە خوا بۆ ئێوەی لە (تەورات)دا باس کردووە (دەربارەی پێغەمبەرایەتی محمد ﷺ) تاوەکو بیکەنە بەڵگە بەسەرتانەوە لای پەروەردگار! ئایا ئێوە عەقڵتان بەو جۆرە شتانە ناشکێت و ژیریتان ناخەنەکار؟!

﴿أَوَلَا يَعْلَمُونَ أَنَّ ٱللَّهَ يَعْلَمُ مَا يُسِرُّونَ وَمَا يُعْلِنُونَ ﴿٧٧﴾﴾

واتە: ئایا مەگەر ئەوانە نازانن کە خوا دەزانێ چی پەنهان دەکەن و چیش ئاشکرا دەکەن؟

﴿وَمِنْهُمْ أُمِّيُّونَ لَا يَعْلَمُونَ ٱلْكِتَـٰبَ إِلَّآ أَمَانِىَّ وَإِنْ هُمْ إِلَّا يَظُنُّونَ ﴿٧٨﴾﴾

واتە: هەندێک لەوانە نەشارەزا و نەخوێندەوارن، وا دەزانن (تەورات) جگە لە چەند ئاوات و هیوایەک هیچی تر نییە، ئەوانە هەر گومانیان کردۆتە پیشەی خۆیان.

﴿فَوَيْلٌ لِّلَّذِينَ يَكْتُبُونَ ٱلْكِتَـٰبَ بِأَيْدِيهِمْ ثُمَّ يَقُولُونَ هَـٰذَا مِنْ عِندِ ٱللَّهِ لِيَشْتَرُواْ بِهِۦ ثَمَنًا قَلِيلًا فَوَيْلٌ لَّهُم مِّمَّا كَتَبَتْ أَيْدِيهِمْ وَوَيْلٌ لَّهُم مِّمَّا يَكْسِبُونَ ﴿٧٩﴾﴾

واتە: واوەیلا لەو کەسانەی کە کتێب دەنووسن بە دەستی خۆیان و دەڵێن: ئا ئەمە لەلایەن خواوەیە، تا کەمێک لە ماڵی دنیا بەدەست بهێنن. جا وەیل بۆ ئەو دەست و (قەڵەمانەی) کە شتی وا دەنووسن، وەیل بۆ ئەو کەسانەی کە کەسابەتی ئاوا ئەنجام دەدەن.



﴿وَقَالُواْ لَن تَمَسَّنَا ٱلنَّارُ إِلَّآ أَيَّامًا مَّعۡدُودَةً قُلۡ أَتَّخَذۡتُمۡ عِندَ ٱللَّهِ عَهۡدًا فَلَن يُخۡلِفَ ٱللَّهُ عَهۡدَهُۥٓۖ أَمۡ تَقُولُونَ عَلَى ٱللَّهِ مَا لَا تَعۡلَمُونَ۝٨٠﴾

واتە: جوولەکەکان دەڵێن: (چەندە گوناحبار بین) تەنها چەند ڕۆژێکی کەم لە دۆزەخدا دەمێنینەوە! پێیان بڵێ: باشە ئێوە پەیمانتان لەخوا وەرگرتووە تا خوای گەورە پەیمانەکەیتان بۆ بەرێتە سەر؟! یا هەر دەتانەوێت شتێک بڵێن بەدەم خواوە کە هیچ بناغەیەکی نییە و هەر نازانن (چی دەڵێن)!

﴿بَلَىٰۚ مَن كَسَبَ سَيِّئَةً وَأَحَٰطَتۡ بِهِۦ خَطِيٓـَٔتُهُۥ فَأُوْلَٰٓئِكَ أَصۡحَٰبُ ٱلنَّارِۖ هُمۡ فِيهَا خَٰلِدُونَ۝٨١﴾

واتە: (چاک بزانن)، ئەو کەسە گوناح و تاوان ئەنجام بدات و تاوانەکانی هەموو لایەکی دابگرێت (ئاشکراو نادیاری) ئەو جۆرە کەسانە نیشتەجێی ئاگری دۆزەخن و بۆ هەمیشەیی تیایدا دەمێننەوە (لە هەر هۆز و تیرە و تایەفەیەک بن).

﴿وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ أُوْلَٰٓئِكَ أَصۡحَٰبُ ٱلۡجَنَّةِۖ هُمۡ فِيهَا خَٰلِدُونَ۝٨٢﴾

واتە: ئەو کەسانەش کە باوەڕیان هێناوە و کار و کردەوەی چاکە ئەنجام دەدەن، ئەوانە خاوەن و نیشتەجێی بەهەشتن و تیایدا ژیانی هەتاهەتایی دەبەنە سەر (لە هەر چین و توێژ و ڕەگەزێک بن)

﴿وَإِذۡ أَخَذۡنَا مِيثَٰقَ بَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ لَا تَعۡبُدُونَ إِلَّا ٱللَّهَ وَبِٱلۡوَٰلِدَيۡنِ إِحۡسَانًا وَذِي ٱلۡقُرۡبَىٰ وَٱلۡيَتَٰمَىٰ وَٱلۡمَسَٰكِينِ وَقُولُواْ لِلنَّاسِ حُسۡنًا وَأَقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتُواْ ٱلزَّكَوٰةَ ثُمَّ تَوَلَّيۡتُمۡ إِلَّا قَلِيلًا مِّنكُمۡ وَأَنتُم مُّعۡرِضُونَ۝٨٣﴾

واتە: (لەبیرتانە) کاتێک کە پەیمانمان وەرگرت لە نەوەی ئیسرائیل کە جگە لە خوا کەسی تر نەپەرستن و لەگەڵ دایک و باوک دا چاکەکار بن، هەروەها لە خزمان و هەتیوان و هەژارانیشدا. گوفتاری چاک و جوان بۆ خەڵکی بڵێن، هەروەها نوێژەکانتان بەچاکی ئەنجام بدەن و زەکاتیش ببەخشن، کەچی ئێوە (لەجیاتی گوێڕایەڵی) پشتتان تێکرد، جگە لە کەمێکتان نەبێ، ئەگینا زۆربەتان ڕووتان (لەو هەموو ئامۆژگارییە بەسوودانە) وەرچەرخاند.



﴿وَإِذْ أَخَذْنَا مِيثَـٰقَكُمْ لَا تَسْفِكُونَ دِمَآءَكُمْ وَلَا تُخْرِجُونَ أَنفُسَكُم مِّن دِيَـٰرِكُمْ ثُمَّ أَقْرَرْتُمْ وَأَنتُمْ تَشْهَدُونَ﴿٨٤﴾﴾

واتە: (لەبیرتانە) کاتێک کە پەیمانمان لە ئێوە وەرگرت کە ئیتر خوێنی یەکتر نەڕێژن، یەکتر لە ماڵوحاڵی خۆتان دەربەدەر نەکەن، بڕیاریشتان لەسەر ئەوە داو خۆیشتان شایەت بوون.

﴿ثُمَّ أَنتُمْ هَـٰٓؤُلَآءِ تَقْتُلُونَ أَنفُسَكُمْ وَتُخْرِجُونَ فَرِيقًا مِّنكُم مِّن دِيَـٰرِهِمْ تَظَـٰهَرُونَ عَلَيْهِم بِٱلْإِثْمِ وَٱلْعُدْوَٰنِ وَإِن يَأْتُوكُمْ أُسَـٰرَىٰ تُفَـٰدُوهُمْ وَهُوَ مُحَرَّمٌ عَلَيْكُمْ إِخْرَاجُهُمْ ۚ أَفَتُؤْمِنُونَ بِبَعْضِ ٱلْكِتَـٰبِ وَتَكْفُرُونَ بِبَعْضٍ ۚ فَمَا جَزَآءُ مَن يَفْعَلُ ذَٰلِكَ مِنكُمْ إِلَّا خِزْىٌ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا ۖ وَيَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ يُرَدُّونَ إِلَىٰٓ أَشَدِّ ٱلْعَذَابِ ۗ وَمَا ٱللَّهُ بِغَـٰفِلٍ عَمَّا تَعْمَلُونَ﴿٨٥﴾﴾

واتە: کەچی ئەوەتە ئێوە (ئاماژەیە بۆ جوولەکەکانی سەردەمی پێغەمبەر صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّم) خەریکی یەکتر کوشتنن، دەستەیەک لە (خزمانی) خۆتان لە ماڵ و حاڵی خۆیان دەربەدەر دەکەن و پیلان دەگێڕن دژ بە دەستەیەکتان تاوان و دوژمنایەتی دەنوێنن، کەچی ئەگەر بە دیل دەستگیریان بکەن بە فیدیە ئازادیان دەکەنەوە، لە حاڵێکدا دەربەدەرکردنەکەیان لەسەرتان حەڕامە، (ئیتر چۆن فیدیە وەردەگرن)؟ کەوابوو چۆن دەبێت باوەڕتان بە بەشێکی (تەورات) هەبێت و بە بەشێکی تری نەبێت؟ ئایا پاداشتی ئەوەتان کە ئە کارە دەکات جگە لە سەرشۆڕیی و سووکی نەبێت لە ژیانی دونیادا هیچی تر هەیە؟ لە ڕۆژی قیامەتیشدا دەگەڕێتەوە بۆ ناو سەختترین سزا، خوایش بێ ئاگا نییە لەو کارانەی ئێوە ئەنجامی دەدین.

﴿أُو۟لَـٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ ٱشْتَرَوُا۟ ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَا بِٱلْـَٔاخِرَةِ ۖ فَلَا يُخَفَّفُ عَنْهُمُ ٱلْعَذَابُ وَلَا هُمْ يُنصَرُونَ﴿٨٦﴾﴾

واتە: ئەمانە ئەوانەن کە ژیانی (بەهەشت)و ڕۆژی دواییان فرۆشتوە و گۆڕیویانەتەوە بە ژیانی دنیا، لەبەر ئەوە سزایان لەسەر کەم ناکرێتەوە و ئەوانە هەرگیز یارمەتی نادرێن و سەرناخرێن.



﴿وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا مُوسَى ٱلْكِتَٰبَ وَقَفَّيْنَا مِنۢ بَعْدِهِۦ بِٱلرُّسُلِ ۖ وَءَاتَيْنَا عِيسَى ٱبْنَ مَرْيَمَ ٱلْبَيِّنَٰتِ وَأَيَّدْنَٰهُ بِرُوحِ ٱلْقُدُسِ ۗ أَفَكُلَّمَا جَآءَكُمْ رَسُولٌۢ بِمَا لَا تَهْوَىٰٓ أَنفُسُكُمُ ٱسْتَكْبَرْتُمْ فَفَرِيقًا كَذَّبْتُمْ وَفَرِيقًا تَقْتُلُونَ ﴿٨٧﴾﴾.

واتە: بەڕاستی ئێمە تەوراتمان بەخشی بە مووسا و بەردەوام دوای ئەویش پێغەمبەرانمان ڕەوانە کرد، عیسای کوڕی مەریەم بەڵگە و نیشانە و (معجزة) جۆراوجۆرمان بەخشی و پشتگیریمان کرد بە فریشتە (جبرئیل)، باشە ئایا (ئەمە ڕاستە) هەر کاتێک پێغەمبەرێکمان ڕەوانە کردبێت، بەڵام لەگەڵ ئارەزووەکانی ئێوەدا نەگونجا بێ، خۆتان بە زل زانیوە و لووتتان بەرز کردۆتەوە و بڕواتان نەهێناوە، ئەوجا دەستەیەکتان (پێغەمبەرەکانتان) بە درۆ خستۆتەوە و هەندێکیشتان (لەو ئادەمیزادە بەڕێزانەتان) دەکوشت.

﴿وَقَالُوا۟ قُلُوبُنَا غُلْفٌۢ ۚ بَل لَّعَنَهُمُ ٱللَّهُ بِكُفْرِهِمْ فَقَلِيلًا مَّا يُؤْمِنُونَ ﴿٨٨﴾﴾.

واتە: (جوولەکەکانی سەردەمی پێغەمبەر صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ) وتیان: دڵەکانمان داخراوە (لە گوفتاری تۆ، تێناگەین، ئەوە وانییە) بەڵکو ئەوانە خوا نەفرینی لێکردوون بەهۆی کوفر و خوا نەناسییانەوە، زۆر کەم ئیمان دەهێنن و باوەڕ دەکەن.

﴿وَلَمَّا جَآءَهُمْ كِتَٰبٌ مِّنْ عِندِ ٱللَّهِ مُصَدِّقٌ لِّمَا مَعَهُمْ وَكَانُوا۟ مِن قَبْلُ يَسْتَفْتِحُونَ عَلَى ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ فَلَمَّا جَآءَهُم مَّا عَرَفُوا۟ كَفَرُوا۟ بِهِۦ ۚ فَلَعْنَةُ ٱللَّهِ عَلَى ٱلْكَٰفِرِينَ ﴿٨٩﴾﴾.

واتە: کاتێک کە لەلایەن خواوە کتێبێک (قورئان) هات بۆیان، کە: ئەو کتێبانەی ئەوانیش پەسەند دەکات و بەڕاستی دەزانی، بەمەرجێ پێشتر مژدەیان دەدا (بەهاتنی پێغەمبەر) بەو خەڵکەی کە خوانەناس و بێباوەڕ بوون، کەچی کاتێک (ئەو پێغەمبەرەیان) بۆ هات کە دەیناسن، بڕوایان پێ نەکرد، کەواتە با نەفرین و لەعنەتی خوا لەسەر کافران بێت.

﴿بِئْسَمَا ٱشْتَرَوْا۟ بِهِۦٓ أَنفُسَهُمْ أَن يَكْفُرُوا۟ بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ بَغْيًا أَن يُنَزِّلَ ٱللَّهُ مِن فَضْلِهِۦ عَلَىٰ مَن يَشَآءُ مِنْ عِبَادِهِۦ ۖ فَبَآءُو بِغَضَبٍ عَلَىٰ غَضَبٍ ۚ وَلِلْكَٰفِرِينَ عَذَابٌ مُّهِينٌ ﴿٩٠﴾﴾.

واتە: (ئەو جوولەکانە) خۆیان بە شتێکی ناپەسەند فرۆشت (هەڵوێستێکی نادروستیان نواند) کاتێک کە کافرن بوون بەو (قورئانەی) خوا ناردوویەتی، (لە حەسوودی) و سەرکەشی دا (ڕەخنەیان گرت و وتیان): بۆچی خوای گەورە دەرگای فەزڵ و لای ڕەحمەت دەکاتەوە لە هەر کەسێک کە بیەوێت لە بەندەکانی، ئەوسا ئیتر دووچاری یەک لەسەر یەکی ڕق و خەشمی خوا بوون (چونکە وەنەبێ تەنها کافر بووبن بە محمد صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ و بە قورئان،



بەڵکو کافر بوون بە مووسا و تەوراتیش کە داوای شوێنکەوتنی محمدیان لێ دەکات) بۆ کافر و خوا نەناسەکان سزایەکی ڕیسواکەر ئامادەیە.

﴿وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ ءَامِنُوا۟ بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ قَالُوا۟ نُؤْمِنُ بِمَآ أُنزِلَ عَلَيْنَا وَيَكْفُرُونَ بِمَا وَرَآءَهُۥ وَهُوَ ٱلْحَقُّ مُصَدِّقًا لِّمَا مَعَهُمْ ۗ قُلْ فَلِمَ تَقْتُلُونَ أَنۢبِيَآءَ ٱللَّهِ مِن قَبْلُ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ﴾

واتە: (ئەوانە) کە پێیان دەوترێ باوەڕ بێنن بەوەی کە لەلایەن خواوە ڕەوانە کراوە، دەڵێن: ئێمە تەنها باوەڕمان بەوە هەیە کە بۆ ئێمە ڕەوانە کراوە، باوەڕیان نییە بە هەموو ئەوانەی کە لە دوای (تەورات) هاتووە وەکو (ئینجیل و قورئان) لە کاتێکدا کە ئەو قورئانە حەق و ڕاستیە و بە ڕاستدانەری (تەورات)ی ئەوانیشە، پێیان بڵێ: ئەی کەواتە بۆچی پێشتر پێغەمبەرەکانی خواتان دەکوشت ئەگەر ئێوە ئیماندارن.

﴿۞ وَلَقَدْ جَآءَكُم مُّوسَىٰ بِٱلْبَيِّنَـٰتِ ثُمَّ ٱتَّخَذْتُمُ ٱلْعِجْلَ مِنۢ بَعْدِهِۦ وَأَنتُمْ ظَـٰلِمُونَ﴾

واتە: بەڕاستی مووسا نیشانەی فرە و (معجزة)ی زۆری نیشاندان، کەچی (کاتێک کە چوو بۆ نزای پەروەردگار، لە کێوی طور) ئێوە گوێرەکەتان پەرست و ستەمێکی ناڕەواتان کرد.

﴿وَإِذْ أَخَذْنَا مِيثَـٰقَكُمْ وَرَفَعْنَا فَوْقَكُمُ ٱلطُّورَ خُذُوا۟ مَآ ءَاتَيْنَـٰكُم بِقُوَّةٍ وَٱسْمَعُوا۟ ۖ قَالُوا۟ سَمِعْنَا وَعَصَيْنَا وَأُشْرِبُوا۟ فِى قُلُوبِهِمُ ٱلْعِجْلَ بِكُفْرِهِمْ ۚ قُلْ بِئْسَمَا يَأْمُرُكُم بِهِۦٓ إِيمَـٰنُكُمْ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ﴾.

واتە: (بیرتانە) کاتێک کە پەیمانمان لێوەرگرتن و کێوی طورمان بەسەردا بەرزکردنەوە و (فەرمانمان پێدان): ئەوەی پێمان بەخشیوون لە (تەورات) بەتوندی بیگرن و لێی لامەدەن و گوێ ڕایەڵ بن، (بەدەم) وتیان: گوێ ڕایەڵین، (بەڵام بەکردەوە) پێچەوانەیان کرد، گوێرەکە پەرستی تێکەڵی دڵ و دەروونیان بووبوو بەهۆی بێباوەڕیانەوە، پێیان بڵێ: (ئەگەر وا بێت) ئیمانەکەتان شتی ناڕەواتان پێ دەڵێت ئەگەر ئیمانداران؟! (باو و باپیران گوێرەکە پەرست و پێغەمبەر کوژ بوون و ئێوەش سەرسەخت و بێباوەڕن).



﴿قُلْ إِن كَانَتْ لَكُمُ ٱلدَّارُ ٱلْـَٔاخِرَةُ عِندَ ٱللَّهِ خَالِصَةً مِّن دُونِ ٱلنَّاسِ فَتَمَنَّوُا۟ ٱلْمَوْتَ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴿٩٤﴾﴾.

**واتە: (ئەی محمد صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ پێیان) بڵێ: ئەگەر ڕاست دەکەن و باوەڕتان وایە کە ماڵی ئەو دنیا (بەهەشت) لای خوا تایبەتی ئێوەیە نەک خەڵکی تر دە ئاواتی مردن بخوازن ئەگەر ڕاست دەکەن (تا زوو بچنە ناو بەهەشت)!**

﴿وَلَن يَتَمَنَّوْهُ أَبَدًۢا بِمَا قَدَّمَتْ أَيْدِيهِمْ ۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌۢ بِٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٩٥﴾﴾.

**واتە: (بەڵام ئەوانە) بەهۆی ڕەفتاری نادروست و دەستپێشکەری ناپەسەندییانەوە هەرگیز ئاواتی مەرگ ناخوازن، خوایش چاک ئاگادارە لە حاڵی ستەمکاران.**

﴿وَلَتَجِدَنَّهُمْ أَحْرَصَ ٱلنَّاسِ عَلَىٰ حَيَوٰةٍ وَمِنَ ٱلَّذِينَ أَشْرَكُوا۟ ۚ يَوَدُّ أَحَدُهُمْ لَوْ يُعَمَّرُ أَلْفَ سَنَةٍ وَمَا هُوَ بِمُزَحْزِحِهِۦ مِنَ ٱلْعَذَابِ أَن يُعَمَّرَ ۗ وَٱللَّهُ بَصِيرٌۢ بِمَا يَعْمَلُونَ ﴿٩٦﴾﴾.

**واتە: بەردەوام ئەو جوولەکانە دەبینیت کە لە هەموو خەڵکی زیاتر بە تەنگ دنیا و ژیانی دنیاوە دێن هەتا بگرە لە هاوەڵپەرست و موشریکەکانیش. (جا ئەگەر ڕاستیان بکردایە) ئاواتیان نەدەخواست کە: هەزار ساڵ هەریەکەیان تەمەنی ببوایە، هەرچەندە وەنەبێ ئەو تەمەنە درێژە لە سزا ڕزگاریان بکا، خوایش زۆر بینایە بەو کردەوانەی کە ئەنجامی دەدەن.**

﴿قُلْ مَن كَانَ عَدُوًّا لِّجِبْرِيلَ فَإِنَّهُۥ نَزَّلَهُۥ عَلَىٰ قَلْبِكَ بِإِذْنِ ٱللَّهِ مُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ وَهُدًى وَبُشْرَىٰ لِلْمُؤْمِنِينَ ﴿٩٧﴾﴾

**واتە: (ئەی محمد صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ پێیان بڵێ): هەرکەسێ دوژمنی جوبرەئیلە (بابزانێ) کە هەر ئەو جوبرەئیلە بە فەرمانی خوا ئەو قورئانەی دابەزاندۆتە سەر دڵت کە کتێبە پێشووەکان بەڕاست دادەنێ و ڕێنموویی (بۆ چاکە) دەکات و مژدە بەخشیشە بە ئیمانداران.**

﴿مَن كَانَ عَدُوًّا لِّلَّهِ وَمَلَٰٓئِكَتِهِۦ وَرُسُلِهِۦ وَجِبْرِيلَ وَمِيكَىٰلَ فَإِنَّ ٱللَّهَ عَدُوٌّ لِّلْكَٰفِرِينَ ﴿٩٨﴾﴾

**واتە: ئەو کەسەی دژایەتی خوا و فریشتەکانی و پێغەمبەرەکانی و جوبرەئیل و میکائیل بکات، ئەوە با دڵنیا بێت کە خوایش دوژمنی کافر و بێباوەڕانە.**



﴿وَلَقَدْ أَنزَلْنَآ إِلَيْكَ ءَايَٰتٍۭ بَيِّنَٰتٍۢ ۖ وَمَا يَكْفُرُ بِهَآ إِلَّا ٱلْفَٰسِقُونَ ﴿٩٩﴾﴾.

**واتە: بێگومان ئێمە نیشانە و ئایەتی زۆرمان بۆ تۆ ناردووە (ئەی محمد ﷺ) کەس باوەڕی پێی لەق نییە، جگە لە دەروون نەخۆش و یاخی بووەکان.**

﴿أَوَكُلَّمَا عَٰهَدُوا۟ عَهْدًا نَّبَذَهُۥ فَرِيقٌ مِّنْهُم ۚ بَلْ أَكْثَرُهُمْ لَا يُؤْمِنُونَ ﴿١٠٠﴾﴾

**واتە: هەرجارێک پەیمان ببەستن (لەگەڵ خوا و پێغەمبەر و موسڵماناندا) خێرا دەستەیەکیان پەیمانەکەیان شکاندووە، بەڵکو زۆربەی زۆریان بڕوایان نییە (بەڕێز و قەدری پەیمان و ئیمان).**

﴿وَلَمَّا جَآءَهُمْ رَسُولٌ مِّنْ عِندِ ٱللَّهِ مُصَدِّقٌ لِّمَا مَعَهُمْ نَبَذَ فَرِيقٌ مِّنَ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَٰبَ كِتَٰبَ ٱللَّهِ وَرَآءَ ظُهُورِهِمْ كَأَنَّهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴿١٠١﴾﴾

**واتە: کاتێک کە پێغەمبەرێکیان لەلایەن خواوە بۆ هات (مەبەست حەزرەتی محمد ﷺ) لەگەڵ ئەوەشدا کە (تەورات) پشتگیری لەو ڕاستیە دەکات، دەستەیەک لە خاوەن کتێبەکان (جووەکان) کتێبی خۆیان خستە پشت گوێ و خۆیان لێ گێل کرد، هەروەک هەواڵی وا نەزانن و (نەیان بیستبێ).**

﴿وَٱتَّبَعُوا۟ مَا تَتْلُوا۟ ٱلشَّيَٰطِينُ عَلَىٰ مُلْكِ سُلَيْمَٰنَ ۖ وَمَا كَفَرَ سُلَيْمَٰنُ وَلَٰكِنَّ ٱلشَّيَٰطِينَ كَفَرُوا۟ يُعَلِّمُونَ ٱلنَّاسَ ٱلسِّحْرَ وَمَآ أُنزِلَ عَلَى ٱلْمَلَكَيْنِ بِبَابِلَ هَٰرُوتَ وَمَٰرُوتَ ۚ وَمَا يُعَلِّمَانِ مِنْ أَحَدٍ حَتَّىٰ يَقُولَآ إِنَّمَا نَحْنُ فِتْنَةٌ فَلَا تَكْفُرْ ۖ فَيَتَعَلَّمُونَ مِنْهُمَا مَا يُفَرِّقُونَ بِهِۦ بَيْنَ ٱلْمَرْءِ وَزَوْجِهِۦ ۚ وَمَا هُم بِضَآرِّينَ بِهِۦ مِنْ أَحَدٍ إِلَّا بِإِذْنِ ٱللَّهِ ۚ وَيَتَعَلَّمُونَ مَا يَضُرُّهُمْ وَلَا يَنفَعُهُمْ ۚ وَلَقَدْ عَلِمُوا۟ لَمَنِ ٱشْتَرَىٰهُ مَا لَهُۥ فِى ٱلْءَاخِرَةِ مِنْ خَلَٰقٍ ۚ وَلَبِئْسَ مَا شَرَوْا۟ بِهِۦٓ أَنفُسَهُمْ ۚ لَوْ كَانُوا۟ يَعْلَمُونَ ﴿١٠٢﴾﴾

**واتە: هەندێ لەو (جوولەکانە) شوێنی ئەوە کەوتن، کە شەیتانەکان دەیانخوێندەوە دەربارەی دەسەڵات و حکوومەتی سولەیمان، (ئاشکرایە) کە هەرگیز سولەیمان کافر نەبووە، بەڵکو شەیتانەکان کافر بوون و خەڵکیان فێری سیحر و جادوو دەکرد، هەروەها مەردوومیان فێری ئەوە کرد کە بۆ هارووت و مارووت (کە دوو فریشتە بوون) لە بابل (دابەزێنرابوون بۆ تێگەیاندنی خەڵکی لە سیحرو جادوو)، ئەوانیش کەسیان فێری هیچ شتێک نەدەکرد تا پێیان نەوتایە: ئەم کارەی ئێمە بۆ تاقی کردنەوەیە و خۆت کافر مەکە. (کەچی هەندێک هەر**



کۆڵیان نەدا)و لەو فریشتانەوە شتی وا فێر دەبوون کە ژن و مێردی پێ لەیەک جودا بکەن، (هەرچەندە) ئەو جادووگەرانە ناتوانن هیچ زەرەرێک بە کەس بگەیەنن، مەگەر ویستی خوای لەسەر بێ، ئەو خەڵکە سەرگەردانە هەمیشە فێری شتێک دەبن کە زیانیان لێ دەدا و سوودی نییە بۆیان، بێگومان دەشزانن ئەوەی کاڵای وا بکڕێ و شتی وا فێرببێ لەو دونیا هیچ بەهرەیەکی دەستناکەوێت، (بەڕاستی) ئەو شتەی ئەوان خۆیان پێفرۆشتووە و کەوتوونەتە داویەوە شتێکی زۆر ناپەسەندە ئەگەر بزانن و تێبگەن.

﴿وَلَوْ أَنَّهُمْ ءَامَنُواْ وَٱتَّقَوْاْ لَمَثُوبَةٌ مِّنْ عِندِ ٱللَّهِ خَيْرٌ لَّوْ كَانُواْ يَعْلَمُونَ ﴿١٠٣﴾﴾

واتە: خۆ ئەگەر (ئەو جوولەکانە) ئیمان و باوەڕیان بهێنایە و پارێزکار و جوانکاربوونایە، بێگومان پاداشتێک کە لەلایەن خوای گەورەوەیە چاکتر و بەفەڕ تر بوو بۆیان، ئەگەر بزانن و (بیر و هۆشیان بەکار بهێنن).

﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَقُولُواْ رَٰعِنَا وَقُولُواْ ٱنظُرْنَا وَٱسْمَعُواْ ۗ وَلِلْكَـٰفِرِينَ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿١٠٤﴾﴾

واتە: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە مەڵێن (راعنا) (چونکە لە زمانی عیبریدا واتاکەی ناشیرینە) بەڵکو بڵێن: (انظرنا) چاوەڕێمان بکە، بەچاکی ئەو فەرمانە لەگوێ بگرن، (چونکە) بۆ کافر و بێ باوەڕان سزایەکی بەئێشمان ئامادە کردووە.

﴿مَّا يَوَدُّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِنْ أَهْلِ ٱلْكِتَـٰبِ وَلَا ٱلْمُشْرِكِينَ أَن يُنَزَّلَ عَلَيْكُم مِّنْ خَيْرٍ مِّن رَّبِّكُمْ ۗ وَٱللَّهُ يَخْتَصُّ بِرَحْمَتِهِۦ مَن يَشَآءُ ۚ وَٱللَّهُ ذُو ٱلْفَضْلِ ٱلْعَظِيمِ ﴿١٠٥﴾﴾

واتە: چ ئەوانەی کە کافرن لە خاوەن کتێبە ئاسمانییەکان، چ موشریک و هاوەڵپەرستان حەزناکەن لەلایەن پەروەردگارتانەوە هیچ خێر و بەرەکەتێک داباریێ بۆتان و ڕووتان تێبکات، بەڵام خوا ڕەحمەتی خۆی تایبەت دەکات بە هەرکەسێ (کە بیەوێ و شایستە بێ)، خوا خاوەنی فەزڵ و بەخششێکی گەورەیە.

﴿۞ مَا نَنسَخْ مِنْ ءَايَةٍ أَوْ نُنسِهَا نَأْتِ بِخَيْرٍ مِّنْهَآ أَوْ مِثْلِهَآ ۗ أَلَمْ تَعْلَمْ أَنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴿١٠٦﴾﴾

واتە: هەر ئایەتێک بسڕینەوە، یا بیخەینە بارودۆخی فەرامۆشییەوە و پشتگوێی بخەین، چاکتر لەو یا وێنەی ئەو دەخەینە ڕوو، مەگەر نازانی کە خوا دەسەڵاتی بەسەر هەموو شتێکدا هەیە؟



﴿أَلَمْ تَعْلَمْ أَنَّ ٱللَّهَ لَهُۥ مُلْكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۗ وَمَا لَكُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ مِن وَلِيٍّ وَلَا نَصِيرٍ ﴿١٠٧﴾﴾

**واتە: ئایا نازانی (ئەی محمد صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ، ئەی ئیماندار) کە بەڕاستی هەر خوا خاوەنی هەموو ئاسمانەکان و زەوییە، جگە لەو خوایە هیچ پشتیوان و یاریدەدەرێکتان نییە؟**

﴿أَمْ تُرِيدُونَ أَن تَسْـَٔلُوا۟ رَسُولَكُمْ كَمَا سُئِلَ مُوسَىٰ مِن قَبْلُ ۗ وَمَن يَتَبَدَّلِ ٱلْكُفْرَ بِٱلْإِيمَٰنِ فَقَدْ ضَلَّ سَوَآءَ ٱلسَّبِيلِ ﴿١٠٨﴾﴾

**واتە: (ئەی هاوەڵان) ئاخۆ ئێوەش دەتانەوێت داخوازی (گەورە و ناقۆڵا) لە پێغەمبەرەکەتان (محمد صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ) بکەن، هەروەک کاتی خۆی داخوازی لە مووسا کرا، جا هەرکەسێ کوفر بگۆڕێتەوە بە ئیمان، بێگومان ڕێبازی ڕاست و دروستی ون کردووە.**

﴿وَدَّ كَثِيرٌ مِّنْ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ لَوْ يَرُدُّونَكُم مِّنۢ بَعْدِ إِيمَٰنِكُمْ كُفَّارًا حَسَدًا مِّنْ عِندِ أَنفُسِهِم مِّنۢ بَعْدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُمُ ٱلْحَقُّ ۖ فَٱعْفُوا۟ وَٱصْفَحُوا۟ حَتَّىٰ يَأْتِيَ ٱللَّهُ بِأَمْرِهِۦٓ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴿١٠٩﴾﴾

**واتە: زۆرێک لە خاوەن کتێبەکان ئاواتەخوازن لەبەر حەسوودی و ناپاکی خۆیان ئەگەر بۆیان بکرێ بتانگێڕنەوە ڕیزی بێباوەڕان ئەمەش دوای ئەوەی کە حەق و ڕاستییان بەتەواوی بۆ ڕوون بۆتەوەو (چوونەتە ڕیزی باوەڕدارانەوە)، بەڵام ئێوە هەر لێیان ببوورن و لێیان مەگرن و چاوپۆشییان لێ بکەن، تا خوا کاری خۆی ئەنجام دەدا و ویستی خۆی جێبەجێ دەکات، بێگومان خوا دەسەڵاتی بەسەر هەموو شتێکدا هەیە.**

﴿وَأَقِيمُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتُوا۟ ٱلزَّكَوٰةَ ۚ وَمَا تُقَدِّمُوا۟ لِأَنفُسِكُم مِّنْ خَيْرٍ تَجِدُوهُ عِندَ ٱللَّهِ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ ﴿١١٠﴾﴾

**واتە: (کەواتە ئەی ئیمانداران) نوێژەکانتان بەچاکی ئەنجام بدەن و لە زەکات دانیش درێغی مەکەن، دڵنیا بن لە هەر کارێکی چاکە بۆ خۆتانی دەکەن، لای خوا بزر نابێت و دێتەوە ڕێتان چونکە بەڕاستی خوا بینایە بەو کار و کردەوانەی کە ئەنجامی دەدەن.**



﴿وَقَالُواْ لَن يَدْخُلَ ٱلْجَنَّةَ إِلَّا مَن كَانَ هُودًا أَوْ نَصَٰرَىٰ ۗ تِلْكَ أَمَانِيُّهُمْ ۗ قُلْ هَاتُواْ بُرْهَٰنَكُمْ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ﴾

**واتە: (جوولەکە و گاورەکان) دەڵێن: کەس ناچێتە بەهەشتەوە جگە لەوانەی کە جوولەکەن یا گاورن، جا ئەوە ئاوات و خەیاڵی خۆیانە (تۆش ئەی محمد ﷺ، ئەی ئیماندار پێیان بڵێ): ئەگەر ڕاست دەکەن، بەڵگەتان لەسەر ئەم قسەیە بهێننە مەیدانەوە.**

﴿بَلَىٰ مَنْ أَسْلَمَ وَجْهَهُۥ لِلَّهِ وَهُوَ مُحْسِنٌ فَلَهُۥٓ أَجْرُهُۥ عِندَ رَبِّهِۦ وَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ﴾

**واتە: بەڵێ هەر کەس بەڕاستی ڕوو بکاتە خوا و چاکەکار و موسڵمان بێت، ئەوە پاداشتی خۆی لای پەروەردگاری دەست دەکەوێت، نە ترسیان دەبێ وە نە غەم و پەژارە.**

﴿وَقَالَتِ ٱلْيَهُودُ لَيْسَتِ ٱلنَّصَٰرَىٰ عَلَىٰ شَىْءٍ وَقَالَتِ ٱلنَّصَٰرَىٰ لَيْسَتِ ٱلْيَهُودُ عَلَىٰ شَىْءٍ وَهُمْ يَتْلُونَ ٱلْكِتَٰبَ ۗ كَذَٰلِكَ قَالَ ٱلَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ مِثْلَ قَوْلِهِمْ ۚ فَٱللَّهُ يَحْكُمُ بَيْنَهُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ فِيمَا كَانُواْ فِيهِ يَخْتَلِفُونَ﴾

**واتە: جوولەکە دەڵێن: گاورەکان لەسەر هیچ بنەما و ڕاستییەک نین، گاورەکانیش دەڵێن جوولەکە لەسەر هیچ بنەما و ڕاستییەک نین، بەمەرجێک ئەوانە کتێبی (تەورات و ئینجیل دەخوێننەوە) هەروەها ئەوانەش کە هیچ نازانن (لە بتپەرستانی عەرەب) هەروا دەڵێن و ( بڕوایان بە ئیسلام و هیچ لایەکیان نییە) خوایش لە ڕۆژی قیامەتدا دادگایی دەکات لە نێوانیاندا و بڕیاری لەوەی ناکۆکن تیایدا دروست دەدات.**

﴿وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّن مَّنَعَ مَسَٰجِدَ ٱللَّهِ أَن يُذْكَرَ فِيهَا ٱسْمُهُۥ وَسَعَىٰ فِى خَرَابِهَآ ۚ أُوْلَٰٓئِكَ مَا كَانَ لَهُمْ أَن يَدْخُلُوهَآ إِلَّا خَآئِفِينَ ۚ لَهُمْ فِى ٱلدُّنْيَا خِزْىٌ وَلَهُمْ فِى ٱلْءَاخِرَةِ عَذَابٌ عَظِيمٌ﴾

**واتە: جا کێ لەوە تاوانبارتر و ستەمکارترە کە مزگەوتەکانی خوا قەدەغە دەکات لەوەی کە ناوی پیرۆزی ئەوی تیا ببرێ و باسی ئایینی ئەوی تیا بکرێ، هەوڵ بدا بۆ وێران کردنی ئەوانە ناچنە مزگەوتەوە بە ترسەوە نەبێت (کە لە دڵ و دەروونیاندا دروست دەبێت)، ئەوانە سووکی و ڕیسوایی بەشیانە لە دنیادا، لە قیامەتیش دا سزای سەخت بۆیان ئامادەیە.**



﴿وَلِلَّهِ ٱلْمَشْرِقُ وَٱلْمَغْرِبُ فَأَيْنَمَا تُوَلُّواْ فَثَمَّ وَجْهُ ٱللَّهِ إِنَّ ٱللَّهَ وَٰسِعٌ عَلِيمٌ ﴿١١٥﴾﴾

**واتە: ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا و (هەموو لایەک) خوا خاوەنیەتی، ڕوو بکەنە هەرلایەک خوا ڕووی لێتانە، بەڕاستی خوا فراوانگیرو زانایە.**

﴿وَقَالُواْ ٱتَّخَذَ ٱللَّهُ وَلَدًا سُبْحَٰنَهُۥ بَل لَّهُۥ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ كُلٌّ لَّهُۥ قَٰنِتُونَ ﴿١١٦﴾﴾

**واتە: (جوولەکە و گاور و بتپەرستان) دەڵێن: خوا منداڵی بۆخۆی بڕیار داوە (لە کاتێکدا کە خوا پێویستی بە کەس نییە) چونکە هەرچی لە ئاسمانەکان و زەویدا هەیە هەر خۆی خاوەنیەتی، هەر هەموویشیان ملکەچ و فەرمانبەرداری ئەون.**

﴿بَدِيعُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَإِذَا قَضَىٰٓ أَمْرًا فَإِنَّمَا يَقُولُ لَهُۥ كُن فَيَكُونُ ﴿١١٧﴾﴾

**واتە: (هەر ئەو زاتە) بەدیهێنەری ئاسمانەکان و زەویە بەجوانترین شێوە بڕیاری هەرشتێک بدات، تەنها ئەوەندەی بەسە کە فەرمانی بوونی بدات، ئیتر خێرا ئەو شتە یا ئەو کارە، دەبێ و ئەنجام دەدرێت.**

﴿وَقَالَ ٱلَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ لَوْلَا يُكَلِّمُنَا ٱللَّهُ أَوْ تَأْتِينَآ ءَايَةٌ كَذَٰلِكَ قَالَ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِم مِّثْلَ قَوْلِهِمْ تَشَٰبَهَتْ قُلُوبُهُمْ قَدْ بَيَّنَّا ٱلْءَايَٰتِ لِقَوْمٍ يُوقِنُونَ ﴿١١٨﴾﴾

**واتە: ئەوانەی کە نەفام و نەزانن دەیانووت: چی ئەبێ ئەگەر خوا لەگەڵ ئێمە گفتوگۆ بکات! یا (معجزة) و نیشانەیەکمان بۆ بنێرێت، (شایانی باسە) کەسانی تریش پێش ئەمان هەمان پێشنیاریان دەوت، ئەمانە دڵەکانیان چوونیەکە و لەیەک دەچێت، خۆ ئێمە بەڵگە و نیشانەی ئاشکرا و ڕوونمان دیاری کردووە بۆ ئەو کەسانەی کە ڕاستی خوازن و بەشوێن حەقیقەتدا دەگەڕێن.**

﴿إِنَّآ أَرْسَلْنَٰكَ بِٱلْحَقِّ بَشِيرًا وَنَذِيرًا وَلَا تُسْـَٔلُ عَنْ أَصْحَٰبِ ٱلْجَحِيمِ ﴿١١٩﴾﴾

**واتە: بەڕاستی (ئەی محمد ﷺ) ئێمە تۆمان هاوڕێ لەگەڵ حەق و ڕاستەقینەکاندا ڕەوانە کردووە تا مژدەدەر بیت بە ئیمانداران، ترسێنەر بێ بۆ بێباوەڕان، تۆ هەرگیز بەرپرسیار نیت لە نیشتەجێکانی دۆزەخ.**



﴿وَلَن تَرْضَىٰ عَنكَ ٱلْيَهُودُ وَلَا ٱلنَّصَـٰرَىٰ حَتَّىٰ تَتَّبِعَ مِلَّتَهُمْ ۗ قُلْ إِنَّ هُدَى ٱللَّهِ هُوَ ٱلْهُدَىٰ ۗ وَلَئِنِ ٱتَّبَعْتَ أَهْوَآءَهُم بَعْدَ ٱلَّذِى جَآءَكَ مِنَ ٱلْعِلْمِ ۙ مَا لَكَ مِنَ ٱللَّهِ مِن وَلِىٍّ وَلَا نَصِيرٍ ﴿١٢٠﴾﴾

**واتە: هەرگیز جوولەکە و گاورەکان لە تۆ (ئەی محمد ﷺ، ئەی ئیماندار) ڕازی نابن، هەتا بەتەواوی شوێن ئایین و بەرنامەیان نەکەویت. پێیان بڵێ: بەڕاستی هەر بەرنامەی خوا (ئایینی ئیسلام، شایستەی ئەوەیە کە شوێنی بکەون) و هیدایەتی ڕاست و دروست هەر لای ئەوە، خۆ ئەگەر شوێن ئارەزووەکانی ئەوان بکەوی پاش ئەوەی زانیاری و زانستیت پێگەیشتووە، ئەوە بزانە کە لەلایەن خواوە هیچ سەرپەرشتیاری و یارمەتییەکت دەست ناکەوێت.**

﴿ٱلَّذِينَ ءَاتَيْنَـٰهُمُ ٱلْكِتَـٰبَ يَتْلُونَهُۥ حَقَّ تِلَاوَتِهِۦٓ أُو۟لَـٰٓئِكَ يُؤْمِنُونَ بِهِۦ ۗ وَمَن يَكْفُرْ بِهِۦ فَأُو۟لَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلْخَـٰسِرُونَ ﴿١٢١﴾﴾

**واتە: دەستەیەک لەوانەی کتێبمان پێبەخشیوون (قورئان) بەچاکی و بەوردی دەوری دەکەنەوە، ئەوانە باوەڕیان پێی هەیە و (باوەڕی پێدێنن) بەڵام ئەوەی بڕوای پێی نەبێت، ئا ئەو جۆرە کەسانە لە خەسارەتمەند و زەرەرمەندەکانن.**

﴿يَـٰبَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ٱذْكُرُوا۟ نِعْمَتِىَ ٱلَّتِىٓ أَنْعَمْتُ عَلَيْكُمْ وَأَنِّى فَضَّلْتُكُمْ عَلَى ٱلْعَـٰلَمِينَ ﴿١٢٢﴾﴾

**واتە: ئەی نەوەی ئیسرائیل یادی ئەو ناز و نیعمەتانە بکەن کە بەسەرتانا ڕژاندووەمە و من (کاتی خۆی) ڕێزی ئێوەم دابوو بەسەر هەموو دانیشتوانی ئەم جیهانەدا.**

﴿وَٱتَّقُوا۟ يَوْمًا لَّا تَجْزِى نَفْسٌ عَن نَّفْسٍ شَيْـًٔا وَلَا يُقْبَلُ مِنْهَا عَدْلٌ وَلَا تَنفَعُهَا شَفَـٰعَةٌ وَلَا هُمْ يُنصَرُونَ ﴿١٢٣﴾﴾ [البقرة]

**واتە: خۆتان بپارێزن لە سزای ڕۆژێک کە بە هیچ شێوەیەک کەس فریای کەس ناکەوێت، کەس نابێتە بارمتەی کەس و تکاو پاڕانەوەی کەس بۆ کەسانی تر سوودی نابێت ( یاخیبوان و ستەمکاران) سەرکەوتووو نابن.**

**بەم شێوەیە لە مانگی شەعبانی ساڵی دووی کۆچی ڕووداوەکان زۆر گەرموگوڕ بوون وەحی خوای پەروەردگار سەعات بە سەعات و ڕۆژ لەدوای ڕۆژ دادەبەزی بۆ موسڵمانان، چونکە کاتی نزیک بوونەوەی بەیەکدا کێشانی موسڵمانان و دوژمنەکانیانە ئەم**



ڕووبەڕووبوونەوە لە ڕووداوێکی زۆر گەورەدا خۆی دێنێتەوە ئەویش جەنگی بەدر یان ڕۆژی فورقان خوای گەورە ناوی ناوە و گەورەترین ڕووداوە لە مێژووی موسڵمانانداا.

نومێر: زۆر باشە کەواتە با ڕووە و بەدر خۆمان ئامادە بکەین و بزانین پێش جەنگی بەدر چی ڕووئەدات و ڕووداوەکان چۆن دێنە پێشەوە.



# ڕووداوەکان پێش جەنگی بەدر

نومێر: دەوڵەتی ئیسلام لە شاری مەدینەدا وا تەمەنی بوو بە دوو ساڵ، پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ سەرۆکایەتی ئەو دەوڵەتە دەکات، بەڵام ڕەوشی ناوخۆیی شاری مەدینە زۆر جێگیر نییە، چەند گرووپێکی موشریک دەوری شاری مەدینەیان داوە لە ئەوس و خەزرەج، عەرەبی چواردەوری ئەعراب و هەروەها یەهوود بەهەمان شێوە لە مەڵاس دایە بۆ موسڵمانان، با قوڕەیشیش لەولاوە بوەستێت کە هێزێکی گەورەی ناوچەکەیە و کەرامەتی شکاوە، شکۆی لەکەدار کراوە بەدەستی موسڵمانان، ئەعراب لە هەمووی زیاتر ڕقیان لە موسڵمانان دەبێتەوە بە هۆکاری ئەوەی پێشتر خەریکی چەتە و دزی و ڕووتکردنەوەی خەڵکی بوون، ئێستا وا ئیسلام و مەفرەزە و هێزەکان ڕێگەیان پێنادەن چیتر چەتەیي و ڕاوڕووتی بکەن، کەواتە ڕەوشەکە نا ئارام و ناجێگیرە.

ماکوان: ئەی کاتی جەنگی بەدر نییە، ئێستا؟

نومێر: بەڵێ ئێستا کۆتایی مانگی شەعبانە و بەم نزیکانە لە ١٧ مانگی ڕەمەزاندا جەنگ ڕوونەدات لە نێوان موسڵمانان و قوڕەیشی کافردا، ئەم جەنگە هەرچی پێوەری جیهانی و هێز و تواناکانە تێک و پێکی دەشکێنێت، هەموو هێز و پێوەرەکان لە جیهاندا هەڵگەڕانەوە و گۆڕانکاری پێ دەکات، هەر لەبەر ئەم گۆڕانکارییە گەورەیە کە خوای گەورە ناوی ناوە (یوم الفرقان) واتا ڕۆژی جیاکەرەوەی حەق لە باتڵ ڕاستی لە خراپەکاری...هتد.

ماکوان: سبحان الله زۆر جار لە جێگایەک هیچ کەس هەر تەماشاش ناکات لەسەر نەخشە، یان هێزێکی بچووک خوای گەورە چ گۆڕانکارییەکی پێدەکات.

نومێر: بەدڵنیاییەوە تۆ جوان دیقەت بدە لێرە وەکو ستراتیژی سەربازی ناتوانین باسی بکەین چونکە هیچ میحوەرێکی هێزی جیهانی تێیدا بەشدار نەبووە، تەنانەت هیچ کەس گرنگی پێنەداوە، هیچ جۆرە دەنگدانەوەیەکی لێدروست نەبووە، لەچاو جەنگی فارس و ڕۆم، چین و ناوچەکانی ئەفریقا، بەڵکو وا تەماشا کراوە کە جەنگی تەنها دوو هۆز و عەشیرەتە، یاخود دوو کۆمەڵە خەڵکن لەچاو هێز و توانای دەوڵەتەکانی ئەو سەردەمە بەتایبەت ڕۆم خاوەنی (١) ملیۆن سەرباز بووە فارس خاوەنی (٢) ملیۆن سەرباز بووە.



جەنگی بەدر موسڵمان (٣١٦) کەس بوون و کافرەکانیش هەزار کەس لەبەر ئەوە لای ئەهلی زەوی هیچ قیمەت و ئیعتبارێکی بۆ دانەنراوە. چونکە دەوڵەتەکان بەرفراوان بوون خاکی زۆریان هەبووە، هەموو لە (١٠) دەوڵەت تێپەڕی نەکردووە.

ماکوان: ئاخر بە شیکارییەکی سادە هەروایە جەنگێکە و لە مێژوودا ڕوویدا هیچ کاریگەرییەکی ئەوتۆی بەجێنەهێشتووە، مەگەر هەندێک خاڵی کاریگەری خستۆتە سەر خەڵکی بیابان، بەڵام ئەگەر بەچاوی قوڵ و بەرفراوانیەوە بیرمان لێکردەوە، دەبێت بڵێین لەدوای جەنگی بەدر بەڕاستی ئوممەتی ئیسلام لەدایک بوو، جێگای پێی خۆی قایم کرد، ئیتر خەڵکی بەچاوی خاوەن پەیام و ئامانج خاوەن تەماعی زۆر بۆ خەڵکی کە بانگەوازی ئیسلامییە، لێرەوە مێژووی مرۆڤایەتی گۆڕانکاری تەواوەتی بەسەردا هات و ئیتر بوونە ئوممەتی خەیری بەسەر هەموو خەڵکییەوە، هەر ئەم خەڵکەن پاشان هەموو عەرشی کیسرا و قەیسەر دەخەنە ژێر پێیانەوە، هەموو سوپا و هێزیان لەبەردەمیاندا دەلەرزن.

نومێر: هۆکاری چییە خوای گەورە ئەم جەنگەی ناوناوە بە (یوم الفرقان)؟



## لەبەرچی خوای پەروەردگار جەنگی بەدری ناو ناوە بە (الفرقان)

ماکوان: لە ڕاستیدا جەنگی بەدر ئەو جەنگە بوو کە جیاوازی کرد لە قۆناغی دروستبوونی دەوڵەتی ساوا و سەرەتایی و لاواز توانای کەم دیاریکراو بوو، بەڵام دوای جەنگی بەدر دەوڵەتی ئیسلامی بوو بەیەکێک لە دەوڵەتە بەهێزەکانی ناوچەکە و قسە ڕۆیشتوو بوو لەناو خەڵکی و هۆز و عەشیرەتەکانی عەرەبیدا، پاشان ئیتر لە دەوڵەتی لۆکاڵی دەرچوو ناوی بیسترا لە هەموو جێگای جیهاندا.

لەبەر ئەوە ئەوەندە غەریب نییە، لای خەڵکی بۆچی خوای پەوەردگار ناوی ناوە بە جەنگی (الفرقان) واتا جیاکەرەوە حەق و ڕاستی لە خراپە و خراپەکاران، بەڵکو نامۆ دەبوو ئەگەر ئەو ناوەی لێ نەنرایە.

پێوەری خوای پەروەردگار وەکو پێوەری مرۆڤ نییە (سبحانە و تعالی) لەسەر زەوی زۆر جەنگ و ڕووداوی گەورە ڕوویان داوە لە نێوانی ئیمپڕاتۆرەکاندا کە بەیەکداکێشانی زۆر گەورە بووە، بەڵام بوو بە مێژوو لە ئەرشیفی مێژوو خۆی شاردۆتەوە و هیچ کاریگەرییەکی لەسەر زەوی دروست نەکردووە، بە نموونەی جەنگی فارس و ڕۆم، هیچ لە واقیعی ژیانی مرۆڤایەتی نەگۆڕی بێجگە لە کوشتن و ماڵوێرانی خەڵکی هەژار و لاواز خوای پەروەردگار دەفەرموویت:

﴿الٓمٓ ۝ غُلِبَتِ ٱلرُّومُ ۝ فِيٓ أَدۡنَى ٱلۡأَرۡضِ وَهُم مِّنۢ بَعۡدِ غَلَبِهِمۡ سَيَغۡلِبُونَ ۝ فِي بِضۡعِ سِنِينَۗ لِلَّهِ ٱلۡأَمۡرُ مِن قَبۡلُ وَمِنۢ بَعۡدُۚ وَيَوۡمَئِذٖ يَفۡرَحُ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ ۝﴾ [الروم]

سەرنجی سەرەتای سوورەتی (الروم) بدە.

واتە: ڕۆمەکان تێکشکێنران (بەدەستی فارسەکان). لە نزیکترین و نزمترین وڵاتیاندا، بەڵام لە ئاییندەدا (نۆرەیان دێتەوە) ڕۆمەکان دوای شکستیان سەردەکەونەوە.

لە چەند ساڵێکدا (چەند ساڵێکی داهاتوو نێوان ٣-٩ ساڵ)، هەموو کارو فرمانێک تەنها بەدەست خوایە، لەوە و پێش و لەوەو دوایش (لە هەموو کات و هەموو شوێنێک)، جا ئەو ڕۆژە ئیمانداران خۆشحاڵ و شاد دەبن.

ئەگەر چی ڕۆم سەرکەوێت یان بدۆڕێت، هیچ کاریگەری جێناهێڵێت لەسەر زەوی یاخود فارس، چەند ڕۆژ و ساتە وەختیکە تێدەپەڕێت بەناو ڕۆژمێر و تەمەنی سەر زەوی، بەڵام دەمەوێت زۆر بەڕاشکاوانە بڵێم جەنگی بەدر لە نێوانی مەککە و مەدینەدا تا ڕۆژی قیامەت



کاریگەری دەبێت و پەند و ئامۆژگاری لێدەردەهێنرێت، ڕاستە لەچاو جەنگەکانی تردا جەنگێکی سادە و زۆر گەورە نەبووە، بەڵام جەنگی بەدر چەند ساتە وەختێک نییە تێپەڕێت بەسەر ژیانی سەر زەویدا، بەڵکو چەند ساتەوەختێک بوو کە گۆڕانکاری کرد لە ژیانی خەڵکیدا تا ڕۆژی قیامەت.

عەزەمەتی بەدر گەورەیە بە جەنگاوەرەکانی، نەک بە چەک و جبەخانەکەی، گەورەیە بە ئەهلی حەق و ڕاستی، نەک گەورەبێت بە جوگرافیاکەی، خەڵکەکەی زۆر سادە و هەژار و زەلیل بوون لە ژیاندا، خوای پەروەردگار دەفەرمووێت:

﴿وَلَقَدْ نَصَرَكُمُ ٱللَّهُ بِبَدْرٍ وَأَنتُمْ أَذِلَّةٌ ۖ فَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ﴾ [آل عمران]

بێگومان خوا لە غەزای بەدردا سەری خستن، هەرچەندە ئێوە لە ژمارە و چەکدا لاواز بوون، دەی کەواتە لەخوا بترسن، بەڵکو بتوانن سوپاسگووزار بن.

ئەو جەنگە گەورەیە بە خەڵکە پاک و بێگەرد و خواناسەکەی تێیدا بەشدار بوون، هەر لەبەر ئەو کۆمەڵە خەڵکە خوای گەورە گۆڕانکاری سیستەم و یاساکانی ئەم گەردوونەی کرد، مەلائیکەت بەشدار بوون، شەیتان خودی ئیبلیس بەشدار بوو بە ملهوڕی و سەرشۆڕی ڕایکرد، بۆیە ناونراوە بە جەنگی جیاکاری لە نێوانی حەق و ناحەقدا.

ئیتر هەموو جەنگی موسڵمان و سوپای موسڵمان پێوەر دەکرێت بە سوپا و جەنگی بەدر هەر سوپایەک توانی وەکو سوپای بەدر بێت ئەوا بەدڵنیاییەوە سەرکەوتن بە دەست دەهێنێت وەکو سەرکەوتنی بەدر، پێوەری سەرکەوتن تەنها لە جەنگی بەدر خۆی دەبینێتەوە، جا لە ڕابردوودا بێت یاخود لە ئێستا و یان لە داهاتوو یان تا قیامەت، جا پێویستە شیکاری و لێکۆڵینەوەی ورد بکرێت لەسەر خەڵکی و چۆنیەتی هۆکار و پلانی ئەو جەنگە.

بەڵام نومێر هۆکارەکە چی بوو تۆ ئەوەم بۆ باس بکە؟!

نومێر: خۆی لە سێ هۆکار دەبینێتەوە، زیاتر پەیوەندی هەیە بە هەواڵگر ی (موخابەرایەت) هەردوولا لە دەوڵەتی مەککە و مەدینەدا.



# هۆکارەکانی جەنگی بەدر

نومێر: کاروانێک لەشامەوە بەرەو شاری مەککە دەگەڕێتەوە بەسەرکردایەتی ئەبو سوفیان، ئەو قافڵە و کاروانانەی موسڵمانان بۆیان دەرچووبوون، نەکاروانەکە کەوتووبووە بەردەستی موسڵمانان نەهیچ جەنگ ڕوویدابوو، بێجگە لە قافڵە و کاروانەکەی مەفرەزەی (نەخلە) لە جەنگێکی بچووک تێیدا ڕوویدا لەنێوان دە سەربازی موسڵمانان و چوار سەربازی کافرەکان، بەڵام ئەو کاروانەی لەم نزیکانە تێپەڕ دەکات زۆر جیاوازترە لە قافڵەکانی دیکە بەچەند هۆکارێک:

**هۆکاری یەکەم:** ئەم کاروانە لە هەموو کاروانەکانی تر زۆرترە کە شتومەکەکان پارەی خەڵکی مەککەی و دەستبەسەرکردنی ئەم قافڵەیە واتە لێدانی ئابووری قورەیش‌و شکاندنی پشتی ئابووری مەککە، زیاد لەهەزار باری وشتر بوو کە سەرمایەکەی بە (٥٠) هەزار دیناری ئاڵتونی مەزەندە دەکرێ.

**هۆکاری دووەم:** ئەم کاروانە بەسەرکردایەتی کەسێکی سادەو ساکارو بازرگانێکی ئاسایی شاری مەککە نییە، بەڵکو ئەبو سوفیان و ستافێک لەگەڵیدایە زیاد لە (٤٠) کەسن، ئەم کاروانە پاسەوانەکانی یەکجار زۆرە و هەروەها کەرەستە و شتومەکەکانیش یەکجار زۆرە، سەرکردەکەشی پیاوێکی ناودار و سەرداری قورەیشە، هۆز و تیرەکەی لە بەهێزترین هۆزو تیرەی قورەیشە کە بەنی ئومەییەیە، بەکاروانی نەخلە بەراورد ناکرێت کە چوار کەس پاسەوانییان دەکرد.

**هۆکاری سێیەم:** زۆر گرنگە ئەویش ئەوەیە ئەو قافڵەیە بەتەنیشت شاری مەدینەدا ڕەت دەبێت، لەمانگی ڕەمەزاندا نزیکەی مانگ‌و نیوێک دوای ڕووداوی کاروانەکەی نەخلە، چوونە دەرو خۆ ئامادەکردن بۆ ئەم کاروانە بەواتای ئەوەیە موسڵمانان ناترسن لەوەی لەپێشتردا ڕوویداوە، ئەوەتا خۆیان ئامادە دەکەن بۆ چالاکییەکی تری نوێ. ئەمەش ئەوپەڕی هێز و چاونەترسی‌و ئازایەتی موسڵمانان دەردەخات، لەبەرانبەر قورەیشدا، گومانیشی تێدا نییە کە دیسان بەم کارەیان عەرشی کافرو ملهوڕان دەلەرزێنن.

هەر بەم سێ هۆکارە پێغەمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ خۆی ئامادەکرد بەگەورەترین سوپا و ژمارەیەکی زۆر لە موسڵمانان، بۆ یەکەمجار ئەو ئامادەییە بکرێ بۆ مەفرەزە و سریەکانی، پێشتر هیچ کام لە دەرچوونە نەدەگەیشتنە (٢٠٠) کەس، بەڵام لەم غەزوەدا پێغەمبەری خوا



ﷺ (٣١٧) کەسی ئامادە کردووە، هەرچەندە ڕای جیاواز هەیە هەندێک دەڵێن: (٣١٣) کەس بوون یان (٣١٤) یاخود (٣١٧)، بۆ یەکەمجار لەگەڵ موسڵمانانی موجاهیدا ئەنساریش بۆ چالاکی جەنگ دەردەچن، پێشتر هەر موهاجیرەکان بوون، بەڵام ئەمجارە زۆرترینیان لە ئەهلی مەدینەن، لە ئەنسارەکان.

ماکوان: ئەنسار چۆن خۆیان ئامادەکرد بۆ جەنگ و چۆن لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ ڕێککەوتن؟

نومێر: پێغەمبەری خوا ﷺ مەجلیسی شوورای پێکهێنا و لە شوورادا باسکراوە.

شوورای پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ چوونە نێو جەنگ.

نومێر: دەرچوونی ئەنسار بۆ چالاکی بە ئارەزوو ویستی خۆیان بوو، پێشتر پێغەمبەری خوا ﷺ لەلای ئەبوبەکر و عومەر باسی ئەم کاروانەی کرد، ئەوان ڕەزامەندییان دەربڕی بۆیە خەڵکی تریش ئامادەی دەرچوون بوون و ڕەزامەندیان بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ نیشاندا، لەگەڵ ئەوەی کە موهاجیر و ئەنسار بۆ ئەم چالاکییە ئامادەی دەرچوون بوون، بەڵام پێغەمبەری خوا ﷺ زیاتر دەیویست قسەکانی ئەنسارەکان ڕوون بن، بەکەیف و ویستی خۆیان زۆریان لەسەر نەکرێت، نەوەک بە ئیحراجی و ڕووگیری ئامادەی ئەو چالاکییە ببن، پێغەمبەری خوا ﷺ چاوەڕێی زیاتری لێدەکردن بۆ ئەوەی زیاتر قسە بکەن، تەنانەت سەعدی کوڕی عوبادە فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ زیاتر بۆچوونی ئێمەت دەوێت؟

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بەڵێ.

سەعد وتی: سوێند بەو کەسەی نەفسی منی بەدەستە، ئەگەر ئەمرمان پێ بکەیت و جەنابت بفەرمووی ئەوا بەنێو شەپۆلەکانی دەریادا دەڕۆین، بەخۆمان و ئەسپەکانمان فەرمانمان پێ بکە دەیپەڕینەوە، تا دەچینە نێو شاری (برک الغماد) شارێکی کۆنە لەسەر کەناری ڕۆژئاوای باشووری دەریای سووری نیوەدوورگەی عەرەبی.

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

٦٣ ـ (وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ، لو أَمَرْتَنَا أَنْ نُخِيضَهَا البَحْرَ لأَخَضْنَاهَا، ولو أَمَرْتَنَا أَنْ نَضْرِبَ أَكْبَادَهَا إلى بَرْكِ الغِمَادِ لَفَعَلْنَا).

صحيح مسلم ١٧٧٩.



لەدوای ئەوەی سەعد تەواو بوو، ژمارەیەکی زۆر لە ئەنسار لە ئەوس‌و خەزرەج، بۆ جەنگ دەرچوون.

ماکوان: سوپای موسڵمانان چۆن بوون، سیمای سوپای ئیسلامی چۆن باس دەکەیت؟

## سیمای سوپای موسڵمانان لە جەنگی بەدر

نومێر: ژمارەی ئەنسارەکان لەنێو سوپاکەدا بریتی بوو لە (٢٣١) جەنگاوەر یاخود موجاهید، (٦١) سەربازیان لە هۆزی ئەوس بوون، (١٧٠) سەربازی تریان لە هۆزی خەزرەج بوون، لەهەمان کاتدا (٨٣) سەرباز لە سوپای موسڵمانان لە موهاجیرەکان بوو.

پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ چەکی بۆ جەنگ کردن ئامادە نەکرد، تەنها وەکو چەکی سەفەرکردن و زادێکی کۆچەر چەکی ئامادە کرد و لەخۆیدا هەڵیگرت، تەنها (٢) ئەسپی لەگەڵ خۆی برد، لەگەڵ (٧٠) وشتر، سوپاکەی کردە دوو بەش، موهاجیر و ئەنسار. ئاڵای موهاجیرەکان درایە دەست عەلی کوڕی ئەبو تاڵیب، ئاڵای ئەنسارەکانیش درایە دەست سەعدی کوڕی موعاز، ئاڵای سوپاکەش درایە دەست هاوەڵی بەڕێز: موسعەبی کوڕی عومەیر، پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ قەیسی کوڕی سەعسەعەی لەکۆتایی سوپاکەدا دانا، ئەم ڕێکخستنی سوپایە لەوپەڕی هێز و خۆئامادەکردندا بووە، چونکە لەبیرمان نەچێت پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ بۆ کاروانێکی ئابووری قورەیش دەردەچێت، کە (٣٠) بۆ (٤٠) کەس پاسەوانی دەکات، ئەمەش ئەوە نیشان دەدات سوپای ئیسلام (٢٥) جار بەتواناترە لە پاسەوانی کاروانەکە، هەواڵگری(موخابەراتی) ئیسلامیی و چاوەکانی کە چاودێریان دەکرد دەستنیشانیان کرد کە کاروانەکە بەدۆڵی بەدردا تێپەڕ دەبێت، بەدریش (٧٠)کم لە مەدینەی پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ دوورە کەوتۆتە باشووری شاری مەدینە، پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ ڕاستەوخۆ دەرچوو بەرەو بەدر بۆ ئەوەی پێش گەیشتنی کاروانەکە ڕێگە لە کاروانەکە بگرێت.



## ڕێگا گۆڕینی كاروانەكە لەلایەن ئەبو سوفیانەوە

نومێر: لەلایەكی دیكەوە ئەبو سوفیان كە سەرۆكی كاروانەكە بوو، ئەو پیاوە یەكێک بوو لە پیاوە هەرە زیرەكەكانی عەرەبو خاوەن پلان و چاودێری تایبەتی خۆی بوو، ئەویش خاوەن موخابەرات و چاودێر بوو، توانی ئەوە بزانێت و بۆی ئاشكرا بوو كە پێغەمبەری خوا صَلَّىٰ اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ بۆ كاروانەكەی دەرچووە و بۆی لەكەمیندایە، بەڵام نەیدەزانی پێغەمبەری خوا صَلَّىٰ اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ گەیشتۆتە كوێ.

بەڵام كاتی بەفیڕۆ نەدا و خێرا پەیامی دایە شاری مەككە بۆ ئەوەی سوپا ڕێكبخەن و دەرچن بۆ بەرگری كردن لە سەروەت و سامانیان، پەیام و نامەكەی بەكەسێكدا نارد ناوی زەمزەمی كوڕی عەمری غیفاری بوو.[٦٤]

بەخێرایی زەمزەمی كوڕی عەمر گەڕایەوە شاری مەككە، لەسەر وشترەكەی وەستا و كراسەكەی خۆی لەبەر دادڕی و كردییە دووبەش، هاواری دەكرد و دەیقیژاند ئەی خەڵكی شاری مەككە! ئەی قورەیش فریا كەون فریا كەون، هەموو سەروەت و سامانتان لەگەڵ ئەبو سوفیاندایە، ئەویش موحەممەد و هاوەڵانی ڕێگەیان پێگرتووە، بڕوا ناكەم بتوانن فریا بكەون، هاوارە ئەم عەیب و عارە لەسەرتان هەڵگرن و فریای بكەون، خەڵكی هەموو ڕاپەڕین و خۆیان ئامادەكرد، كارەكەیان زۆر بەجددی وەرگرت، هێشتا برینی كاروانی نەخلەیان ساڕێژ نەبووە، لەبەر ئەوە زۆر بەزوویی هاتنە دەست و كارەكەیان بەگرنگ وەرگرت.

ماكوان: ئەی سیما و سوپای هێزی قورەیشی موشریک چۆن بوو؟

## سیمای سوپای كافران

نومێر: قورەیش دەستی كرد بە كۆكردنەوەی سەرباز و ڕێكخستنی سوپا، بەوپەڕی هێز و توانا و لەسەر ئاستێكی زۆر بەرز.

- (١٣٠٠) سەربازی لە قورەیش و هۆزەكانی تری عەرەبی چواردەوری مەككە ئامادە كرد، لەدوای ئەوەی زانرا كاروانەكەی ئەبو سوفیان ڕێگەی خۆی گۆڕیوە و پارێزراوە، (٣٠٠) كەس لەڕێگەدا گەڕانەوە بەرەو شاری مەككە.

- (١٠٠) ئەسپ.

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

٦٤ ـ ضمضم بن عمرو الغفاري.



- (٦٠٠) کەسی درع، جۆرێکە *لەسەربازی تایبەتی* ئەوسەردەمە.

- *لەسەروو* (١٠٠٠) وشتر ژمارەکەی نەزانراوە، چونکە ڕۆژانە بۆ نانداني سوپاکە (٩ بۆ ١٠) وشتر سەردەبڕدران.

- لەگەڵ ئەو هەموو سوپایەدا گەورە پیاوانی قورەیشیش دەرچوون، واتە: سەرکردەی کوفری قورەیش هەموویان هاتن بۆ جەنگ وەک: عوتبەی کوڕی ڕەبیعە، شەیبەی کوڕی ڕەبیعە، وەلیدی کوڕی عوتبە، ئەبو جەهل، عوقبەی کوڕی ئەبو موعیت[٦٥]، بەڵام ئەبو لەهەب لەگەڵیان دەرنەچوو، کەسێکی لەجیاتی خۆی نارد.

- ئەوەی سەرکردایەتی هەموو سوپای موشریکی قورەیشی دەکرد، فیرعەونی ئەم ئوممەتە بوو، ئەبو جەهل و یەکێک لە گەورە پیاوانی قورەیش، هێزێکی گەورە و ترسناک و خەتەرناک، هەموو کافران بەشداربوون لە ڕێکخستنی ئەو سوپا بەهێزە.

- خودی ئیبلیس بەشدار بوو لە جەنگەکە.

ماکوان: شەیتان خودی خۆی بەشدار بوو لەو جەنگەدا؟

نومێر: بەڵێ، شەیتان ئیبلیسی لەعنەتی خودی خۆی تێیدا بەشدار بوو، هانی موشریکەکانی دەدا بۆ جەنگ.

## هاوکاری ئیبلیس بۆ کافران لە جەنگی بەدر

نومێر: خودی شەیتانی گەورە ئیبلیس لەعنەتی خوای گەورەی لێبێ، کاتێک قورەیش بڕیاری دەرچوونی دا، قورەیش کێشەی لە هۆزی بەنی بەکردا هەبوو لەغەدر و خیانەتی هۆزی بەنی بەکر دەترسان، کێشەیەکی کۆن لەنێوانیاندا هەبوو لەو سەردەمەدا سەری هەڵدابوو، کێشەکە بەبێ چارەسەر کراوەی مابووەوە، قورەیش زۆر دوودڵ بوون لە دەرچوون، ئیبلیس لەسەر شێوەی (سوڕاقەی کوڕی مالیکی جەعشەمی مەدلەجی) یەکێک بوو لە گەورە پیاوانی هۆز و تیرەی بەنی کینانە هات و وتی: (من پەیمانتان دەدەمێ و گرەنتی ئەوەتان دەکەم لە پشتەوە، واتە: لە پشتی قورەیش هەرچی ڕوویدات کینانە هاوکاری قورەیشە لەوەی لێی دەترسێن، کاتێک ئەمەیان بیست ئیتر هەموویان بۆ جەنگ کردن دەرچوون).[٦٦]

---

٦٥ ـ عتبة بن ربيعة، شيبة بن ربيعة، وليد بن عوتبة، أبو جهل، عقبة بن أبي معيط.

٦٦ ـ فَقَال لَهم الشَّيطان: أَنَا لَكُمْ جَارٌ مِنْ أَنْ تَأْتِيَكُمْ كِنَانَةُ مِنْ خَلْفِكُمْ بِشَيْءٍ تَكْرَهُونَهُ، فَخَرَجُوا سِرَاعًا). سندها صحيح ولها اكثر من طريق.



داخۆ چەندجار شەیتان دژی موسڵمانان لەسەر شێوەی مرۆڤ جەنگی هەڵگیرساندبێ، بەبێ ئەوەی کەس زانیبێتی، تەنها خوای گەورە زانایە بەسەرمانەوە، بەڵام هەمیشە پیلان و کاری شەیتان لاوازە، خوای پەروەردگار دەفەرمووێ:

﴿ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ يُقَٰتِلُونَ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِۖ وَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ يُقَٰتِلُونَ فِي سَبِيلِ ٱلطَّٰغُوتِ فَقَٰتِلُوٓاْ أَوۡلِيَآءَ ٱلشَّيۡطَٰنِۖ إِنَّ كَيۡدَ ٱلشَّيۡطَٰنِ كَانَ ضَعِيفًا﴾

واتە: ئەوانەی ئیماندارن تەنها لەپێناوی خوا دەجەنگن، (بەڵام) ئەوانەی بێباوەڕن لەپێناو ستەمکار و زۆردار و تاغووتدا دەجەنگن، دە بجەنگن دژی یاوەرانی شەیتان، (چونکە ) بەڕاستی پیلان و تەڵەکەی شەیتان پووچ و لاوازە.

شەیتان هۆکاری سەرەکی بوو بۆ دەرچوونی قوڕەیش، بەدرۆ هانی ئەوانی دا کە هەرچییان کردووە جەنگەکە بکەن، بۆ ئەوەی چیتر موسڵمان بۆر نەبن بەسەر قوڕەیشدا، بەم جۆرە هانی قوڕەیشیدا بۆ جەنگ کردن، خودی ئەبو جەهل هاوشێوەی شەیتان هانی خەڵکی دەدا بۆ دەرچوون بۆ جەنگ.

## ئەبوجەهل هاوشێوەی ئیبلیس

نومێر: بەهەمان شێوە ئەبو جەهل وەکو شەیتان کاری دەکرد بگرە لەو زیرەکتر و بەتواناتر بوو، زۆر لەو گەورەتر کاری دەکرد، ئەوەی ئەبو جەهل دەیکرد بە خەیاڵی شەیتاندا نەدەهات، ڕایکرد هەر بەزۆر هەموو سەرۆک عەشیرەت و هۆزەکانی لەگەڵ خۆیدا برد بۆ جەنگ، وای لێکردن هەمووی بەرەو مەرگ هەنگاو هەڵبهێننەوە، نموونەیەکت بۆ باس دەکەم ئەبو جەهل لەگەڵ ئومەییەی کوڕی خەلەف، زۆر سەرنج ڕاکێشە!

ئومەییەی کوڕی خەلەف یەکێک بوو لە تاوانبارە سەرەکییەکانی شاری مەککە، زۆر ئازاری موسڵمانانی دابوو، لەسەردەمی نەفامیدا هاوڕێی نزیکی سەعدی کوڕی موعاز بوو، کاتێک سەعد چوو بۆ سەردانی لەشاری مەککە، لەکاتی میوانداریەکەدا سەعد پێی وت: گوێی لە پێغەمبەری خوا ﷺ بووە فەرموویەتی: ئومەییە دەکوژرێت!

ئومەییە زیڕەی کرد و ترسی لێنیشت وتی: لەشاری مەککە دەمکوژن؟!

سەعد فەرمووی: نازانم.



ئومەییە بە نازانمەکەی سەعد ئەوەندەی تر ترسی لێنیشت، لەدوای ئەوەی قورەیش دەرچوون ئەو بەپەلە گەڕایەوە بۆ لای ژنەکەی و وتی: دایکی صەفوان بیرتە کە سەعد چی پێوتم؟

دایکی صەفوان: چی پێ وتی؟

وتی: موحەممەد وتوویەتی و ئاگاداری کردۆتەوە بە کوشتنی من!

وتم لە مەککە دەمکوژن؟ سەعد وتی: نازانم، وەڵاهی منیش لەشاری مەککە ناڕۆمە دەرەوە، ئەوە حاڵ و گوزەرانی سەرکردەکانی قورەیش بوو، خۆیشیان دەیانزانی ئەهلی خراپەکاری و باتڵن، ئەو ڕووداوانە باسی ئەو ڕەوشە دەکات بۆمان لەنێو دڵ و دەروونیاندا، دەیزانی کە ئەهلی ئیمان خەڵکی ڕاستگۆ و لەسەر حەقن، قسەکانیان ڕاست و دروستە و هەڵەی تێدا نییە و حەق هەرگیز باتڵ لەخۆی ناگرێت، بەڵام خۆ بەزلزانین و لووتبەرزی ئەهلی کوفر ڕێگرە لەبەرانبەر وەرگرتنی ئیماندا، هەموو ئیماندارێک دەبێت ئەوە باش بزانێت کە دوژمنەکەی لەنێو ناخ و دەروونیدا لە ئیمانداران دەترسن، ترسێکی وا تەنانەت لە خەونیشدا ڕایان دەپەڕێنێت، گەرچی سوپای بەهێز بێت و توانای زۆربێت و هاوپەیمانی هاوکاری زۆر بێت لەهەموو جێگاکاندا، بەڵام لە کۆتاییدا لە موسڵمانان دەترسێن.

کاتێک سوپای قورەیش بڕیاریدا دەربچێت بۆ بەدر، ئومەییە ترسا بکوژرێت وتی: دەرناچم، چونکە

دەیزانی کەلامی پێغەمبەری خوا ﷺ وەحییە و لەخۆیەوە قسە ناکات و ڕاستگۆیە، سەرەتا ئەبو

جەهل چوو بۆ لای پێیووت: ئەی باوکی سەفوان! تا ئێستا کەس تۆی نەبینیوە لە جەنگو ڕووبەڕووبوونەوەدا دوا بکەویت، دەترسیت لەکاتێکدا تۆ گەورە و سەرەوەری ئەم دۆڵەی، لەکاتێکدا تۆ دەرنەچیت بۆ جەنگ خەڵکەکەش نایەن، ئەبو جەهل زۆر هانیدا بۆ جەنگ و زۆر بەشان و باڵی هەڵیدا، بەڵام چارەی نەبوو وتی: دەرناچم و نایەم بۆ جەنگ، سەرەتا ڕەتی کردەوە بەڵام ئەبو جەهل وازی نەهێنا و بەزۆر دەیویست بەرەو مەرگی ببات، پاشان ئەبو جەهل عەترێکی ژنانەی بەدیاری بە تاوانبارێکی تر کە عوقبەی کوڕی ئەبی موعیت بۆ نارد، عەترەکەی دایە دەستی و وتی: لەمەولا لە ئافرەتانی خۆمانت هەژمار دەکەین، ئەویش وتی: خوا ناشیرینت بکات چۆن وا بەمن دەڵێیت؟ دیاری و قسەکەی بەکارهێنا بۆ ئەوەی دەربچێت لەگەڵیان، فشاری ئەبو جەهل و قسەکەی عوقبەی کوڕی ئەبی موعیت زۆر کاریگەری لەسەر ئومەییەی کوڕی خەلەف کرد و ناچاریان کرد بەچوونە دەرەوە بۆ جەنگ، بەڵام دەیزانی



دەكوژرێت بۆیە ویستی پلانێک دابنێ و خۆی لە مەرگ ڕزگار بكات، هەڵسا بە كڕینی بەهێزترین و خێراترین ئەسپ، بۆ ئەوەی زوو ڕابكات و هەڵبێت، گەڕایەوە ماڵەوە بۆ ئەوەی خۆی بۆ دەرچوون ئامادە بكات، پاشان دایكی سەفوان پێی وت: ئەی باوكی سەفوان بیرت چۆتەوە هاوڕێ و برادەرەكەی یەسریبت چی پێ وتووی؟ ئومەییە وتی: نا، بیرم نەچۆتەوە بەڵام زۆر ناڕۆم لەم نزیكانە دەگەڕێمەوە، لەكاتی دەرچوونی بۆ بەدر چەند جار دەیویست بگەڕێتەوە و هەوڵی گەڕانەوەی دەدا، بەڵام ئەبوجەهل و عوقبە و هاوڕێ تاوانبارەكانی وازیان لێ

نەهێنا هەتاوەكو گەیشتە بەدر، تا گەیشتە ئەو جێگایەی كە پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ

فەرمووبووی: لێرەدا دەكوژرێت.

﴿إِنَّهُمْ يَكِيدُونَ كَيْدًا ﴿١٥﴾ وَأَكِيدُ كَيْدًا ﴿١٦﴾﴾ [الطارق]

بەڕاستی ئەوان خەریكی پیلان و داودانانەوەن، بەڵام منیش پلان و نەخشەی خۆم دەخەمە كار.

زۆرجار سەرانی باتڵ سوپا و سەربازەكانیان بەرەو هەلاكەت دەبەن، خوای پەروەردگار لەبارەیانەوە دەفەرمووێ:

﴿ٱسْتِكْبَارًا فِى ٱلْأَرْضِ وَمَكْرَ ٱلسَّيِّئِ ۚ وَلَا يَحِيقُ ٱلْمَكْرُ ٱلسَّيِّئُ إِلَّا بِأَهْلِهِۦ ۚ فَهَلْ يَنظُرُونَ إِلَّا سُنَّتَ ٱلْأَوَّلِينَ ۚ فَلَن تَجِدَ لِسُنَّتِ ٱللَّهِ تَبْدِيلًا ۖ وَلَن تَجِدَ لِسُنَّتِ ٱللَّهِ تَحْوِيلًا ﴿٤٣﴾﴾ [فاطر]

پیلانی شەڕو تاوان تەنها بەسەر ئەوانەدا دەشكێتەوە كە نەخشەی بۆ دەكێشن.

ئەبو جەهل سەركردەی هێزی قورەیش بوو وایدەزانی باشترین هێزی دژی موسڵمانان ئامادە كردووە، وایدەزانی پلانی باشی دژی موسڵمانان داناوە، بەڵام خوای گەورە دەفەرمووێ:[٦٧]

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

٦٧ ـ هەمان ئایەتی پێشووتر.



## ئەبو سوفیان داوا لە قوڕەیش دەکات بگەڕێتەوە مەککە

نومێر: لەدوای دەرچوونی سوپای قوڕەیش زۆریان نەما بگەنە ناوچەی بەدر، لەلایەن ئەبو سوفیانەوە نامەی دووەمیان پێگەیشت، لەنامەکەدا دەڵێت: دەرچوون بۆ ئەوەیە کاروانەکەتان و سەروەت و سامانەکانتان بپارێزن، بەڵام سوپاس بۆ خوا خوای گەورە ماڵ و کاروان و سەروەت و خەڵکی لەگەڵ کاروانەکەدا پاراست، تکایە بگەڕێنەوە.

لێرەدا ئەبو سوفیان زانی سوپای موسڵمانان بۆ ناوچەی بەدر بەڕێکەوتوون و لەوێ کەمینیان داناوەتەوە، بۆیە خێرا بەرەو ڕۆژئاوا ڕێگەی گرتە بەر، لەسەر کەناری دەریای سوور تا بگاتەوە شاری مەککە، کاتێک قافڵە و کاروانەکەی لەدەستی موسڵمانان دەرباز کرد و هەڵهات، ئەبو سوفیان پێی وابوو لە ئێستادا کاتی ئەو جەنگە نییە، بەڵکو پێویستە خۆیان باشتر ئامادە بکەن هێز و توانای زیاتر کۆبکەنەوە، تا موسڵمانان بەتەواوی لەناو ببەن.

نامەکە دڵی زۆربەی هەرەزۆری سوپاکەی خۆشکرد و حەزیان بە جەنگ کردن نەدەکرد، وەک ئومەییەی کوڕی خەلەف زۆربەیان دەترسان، چونکە دەیانزانی ناحەقی زۆر و زوڵمی زۆریان دەرهەق بە موسڵمانان کردووە، هەموو دەیانویست بگەڕێنەوە بۆ مەککە.

بەڵام ئەبو جەهل بە ڕێگری کردن لە گەڕانەوە، هانی سوپاکەی دەدا بۆ جەنگ کردن، هەروەک چۆن فیرعەون بەزۆر سەربازەکانی بەنێو دەریاکەدا برد، تا ئەوەی هەموویان لەنێو ئاودا خنکان، ئەبو جەهل وتی: وەڵڵاهی کەس ناگەڕێتەوە، هەتا نەچینە بەدر، دەبێ وەکو سوپای سەرکەوتوو سێ ڕۆژ لەدۆڵی بەدردا بمێنینەوە، حەیوان سەردەبڕین، گۆشت دەبرژێنین، خواردن و خواردنەوە دەخۆین، مەی و عارەق دەخۆینەوە، مۆسیقا و سەما دەکەین، هاوشێوەی هەموو ئەو سوپایانەی لەجەنگدا سەرکەوتوو دەبن، تا هەموو عەرەب هەواڵمان بزانن، بزانن کە ئێمە سەرکەوتووین و گەڕانەوەمان وەکو سوپای سەرکەوتووو دەبێت، دەبێ هەتا هەتایە خەڵکی لێمان بترسن.

ماکوان: ئەی هەموو بەقسەی ئەبوجەهلیان کرد، بەرەو دۆڵی بەدر ڕۆیشتن؟

نومێر: بەڵێ زۆرینە ناچار بوون، هەرچەندە ڕای جیاواز کەوتە نێوانیان، هەندێکیان گەڕانەوە بۆ شاری مەککە.



## سوپای دەوڵەتی مەککە دووبەرەکی تێدەکەوێت

سەرکردایەتی ئەخنەسی کوڕی شورەیق[٦٨] گەڕانەوە، ئەوەی لەهۆز و تیرەی بەنی زووهرە بوو بەتەواوی لەگەڵیدا گەڕانەوە بریتی بوون لە (٣٠٠) سەرباز، ئەم ڕاجیایی و دووبەرەکییە لەنێو هێزی کافراندا، سەرکەوتنێکی زۆر گەورە بوو بۆ ئیمانداران.

لە ئێستادا سوپای قوڕەیش هەزار سەربازە، بەرەو ڕێگەی بەدر کەوتنە ڕێ، زۆریان نەماوە بگەنە بەدر، بەڵام لە جێگەیەکدا لەسنووری بەدر بەناوی (عەدوەت و قوسوا) (بالعدوة القصوى).

ماکوان: سوپای موسڵمانان حاڵ و گوزەرانیان چۆنە؟

نومێر: هەواڵگری سەربازی ئیسلامی (ئیستیخبارات) دوو هەواڵی گرنگی بۆ سوپای پێغەمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰٓ آلِهِۦ وَسَلَّمَ گواستەوە، زۆر گرنگ بوو:

یەکەم: هەڵهاتنی کاروانەکە.

دووەم: سوپای مەککە نزیکە بگاتە دۆڵی بەدر.

لە ئێستادا ڕەوشەکە زۆر ترسناک و خەتەرناکە، هێز و توانای موسڵمانان بەهێز بوو لەچاو قافڵەکەی ئەبو سوفیان. بەڵام سێ جار لاوازترە بەرانبەر سوپای سەربازی قوڕەیش کە خۆیان ڕێکخستووە بۆ جەنگ، هێزی موسڵمانان تەنها بۆ جەنگێکی کەمین و ڕێگا پێگرتن خۆیان ئامادە کردووە، بەگوێرەی

پێویست چەک و جبەخانەی پێویستیان پێنییە.

ماکوان: ئەی چارە چییە؟

نومێر: چارە دوو ڕێگایان هەیە، پلانی(أ) گەڕانەوەی سوپا بۆ شاری مەدینە، پلانی (ب) جەنگ لەگەڵ هێزێک سەربازەکانی سێ جار هێزی موسڵمانانە، خاوەنی چەکی بەهێزو توانای بەهێزترن.

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

٦٨ ـ أخنس بن شريق.



لێرە ئیتر بۆمان دەردەکەوێت سوپای موسڵمانان سیمای سوپای سەرکەوتووە، ڕوخساری ئەم سوپایە سەرکەوتن پیشان دەدات، پێشتر ئاماژەمان پێکرد پێناسەو سیمای سوپای سەرکەوتوو لە سوپای بەدردا کۆبۆتەوە، هەر سوپا و سەربازانێک و سەرکردەیەک دەیەوێت سەربکەوێت دەبێ باش لە سوپای بەدر بکۆڵێتەوە تا ئەوانیش بەو ئەدەوات و کارانەی ئەوان کردوویانە بۆ سەرکەوتن ئەمیش بیگرێتە بەر.

کەواتە: هەر ڕەوەند و جیلێکی موسڵمان بیانەوێت سەربکەون دەبێ ڕێگا و شوێنی سوپای بەدر بگرنە بەر، ئینجا سەردەکەون، بۆ ئەوەی باشتر لە سیمای سوپای سەرکەوتوو تێبگەین، پێویستە سوورەتی ئەنفال بەجوانی تێبگەین و تەدەبوری بکەین، ئەو سوورەتە هەمووی باسی سوپای بەدرە.

ئێستا دوو ڕێگا یاخود دوو بژاردە لەبەردەم پێغەمبەری خوادایە ﷺ

یەکەم: جەنگ، دووەم: گەڕانەوە بۆ شاری مەدینە، یاخود هەڵهاتن!

بەڵام پێغەمبەری خوا ﷺ لەناخەوە حەزی لە جەنگ بوو، چونکە کشانەوە کاریگەری زۆر گەورە و خراپ دروست دەکات، کشانەوە کاریگەری خراپی لێدەکەوێتە سەر موسڵمانان و ترسو بیم دەکەوێتە دڵیان، ئەوەی لە مەفرەزەی نەخلە بەدەستیان هێناوە بۆیان دەبێتە هۆکاری خراپ، دەستکەوتەکەیان لەبیر دەباتەوە، هانی زیاتری کافرو جوولەکە دەدات بۆ لێدانی موسڵمانان، بگرە جورئەتی ئەوەیان بۆ دروست دەبێ هێرش بکەنە سەر شاری مەدینە، لەکاتی گەڕانەوەی موسڵمانان بۆ مەدینە لەوانەیە قوڕەیش بەرەو مەدینە هەنگاو هەڵبهێنێتەوە، گەڕانەوە زۆر ترسناکە و خەتەرناکی زیاترە لە جەنگ.

لەهەمان کاتدا پێغەمبەری خوا ﷺ سەرکردەیەکی دیکتاتۆر و خۆویست نییە، وەکو ئەبوجەهل بۆ خاتری خۆی کۆمەڵەکەی کار پێ بکات! چونکە سەرکردەی دیکتاتۆر لەناخیدا وایە تەنها بۆچوونی ئەو ڕاستە و بەس، ئەو لەهەموو بوارەکانی شارەزایە، لەبەر ئەوە پێویست ناکات پرسو ڕاوێژ بەگەلەکەی بکاتو شوورایان بۆ دروست بکات، بەڵام پێغەمبەری خوا ﷺ وانەبوو، بڕوای تەواوی بە شوورا و ڕاوێژ و قسەکردن هەبوو لەگەڵ تەواوی سوپاکەیدا بەئاشکراو شەفافانە. هەربۆیە یەکێکی تر لە سیفاتو پێناسەی سوپای سەرکەوتوو شوورا و ڕاوێژ و پرس پێکردنە.

ماکوان: ئەی مەگەر پێغەمبەر ﷺ وەحی بۆ نایە چ پێویستی بە شوورا و ڕاوێژ پێکردنە



نومێر: ئەو قسە زۆر ڕاستە، بەڵام ڕاوێژ و شوورا لەوەدایە کە دەقی لەسەر نییە، دەق بە قورئان یاخود بە فەرمووده بوونی هەبوو شوورا هیچ کاری پێ ناکرێت، هەموو ملکەچی وەحی دەبن.

## شوورا و پرەنسیپی پیادەکردن

نومێر: پێغەمبەری خوا ﷺ هەمیشە ڕاوێژ و پرسی بە خەڵکەکەی و ئوممەتەکەی کردووە، لەو بوارانەی کە وەحی تێدا نەهاتووە، هەروەکو ئاماژەم پێدا ئەگەر کارێک ئەمری خوا و پێغەمبەرەکەی لەسەر بێ ئەوە بەدڵنیاییەوە بێجگە لە گەردنکەچی هیچ بژاردەیەکی تر نییە، کەواتە: ڕاوێژ و شوورا توخمێکی گرنگە لەم ئایینە، ئەگەر ئەمرێکی خوایی نەبوو پێویستە شوورا و ڕاوێژ بکرێت، هەموو جووڵانەوەیەکی پێغەمبەر ﷺ بە شوورا و ڕاوێژ بووە، کاتێک لەشاری مەدینە دەردەچوو ڕاوێژی دەکرد کاتێک دەچووە جەنگ پرس و ڕاوێژی دەکرد، لەکاتێکدا بۆ لێدانی ئابووری قورەیش و قافڵەکەی هەر بە پرسو ڕاوێژ بوو، لەداهاتوودا زیاتریش شوورا و پرس و ڕاوێژی پێغەمبەری خوا ﷺ دەبینین، لەزۆر جێگەو شوێندا دەکەوێتە بەرچاومان و زۆرجار وا هەست دەکەیت واجب و فەرزە لەسەر موسڵمانان دەبێ هەموو شتێکیان بە پرسو ڕاوێژ بێت.

کەواتە: دەتوانین بڵێین سیمای سوپای سەرکەوتوو پیادەکردنی پرەنسیپی شوورا و ڕاوێژە، بەڵام ڕاوێژ و پرسی ڕاستی حەقیقی، نەک دراما و فیلم لەبەرچاوی گەلدا یان بەناوی دیموکراتییەوە و لەناوبردنی گەلانی تر، بەڵکو شوورایەک ئامانجی بڕیاری ڕاست و دروست بێت بۆ ئوممەتەکەی.

پێغەمبەری خوا ﷺ مەجلیسێکی شوورا و ڕاوێژی ڕێکخست کە هەموو سوپاکە گوێگربن و بەشداربن، ئاڵوگۆڕی ڕاو بۆچوونەکانیان بکەن، چوون ئەم کێشەیە زۆر گەورەیە و هەر بۆیە شوورای بەو گەورەییە بەست، پێویست بوو کە هەر (٣١٤) گوێبیست بن، یەکەم ڕاوێژکاری پێغەمبەری خوا ﷺ دەستی کرد بە قسەکردن کە بریتی بوو لە ئەبوبەکری سدیق، هانی پێغەمبەری ﷺ دا بۆ جەنگ، پاشان ڕاوێژکاری دووەمی پێغەمبەری خوا ﷺ بەهەمان شێوە، لەگەڵ جەنگ کردندا بوو، ئەویش عومەری کوڕی خەتتاب بوو.



پاشان ڕاوێژکارێکی سەربازی هەڵسا و دەستی کرد بە قسەکردن، بەناوی میقدادی کوڕی عەمر قسەی زۆر جوانی کرد، تەنانەت لەسەر قسەکانی میقداد عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود کۆمێنتارێکی هەیە دەڵێ: ئەوەی کە لەو وێستگەیەدا وتی: (میقدادی کوڕی ئەسوەد) بەم ناوەش بانگ دەکرا، حەزم دەکرد من بموتایە قسەکەی ئەوەندە جوان بوو، هیچ شتێک ناتوانێت بەرانبەری بوەستێتەوە، واتە: هیچ وێستگەو هەڵوێستێك نییە هێندەی ئەو هەلویستەی میقداد جوان بێت.

میقداد وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوەی خوای گەورە فەرمانت پێدەکات ئەنجامی بدە، سوێند بەخوا ئێمە وەک هاوڕێکانی مووسا نالێین: بڕۆ تۆو خواکەت جەنگ بکە، ئێمە لێرە چاوەڕێتان دەکەین بەڵام ئێمە دەڵێین: بڕۆن تۆو خواکەت جەنگ بکەن، ئێمەش بەدواتاندا دەجەنگین سوێند بەوەی تۆی بەحەق ناردووە ئەگەر بمانبەیت بۆ شاری (برک الغماد) هیچ وتووێژو لارییەک نانوێنین و بەدواتدا دێین، دەجەنگین بێئەوەی هیچمان پێ بڵێیت تا دەگەیتەوە ئەو جێگایە، (دیارە شاری برک الغماد، وەکو نموونەو مەسەلە هاتۆتەوە لای ئەنسار).[٦٩]

پێغەمبەری خوا ﷺ بە قسەکانی میقداد زۆر خۆشحاڵ بوو، پێشتریش بە قسەکانی ئەبوبەکرو عومەر، بەڵام بەردەوام چاوەڕوانی زیاتری پرسو ڕاوێژی زیاترە لە سوپاکەی، هەر دەیفەرموو: ڕاوێژتان پێدەکەم تکایە بۆچوونی خۆتان بڵێن، (أشيروا عَلَيَّ أَيُّهَا النَّاس)

پێغەمبەری خوا ﷺ لەزۆرێک لە جێگاکاندا بەڕاوێژی ئەبوبەکر و عومەر کۆتایی دەهێناو دەیفەرموو: ئەگەر ئەو دوو کەسە لەسەر شتێک ڕاوێژیان پێ بکەم کۆک بن، ئەوا منیش ڕام لەگەڵ ڕای ئەوانە (لو إجتمعا ما فی مشورة ما خالفتکما) بەڵام لێرە پێغەمبەری خوا ﷺ زیاتر داوای پرسو ڕاوێژی دەکرد، تەنانەت دوای قسەکانی میقدادیش هەر چاوەڕێی زیاترە.

ڕاستە میقداد لە ئەنسار بوو بەڵام دیارە پێغەمبەر ﷺ ڕای ئەوانی زیاتر دەوێت، چونکە پێغەمبەر ﷺ بەشتا گوێی لە ئەنسارو سەرکردەکانی ئەنسار نەبووە بەتەواوەتی، ئەنسار پێشتر لە مەدینە ڕازی بوون بە دەرچوون لەگەڵ پێغەمبەردا

---

٦٩ ـ (يا رسول الله امض لما أراك الله فنحن معك والله لا نقول لك كما قالت بنو إسرائيل لموسى عليه السلام اذهب أنت وربك فقاتلا إنا ها هنا قاعدون ولكن اذهب أنت وربك فقاتلا إنا معكما مقاتلون فوالذي بعثك بالحق لو سرت بنا إلى برك الغماد لجالدنا معك من دونه حتى تبلغه)صحيح، اخرجه البخاري.



ﷺ، بەڵام بۆ كاروانەكە ئێستا كاروانەكە لەكیس چووە، ئێستا ڕووبەڕووی سوپایەكی گەورە دەبنەوە هەرچەندە پێغەمبەری خوا ﷺ ئەگەر ئەمریان پێبكات گەردن كەچن بۆ فەرمانی پێغەمبەر ﷺ.

فەرمانی ڕاستەوخۆ جێبەجێ دەكەن، چونكە ئەوان لە ئیمانێكی بێوێنەدان، كاتێك لەشاری مەككە لە پەیمانی عەقەبەی دووەمدا كاتێك ئەنسار بەیعەتیان دایە پێغەمبەر ﷺ لەسەر سەرخستنی لە شاری مەدینەدا هیچ فەرمانێكی خوای لەسەر نییە كە لە دەرەوەی مەدینەدا جەنگو جیهاد بكەن، لێرەدا شوورا یەكلاكەرەوەی كێشەكانە، پێغەمبەری خوا ﷺ نەیدەویست بەزۆر فەرمانی جەنگ بە ئەنسار بدات لەدەرەوەی شاری مەدینە، چونكە جیاوازی هەیە لەنێوان دوو كەسدا كە جیهاد بكات بەزۆر و پێی خۆش نەبێت، كەسێكی تر جیهاد بكات لەپێناوی خودا بەحەز و ئارەزووی خۆی، ئەوەشمان لەبیر نەچێت ئەنسار سێ بەشی سوپاكەیە، پێكهاتەیەكی زۆر گەورەن، چەندجار پێغەمبەری خوا ﷺ دووبارەی كردەوە فەرمووی: ڕاوێژ و پرس و ڕاتانم بدەنێ؟!

لەو كاتەدا سەعد سەری بەرزكردەوەو وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ لەوە دەچێت ڕا و بۆچوونی ئێمەت بوێت؟ پێغەمبەری خوا ﷺ زۆر ڕاشكاوانە فەرمووی: بەڵێ ڕای ئێوەم دەوێ، (گوێ لە قسەكانی سەعد بگرە بڕوا بكە پێویستە بەئاوی ئاڵتوون بنووسرێتەوە، ئەوەندە قوڵ و جوانە، تەنانەت سیفاتو پێناسەی دایە سوپاكە بۆ سەركەوتن).

ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئێمە ئیمانمان پێت هێناوە و بەڕاستگۆمان داناویت، شایەتی دەدەین ئەوەی هێناوتە هەمووی حەقو ڕاستە، هەر لەسەر ئەو بنەمایە پەیمانو عەهدو گفتمان پێداویت بۆمان نووسیویت لەسەر گوێڕایەڵیو بەجێهێنانی فەرمانەكانت، جا ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ كوێ دەڕۆیتو دەمانبەیت ئێمە ئامادەین. سوێند بەوەی ناردوویەتی بە حەق، ئەگەر داوامان لێ بكەیت بەناو شەپۆلی دەریادا بڕۆین، ئەوا لەگەڵتا شەپۆل و نێو دەریا دەبڕین، یەك پیاو لە سەربازانی ئەنسار نابینی سەرپێچیت بكات، حەزمان بە ڕاكردنو هەڵهاتن نییە لەبەرانبەر دوژمنەكانمان، ئێمە لە جەنگ ئارامگرین و ڕاستگۆین لە ڕووبەڕووبوونەوەدا، ئەوەی خوای پەروەردگار لە ئێمەی دەوێت ئێمە دەیكەین، بەڵكو خوای گەورە دڵخۆشو ئارامیمان پێببەخشێت، بڕۆ لەسەر بەرەكەتی پەروەردگار، لەوانەیە ترسی ئەوەت هەبێتو بڵێیت: گوایە ئەنسار تەنها هەقی ئەوەیان هەیە لەنێو ماڵو شاری خۆیاندا بمپارێزن؟! بەڵام ئەوا من لێرەوە بەناوی هەموو ئەنسارەوە پێت دەڵێمو



لەجیاتی ئەوان وەڵام دەدەمەوە، چیت لە ئێمە دەوێ داوا بکە، لەگەڵ کێ پەیوەندی دەبەستی بیبەستە، لەگەڵ کێ پەیوەندی دەپچڕێنی بیپچڕێنەو سەرپشکی، بەئارەزووی خۆت لەماڵو سەروەتو سامانمان ببە، بەکوێی ئەدەی سەرپشکی، ئەوەی کە دەیبەیت لەسەروەتو سامانمان لامان خۆشەویستترە لەوەی بۆمان بەجێ دەهێڵی، هەر فەرمانێک تۆ دەیفەرموویتو هەر ئەمرێک لەلای جەنابتە ئێمە ملکەچین، شوێن فەرمانەکەت دەکەوین و سەرپێچی ناکەین، وەڵاهی ئەگەر ئەمر بفەرمووی تا شاری برکی غەمەدان لەگەڵتا دێین، وەڵاهی ئەگەر فەرمانمان پێ بکەیت بەنێو شەپۆلی دەریادا دەڕۆینو لەگەڵتدا دەریاو شەپۆلەکانی دەبڕین.[٧٠]

ئەمانە ئەنسارن تەنها ئیماندار خۆشی دەوێن، ئەوەی ڕقی لێیانە مونافیقە. کاتێک پێغەمبەر صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ گوێی لە قسەکانی بوو زۆر خۆشحاڵ بوو، بەوپەڕی چالاکیو تواناو هێزەوە هەڵسایەوە، ڕووی کردە خەڵکەکە بە حەماسو وتاری ئاگرین فەرمووی: بڕۆنو موژدەتان لێبێت، بەڕاستی خوای پەروەردگار پەیمانی یەکێک لەو دووانەی پێداوم، یان گرتنی کاروانەکە یان سەرکەوتن لە بەدر، سوێند بەخوا چاوم لە جێگەی تەرمو مەیتەکانی قوڕەیشە.[٧١]

عومەری کوڕی خەتاب لە خاکی بەدردا لەگەڵ پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ پیاسەی دەکرد، پاشان بۆ پیاسە چەند موسڵمانێکی دیکەیان لەگەڵ کۆبۆوە، شەوێک پێش دەستپێکی بەیەکگەیشتن لە بەدردا، پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ دەڕۆیشت لەگەڵ هاوەڵانیدا

---

٧٠ ـ قَالَ لَهُ سَعْدُ بْنُ مُعَاذ: (وَاللّهِ لَكَأَنّك تُرِيدُنَا يَا رَسُولَ اللّهِ؟ قَالَ أَجَلْ قَالَ فَقَدْ آمَنّا بِك وَصَدّقْنَاك، وَشَهِدْنَا أَنّ مَا جِئْتَ بِهِ هُوَ الْحَقّ وَأَعْطَيْنَاك عَلَى ذَلِكَ عُهُودَنَا وَمَوَاثِيقَنَا، عَلَى السّمْعِ وَالطّاعَةِ فَامْضِ يَا رَسُولَ اللّهِ لِمَا أَرَدْتَ فَنَحْنُ مَعَك، فَوَاَلّذِي بَعَثَك بِالْحَقّ لَوْ اسْتَعْرَضْتَ بِنَا هَذَا الْبَحْرَ فَخُضْتَهُ لَخُضْنَاهُ مَعَك، مَا تَخَلّفَ مِنّا رَجُلٌ وَاحِدٌ وَمَا نَكْرَهُ أَنْ تَلْقَى بِنَا عَدُوّنَا غَدًا، إنّا لَصُبُرٌ فِي الْحَرْبِ صُدُقٌ فِي اللّقَاءِ. لَعَلّ اللّهَ يُرِيك مِنّا مَا تَقَرّ بِهِ عَيْنُك، فَسِرْ بِنَا عَلَى بَرَكَةِ اللّهِ) سيرة إبن هشام، ج١، ص٦١٥.

٧١ ـ (لَعَلّكَ تَخْشَى أَنْ تَكُونَ الأَنصارُ تَرَى حقاً عليها أن لا ينصروك إلا فى ديارها، وإنى أقول عن الأنصار، وأُجِيب عنهم: فاظْعَنْ حَيْثُ شِئْت، وَصِلْ حَبْلَ مَنْ شِئْتَ، واقْطَعْ حَبْلَ مَنْ شِئْتَ، وخُذْ مِنْ أَمْوَالِنَا مَا شِئْتَ، وَأَعطِنَا مَا شِئْتَ، وَمَا أَخَذْتَ مِنَّا كَانَ أَحَبَّ إلَيْنَا مِمَّا تَرَكْتَ، ومَا أَمَرْتَ فِيهِ مِنْ أَمْرٍ فَأَمْرُنَا تَبَعٌ لأَمْرِكَ، فَواللهِ لَئِن سِرْتَ حَتَّى تَبْلُغ البَرْكَ مِنْ غمدَان، لَنَسِيرَنَّ مَعَكَ، وَوَاللهِ لَئِنِ اسْتَعْرَضْتَ بِنَا هذَا البَحْرَ خُضْنَاهُ مَعَكَ") إبن القيم، زاد المعاد، ج٣، ص١٧٣.

(سيروا وأبشروا، فن الله قد وعدني إحدى الطائفتين، والله لكأني الآن أنظر إلى مصارع القوم) إبن كثير السيرة النبوية، ج٣، ص٤٩٠.



دەیفەرموو: ئەمە جێگای ئەبو جەهلە، لێرە دەکوژرێت، ئەمە جێگای عوتبەو ئەمە جێگای شەیبەیە...هتد.

یاخود دەیفەرموو: سبەینێ ئەمە جێگەی فڵان کەسەو دەکوژرێت، إن شاء الله ئەمە جێگەی تەرمو کوژراوی فڵان کەسە، یەک جێگەی نەفەرموو بوو ئەو ڕووداوەی تێدا ڕوونەدات، هەموو شوێنو جێگەکان وا دەرچوون کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموو‌بووی!

## وەسفو پێناسەی سوپای سەرکەوتوو

نومێر: لەباسەکانی ڕابردوودا باسی چەند سیفەتێکی سوپای سەرکەوتوومان کرد، نازانم هەر گوێت گرتووە، ماکوان هیچ زیادەیەکت نییە بۆ باسەکەم، یاخود هیچ لێکۆڵینەوەیەك و شیکاریەکی ئەوتۆت هەیە، لە فیقهی واقیعو جۆرەکانییەتی بۆم باس بکەیت؟

ماکوان: بەخۆشحاڵییەوە ئێمە لەباس و خواستی ژیانی پیاوێکین هەموو گیانی نوورە هاوەڵانی وەکو ئەستێرە بەدەوری نووری ئەو مانگەوە جریوەیان دێت، حەزدەکەم زیاتر لە خزمەتیاندابم و زانیاری لەبارەیان کۆبکەمەوە نومێری برام.

یەکەم: ئەوەی کە ئاماژەت پێداوەو لای من زۆر گرنگە، شووراو ڕاوێژە کە بینای ئەم ئوممەتەی لەسەر کراوە، بۆ سوپای دەوڵەتو هەموو دامو دەزگاو تەنانەت خێزانیش پێویستە کە پرەنسیپی شووراو ڕاوێژ پیادە بکەن.

دووەم: لەنێو هەموو پێناسەو سیفاتەکانی ئەم سوپا سەرکەوتووە پێناسەیەکی ڕەهایی سەرکەوتنی تێدا بەدی دەکرێت، ئەم سیفاتەش پێغەمبەری خوا ﷺ هەموو ژیانی خۆی بۆ تەرخان کرد، کۆششو هەوڵی ئەوەبوو کە ئەو سیفاتە لەنێو ناخی موسڵمانان بڕوێنێت هەموو ئەو کاتەی لەشاری مەککەدا بوو، پاشان تا ئەو ساتەوەختەی لەنێو شاری مەدینەدا دەوڵەتی دامەزراندووە هەر خەریکەو بگرە تا وەفاتی کرد، ئەویش سیفاتی ئیمانی تەواوە بەخوای موتەعال، ئاراستەی نییەتی پاکو بێگەرد بۆ خوای پەروەردگار، ئیمانی تەواو بەخودی پێغەمبەرەکەی و شوێنکەوتنێک کە هیچ دوودڵیو گومانێک نەگرێتە خۆی پەشیمانی بەدواوە نەیەت.

بینیمان سوپای قورەیشو مەککە وا هاتوون بۆ جەنگ بۆ ئەوەی خەڵک باسیان بکات کە بەهێزو توانان، یاخود هاتوون بۆ ڕازیکردنی شەهوەتو نەفسو ڕێگری لەدینی خوا.



﴿وَلَا تَكُونُواْ كَٱلَّذِينَ خَرَجُواْ مِن دِيَٰرِهِم بَطَرًا وَرِئَآءَ ٱلنَّاسِ وَيَصُدُّونَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِۚ وَٱللَّهُ بِمَا يَعۡمَلُونَ مُحِيطٌ﴾

نەکەن وەک ئەو جۆرە کەسانەبن لەوڵاتو شوێنی خۆیان دەرچوون لەبەر کەشووفش کردنو خۆنواندن لەبەر چاوی خەڵک دەیانەوێ کۆسپ بکەنە بەردەم ئایین و ڕێبازی خوا، لەکاتێکدا خوا بەئاگایە بەسەرەتاو سەرەنجامی هەموو ئەو کارانەی کە دەیکەن.

بەڵام کە تەماشای ڕاستگۆیی‌و ئاراستەی ڕوونو ئاشکرای هاوەڵانو وشەکانیان دەکەین ڕاستەوخۆ بۆت دەردەکەوێت ئەوان دەزانن لەبەرچی دەجەنگن، بۆچی دەجەنگن، بۆ کێ دەجەنگن، مەبەستەکەیان پاکەو جوانەو ڕازیکردنی خوای پەروەردگار مەبەستو ئامانجیانە.

بەواتای تەواوەتی خوای گەورە لای ئەوان مەبەستە، خۆ ئەگەر ئیمان لە جەنگدا نەبوو ئەو سەرکەوتنە بەدەست نایەت، جا هەر سوپایەک ئیمانی نەبوو هیچ کات سەرکەوتوو نابێت، ئاستەمە سوپای عەلمانی سەرکەوتن بەدەست بهێنێت، یاخود سوپای سەرپێچیکەر لەفەرمانی خوای گەورە یان سوپای فاسیق‌و خراپەکار یان سوپایەک لەپێناوی سەرکردە بجەنگن، یاخود لەپێناوی عەشیرەت‌و نەتەوەو دەمارگیریدا جەنگ بکەن، هەموو ئەمانە ئەگەرچی سەرکەوتنێکی کاتی بەدەست بهێنن چونکە بۆ خوا نییە، کۆتاییەکەی سەرگەردانییە.

سوپا هەیە هەر نازانێت لەبەرچی دەجەنگێت، مورتەزیقەیە(بەکرێگیراو) ئەوە هەرگیز سەرکەوتن نابینێ، سوپا زۆر هەیە زۆرجار پێکهاتەکەی لە موسڵمانانە، نازانێت بۆ کێ‌و لەبەرکێ دەجەنگێت؟ چونکە سەرکردەکەی فەرمانی کردووە، ئیتر ناپرسێت بۆچی ئەمری کردووە؟ بۆ کێ فەرمانی داوە بەسەریدا، ئایا ئەو جەنگە خوا پێی خۆشە، بۆ ڕازیکردنی خوایە؟ یان خوای پەروەردگار تووڕە دەکات؟ کەس ناپرسێت ئەم سوپایانە ئەستەمە سەربکەون، جەنگ‌و جیهاد لە ئیسلامدا یەک پێوەری هەیەو تەنها ئەو پێوەرە سوپای موسڵمانانی پێدەناسرێنرێت، بەدڵنیاییشەوە سەرکەوتوو دەبێت، ئەویش سەرخستنی خوای پەروەردگارە، واتە: پیادەکردنی دینەکەی‌و ناسین‌و شوێنکەوتنی پێغەمبەر ﷺ پەروەردە بوون لەسەر بنەمای ئیمانی‌و گوێڕایەڵی خواو پێغەمبەرەکەی ﷺ، پێغەمبەری خوا ﷺ (١٣) ساڵ کار لەسەر ئەوە دەکات. خوای گەورە لە تێگەیشتن لە سەرکەوتن سوپای موسڵمان دەفەرمووێ:



﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِن تَنصُرُواْ ٱللَّهَ يَنصُرۡكُمۡ وَيُثَبِّتۡ أَقۡدَامَكُمۡ ۝٧﴾

سێیەم: یەکێکی تر لە سیفاتی سوپای سەرکەوتوو بریتییە لە هیواو ئاواتی سەرکەوتن دووربوون لە دۆڕانو بیری خراپو ترسنۆکیو خۆ ئامادەکردن بۆ هەڵهاتن، هەرچەندە داڕووخان و داڕمانی ناخی سوپا لەوە سەرچاوە دەگرێت لە پێناوی چیدا دەجەنگێو خەباتو کۆشش دەکەیت؟ ئەگەر لەبەر دونیایە ئەوا هەموو دونیا لای خوا ئەرزشی باڵە مێشوولەیەکی نییە، گومانی تێدا نییە ئەوەی لەپێناوی دەجەنگیت ئەگەر لەبەر خوا نەبێت بەدڵنیاییەوە سوپایەکی دۆڕاوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: خوای گەورە پەیمانی سەرکەوتنی پێداوین یان قافڵەکە یاخود سەرکەوتن بەسەر سوپا کەدا، ئەمەش ئەوپەڕی هیواو ئاواتی سەرکەوتنی بەخشییە هاوەڵان.

چوارەم: یەکێکی تر لە پێناسەو سیفاتی سوپای سەرکەوتووی موسڵمانان دوودڵ نەبوونە لە بڕیارو تەوەکولی تەواوە بەخوای پەروەردگار، قۆناغی ڕاوێژ قۆناغی گۆڕینەوەی ڕاو بۆچوونەکانە، ئەگەر موسڵمانان لەسەر هەر پلانێک یاخود بڕیارێک ڕێکەوتن، دەبێ دەستبەجێ پیادەی بکەن بێ دوودڵیو ڕای جیاواز، ئەگەر دوودڵیو دڵەڕاوکێ دروست بوو ئەوا کارەکەو پڕۆژەکە لاواز دەکات، هیمەتو قیمەتی جەنگو سوپاکە لاواز دەکات، جورئەتی دوژمن لە بەرانبەرت زیاد دەکات و دەرگەی شەیتان دەکرێتەوە، خوای پەروەردگار دەفەرمووێ:

﴿فَبِمَا رَحۡمَةٖ مِّنَ ٱللَّهِ لِنتَ لَهُمۡۖ وَلَوۡ كُنتَ فَظًّا غَلِيظَ ٱلۡقَلۡبِ لَٱنفَضُّواْ مِنۡ حَوۡلِكَۖ فَٱعۡفُ عَنۡهُمۡ وَٱسۡتَغۡفِرۡ لَهُمۡ وَشَاوِرۡهُمۡ فِي ٱلۡأَمۡرِۖ فَإِذَا عَزَمۡتَ فَتَوَكَّلۡ عَلَى ٱللَّهِۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلۡمُتَوَكِّلِينَ ۝١٥٩﴾ [آل عمران]

(ئەی موحەممەد) بەهۆی ڕەحمەتی خواوەیە تۆ نەرمو هێمن بوویت لەگەڵیان، خۆ ئەگەر تووڕە و بێبەزەییو قسە ڕەق بووای ئەوە هەموویان لە دەورت بڵاوەیان دەکرد، کەواتە: چاوپۆشیان لێ بکەو لێیان ببوورە، داوای لێخۆشبوونیان بۆ بکە لەکارو پێشهات ڕاوێژیان پێ بکە (دوای مەشوەرەت و پرسو ڕا) ئەگەر بڕیارت دا (کارێک ئەنجام بدەیت، ئەنجامی بدە)، پشت بەخوا ببەستە چونکە بەڕاستی خوا ئەوانەی خۆش دەوێت کە پشتی پێدەبەستن.



تەماشا بکە لەگەڵ کەمی هێزو چەکو کەرەستەی جەنگ، موسڵمانان لە بەدردا بڕیاری جەنگیان دا بێئەوەی دوودڵ بن، ئەهلی باتڵو کافران هەمیشە لەسەر لێشێواوی‌و دوو دڵیدان، ئەمەش لە جەنگو سوپای قورەیش ئەم دوودڵییە دەبێت.

- بینیمان چۆن ئومەییەی کوڕی خەلەف بۆ دەرچوون بۆ جەنگ دوودڵ بوو، ترسی لێ نیشتبوو.

- بینیمان چۆن (٣٠٠) کەسی دیکە لە سوپای قورەیش جیابوونەوە، لەگەڵ ئەخنەسی کوڕی شورەیق گەڕانەوە بۆ مەککە.

- بینیمان هەموو سوپاکە دوودڵ بوون لە جەنگکردن لەگەڵ موسڵماناندا، بەڵام ئەبو جەهل پاڵی پێوەنان بۆ جەنگ.

- بینیمان لەشاری مەککە هەموو ترسیان لێنیشتبوو بۆ دەرچوون دوودڵ بوون، شەیتان خۆی لێکردن بە (سوڕاقەی کوڕی مالکی جوعشەمی) بەدوودڵی دەرچوون.

ئەگەر پێتخۆشە با بڕۆین بۆ ناوچەی بەدر بەچاوی خۆمان ببینین، نومێر زۆری پێخۆشبوو دوو ئەسپمان زین کردو خواردنمان بردو بەرەو دۆڵو ناوچەی بەدر کەوتینە ڕێ. دوای چەند کاتژمێرێکی زۆر کە گەیشتینە ناوچەی بەدرو تێکەڵ بووین بە سوپای کافرانو هەندێک هۆکاری ترم بینی بەتەواوی دوودڵی داوەتە کافرەکان بۆ جەنگ، ترسێکی وایان لێنیشتووە زۆر جێگەی سەرنجە، وەک ئەوەی ترس بەسەریاندا دابەش کرابێ.

عوتبەی کوڕی ڕەبیعە بەتەواوی جەنگ لەگەڵ موسڵمانان ڕەت دەکاتەوە، ڕووی کردە سوپای عەشیرەتەکەی خۆی وتی: ئەی هۆزەکەم! گوێڕایەڵیم بکەن بەرانبەر بە موسڵمانان، ئەگەر ئێوە جەنگتان کردو ئەوانتان لەنێو برد، بۆ هەتا هەتایی لەدڵتان دەرناچێت، چۆن برا برای دەکوژێت یاخود کەسوکاری یەکتر، چۆن دوای ئەو جەنگە دەتوانن بژین ئامۆژگاریتان دەکەم ئەم کارە بخەنە گەردنی منو بگەڕێنەوە بۆ مەککە.

ئەبوجەهل توڕەبوو فووی کردە خۆی‌و وتی: وەڵڵاهی جادووت لێ کراوە ئەو جادووەی لەو پیاوە کراوە جادووی ترسنۆکییە، پاشان وتی: بۆ ئاوا دەژین، موحەممەد و هاوەڵەکانی هەمووی ناگەنە (١٠٠) کەس. عوتبە بەتووندی وەڵامی دایەوەو وتی: ئەی ئەبوجەهل بەیانی کە ڕووبەڕووبووینەوە دەزانی کێ جەبانو ترسنۆکە، دەبینی کێ بۆ گەلو هۆزەکەی خراپەکارو فەسادخوازە، سبەینێ دەبینی موسڵمانان چۆن پێماندا دەکێشن‌و وەکو مار کەللەی



سەرمان دەپەڕێنن، تەمەشای دەمووچاوی موسڵمانانت کردووە هەمووی دەڵێی شمشێرە. ئەوە نەفسیەت‌و دەروونی سوپای کافری قورەیش بوو.

پاشان کەسێکی تر لە سەرکردە سەربازییەکانی قورەیش هاتە لای عوتبەی کوڕی ڕەبیعە، بەناوی (حەکیمی کوڕی حیزام) پێی وت: ئەی باوکی وەلید! با بگەڕێینەوە جەنگ نەکەین، تۆ بەم شەرەفە بگەڕێرەوە تا ئەو ڕۆژەی دەمریت سەربەرزییە بۆ تۆ؟

عوتبە وتی: چی بکەم؟

حەکیم وتی: ئێوە داوای خوێنی کوڕی جەزرەمی دەکەن کە لە مەفرەزەی نەخلە کوژراوە، ئەویش هاوپەیمانت بووە، تۆ خوێنەکەی بدەو با سوپاکە بگەڕێتەوە، عوتبە وتی: من ئامادەم ئەوەی تۆ دەیڵێی دەیکەم، بەڵام سەرکردەی سوپاکە کوڕی حەنزەلەیە مەبەستی ئەبو جەهل بوو، ئەو ڕازی بکە من ئامادەم، حەکیم چووە لای ئەبوجەهل بۆ ئەوەی قسەی لەگەڵ بکات. کاتێک چووە لای پێیوت: ئەی ئەبولحەکەم بەسوپاکەتەوە بگەڕێرەوە، کە لەدژی کوڕی مامەکەت هاتوون واتە: ئامۆزاکەت، مەبەستی ئەوەبوو بە نزیکی‌و ڕەحم بیجووڵێنێت، بیری خستەوە کە نزیکی ڕەسوولی خوایە. ئەبوجەهل لە وەڵامدا وتی: ئەوە بێجگە لەتۆ پیاوێک و نوێنەرێکی دیکە نەبوو بینێرن، سووکایەتی پێکرد بەتەواوی ڕەتی کردەوەو بڕیاری جەنگی دا.

کەسێک بەناوی عومەیری کوڕی وەهبی جەمحی چوو بزانێت سوپای موسڵمانان لە چەند کەس پێکهاتوون، گەڕایەوە بۆ لای قورەیش و وتی: لە (٣٠٠) کەس پێکهاتوون توانی بەڕاستی ژمارەکە بزانێت، بەڵام لەگەڵ ئەوەی سوپای کافران سێ ئەوەندەی سوپای موسڵمانان بوو، کەچی ترسی لێ نیشتبوو بە ترسنۆکی گەڕایەوەو وتی: ئەی خەڵکینە ئەوەی من بینیم زۆر ترسناک بوو ئەو گەلە شمشێریان بۆ جەنگ تیژکردووە، لە مردن ناترسن‌و هەموو شتێکیان خستۆتە پشتی سەریان، تەنها بیر لە جەنگ دەکەنەوە، هیچ زرێ(درع) و قەڵغانێکیان هەڵنەگرتووە، خۆیان‌و شمشێرەکانیان بۆ مردن ئامادە کردووە، سوێند بەخوا ئەوان چەند کەسن ئەوەندە کەسە لە ئێوە دەکوژن، ئینجا ئەگەر خۆیان بکوژرێن، جا کە ئەوەندەتان لێکوژرا دوای ئەوە هیچ مانایەکی نییە، بەقسەم بکەن ڕا بکەن!

تەماشاکە چۆن ئەهلی کوفر و باتڵ دوودڵ و لە دڵەڕاوکێدان؟

چۆن خەڵکێک وەکو ئەوانە بێت دەتوانێت جەنگ بکات؟

من ئەو یەقینەم هەیە هەرکەس لەهەر کات‌و زەمانێکدا لەگەڵ موسڵمانان بجەنگێت ئەوە حاڵ‌و گوزەرانییەتی، لە موسڵمانان دەترسێت.



تەماشای سوپای موسڵمانان بکە ڕێک پێچەوانەی سوپای کافرانە، سوپای ئیماندار بڕوای بەخواو پێغەمبەرە ﷺ لەپێناوی خوای پەروەردگار کار دەکاتو دەجەنگێت گەشبینە، یەقینی هەیە کە هەموو سەرکەوتنێک خوا دەیبەخشێ بێ دوودڵیو دڵەڕاوکێ بڕیار دەدا، کاریان بە شووراو ڕاوێژیان بەیەکتر کردووە، ئەم سوپایە بەهەموو شێوەیەک ئەگەری سەرکەوتنی زۆر نزیکە.

نومێر: بەڵام من ترسیش دەبینم لە سوپای موسڵماناندا، خۆ هەموو وەکو ئەبو بەکرو عومەرو میقدادو سەعد بڕیاری ئازایەتییان نەداوە؟!

ماکوان: بەڵێ بەدڵنیاییەوە ئیمانو ئازایەتی خەڵک لە کەسێکەوە بۆ کەسێکی دیکە جیاوازە، هەمووی وەک عومەرو ئەبوبەکرو میقدادو سەعد بێت، بەڵام من ئەو ترسە لە هەندێکیاندا زۆر بە ئاسایی دەبینم، چونکە خوا نەخواستە لەبەر کەمی ئیمانو یەقینیان نییە، بەڵکو هەستو سۆزو عەقڵیان وابوو کە چەکی تەواویان پێ نییەو بۆ جەنگ خۆیان ئامادە نەکردووە، بەڵکو بۆ ڕێگری کردن لە کاروانێکی بازرگانیو لێدانی کاریگەریەکی ئابووری ڕووخاندنی ورەی کافران لە جەنگێکی پارتیزانی خۆیان ئامادە کردووە، هەندێکیشیان حەزیان بە کاروانەکە بوو، لە ئێستادا حەزیان بە جەنگ نییە، چونکە بە عەقڵ تەماشای پرۆسەکە دەکەن، هێزی دوژمن سێ جار ئەوەندەی هێزی ئیماندارنە.

خوای گەورە دەفەرمووێ:

﴿كَمَآ أَخۡرَجَكَ رَبُّكَ مِنۢ بَيۡتِكَ بِٱلۡحَقِّ وَإِنَّ فَرِيقٗا مِّنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ لَكَٰرِهُونَ ۝٥ يُجَٰدِلُونَكَ فِي ٱلۡحَقِّ بَعۡدَ مَا تَبَيَّنَ كَأَنَّمَا يُسَاقُونَ إِلَى ٱلۡمَوۡتِ وَهُمۡ يَنظُرُونَ ۝٦ وَإِذۡ يَعِدُكُمُ ٱللَّهُ إِحۡدَى ٱلطَّآئِفَتَيۡنِ أَنَّهَا لَكُمۡ وَتَوَدُّونَ أَنَّ غَيۡرَ ذَاتِ ٱلشَّوۡكَةِ تَكُونُ لَكُمۡ وَيُرِيدُ ٱللَّهُ أَن يُحِقَّ ٱلۡحَقَّ بِكَلِمَٰتِهِۦ وَيَقۡطَعَ دَابِرَ ٱلۡكَٰفِرِينَ ۝٧﴾ [الأنفال]

واتە: وەک چۆن پەروەردگارت لەنێو ماڵەکەت دەریهێنای لەکاتێکدا بەڕاستی کۆمەڵێک لە بڕواداران پێی دڵگران بوون، ئەو کۆمەڵە ئیماندارە موجادەلەت لەگەڵ دەکەن لە شتی ڕاستو دروستدا، دوای ڕوون بوونەوەی (جەنگیان پێناخۆشە) وەک بدرێنە بەر بۆ مردن لەکاتێکدا بەچاوی خۆیان هۆکاری مەرگ ببینن، یادی ئەو کاتە بکەنەوە خوا بەڵێنی پێدابوون کە یەکێک لەو دوو دەستەیە بەڕاستی بۆ ئێوە دەبێت (یان کاروانە، یان سەرکەوتن بەسەر لەشکرەکە) ئێوەش بەڕاستی ئاواتەخوازنو حەز دەکەن کاروانە بێچەکو ئاسانەکە بۆ ئێوە بێت، خوایش



دەیەوێت حەق‌و ڕاستی بە فەرمانەکانی خۆی بچەسپێنێت، کافرانیش بنەبڕ بکات‌و ڕیشەکەنیان بکات.

ئەم شعوورو هەستەی کە لەلایان دروست ببوو، ئایا خەتەرناک‌و ترسناکە؟ بێگومان نەخێر، مرۆڤ دەبێت بترسێت، بەڵام ترسێک کاریگەری لەسەر فەرمان‌و گوێڕایەڵی خوای پەروەردگار نەکات. گرنگە لەنێو سوپاکەدا کە دەیان خاوەن ئیمان بەرزی تێدایەو دەتوانێت ئیسلاح‌و چاکەخوازی بڵاو بکەنەوە مەرج نییە هەموو سوپاکە وەکو عومەرو ئەبوبەکرو میقدادو سەعد بن، بەڵکو لە سوپادا پێویستی بە خەڵکانێکی وەکوو ئەبو بەکر، عومەر، حەمزە، عەلی، سەعد و...هتد هەیە.

ئەوەی باسم کرد ئەمڕۆ ڕێکەوتی ڕۆژی پێنج شەممە (١٦)ی ڕەمەزانی ساڵی (٢)ی کۆچییە، بەیانی کە ڕۆژی جومعەو (١٧)ی ڕەمەزانە ئەو ڕۆژەیە کە بەدر ڕوو ئەدات گەورەترین ڕۆژە لە ڕۆژانی ئیسلامدا، بگرە لە هەموو دونیادا لەم ڕۆژەدا فێر دەبیت چۆن سوپای سەرکەوتووو دروست بکەیت، هەروەها دەشزانین کە سەرکەوتن چۆن دێت‌و دروست دەبێت، زۆر سوننەت‌و یاسای خوایی لەم جەنگەدا فێر دەبین کە چۆن جەنگ جیاکەرەوەی حەق‌و باتڵە.

لەناوچەی بەدردا لەگەڵ نومێر هاتووچۆمان دەکرد بەناو ئەو سوپایەدا لەکافرو موسڵمانان چاودێر بووین‌و ڕووداوەکانمان هەڵاوێر دەکرد، من بەرچاوم ڕەش بوو کەوتمەوە ناو زیندانەکەم کە سارد بوو، بەتانیەکەم پێوە لاچووبوو هەستم بە سەرما دەکرد، بەڵام سەرماکە سات بەسات‌و کات بەکات زیاتر دەبوو، هەتا واملێهات لەرز دایگرتم، پاشان تووشی سەرئێشەو لاوازییەکی لاشە بووم تا نیوەڕۆ لەنێو جێگادا مامەوە، مامۆستا کرێکار و برایانی تری زیندان هاتن بۆ لام مۆڵەتیان لە پاسەوانەکان وەرگرت، بەڵام نەمتوانی قسە لەگەڵ هیچیان بکەم، چەند پەرستارێک هاتن پشکنینیان بۆ کردم دەرچوو کە تووشی کۆرۆنا بووم، بۆ ماوەی (٢٣) ڕۆژ دوورخرامەوە و بەتەنها لەژوورێک مامەوە، بەڵام هەندێک کتێبم هێنا کە کتێبەکەی فەرغەلی تێدا بوو، ماوەی چەند ڕۆژێک لەبەر ئازارو نەخۆشی توانای خوێندنەوەم نەمابوو، وردە وردە بەرەو باشبوون دەچووم، پاسەوانێکی زیندانەکە زۆر سەرسەری‌و هیچ‌و پووچ بوو، هەر دەهات‌و دەڕۆیشت لەبەردەم خۆیەوە دەیوت: تیرۆرست، چەندجار ئەو قسەیەی دووبارە کردەوە زۆر گوێم پێنەدا، بەڵام دیاربوو کۆتایی پێنەدەهێنا، منیش بۆ ئەوەی زیاتر بیبوغزێنم کوڕێکی میسری بەناوی (عیصام) فێری کردبووم بە سەگی پاسەوان دەوترێت: (گاردیا)، منیش زوو زوو بانگم دەکرد گاردیا، گاردیا! کاتی ئێوارەبوو هاتە بەردەم دەرگای



ژوورەکەو بەمنی وت: ئەزانی لەماوەی ڕابردوودا من لە عێراق بووم چەندین کوڕو کچی خەڵکی وڵاتەکەی تۆم کوشتووە، پێشتریش لە ئەفغانستان بووم بەدەیانی ترم لە ئێوە کوشتووە، چونکە ئێوە هەمووتان تیرۆریستن، هەر بۆ کوشتن باشن؟

زۆر ڕقم هەڵسا مردنم بەپارە دەکڕی، وتم: گاردیا منیش لەو تیرۆریستانەم ئەگەر پیاوەتیت تێدایە دەرگاکەم بۆ بکەوە بزانین کاممان توانای کوشتنی ئەوەی ترمان هەیە؟

دەرگاکەی کردەوە ڕێک کێشام بەناو دەمیاو شەقو لێدان بەئارەزووی خۆم تێیکەوتم، ئەوەندەم زانی (١٠) کەس لە پاسەوانەکان بۆم هاتن، لەگەڵ دوو پەرستاری پیاو بەهەموویان لێیان دەدام تا بێهۆش کەوتمو بردیانمەوە ژوورەکەم. نازانم ماوەی چەندم پێچوو، بەڵام لێدانەکەیان زۆر پرۆفیشناڵ نەبوو، بەدەمو چاویاندا نەکێشام تەنها دەیانکێشا بە سکمدا زۆر ئازارم پێگەیشت، بەڵام زۆر دڵخۆشبووم لەو پاسەوانە سەگەم دا، ئەوانیش بە ئینگلیزی قسە ناکەن.

پاسەوانەکان گۆڕان، ئەوانەی لە منیان دابوو وایان دەزانی بۆ بەیانی سکاڵایان لەسەر تۆمار دەکەم، بەپاسەوانەکانی دیکەیان وتبوو هیچی بەگوێ مەکەن و قسەی لەگەڵ مەکەن، چونکە ئێمە سزامان داوە بۆ ماوەی (٣٦) کاتژمێر، هیچ هاوکاری مەکەن. من دواتر ئەمەم زانی کوڕێکی مەغریبی بەناوی سەمیر بۆی باس کردم، بەهەرحاڵ منیش زۆر لەلام ئاسایی بوو، وەکو ڕۆژانی دیکە ژیانی خۆم لە زینداندا بەسەر دەبرد، چۆن سکاڵا دەبەمە لای تاغووت، سکاڵام تەنها لای خوای پەروەردگارە. بێجگە لەویش سکاڵا بۆ هەرکەس بەریت زەلیلییە، ماوەیەکی زۆر کەس بەلامدا نەهات، منیش سەرقاڵی قورئان خوێندنو کتێب خوێندنەوەی خۆم بووم، شەوێک زۆر بەزەییم بەخۆمدا دەهاتەوە بەوەی کە لەنێو زیندان زیندانێکی دیکە کراوم و کەرەنتینەم، لەولاشەوە ماوەی یەک هەفتەیە قسەم لەگەڵماڵو منداڵی خۆم نەکردووە و هەواڵم نییە، ناهێڵن تەلەفونیش بکەم.

شەو خەوم بینی، لە خەونمدا ئایەتێکم دەخوێند لەسورەتی (الأنبياء)، چەند جار دووبارەم دەکردەوە، باوکیشم لەلام بوو، هەر دەیوت:

بۆ بەیانی هاتنە لای ژوورەکەم وتیان: هەفتەیەکە قسەت لەگەڵ کەس نەکردووە، تەلەفوون دەکەیت، وەتسئاپمان بۆ ئامادە کردوویت بۆ ماوەی سەعاتێک قسە بکە! منیش وتم: باشە، سوپاس بۆ خوا خەونەکەم هاتە دیو قسەم لەگەڵ کەسوکارو ماڵو منداڵو دایکم کرد لە ڕێگەی خێزانمەوە، وتیان: باشیت؟ وتم: عەیبم نییە سوپاس بۆ خوا زۆر باشم، (ئەم باسانە بەدوورودرێژی لە کتێبی مەملەکەتی زیندان دەنووسم).



پاشان سوپاس بۆخوا شەو تەندروستیم زۆر باش بوو، بەڵام ئازاری لێدانو ئەشکەنجەی ئەوانم بە ئێشەوە هەست پێدەکرد، چوومەوە سەر کتێبەکەو گەڕامەوە بۆ لای نومێر، تەماشام کرد هەردووکمان بەستراوینەتەوە من کە خەبەرم بوویەوە لای نومێر بووم، ئەو قسەی لەگەڵ چەند کەسێک دەکرد، منیش وتم: نومێر چی ڕوویداوە؟

نومێر: قسە مەکە ئێستا بەپارە ئازادمان دەکەن!

ماکوان: باشە، بەڵام هیچ تێنەگەیشتم ئەوەندە ئازارم هەبوو توانای ڕۆیشتنو بەپێوە وەستانیشم نەبوو، دوای ئەوەی ئازاد کراین، وتم: نومێر چی ڕوویداوە؟

نومێر: کە قسەکەت بۆ کردم لەپڕ کەوتیتە سەر زەوی، منیش هەڵمگرتیتەوە بۆ ئەوەی بتبەمە سەر جێگاکەتو پارێزراو بیت، ئەمانە مەفرەزەیەکی قوڕەیش بوون، من خەمی تۆم بوو لەگەڵ ئەوەی بێهۆش بوویت، ئەوان وایان زانیت مردوویت، بەڵام چەند شەقو لەقەو شەلاقێکیان لێدایت، ئیتر کە دەنگت نەما وازیان لێهێنایت، منیش زۆر لێیاندام لەکۆتاییدا پێموتن: ئێمە ڕێبوارین بۆ بازرگانی لە میسر و شامەوە هاتووین بۆ ئەم ناوچەیە، ئیتر وازیان لێ هێنایـن.

ماکوان: سوپاس بۆ خوا، ئەی من چەند ڕۆژە ڕۆیشتووم؟

نومێر: نا، هەمووی چەند وەختێکی کەمە تۆ بێهۆش بوویت زۆر نییە، دەبێت زۆر ئاگامان لەخۆمان بێت، بچنە نێو سوپای موسڵمانان باشترە، چونکە لەوێ نامانبینن تەنها ئێمە ئەوان دەبینین، بەڵام کافرەکان دەمانبینن وا باشە لەنزیک سوپای پێغەمبەری خوا بین.

ماکوان: زۆرباشە ئەی جەنگ دەستی پێنەکردووە؟

نومێر: ئیتر ئەم بەرەبەیانە دەست پێدەکات.

## ڕۆژی بەدر

نومێر: غەزوەیەکی زۆر گەورەیە، چۆن گەورە نییە کە پێناسەو سیفاتی هەموو سوپای سەرکەوتووی تێدا بەرجەستەیە و سوپایەکە خوای گەورە سەر دەخات، سوپایەکە لەپێناو خوای گەورە کار دەکات، هەموو شتێکدا کار بۆ ڕەزامەندی خوای پەروەردگار دەکات، سوپای دۆڕاو سوپای کافرو مونافیقو فاسقو خوانەناسو تاوانبارە تەنها بۆ بەرژەوەندی خۆی کار دەکات، بۆ ئارەزوو هەوای نەفس دەجەنگێت، بەلایەوە گرنگ نییە گیانی خەڵکو سەروەتو سامانی خەڵک، سوپای سەرکەوتوو گەشبینە بە سەرکەوتنی لەلایەن خوای پەروەردگارەوە،



سوپای دۆڕاو لە دڵەڕاوکێو کەئابەو خەمۆکیدایە، سوپای سەرکەوتوو تەوەکولی بە پەروەردگارە و دوودڵ نییە، سوپای دۆڕاو ترسنۆکەو جەبانە لە بڕیاردانی، سوپای سەرکەوتوو شوورا پیادە دەکات، لەوەی کە دەقی لەسەر نەهاتووە، سوپای دۆڕاو دیکتاتۆرەو بێجگە لە ڕا و بۆچوونی سەرۆکەکەی ڕای بۆچوونی کەسی دیکەی قبووڵ نییە، هیچ ئەرزشێکی بۆ گەلو نیشتمان نییە، ئەگەر سەرۆک هەرچی وت قسەی گەلو نیشتمان لەجەنگی بەدردا سیفاتی سوپای موسڵمان لە سوپای مەدینەی ئیماندارلا کۆبۆتەوە، پێچەوانەکەی سوپای دۆڕاو هەموو سیفاتو پێناسەی لە سوپای کافردا بوونی هەیە، ئەوانەی کە باسمان کرد بریتی نییە لە سیفاتی سوپای دۆڕاو سەرکەوتووو، بەڵکو سیفاتی تر ماوە کە باسی بکەین. ئەویش لەکاتی جەنگەکەدا دەردەکەوێتو زیاتر قسەی لەسەر دەکەم ئەمڕۆ ڕۆژی فورقانە، جیاوازییە لەنێوان حەقو ڕاستیو باتڵو خراپەکاریدا.

## نزیکبوونەوەی هەردوو سوپاکە لەیەکتری

نومێر: سوپای مەککە سەربازگەی لەناوچەی (عەدوەتو لقوصوا) لەباشوری دۆڵی بەدردا دروست کرد، هەروەها سوپای موسڵمانان پێشڕەوی کرد لە بەدردا بۆ باکووری دۆڵەکە بەناوی (عەدوەتو دنیا)

بەڵام پێغەمبەری خوا ﷺ دەیویست بەتەواوەتی جۆرو شێوەی سەربازیو تواناکانیانو هێزو قیادەی سەربازی سوپاکە بزانێت، بۆیە لەگەڵ ئەبوبەکری هاوڕێیدا هەڵسان بە گەڕانو پشکنین بۆ سوپای مەککەو توانی سەربازگەی کافران دەستنیشان بکات، بەڵام نەیتوانی بزانێ چەند سەربازنو سەرکردەکانیان کێن.

بۆیە گەڕانەوە بۆ سەربازگەی خۆیان و مەفرەزەیەکی بچووکی لە زانیاری سەربازی دروست کرد کە بریتی بوون لە: عەلی کوڕی ئەبو تالیب، زوبێری کوڕی عەوام، سەعدی کوڕی ئەبی وەقاس خوا لەهەموویان ڕازیبێ، ئەو مەفرەزەیە توانیان دوو سەربازی قوڕەیش لە ناوچەکەدا دەستبەسەر بکەن، هێنایانن بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ پێغەمبەری خوا کەوتە لێپرسینەوەو پشکنین.

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: پێم بڵێ: لەسەر قوڕەیش؟

یەکێکیان وەڵامی دایەوەو وتی: لەپشتی ئەم گردەوە لەناوچەی (عەودەت ولقوصوا) سەربازگەیان خستووە.



پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەو سوپایە چەندە، یاخود ئەو گەلە هاتوون چەند کەسن؟

وتی: زۆرن.

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ژمارەیان چەندە؟

وتی: نازانم.

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بۆ خواردن ڕۆژانە چەند وشتر سەردەبڕن؟

وتی: ڕۆژێک نۆ، ڕۆژێک دە.




نەخشەسازی غەزوەی بەدر



پێغەمبەر صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ فەرمووی: ئەو سوپایە لەنێوان (٩٠٠) بۆ (١٠٠٠) کەسە.

پاشان پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ بەردەوام بوو فەرمووی: کێیان لەگەڵدایە لە سەرکردەو ئەشرافی قورەیش؟

وتیان: عوتبەی کوڕی ڕەبیعە، شەیبەی کوڕی ڕەبیعە، ئەبو بوختەری کوڕی هیشام، حەکیمی کوڕی حیزام، نەوفەلی کوڕی خوەیلید، حارسی کوڕی عامر، توعەیمەی کوڕی عودەی، نەزری کوڕی حاریس، زەمعەی کوڕی ئەسوەد، ئەبو جەهلی کوڕی هیشام، ئومەییەی کوڕی خەلەف، وەلیدی کوڕی موغیرە، عوقبەی کوڕی ئەبی موعیت، عەمارەی کوڕی وەلید.[٧٢]

پاشان پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ ڕووی کردە ئیمانداران و فەرمووی: ئەمڕۆ

مەککە هاتووە بە پارچەیەك لەجگەریان( أفلاذ أكبادها)[٧٣] بەوشێوەیە پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ توانی ئەو زانیارییانە بەدەست بهێنێت کە دەیویست، زانیاری لەسەر سوپای قورەیش کۆکردەوە، هەموو ئەو زانیارییانە بەکارهێنایەوە لەمەیدانی جەنگەکەدا، بەهۆکاری ئەو زانیارییانە پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ بەپەلە کەوتە خۆی، سوپاکەی بردە ناوچەی پێش (عەدوە) بۆ ئەوەی خاکێکی باش لە جەنگەکەدا بۆ سەربازەکانی هەڵبژێرێ، سوپاکەی بەگوێرەی جێگا ستراتیژییەکان دابەش کرد، پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ خۆی لەناوچەی بەدردا جێگاکەی هەڵبژارد، شەوێکی لەو جێگایەدا بەسەر برد ئەویش شەوی بەدر بوو.

## وەرگرتنی ڕای سەرکردە سەربازییەکانی نێو سوپای موسڵمانان

نومێر: کاتێک پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ سوپاکەی ڕێکخست، هاوەڵی بەڕێز (حەبابی کوڕی مونزیر) یەکێک بوو لە شارەزاکانی بواری سەربازی ناسرابوو لەو بوارەدا، هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ زۆر بە ئەدەب و بیرکردنەوەیەکی قووڵەوە پرسیاری لە پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ کرد:

ئەی پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ ئەو جێگایەی سەربازەکانت تێدا ڕێکخستووە، ئایا فەرمانی خوایە، یاخود دەتوانین ڕاوبۆچوونی خۆمان بڵێین؟ لێرەدا مەبدەئی شووراو

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

٧٢ ـ عتبة ابن ربيعة، شيبة بن ربيعة، أبو البختري بن هشام، حكيم بن حزام، نوفل ابن خويلد، حارث ابن عامر، طعيمة بن عودة، نضر بن حارث، زمعة بن اسود، أبو جهل بن هشام، امية بن خلف، وليد بن مغيرة، عقبة بن ابي معيط، عمارة بن وليد.

٧٣ ـ (پارچەیەکیان) لە جگەر مەبەست لە تەواوی سەرانی قورەیشە.



پرەنسیپەکانی دەردەکەوێ، چونکە ئەگەر ئەمە فەرمانە ئەوە قسەی تێدا ناکەین، بەڵام ئەگەر بۆمان هەیە ڕاوبۆچوونی خۆمان بڵێین: لەڕووی سەربازی پلانگێڕییەوە؟!

پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ فەرمووی: بەڵێ، دەتوانن جەنگ بریتییە لە پلانو تاکتیک.

پاشان حەبباب زۆر بە ڕاشکاوانە بێ ترسو دوودڵی وتی: ئەی پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ ئەم جێگایە بەکەڵک نایەت، چونکە کارەکە زۆر خەتەرناکو ترسناکە، یاری مەرگە، لێرەدا ئامۆژگاری بەرپرسیارەتییە، ئەی ڕاوبۆچوونەکەی چییە؟

حەبباب وتی: هەڵسن لێرەدا نزیکترین جێگەی بیرە ئاوەکان لەنزیک سوپای قورەیش لەوێدا کەمینو سوپا دەخەینو هەرچی بیرەکانە سەری دەنێینەوە، یاخود پڕی دەکەینەوە، پاشان حەوزێک لەئاو دروست دەکەین، پڕی دەکەین لە ئاو، ئێمە ئاو دەخۆینەوە، ناهێڵین ئەوان ئاو بخۆنەوە، حەوزەکەیان بۆ چۆڵ دەکەین، کە بێنە سەر حەوزەکە ئێمەیش دەیانکوژین!

پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ بێ هیچ دوودڵییەک ڕایەکەی قبووڵ کرد، فەرمووی: ڕاکەت جێگەی خۆیەتی. دەستبەجێ هەستان بە ئەنجامدانی کارەکەو جێگەکەیان گۆڕی بۆ ئەو جێگەیەی حەبباب دەستنیشانی کردبوو.

ماکوان: پێویستە هەڵوەستەیەک بکەین لەسەر هەڵوێستەکەی حەببابی کوڕی مونزیر، هەڵوێستێکی زۆر ئەرێنی بوو، هاوەڵان باوەڕیان وا لەدڵو مێشکدا چەسپیبوو کە ڕاستە پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ وەحی بۆ دێت، بەڵام ئەگەری ئەوە هەیە ئەمانیش بە ئاشکراو بێ دوودڵی ڕاوبۆچوونی خۆیان بڵێن، هەر بۆیە دەبینین هاوەڵان چەندە کاری ئەرێنیان لێ چاوەڕان دەکرا، هەر کارێکی چاک یاخود ڕایەکی جوانو باشیان هەبووایە خێرا دەچوونە خزمەتی پێغەمبەر صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ و باسیان دەکرد، ئەم ئەداکردنی ڕاوبۆچوونە شارستانییەتو ژیارو دەوڵەت پێش دەخات، لەکۆتاییدا هەموو ئەوەیان دەزانی کە پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ وەکو ئەوان مرۆڤە، بۆیە ئەوەی کە ئاراستەی وەحی نەبێت ئاسایی بوو بۆچوونی خۆیان پێش بۆچوونی پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ بخەن، ئەگەر خۆ شتێک هەڵە بوایە یاخود پێچەوانەی شەریعەت بووایە، پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ



بە وەحی بۆی ڕاست دەکردنەوە، حەبباب باش لەو فەرموودەیەی پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ گەیشتبوو، دەفەرمووێ: ئێوە زاناترن بەکارو ژیانی دونیاتان.[٧٤]

ئەمەش پانتایی زۆر فراوان لەبواری فیکرو زانستو فەلسەفەدا دەبەخشێتە خەڵکی بۆ داهێنانو برەودان بە زانستو زانیاری، هەروەها ئەقڵەکانی ناو موسڵمانان کاردەکەن بۆ بەرەو پێشچوونی ئوممەتەکە.

خۆ ئەگەر ڕاکەی حەبباب هەڵەبووایە پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ دەیزانی، یاخود بەلانی کەمەوە بڕوایان بەو پڕەنسیپە هەبوو کاریان لە پێناودا دەکرد، ئەمەیش دەمانگەیەنێتەوە بە مەبدەئی شووراو ڕاوێژ.

شووراو ڕاوێژ فێرمان دەکات بگەڕێتەوە بۆ تواناو هێزەکانی کۆمەڵگەو سوودی لێ وەربگرین، ئەی چۆن ئەو هەموو تواناو ئەقڵە جوانەی خوای پەروەردگار دروستی کردووە سوودی لێ وەربگرین؟ چۆن حیکمەتی ئەو خەڵکە وەربگرین کە خوای پەروەردگار بەجوانترین شێوە خەڵقی کردوون، بەوپەڕی موعجیزەو حیکمەتی زۆر سەرسوڕهێنەر.

کەواتە: بێ شووراو ڕاوێژ ئەستەمە ئەم ئوممەتە هەڵسێتەوەو جارێکی تر بێتەوە پێشەنگی گەلانی تری دونیا.

لەدوای ئەوەی چوونە ئەو جێگەیە، چی دیکە ڕوویدا؟

نومێر: هەروا تەماشام دەکرد مەقەڕی قیادەیان(فەرماندەیی) بە قامیشو خێمە بۆ پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ دروست کرد، بۆ ئەوەی ئیدارەی جەنگەکە بکات، خۆی لەگەڵ سوپاکە جیا نەکردەوە، وەکو سەرکردەی دیکە نەبوو لە جەنگ بەشدار نەبێتو لەدوورەوە تەماشا بکات، بەڵکو عەلی کوڕی ئەبو تاڵیب دەڵێ: لەکاتی گەرمەی جەنگدا لەڕۆژی بەدردا پێغەمبەری خوام صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ دەبینی نزیکترین بوو لەهەموو سەربازەکانی، لەبەرانبەر سوپای دوژمندا لە جەنگو ڕووبەڕووبوونەوەدا ئازاو چاونەترس بوو.

---

٧٤ ـ أَنْتُمْ أَعْلَم بِأُمُورِ دُنْيَاكُمْ؛ ( مُسْلِمٌ).



## ئارامی‌و هێمنی لەسەر سوپای موسڵمانان

نومێر: لە شەوی ڕابردوو لە بەدردا دوو شتی زۆر سەرسووڕهێنەر ڕوویدا، خەوی قووڵ بەسەر موسڵماناندا هات، بە ئارامی هەموویان خەوتن‌و پاشان باران باری، زۆر بەهێمنی‌و هێواشی لەهەمان شەودا.

خەولێکەوتن لەو شەوەدا بەئارامی زۆر سەیرە، چونکە سوپای کافران چەند هەنگاوێک دوورن لە ئیماندارانەوە، سوپاکەش زۆر بەهێزو گەورەیە، لەگەڵ ئەوەشدا خەوێکی ئارام‌و خۆش لە ئیمانداران کەوت، بێ ترس‌و دڵەڕاوکێ، مرۆڤ زۆرجار لەماڵی خۆیدا کە سەرقاڵی کارێکە خەوی لێناکەوێت، کە ماڵەکەی ئەوپەڕی ئەمان‌و هێمنییە بۆی، بەڵام چی دەڵێیت لە جێگایەکدا لەخاکی جەنگدا کە ئەگەر هەیە کۆتایی بەژیانی بێت!

هێمنی مێشک و ئارامی دڵان لەو کاتەدا بۆ موسڵمانان زۆر سەرسوڕهێنەر بووە بیر لە ماڵ‌و سەروەت و سامان و منداڵ ناکاتەوە، تەنانەت بیر لەخودی خۆشی ناکاتەوە، زۆر بەئارامی خەویان لێکەوت.

خوای پەروەردگار دەفەرمووێ:

﴿إِذْ يُغَشِّيكُمُ ٱلنُّعَاسَ أَمَنَةً مِّنْهُ وَيُنَزِّلُ عَلَيْكُم مِّنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً لِّيُطَهِّرَكُم بِهِۦ...﴾

واتە: ئەو موژدە و ئارامی دڵە کاتێک بوو کە خوای گەورە بە وەنەوز دایگرتن بۆ ئەوەی هێمنییەک بێ بۆتان لەلایەن خۆیەوە ئاوێکیشی لە ئاسمانەوە بۆتان باراند، بۆ ئەوەی خاوێنتان بکاتەوە.

هەموو لەو شەوەدا بەئارامی خەوتن، ئەمەش موعجیزەیەکی خوای پەروەردگارە بۆ سوپای سەرکەوتووو، بۆ ئەوەی لاشەی چالاک‌و خاوەن هێزیان هەبێت، ئەوەی لەو شەوەدا نەخەوت تەنها پێغەمبەری خوا ﷺ بوو، هەموو شەوەکە بەندایەتی‌و دوعای دەکرد لە خوای پەروەردگار دەپاڕایەوە.

لەلایەکی دیکەوە سوپای قوڕەیشی کافر خەو لەچاویاندا زڕابوو، ئۆقرەیان لێ بڕابوو و دوودڵ‌و حەیران بوون، بۆ ئەوانیش جەنگێکی ترسناک‌و پڕ ترس‌و خەماوی بوو.

چونکە بڕوایان بەخودی جەنگەکە نەبوو، نەیاندەزانی بۆچی دەجەنگن و لەبەرچی دەجەنگن، لەپێناوی ئەبوجەهل‌و لات‌و عوزایە، یاخود لەپێناوی کاروان‌و قافڵەیەکە؟ بەڵام وا



کاروانەکە ئەبو سوفیان دەربازی کردووە، دەی ئیتر بۆچی بجەنگن، ئەگەر کوشتن لەئارادایە کە لەبواری دەروونی ناجێگیرو ترسو بیمدا دەژین، خوای پەروەردگار دەفەرمووێ:

﴿حُنَفَآءَ لِلَّهِ غَيْرَ مُشْرِكِينَ بِهِۦ وَمَن يُشْرِكْ بِٱللَّهِ فَكَأَنَّمَا خَرَّ مِنَ ٱلسَّمَآءِ فَتَخْطَفُهُ ٱلطَّيْرُ أَوْ تَهْوِى بِهِ ٱلرِّيحُ فِى مَكَانٍ سَحِيقٍ ﴿٣١﴾﴾ [الحج]

واتە: هەوڵ بدەن هەمیشە شوێن ڕاستی بکەون و لەبەر خاتری زاتی خوا ملکەچ بن بۆ حەق، نەکەن هیچ شەریکو هاوەڵێکی بۆ بڕیار بدەن، جا ئەوەی هاوەڵ و شەریک بۆ خوا بڕیار بدات، وەکو ئەوە وایە لە ئاسمانەوە بەربێتەوە و باڵندە پەلاماری بدات (پارچە پارچەی بکات) یاخود ڕەشەبایەکی بەهێز بیڕفێنێت، بیبات بۆ شوێنێکی دوور و قووڵ.

هەموو ئەو ترس و دڵەڕاوکێیە لە شەڕی بەدردا بەردەوام بوو، لەدڵ و دەروونی کافراندا ئۆقرەیان لێ بڕابوو بێجگە لە سەربازانێکی تر لە دژیاندا دەجەنگین، لەلایەن خوای پەروەردگارەوە یەکەمیان بێ خەوی و نائارامی بوو، پاشان باران یەکێک بوو لە سەربازەکانی خوای گەورە لەو شەوەدا ڕوویدا ئەویش ئەوەبوو کە پەڵە هەورێک دێنێت و هەموو بەدر دەتەنێت. موعجیزەکە زۆر گەورە بوو

لەو ناوچە بچووکە باران بەدوو شێوە دەباری بەسەر موسڵمانانو کافران، بۆ ئیمانداران زۆر بەهێمنیو ئارامی دەباری، بۆ کافران بە لێزمەو بەخووڕ دەهاتە خوار هەموویانی ماندوو کرد.

موسڵمانان تێرو پڕیان لێ خواردەوە، کوپەو گۆزەکانیان پڕ کردو جلو بەرگو خۆیان لێ شۆردو بەئارامی خەوتن، هەرچی ماندووبوونی ڕێگاو تەپو تۆزو غوبار بوو لەسەریان لاچوو، ئەوەی شەیتان پێی کردبوون بە وەسوەسەو لەشپیسی و جەنابەت لەسەریان لاچوو، بەهۆکاری کەمی ئاو، خوای پەروەردگار دەفەرمووێ:

﴿إِذْ يُغَشِّيكُمُ ٱلنُّعَاسَ أَمَنَةً مِّنْهُ وَيُنَزِّلُ عَلَيْكُم مِّنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً لِّيُطَهِّرَكُم بِهِۦ وَيُذْهِبَ عَنكُمْ رِجْزَ ٱلشَّيْطَٰنِ وَلِيَرْبِطَ عَلَىٰ قُلُوبِكُمْ وَيُثَبِّتَ بِهِ ٱلْأَقْدَامَ ﴿١١﴾﴾

بەڵام باران بۆ کافران وا قوڕاوو چڵپاوی بۆ دروست کردن هەموو جلو بەرگیان قورس و قوڕاوی بوو، توانای هەنگاو هەڵێنانیان نەبوو، کێ دەتوانێت لەگەڵ خوای پەروەرگار بجەنگێت، ئەگەر مرۆڤ بە ئیخلاس و ڕاستگۆیی خوای گەورە سەر بخات.



## بەری بەیانی لە بەدردا

نومێر: یەکەم کار پێغەمبەری خوا ﷺ دەنگ بەرز دەکاتەوە، بەنزاو دوعاو پاڕانەوە بۆ خوای پەروەردگار، لەبەرچاوی هەموویاندا بۆ ئەوەی بیریان بخاتەوە، ئەم جەنگە دەبێت پەیوەندیت تەنها بەخواوە بێت، چونکە زاتی پاکی یارمەتیدەرەو ئێمەش تەڕەفی خوای پەروەردگارین، سەرکەوتن و تەمکین هەر لای ئەو زاتەوەیە.

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: خوای پەروەردگار! وا قوڕەیش بە لووتبەرزی و فەخرو شانازییەوە ڕووبەڕوومان دەبنەوە، بەرپەرچی زاتت ئەداتەوەو پێغەمبەرەکەت بەدرۆ دەخەنەوە، خوای پەروەردگار سەرکەوتنم پێ ببەخشە کە پەیمان و وەعدی زاتی بەرزتە، خوایە سەرشۆڕو زەلیلیان بکە.[٧٥]

ئەم دوعایەی پێشتریش لەکاتی ڕێگادا بۆ گەیشتن بۆ بەدر دووبارەی دەکردەوە.

کە لەشاری مەدینەش دەرچوون پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو، لەهەمان کاتدا لەخاکی بەدر دووبارەی دەکردەوە دەستی بەرز دەکردەوە بۆ ئاسمان بۆ خوای پەروەردگار، خوای پەروەردگار تەماشامان بکە هەموو پێپەتی و هەژارین، هەڵمانبگرەو بە پێخاوسیمان مەهێڵە، خوای پەروەردگار هەموو ڕووت و ڕەجاڵین دامانپۆشە، خوا گیان هەموو سک برسین تێرمان بکە.[٧٦]

چونکە هەموو سەروەت و سامانیان زەوت کرابوو لەژێر دەستی بێدینە خوانەناسەکانی قوڕەیش، لەبەرەبەیانی جەنگی بەدرو لەهەموو کاتەکانی جەنگدا لەگەرمەی پێداکێشانی هەردوو سوپا دا پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو: خوای پەروەردگار ئەوەی پەیمانت پێداوم بۆم بهێنە دی، خوای موتەعال ئەوەم پێببەخشە کە پەیمانت پێداوم، خوای مەعبوودمان ئەگەر ئەو کۆمەڵە موسڵمانە جەنگاوەرە لەئەهلی ئیسلام تیابچن لەسەر زەوی خواپەرستی و یەکتاپەرستی و ئومێد نامێنێت.[٧٧]

پێغەمبەری ئازیز بەردەوام بوو لە نزاو پاڕانەوەو دوعاکردن، تاوەکو عەبای سەرشانی کەوتە خوارەوە، ئەبوبەکرد هاتوو دایەوە بەشانیداو بەسۆزەوە بە پێغەمبەری خوای فەرموو: دەستی

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

٧٥ ـ اللهم هذه قريش قد أقبلت بخيلائها وفخرها، تحادك وتكذب رسولك، اللهم فنصرك الذي وعدتني، اللهم أحنهم الغداة. سيرة ابن هشام.

٧٦ ـ (اللَّهُمَّ إِنَّهُمْ حُفَاةٌ فَاحْمِلْهُمْ اللَّهُمَّ إِنَّهُمْ عُرَاةٌ فَاكْسُهُمْ اللَّهُمَّ إِنَّهُمْ جِيَاعٌ فَأَشْبِعْهُمْ) صحيح ابي داود.

٧٧ ـ (اللَّهُمَّ أَنْجِزْ لِي مَا وَعَدْتَنِي، اللَّهُمَّ آتِ مَا وَعَدْتَنِى، اللَّهُمَّ إِنْ تَهْلِكْ هَذِهِ الْعِصَابَةُ مِنْ أَهْلِ الإِسْلاَمِ لاَ تُعْبَدْ فِي الأَرْضِ).صحيح مسلم.



بەشانی پێغەمبەرەوە بوو، (ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ داوات لێدەکەم بەناوی خوای پەروەردگار دە ئیتر بەسە، خوای پەروەردگار سەرکەوتنت پێ دەبەخشێ چونکە پەیمانی پێداویت[78]، پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوەندە بە کەساسی و گەردن کەچی دەپاڕایەوە ئەبو بەکر بەزەیی پێدا هاتەوە، مرۆڤ دەبێ بەم شێوەیە دوعاو نزا بکات، بەردەوام بوو لە دوعا کردن، تا خوای پەروەردگار وەعدی سەرکەوتنی پێدان.

﴿إِذْ تَسْتَغِيثُونَ رَبَّكُمْ فَٱسْتَجَابَ لَكُمْ أَنِّي مُمِدُّكُم بِأَلْفٍ مِّنَ ٱلْمَلَٰٓئِكَةِ مُرْدِفِينَ﴾ [الأنفال]

واتە: یادی ئەوە بکەنەوە کە لە پەروەردگارتان دەپاڕانەوە، داوای یارمەتیتان لێ دەکرد، خوایش خێرا بەهاناتانەوە هات، فەرمووی: بەڕاستی من بەهەزار فریشتەی تر یارمەتی‌و کۆمەکیتان دەکەم بەشوێن ئەوانی تردا.

دوعاو داواکردن لە خوای پەروەردگار نیشانەی سوپای سەرکەوتووە، هەرکات موسڵمانان بەهێزو توانای خۆیان نەنازین‌و داوای هێزو توانایان لەخوای پەروەردگار کرد، خوای پەروەردگار غیرەتیان پێ دەبەخشێ.

﴿مَن كَانَ يُرِيدُ ٱلْعِزَّةَ فَلِلَّهِ ٱلْعِزَّةُ جَمِيعًا...﴾ [فاطر]

واتە: ئەوەی سەربەرزی‌و پایەبڵندی دەوێت، با بزانێت هەموو سەربەرزی‌و پایە بڵندییەک هەر بۆ خوایە.

ئەمە دوعای تەرەفی موسڵمانان بوو، پاشان کافرەکانیش دوعاو نزا دەکەن، لەوانەی کە دوعای دەکرد لەبەرچاوی سەربازەکانی؛ ئەبو جەهل بوو:

---

٧٨ ـ (فما زال يَهْتِفُ بربِّه، مادًّا يديْه مستقبلَ القِبلة، حتى سقط رِداؤه عن مَنْكِبيه، فأتاه أبو بكر فأخذ رِداءه، فألقاه على مَنْكِبيه،
ثم التَزَمه مِن وَرَائه، وقال: يا نبيَّ الله، كفاك مناشَدَتَك ربَّك، فنَّه سيُنْجِز لك ما وعَدَك).



## دوعاكەی ئەبو جەهل

نومێر: ئەوەی لەلای من جێگەی تێڕامانە كافرەكانیش دوعا دەكەن و لەسەروو هەموویانەوە ئەبو جەهل، بەڕاستی سەیرە دەیوت: ئەی خودایە لەڕۆژی بەدردا سیلەی ڕەحممان پچڕاندووە، هاتووین بۆ جەنگێك چارەنووسەكەی نازانین، بەزەیی‌و سۆزت داوا دەكەین خوایە هەركام لە ئێمە لای تۆ خۆشەویستە و زاتت لێی ڕازییە ئەمڕۆ سەری بخە.[79]

ماكوان: لەڕاستیدا منیش لام سەیرە، چونكە دەزانم ئەبو جەهل یەقینی بە قورئان هەیە كە ڕاستە، دەیزانی فریشتە پاسەوانی پێغەمبەری خوا ﷺ دەكات و دەیپارێزێت، لەشاری مەككە كەسێك كرێكاری دەكرد بۆ ئەبو جەهل، پارەكەی دوا دەخست و نەیدەدایە، كەسەكە چووە نێو بازاڕی قورەیش داوای كرد كێ دەتوانێ هاوكاریم بكات و كرێی كارەكەم لە ئەبو جەهل وەربگرێت، كۆمەڵێك لە سەرانی قورەیش وەک گاڵتە پێكردن وتیان: (موحەممەد)! دەیانزانی ئەبو جەهل بە قسەی پێغەمبەری خوا ﷺ ناكات، ناردیانە لای پێغەمبەر ﷺ كرێكارەكە چووە لای پێغەمبەری خوا ﷺ داوای لێكرد پارەكەی بۆ وەربگرێتەوە، دەستبەجێ پێغەمبەری خوا ﷺ هەڵساو چوو لەگەڵیداو پارەكەی لە ئەبو جەهل وەرگرت، لەپاشان كرێكارەكە چووە لای سەرانی قورەیش سوپاسی كردن‌و وتی: موحەممەد پارەكەی بۆ لێوەرگرتم، هەموویان لایان سەیر بوو، ئەبو جەهلیان بینی وتیان: ئەی ئەبولحەكەم چی ڕوویداوە؟

ئەبو جەهل: لەڕاستیدا كە موحەممەد هات دوو پاسەوانی لەگەڵدابوو، لەوە ترسام ئەگەر بڵێم پارە نادەم لە گەردنم بدەن. ئەوەشی كە دەڵێم، یەقینی هەبوو كە قورئان موعجیزەیەو لای خوای پەروەردگار هاتووە، دەچوو بە نهێنی گوێی لە قورئان دەرگرت، كاتێک پێغەمبەری خوا ﷺ دەیخوێند، ئەو دەمارگیری عەشیرەتەكەی كوێری كردبوو، خۆ ئەگەر پێغەمبەری خوا ﷺ لە بەنی مەخزووم بووایە ئەو كێشەی نەبوو.

بۆیە لام سەیرە نزاكەی لەخۆی كردووە، خوای گەورە گیرای كردووە، بەدەنگی بەرز هاوار دەكات‌و دەڵێت: (خوایە ئەو سەربخەیت كە خۆشت دەوێت) زۆر لام سەیرە، بەڵام دەشێت دوو تەفسیری بۆ بكەین: یەكەمیان: ئەبو جەهل بەجۆرێک لە جۆرەكان سوپاكەی هانی

---

٧٩ ـ (أنَّ أبا جهلٍ قال حينَ الْتَقى القَومُ: اللَّهُم أقْطَعُنا للرَّحِمِ، وآتانَا بما لا يُعرَفُ، فأَحْنِه الغَداةَ، اللَّهُمّ أَيْنَا كَانَ أَحَبَّ إِلَيْكَ وَأَرْضَى عِنْدَكَ فَانْصُرْهُ الْيَوْمَ). زاد المعاد ج٣، ص١٦٠.



جەنگ دەدا لەڕووی مەعنەوی و ڕۆحی و سەربازییەوە ئامادەیان دەکات، چونکە زۆرێک لە سەربازو جەنگاوەرەکان دەزانن کێشەکەیان ڕەوا نییە هەست بە دوودڵی و لاوازی و ترس دەکەن، خاوەنی کێشەی ڕەواو حەق نین، سوپای قورەیش هەستیان وایە زاتێک لەپشتی موسڵمانانەوەیە زۆر بەهێزو توانایە، لەپێناوی خوا دەجەنگن، بۆیە سەرکردەکەیان دێتو چەواشەیان دەکات، خەیاڵێکی کوشندەیان ئەداتێو خوماریان دەکات و بەدرۆ دەڵێت: ئێوە لەسەر حەقن، کارەکەتان جوان و لەپێناو مرۆڤایەتیو نیشتماندایە، بەدرۆ دەمیان شیرین دەکاتو دەڵێ: بۆ بەرژەوەندی کۆمەڵگەو خەڵکی کار دەکەینو دەجەنگین، بەڵکو دەیەوێ وا قەناعەتیان پێ بکات گوایە ئەوانیش لەپێناوی دیندا دەجەنگن، ئەبو جەهل وا خۆی نیشان دەدات کەسێکی خواناسو دیندارە موخلیس و گەردنکەچە بۆخوا هەروەکو فیرعەون، خوای پەروەردگار دەفەرمووێ:

﴿وَأَضَلَّ فِرۡعَوۡنُ قَوۡمَهُۥ وَمَا هَدَىٰ ۝٧٩﴾ [طه]

واتە: فیرعەون قەوم و گەلەکەی خۆی گومڕا کردو ڕێنموویی نەکردن.

یاخود فیرعەون دەربارەی خۆی دەڵێت:

﴿يَٰقَوۡمِ لَكُمُ ٱلۡمُلۡكُ ٱلۡيَوۡمَ ظَٰهِرِينَ فِي ٱلۡأَرۡضِ فَمَن يَنصُرُنَا مِنۢ بَأۡسِ ٱللَّهِ إِن جَآءَنَاۚ قَالَ فِرۡعَوۡنُ مَآ أُرِيكُمۡ إِلَّا مَآ أَرَىٰ وَمَآ أَهۡدِيكُمۡ إِلَّا سَبِيلَ ٱلرَّشَادِ ۝٢٩﴾ [غافر]

واتە: ئەی قەوم و هۆزم ئەمڕۆ ئێوە دەسەڵاتتان هەیە بەسەر ئەم ناوچەیەدا و بە ئارەزووی خۆتان فەرمانڕەوایی دەکەن، جا بیر بکەنەوەو تێفکرن کێ دەتوانێت فریامان بکەوێت، کێ دەتوانێت ڕزگارمان بکات لە تۆڵەو سزای خوا ئەگەر یەخەی پێگرتین؟ فیرعەون قسەکەی پێ بڕیو وتی: من تەنها هەر ئەو ڕاو بۆچوونە بەچاک دەزانمو لام پەسەندە کە پێم ڕاگەیاندن، من تەنها ڕێبازی چاکو دروستم نیشان داوون.

ئەم جۆرە تاغووتانە دەیانەوێت جۆرێک لە تاوانو کارە قێزەونەکانیان بەخێرو هیدایەتو ئیرشاد کردنو ئیسلام بەخەڵکی بناسێنن، تاغووتی کۆنو نوێ هەمان کار ئەنجام دەدەنەوە، هەموویان دەڵێن: ئێمە چاکە خوازین، بۆ خزمەتی گەلو نیشتمان کار دەکەین، زیندانەکانیان پڕە لە خەڵکی بێتاوانو کۆشك و تەلارەکانیان جومجومە و ئێسقانی مرۆڤە و ئەو خواردن و خواردنەوەیان خوێن و گۆشتی میللەتی فەقیرو هەژارە. ئەمە خاڵی یەکەم بوو بۆ هەڵخەڵەتاندن و چەواشەکاری بوو.



خاڵی دووەم: بەڵکو دەیەوێ وا خۆی نیشان بدات کە کەسێکی دیندارَ و خاوەن ڕەوشتێکی بەرزە، خۆی و دەوروپشتی وا هەڵبخەڵەتێنێت و چەواشەیان بکات کەوا چاکەخوازە و زانا و خاوەن ئەدەبە، خێرو خۆشی بۆ هەمووان دەوێت.

زۆرجار دیکتاتۆر و طاغوتەکان ئەوەندە درۆیان کردووە ناچار وایان لێدێت کە بڕوا بەخۆی دەکات کە ڕاستگۆیە و لەسەر حەقە و ڕاستی دەخوازێت و ئەوانەی دەوروپشتیشی بڕوای پێ دەکەن! ئەم قۆناغە بۆ ئەو جۆرە کەسانە زۆر ترسناکە کە قۆناغی کوێر بوون و نابینا بوونە لە واقیعدا.

جیاوازی حەق و ڕاستی لە خراپە و باتڵ جیا ناکاتەوە، نازانێت چی ڕاست و چی هەڵەیە، ئەم قۆناغانە هەمووی خوای گەورە دەستنیشانی کردووە، لە قورئاندا لەسەر فیرعەون و هامان و قاروون و پیاو خراپان بەگشتی، یەکەم قۆناغ دەزانێت چی ڕاستەو چی هەڵەیە، بەڵام نایکات تاوەکو هەواو ئارەزوو هەوەسی تێر بکات، یان لەبەر خاتری بەرژەوەندی خۆی و ئامانجەکانی، لەدوای ئەوە کوێر دەبێت.

﴿وَإِن تَدْعُوهُمْ إِلَى ٱلْهُدَىٰ لَا يَسْمَعُوا۟ ۖ وَتَرَىٰهُمْ يَنظُرُونَ إِلَيْكَ وَهُمْ لَا يُبْصِرُونَ ۝١٩٨﴾ [الأعراف]

واتە: خۆ ئەگەر بانگیان بکەیت بۆ بانگەوازی هیدایەت ئەوە بانگەوازت نابیستن، (چ جای ئەوەی یارمەتیشت بدەن) تۆ دەیانبینیت ئەوان سەیرت دەکەن لەکاتێکدا کە نابینن. یاخود لەسەر چاویان پەردەی نابینایی هەیە.

﴿... وَعَلَىٰٓ أَبْصَـٰرِهِمْ غِشَـٰوَةٌ ۖ... ۝٧﴾ [البقرة]

واتە: پەردەی بەسەر چاویاندا هێناوە. یاخود گوێچکەیان هەیە، بەڵام دەنگ نابیستن.

﴿إِنَّكَ لَا تُسْمِعُ ٱلْمَوْتَىٰ وَلَا تُسْمِعُ ٱلصُّمَّ ٱلدُّعَآءَ... ۝٨٠﴾ [النمل]

واتە: بێگومان تۆ ناتوانیت ئەو بانگەوازە بخەینە نێو دڵی دڵ مردوو و کەڕو لاڵەکانەوە، بەتایبەت کاتێک ڕوو وەردەگێڕن و پشت هەڵدەکەن. دڵیان داخراوەو حەق وەرناگرن، ئامۆژگاری کاریگەری لەسەریان نییە.



﴿وَجَعَلۡنَا عَلَىٰ قُلُوبِهِمۡ أَكِنَّةً أَن يَفۡقَهُوهُ وَفِيٓ ءَاذَانِهِمۡ وَقۡرٗاۚ وَإِذَا ذَكَرۡتَ رَبَّكَ فِي ٱلۡقُرۡءَانِ وَحۡدَهُۥ وَلَّوۡاْ عَلَىٰٓ أَدۡبَٰرِهِمۡ نُفُورٗا ٤٦﴾ [الإسراء]

واتە: (چونکە مەبەستیان نییە تێبگەن) ئێمەیش پەردە دەهێنین بەسەر دڵیاندا تا هەر تێینەگەن، گوێشیان سەنگین دەکەین تا نەیبیستن.

هەموو تاغووت و دیکتاتۆرو زاڵمێک بەم قۆناغی کردارییە لە چاو و گوێ و دڵ تێدەپەڕێت، دەتوانین بەدوو قۆناغی سەرەکی دەستنیشانی بکەین:

قۆناغی یەکەم: قۆناغی چەواشەکاری و هەڵخەڵەتاندن، لەپێناو بەجێهێنانی ئامانج و دەسەڵاتی تایبەتی خۆی، ئەتوانێ حەق و ڕاستی و چاکەو خراپەو باتڵ لەیەک جیا بکاتەوە، بەڵام خۆی نایەوێت هیچ جۆرە هیدایەتێک وەربگرێت.

قۆناغی دووەم: قۆناغی نابینایی چاکەیە، هیچ جۆرە چاکەو چاکەخوازییەک نابینێ، (الطمس)، خوای گەورە ناوی لێناوە تەمەس، پێشتر دەیزانی ڕاست و چەوت کامەیە، بەڵام ئەوەندە بەردەوام بوو لەسەر خراپە ئێستا تەنها خراپە دەبینێت، چاکەی ون کردووە، هەموو ژیانی تاوان و تاوان کردنە.

ئەوەی دەچێتە ئەم قۆناغە کۆتاییەکەی زۆر ترسناکە، مێژوو هەزاران کەسی لەوجۆرەی تۆمار کردووە لە فیرعەونەوە هەتا قەزافی و سەدام و هەزارانی وەکو ئەوان.

ئەم کورتە باسە شیکاری بوو لەسەر کارەکەی ئەبو جەهل زۆر شتمان بۆ تەفسیر دەکات، وشەی تاغووت و تاغووتەکان دەناسین کە چەندە مووجریم و ئازاردەری خەڵکین و ماڵ و سەروەت و سامانیان دەخۆن، نامووس و شەرەفی خەڵکی دەشکێنن، ئەوەی حەرامە بۆخۆیان حەڵاڵی دەکەن، کەرامەتی ملیۆنەها دەخەنە ژێر پێڵاوەکانیان و دوایی دەڵێن: ئێمە چاکە خوازو ئیسڵاح و خۆشنوودیمان بۆ ئێوە دەوێ، باسی شەرەف و ڕەوشت و کەرامەت دەکەن، خۆیان هیچیان نییە و ئەمە حاڵیانە بەگشتی. ئەوە شیکاری بەندە بوو لەسەر دوعاکەی ئەبو جەهل.

نومێر: دەمت خۆش زۆر جوان و گرنگ بوو، بەڵام...

ماکوان: نومێری برام با بڕۆین بزانین لە مەیدانەکەدا چی ڕوودەدات.

نومێر: پێغەمبەر ﷺ ئاراستەی موجاهیدەکان دەکات و قسەیان بۆ دەکات، پاش کەمێکی دیکە جەنگ دەست پێدەکات.



## ئاراستەكردنی سوپای موسڵمانان، لەلایەن پێغەمبەری خواوە صَلَّىٰاللَّهُعَلَيْهِوَعَلَىٰآلِهِوَسَلَّمَ

نومێر: پێغەمبەری خوا صَلَّىٰاللَّهُعَلَيْهِوَعَلَىٰآلِهِوَسَلَّمَ دەستی كرد بە ڕێكخستنی سوپاكەو ڕیزكردنیان، ئەمەش یەكەمجارە عەرەب بە ڕیزو سەف جەنگ بكات، پێغەمبەری خوا صَلَّىٰاللَّهُعَلَيْهِوَعَلَىٰآلِهِوَسَلَّمَ بۆ یەكەمجار لەنێو عەرەبدا بەكاری هێنا، زۆر جەختی لەسەر جوانی ڕیز و ڕێكوپێكی و سیستماتیک دەكردەوە، كە هەمووی بەیاساو وردەكاری ڕێكخستن.

دەستی كرد بە قسەكردن، هەموو ئەوانەی فەرمووی فەرمانی گرنگی سەربازی بوو، بەوپەڕی وردەكارییەوە، هەتا سوپای دوژمن نزیكتان نەبوونەوە تیریان بۆ مەهاون.[٨٠]

ئەمەش بۆ ئەوەی تیرەكان بەهەدەر نەڕوات، چونكە یەشتا دوژمن دوورەو تیرەكان نایانگاتێ. زۆرجار جەنگاوەر بەهۆی باری دەروونی جەنگییەوە زۆر تیر دەهاوێژن، یاخود فیشەک زۆر دەتەقێنن بەبێ ئەوەی ئامانج بپێكن!

هەروەها سوپای موسڵمانان زەخیرەی چەكیان زۆر كەمە و پێویستە دەستی پێوە بگرن، ئەمەش هەڵوەستەی دەوێت، نیشانەی سوپای سەركەوتووە. لەمەوە ئەوەمان بۆ ڕوون دەبێتەوە چەندە تواناو هێزی ماددی لەتواناتدا هەیە بەكاری بهێنە بۆ سەركەوتن.

ماكوان: كەواتە گرنگترین قۆناغی سوپای سەركەوتوو بریتییە لە:

یەكەم: بەكارهێنانی چاودێری سەربازی بۆ كۆكردنەوەی زانیاری لەسەر دوژمن.

دووەم: پاراستنی نهێنی و دەرنەچوونی زانیاری، هەروەكو پێغەمبەر صَلَّىٰاللَّهُعَلَيْهِوَعَلَىٰآلِهِوَسَلَّمَ كردی.

سێیەم: هەڵبژاردنی جێگەی گونجاو بۆ ئەنجامدانی جەنگ.

چوارەم: ئاراستەی سەربازی و دانی زانیاری بە سەربازەكان.

پێنجەم: ڕێكخستن و ڕیزكردنی ڕیزەكان بۆ جەنگ.

شەشەم: كۆكردنەوەی هێزو توانای ماددی بۆ جەنگەكان تا سەركەوتن، بەكارهێنانی هۆكارەكانی سەركەوتن و پاشان تەوەكول بەخوای پەروەردگار.

---

[٨٠] إِذَا أَكْثَبُوكُمْ - يَعْنِي : إِذَا غَشُوكُمْ - فَارْمُوهُمْ بِالنُّبْلِ وَاسْتَبْقُوا نُبْلَكُمْ أخرجه البخاري (١٤٦٤/٤، رقم ٣٧٦٣)، وأبو داود (٥٢/٣، رقم ٢٦٦٣).

نومێر: بەڵێ ڕاستە پێغەمبەری خوا ﷺ سەربازەکانی زۆر چاپووک و چاونەترس بوون، هێزە مرۆییەکەی لەوپەڕی تواناو پرۆفیشناڵی زەمەنی خۆی بووە. لەگەڵ ئەوەی تەنها دوو ئەسپی پێبووە لەگەڵ حەفتا وشتر، ئەوەی لەگەڵ خۆی هێنابووی تەنها تفاقی سەفەرکردن بوو، ئەوەندەی توانای هێزی هێنابوو هەربۆیە خوای گەورە وەسفی واقیعەکەمان بۆ دەکات و دەفەرمووێت:

﴿وَأَعِدُّواْ لَهُم مَّا ٱسۡتَطَعۡتُم مِّن قُوَّةٖ وَمِن رِّبَاطِ ٱلۡخَيۡلِ تُرۡهِبُونَ بِهِۦ عَدُوَّ ٱللَّهِ...﴾ [الأنفال]

واتە: (خوا فەرمان دەکات بەکاربەدەستانی ئیسلام) هەرچی لەتواناتاندایە بۆ بەهێزکردنی سوپای ئیسلام بیخەنە گەڕو ئامادەی بکەن، لە ئامادەکردنی هەموو جۆرە ئەسپ و کەمتەرخەمی مەکەن تا دوژمنانی خواو دوژمنانی خۆتانی پێ چاوترسێن بکەن.

حەزدەکەم لەباسی سیفاتی سوپای سەرکەوتوو یەک دانەی دیکەت بۆ باس بکەم، ئەویش دڵنەرمی و بەڕەحمی سەرکردەکەیانە لەگەڵیاندا، مەبەستم پێغەمبەری خوایە ﷺ کە چەندە خۆنەویستە لەگەڵیان، لەگەڵ ئەوەی جێگای سەربازی توندو یاریکردنی مەرگە، کەچی پێغەمبەری خوا ﷺ لەوپەڕی نەرمی و بەزەییدایە لەگەڵ سوپاکەی لەگەڵیاندا دەژی و لەگەڵیاندا نان دەخواو خۆی لێیان جیانەکردۆتەوە، سەربازو بەرپرسی سەرەکی وەکو یەک دەژین، هەربۆیە بە خۆشەویستی زۆرەوە لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ دەجەنگن.



## ڕەحم و سۆزی سەرکردە لەگەڵ جەنگاوەرەکانیدا

نومێر: لەڕاستیدا زۆر پێویستە لەسەر ئەو وێستگەیەی ژیانی پێغەمبەری خوا ﷺ هەڵوەستە بکەین، لەکاتی ڕیزکردنی سەربازو موجاهیدەکاندا پێغەمبەری خوا ﷺ بینی کەسێک بەخواری وەستاوە، شیرێکی بەدەستەوە بوو وەکو دارێک بۆ ڕیزکردنی سوپاکەی بەکاری دەهێنا، یەکێک لەو موجاهیدانە لە ڕیزەکە دەرچووبوو هاوەڵەکە ناوی (سەواد کوڕی غەزیەت) بوو، پێغەمبەری خوا ﷺ زۆر بەسادەیی پێی فەرموو، بەدارەکە یاخود بە تیرەکە فەرمووی: (سەواد) بڕۆ ناو ڕیزەکەو جوان بوەستە، واتە: تیرەکەی دا بەسکیدا بۆ ئەوەی بچێتەوە نێو ڕیزەکە.

بەڵام ئەوەی جێی سەرسوڕمان بوو و سەری هەمووانی سوڕماند کاردانەوەی سەواد بوو لەنێو ئەو هەموو سوپایەدا بەدەنگی بەرز وتی: ئەی ڕەسوڵی خودا ئازارم پێگەیشت، حەقی خۆم دەوێت! پیاتکێشاوم دەبێ پیاتکێشمەوە، لەهەمووی سەرسامتر پێغەمبەری خوا ﷺ بێ هیچ دوودڵییەک فەرمووی: سەواد تۆڵەی خۆتم لێ بکەوە.

سەواد: من سکم ڕووت بوو کاتێک پیاتکێشام، دەبێ جەنابت سکت ڕووت بێت تا پیاتدابکێشم!

پێغەمبەری خوا ﷺ زۆر بەسادەیی و ئاسانی فەرمووی: فەرموو تۆڵەی خۆت بکەرەوە بەڕووتی بکێشەوە بەسکمدا! تەماشای هەڵوێستی ئەو سەرکردەیە بکە.

ماکوان: زۆر لەلام سەیر نییە چونکە ئێمە باسی پاشاو شا و کیسرا و قەیسەر ناکەین، یان سەرۆک وەزیرو سەرۆک کۆمارێک، لەهەموو ئەوانە گەورەتر باس دەکەین، پێغەمبەری خوا ﷺ ڕاستە سەرۆکی گشتییەو سەرۆکی دەوڵەت و سەرۆکی بەرزی هەموو لایەک و سەربازگەو سەربازەکانە، لەکۆتاییدا پێغەمبەرە ﷺ بە ئاڕاستەی خوای پەروەردگار کار دەکات، خوای گەورە هەڵیبژاردووە.

ئەی لەدواییدا چی ڕوویدا هاوەڵەکە کێشایەوە بەسکی پێغەمبەری خوادا ﷺ ؟



نومێر: لەهەمووی سەرسووڕهێنەرترو غەریبتر هەڵوێستی هاوەڵەکە بوو. هەموو هاوەڵانی دیکە لۆمەیان کرد، پێغەمبەری خوا ﷺ دەستبەجێ سکی خۆی بۆ ڕووت کرد تا پێیدا بکێشێ.

بەڵام ئەو چووە پێشەوەو سکی موبارەکی پێغەمبەری خوای ﷺ ماچ کرد، تەنانەت پێغەمبەری خوا ﷺ لەلای سەیر بوو فەرمووی: سەواد چی وای لێکردی ئەو هەڵوێستە ئەنجام بدەیت؟

وەڵامەکەی سەوادیش لەهەموو ڕووداوەکە سەیرو غەریبتر ئەوەت بۆ باس دەکات کە خۆشەویستی سەربازو سەرکردەکەی گەیشتۆتە چ ئاستێک، سەواد وتی: ئەی پێغەمبەری خوا جەنگەو لەوانەیە بکوژرێم، حەزدەکەم کۆتا شتێک پێی بگەم ماچ کردنی لاشەی جەنابت بێ. ئەمەش یەکێکە لە نیشانەکانی سوپای سەرکەوتوو کە ڕەحم و بەزەیی لەنێوان سەربازو سەرکردەدا هەیە.

## دەستپێکی جەنگی بەدر

نومێر: سوپا لەبەردەمی یەکتردا وەستان کاتژمێری جەنگ سفرە، پیاوێک لە قوڕەیش موشریک بوو بەناوی: (ئەسوەدی کوڕی عەبدولئەسەدی مەخزومی) سوێندی خوارد دەبێ لەو حەوزەی موسڵمانان دروستییان کردووە ئاو بخواتەوە یان بکوژرێ.

تەماشای گومڕایی و سەرلێشێواوی ئەو خەڵکە بکە چۆن کوێر بوو سەری خۆی دەکات بە داوی دۆزەخدا و لەپێناوی چیدا کۆشش و خەبات دەکات، لەپێناوی چ فەسادو خراپەکارییەکدا سوێند دەخوات ڕاستەوخۆ خۆی فڕێدەداتە نێو دۆزەخ، خوای گەورە لەبارەی ئەو جۆرە کەسانەوە دەفەرموێت:

﴿أَفَمَن زُيِّنَ لَهُۥ سُوٓءُ عَمَلِهِۦ فَرَءَاهُ حَسَنًاۖ فَإِنَّ ٱللَّهَ يُضِلُّ مَن يَشَآءُ وَيَهۡدِي مَن يَشَآءُۖ...﴿٨﴾﴾

[فاطر]

واتە: ئایا ئەو کەسەی کردەوە ناشیرینەکانی بۆ ڕازێنراوەتەوە بەجوان و چاک دەیبینێت بەڕاستی خوا بیەوێت هەرکەس گومڕا بکات دەیکات، هەرکەسیش هیدایەت بدات دەیدات.

بەڵێ: ئەسوەد بەردەوام بوو لە ڕۆیشتن بۆ نێو جەرگەی موسڵمانان، بەڵام لەگەڵ کێ ڕوبەڕوو بوویەوە، لەگەڵ شێرێکی خوای پەروەردگار، حەمزەی کوڕی عەبدولموتەڵیب بەیەکەم



لێدان قاچی پەڕاند، بەڵام (سبحان الله) ئەسوەد سوێندی خواردبوو دەیویست بەوەفا بێت بەرانبەر سوێندەکەی، بەڵام حەمزە لەو خۆڕاکێشانە بەسەر حەوزەکە خستی لە جێگەی خۆیدا کوشتی، نەیهێشت مورادو پەیمانەکەی بەرێتە سەر.

ئەمە خاڵێکی زۆر گرنگ بوو هەر لەسەرەتاوە بۆ موسڵمانان تۆمار کرا، زۆر گرنگە بۆ موسڵمانان نەک لەبەر ئەوەی کەسێک کوژراوە، بەڵکو لەبەر ئەوەی لەنێو جەنگەکەدا خوای گەورە هێزو چاونەترسی و تەوفیقی دایە خواناسان، بواری دەروونی موسڵمانان زۆر بەرز بوویەوە.

کە کافران بەتایبەت قیاداتی قورەیش ئەوەیان بینی هەموو ڕقیان هەڵساو تووڕە بوون، سێ لە سەرکردەکانی موشریکەکان خۆیان بۆ ڕووبەڕووبوونەوە ئامادەکرد، وەکو پێشانگایەک و سەرەتایەک بۆ جەنگ، جەنگاوەرەکان جۆرێک لە خۆنواندن لەو سەردەمەدا باو بوو، دوای ئەوە هێرشی گشتی دەست پێدەکات.

کێ هەڵسان بۆ جەنگ لەکافرەکان سێ کەس لەیەک خێزان کارێکی زۆر سەیر بوو، یەکێک لەوانە حەزی بەجەنگ نەبوو، بەڵام تووشی کوێری بوو هەڵسا بۆ جەنگ. یەکەم: عوتبەی کوڕی ڕەبیعە، دووەم: براکەی شەیبەی کوڕی ڕەبیعە، هەردووکیان دوو سەرکردەی گەورەی قورەیش بوون، پاشان کوڕەکەی بەناوی: وەلیدی کوڕی عوتبە، ئەویش لە سوارچاکانی قورەیش بوو و ناسراو بوو لەنێو عەرەبدا، ئەم سێ کەسە لە سوارچاک و سەرکردەکانی مەککە بوون، سەیرەکە لەوەدایە، عوتبە سەرکردەیەکی لەسەرخۆو خاوەن ڕاوبۆچوونی حەکیمانە بوو، پێشتر زۆر هەوڵیدا بۆ نەکردنی ئەم جەنگە، کەچی خۆی یەکەم کەس بوو هەڵسا بۆ ڕووبەڕووبوونەوە لە گۆڕەپانی جەنگدا بۆ خۆنواندن، هەمیشە ئەیوت: لە موحەممەد ساحیرتر نییە، شاعیر تر نییە، درۆزنتر نییە، کاهینتر نییە، تەنانەت کاتێک هەڵسا بۆ جەنگ سواری وشترێکی سوور بووبوو، پێغەمبەری خوا ﷺ بینی فەرمووی: (ئەگەر لەنێو ئەو گەلی قورەیشەدا کەسێکی تێدابێت خاوەن ڕاوبۆچوونی بێت پێگەیشتوو بێت، خاوەنی ئەو وشترە سوورەیە)،[٨١] بەڵام هۆزەکەی بە قسەیان نەکرد.

بەداخەوە عوتبە چووە نێو جەنگەکە بۆ شەڕ، بەڵام نەگەڕاوە وەکو نەفسیی کوڕی شورەیق، هەرسێکیان دەرچوونە نێو مەیدان و داوای جەنگیان لە موسڵمانان کرد.

---

٨١ ـ (إن يكن في أحد من القوم خير، فعند صاحب الجمل الأحمر إن تطيعوه يرشدوا).



خێرا سێ کەسی ئەنسار وەکو شێر بۆیان دەرپەڕین، بۆ ئەوەی بیسەلمێنن کە خاوەنی عەهدو پەیمانن، جەنگەکە بە جەنگی خۆیان دەزانن.

بەڵام سوارچاکەکانی قورەیش وتیان: ئێمە کارمان بە ئێوە نییە، بەڵکو دەمانەوێت لەگەڵ ئامۆزاکانی خۆماندا بجەنگین، جۆرێک بوو لە سیاسەتی جەنگ ویستیان پارچە پارچەیی بخەنە نێو ڕیزی موسڵمانان، واتە: ئێمە کێشەمان لەگەڵ خەڵکی مەدینەدا نییە، دەمانەوێت قورەیش لەگەڵ قورەیش جەنگ بکات!

پێغەمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰٓ آلِهِ وَسَلَّمَ فەرمانی کرد بە گەڕانەوەی هەرسێ ئەنسارەکە، بەدەنگی بەرز فەرمووی: ئەی عوبەیدە هەڵسە بۆ جەنگ، (عوبەیدەی کوڕی حارسی کوڕی عەبدولموتەلیب)، کوڕی مامی پێغەمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰٓ آلِهِ وَسَلَّمَ.

پاشان فەرمووی: حەمزە، هەڵسە، (مامی پێغەمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰٓ آلِهِ وَسَلَّمَ).

دوای ئەوە فەرمووی: هەڵسە ئەی عەلی کوڕی ئەبو تاڵیب، بەهەمان شێوە ئامۆزایەتی.

تەماشای هەڵبژاردەی پێغەمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰٓ آلِهِ وَسَلَّمَ هەمووی لە خانەوادەکەی خۆی هەڵبژارد. بۆ ئەوەی خەڵکی بزانن خێزانەکەیشی وەکو هەموو سەربازەکانی تر لەبەرەی جەنگدان، بەڵکو پێشەنگن.

جەنگ دەستی پێکردو زرەی شمشێر بەرز بوویەوە، مەیدان خرۆشی سەندو تەرەفی خوای پەروەردگار بەدەنگی بەرز هاواری تەکبیر دەکات، دەڵێن: (الله أكبر)، تەرەفی موشریک هاواری دەکرد هوبەل و لات و عوزا بەبەرز ڕادەگرن، لەچەند ساتێکی کەمدا خوێن لە شمشێرەکەی عەلی کوڕی ئەبو تاڵیب خوارەی کرد، شەیبەی کوڕی ڕەبیعەی کوشت، پاشان حەمزە عوتبەی کوشت، حیکمەت و عەقڵزانی عوتبە فریای نەکەوت تا کۆتایی لە دۆزەخدایە، دەنگی (الله أكبر) و (الحمدلله) بەرز بوویەوە، بەڵام بەردەوام جەنگ لەنێوان عوبەیدە و وەلید دایە، هەردوولا یەکتریان بریندار کرد، حەمزەو عەلی بەخێرایی چوون بەلای عوبەیدەوە، وەلیدیان کوشت و عوبەیدەیان گواستەوە بۆ سەربازگەکەیان، خاڵی دووەم نووسرا بۆ موسڵمانان لەسەرەتاوە چوار لە موشریکەکان کوژران، پاشان مەیدانی جەنگ گڕی سەندو هێرشی گشتی دەستی پێکرد، هاواری موسڵمانان بەرز بوویەوە، بەدەنگی بەرز هاواریان دەکرد (أحَدٌ، أحَد) درووشمی جەنگی بەدر بوو، دەنگی زرەی شمشێر دەچێتە ئاسمان و تەپوتۆز ئەو ناوەی تەنیووە، زۆر ترسناکەو یەکەمجارە موسڵمانان تووشی جەنگی وا قورس بوونەتەوە، لەگەڵ کافرەکاندا.



## پەروەردە لەسەر چوونە بەهەشت

نومێر: لەگەڵ درووشمی بەرزی (أحد، أحد) ئازایەتی هاوەڵان و حەماس و وریاییان دەردەکەوت، بەڵام یەشتا پێویستیان بە هاندانی زیاترە بۆ جەنگ، چونکە جەنگەکە زۆر سەختە. بەهەموو پێوەرێکی سەربازی (٣١٦) کەس ڕووبەڕووی هەزار جەنگاوەر بوونەوە زۆر ترسناکە، پیغەمبەری خوا ﷺ (١٥) ساڵە هاوەڵان بۆ ئەوە پەروەردە دەکات کە هەرکەس گوێی لێبێت ئارامی لێ هەڵدەگیرێت و زیاتر چالاک و بەهێزتر دەبێت، ماندووبوون چییە نازانێت ئەویش کاتی ئەوەیە بەهەشت بیری هاوەڵان بخاتەوە.

پێغەمبەری خوا ﷺ دەنگی بەرز دەکردەوە دەیفەرموو: سوێند بەو کەسەی گیانی منی بەدەستە ئەمڕۆ هەرکەس لە ئێوە چاونەترسانە لە گۆڕەپانەکەدا بجەنگێت خۆ ئەگەر کوژرا ئارام بوو ڕووو لە دوژمن بوو هەڵنەهات، بەدڵنیاییەوە خوای پەروەردگار دەیخاتە بەهەشت.

ماکوان: ئەم وتەیە قسەیەکی زۆر عەجیبە و عەلمانی خوانەناسان لێی بێئاگان، تەنانەت کافرو فاسقەکان پەی پێ نابەن، قسەکەی پێغەمبەر ﷺ چەندە عەجیب و جوان و سەرسووڕهێنەرە، هەموو سوپایەک داوا دەکات لە جەنگدا گیانیان پارێزراو بێت، لێرەدا ڕێک پێچەوانەیە گیانت ببەخشە.

(سبحان الله) کە جوانە هەر کەس لە جەنگدا ئازاو چاونەترس بوو و هەڵنەهات، خۆگرو ئارامگر بوو دەچێتە بەهەشت، ئاخر خۆ بەهەشت تەنها ئەو وشە نییە، بەڵکو خۆشییەکانی بە خەیاڵدا نەهاتووە، ناتوانین وێنای بکەین کە هەرچی خەیاڵ و بیرکردنەوەو وێناکردن هەیە لە مێشکی مرۆڤ و توانای مرۆڤدا لە یەکەم مرۆڤەوە تا کۆتا مرۆڤ ناتوانێت وێناو خەیاڵی بکات، جا لەبەر ئەوە کە دەڵێین: بەهەشت بەڕاستی تەنها هاوەڵان و ئەوانەی شوێن کەوتەی هاوەڵانن دەزانن واتای چییە. لەسەر هەموویەوە ئەو بەهەشتە لەسەر زەوی نییە، نە بە کەرەستەو ئامێری گواستنەوە بۆی دەڕۆیت نە کۆچی بۆ دەکەیت بەڵکو ڕاستەوخۆ موجاهید لەگەڵ دەرچوونی ڕۆح لە لاشەی ڕاستەوخۆ بۆ ئەو جێگایەیە.

تەنها پەردەیەک لەنێوان موجاهیدو بەهەشت مردنە، کە مردنمان تێپەڕاند ئیدی بەهەشتە، دەی مەرگ وەرە تۆ لەکوێی با بڕۆینە بەهەشت، زۆر بە خۆشحاڵییەوە پێشوازی لە مەرگ دەکەین بۆ چوونە بەهەشت.



سبحان الله مردن چەندە مەکروهەو خەڵکی لێی دەترسێن، لای خەڵکی بەگشتی بەڵام لەپێناوی خوادا بوو، ئیتر بۆی دەگەڕێین. مردن دەبێتە هیواو ئامانج و خۆشی بۆ خاوەنەکەی، ئاخر بەهەشت سەد پلەیە، خودا ئامادەی کردووە بۆ کۆششمەندان و موجاهیدەکان لەپێناو خوا، لەنێوان هەر پلەیەکدا پانتاییەکەی ئەوەندەی ئەم گەردوونەیە کە ئێمە تێیدا دەژین، ئەمەش قسەی ماکوان نییە بەڵکو پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: [٨٢]

هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: دەرچوونێک لەپێناوی خوای پەروەردگاردا، ئەو دەرچوونە باشترو خێرترە لەهەرچی خێری ئەم دنیایەدا هەیە لەگەڵ نیعمەتەکانی، ئەوەندەی تیرو کەوانی یەکێکتان[٨٣] پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: خۆ ئەگەر ئافرەتێکی ئەهلی بەهەشت لەم ژیانەدا دەرکەوێت جوانی، نازداری، ڕوونی، شەوق و زەوقی لەهەرچی ئافرەتانی سەرزەوییە جوانترە، بۆنخۆشی جوانی و ڕۆشتنی بۆنەکەی لەنێوانی ئاسمان و زەوییە، یاخود ڕۆژئاواو ڕۆژهەڵاتە، تاجێک ئەو سەرپۆشەی کە بەسەرییەوەیەتی لەخێرو بەرەکەتی ئەو ژیانی دونیایە زیاترە، تەنانەت پێغەمبەری خوا ﷺ بەو هەموو پێناسەو وەسفە جوان و دەقیقە نەیتوانیووە بۆمان وەسف بکات، هەر دەفەرموێت زیاترە لەوەی کە لەم ژیان و جیهانەدا هەیە. [٨٤]

هەرکەسێک خاوەنی یەقین بوو بەو وتانەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەستەمە موشتاق نەبێ بۆ بەهەشت، نەیەوێ بەزووترین کات پێی بگات، هەر لەبەر ئەوەیە سوپای سەرکەوتوو حەزی لە مردنە و لە مردن ناترسن، وتەکەی خالیدی کوڕی وەلید کە زۆر بەناوبانگە پێشتر باسمان کردووە، بەرانبەر سوپای فارس دەڵێت: بە پیاوانێکەوە هاتووم بۆ جەنگ کە مردنیان خۆش دەوێت، ئەوەندەی ئێوە دونیاتان لەلا خۆشەویستە.

کاتێک باسی سوپای دۆڕاوو شکست خواردوو دەکەین یەکێک لە سیفاتەکانی دونیا ویستان (الوهن)ە، لە پێغەمبەری خوایان پرسی ﷺ (الوهن) چییە؟

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

٨٢ ـ أَنَّ رَسُولَ ٱللَّهِ ؟ قَالَ : إِنَّ فِي ٱلْجَنَّةِ مِائَةَ دَرَجَةٍ أَعَدَّهَا ٱللَّهُ لِلْمُجَاهِدِينَ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ ، مَا بَيْنَ ٱلدَّرَجَتَيْنِ كَمَا بَيْنَ ٱلسَّمَاءَ وَٱلْأَرْضَ رَوَاهُ ٱلْبُخَارِي أخرجه أحمد (٣٣٩/٢، رقم ٨٤٥٥)، والبخاري (١٠٢٨/٣، رقم ٢٦٣٧) وابن حبان (٤٧١/١٠، رقم ٤٦١١).

٨٣ ـ مەبەست نێوانی کەوانی ئەو سەراو سەری کەوانە کە یەکە هەموو پێوانەکەی ناکاتە یەك مەتر، واتە: ئەوەندەی ئەو مەترە لە خاکی بەهەشتدا خێری هەموو دونیایە.

٨٤ ـ (لِغَدْوَة فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ أَوْ رُوحِهِ . . . فَذَكَرَ . يَعْنِي : ذَكَرَ حَدِيثُ سُلَيْمَانُ بْنُ دَاوُدْ . [ أَيُّ حَدِيثِ : لِغُدُوَة فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ ، أَوْ رُوحِهِ خَيْرٌ مِنْ ٱلدُّنْيَا وَمَا فِيهَا ، وَلِقَابِ قَوْس أَحَدِكُمْ أَوْ مَوْضِع قَدِّهِ - يَعْنِي سَوْطُهُ - مِنْ ٱلْجَنَّةِ خَيْرٌ مِنْ ٱلدُّنْيَا وَمَا فِيهَا).



فەرمووی: خۆشەویستی دونیاو ڕقبوونەوە لەمردن[85] ئەستەمە قەومێک بدۆزێت کە حەزی بە مردن و بەهەشت بێت و دونیای لەلا هیچ بێت.

سەرۆک وەزیرانی ڕابردووی ئیسرائیل کە مردووە، یەهوود لەکەنیسەیەکی خۆیاندا بانگیان کرد، لۆمەی ئەوەیان لێکرد کە لەبەرچی تواناى نییە دەست بەسەر هێزو تواناکانی حەماس و جیهاددا بگرێت؟

وتی: تەحەددای هەرچی دەزگای موخابەراتی جیهانییە دەکەم بتوانێ ڕووبەڕووی هێزێک ببێتەوە کە بەدوای مردندا دەگەڕێ، لەڕاستیدا قسەکە زۆر ڕاست و زۆر واقیعییە و بەوپەڕی دیقەتەوە کردی، چونکە تۆ ڕووبەڕووی هێزێک دەبییەوە بەمردن دەیترسێنیت ئەو بەدوای مردندا دەگەڕێ، بەچی دەیترسێنیت دەڵێی دەتکوژم؟

ئەویش دەڵێ: من ئەوەم دەوێ.

ئایا لە ئێستادا ئوممەتی موسڵمان مەرگی دەوێت؟ ئاوات و هیوای مەرگە بۆ سەرکەوتن، ئایا کەس لە ئێمە هیواو ئاواتی مەرگە لەپێناو دینەکەی.

ئەم پرسیارە دەبێ هەموو کەس لەخۆی بکات کە مردن بووە ئارەزوو، دڵنیابن سەرکەوتن دێت و خوای گەورە دەیبەخشێ.

ئەم هیواو ئاواتە لەڕاستیدا خەماوی و خەمناکی نییە ڕۆژی قیامەت کە خوای پەروەردگار لێپرسینەوەمان لەگەڵ دەکات دەبینین چەندین خەڵکی بێ پرسیار و وەڵام دەچنە بەهەشت و پێشبڕکێیانە بۆ بەردەم دەرگای بەهەشت، تۆیش حەیران و دوودڵیت. ئەی بۆ لە ئێستاوە قەدەری خۆت ناگۆڕیت و حەز بەو بەهەشتە ناکەیت؟!

مەڵێ کوا جیهاد؟ کوا جەنگ؟ هەموو ئەوەی باسم کرد نییەت و ڕاستگۆییە لەگەڵ خوای پەروەردگارو خۆتدا، بەڕاستگۆیی داوای بکە خوای گەورە دەیبەخشێت، جا بەڕاستی دەتەوێ لەپێناوی خوا بمریت یاخود نا؟ خۆ ئەگەر ڕاستگۆبیت سوێند بەخوا پاداشتەکەی وەردەگریت، ئەگەرنا لەنێو ماڵی خۆتدا بمریت و لەسەر جێگەی گەرم و نەرم.

ئەوەش پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: هەرکەسێک بەڕاستگۆیی داوای شەهیدی بکات ئەوا خوای گەورە پاداشتی شەهیدی و جێگەی شەهیدانی پێ دەبەخشێت، هەرچەندە لەسەر جێگەکەی بمرێت، بەڵام ئەوەی دەتەوێت و دەرگای جیهادو خەباتی بۆ

---

٨٥ ـ (حُبُّ ٱلدُّنْيَا وَكَرَاهِيَةِ ٱلْمَوْتِ) أبو داود (٤٢٩٧).



بکرێتەوە هەزار جار نایەوێت و ئەو پاداشتی شەهیدییە ڕەت دەکاتەوە. کەواتە لێرەدا ڕاستگۆیی دەوری خۆی دەبینێت.

نومێر: زۆر ڕاستە تەماشاکە بەهەشت چ کاریگەرییەکی هەبوو لەسەر هاوەڵان لە بەدردا، (عومەیری کوڕی حەمام) بە تەنیشت پێغەمبەری خواوە ﷺ وەستا بوو، گوێی لە پێغەمبەر ﷺ بوو دەیفەرموو: هەڵسن بۆ بەهەشتی خوای پەروەردگار کە پانایەکەی بەقەدەر ئەو گەردوونەیە.[87]

ئێمە چەندجار گوێمان لەو وتەیە بووە بەدڵنیاییەوە زۆر، بەڵام هیچ کاریگەری لەسەر دڵمان دروست نەکردووە.

کاتێک عومەیر گوێی لەو ڕستەیە بوو زۆر بە سەرسامییەوە وتی: پانتاییەکەی ئەوەندەی ئەو گەردوونەیە؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بەڵێ، ئیتر بێ شیکاری و ڕوونکردنەوە، چونکە ئەو ڕاستەوخۆ تێگەیشت هیچ لێدوان و موناقەشەیەکی نەکرد هەڵساو وتی: (بەخین، بەخین " بَخٍ بَخٍ") ئەمە وشەیەکی زۆر سەرسوڕمانە لەلای عەرەب.

بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: [88]

واتە: چی وای لێکردی ئەوەندە سەرسام بیت، وەکو ئەوە وابوو بڵێ: گومانت هەیە؟

عومەیر ڕاستەوخۆ خێرا فەرمووی: نا ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ سوێند بەخوا بۆیە وتم کە حەزو ئاواتمە لە ئەهلی ئەو بەهەشتە بم.

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: تۆ ئەهلی ئەو بەهەشتەی، (فنک من أهلها)، عومەیر کە گوێی لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو موژدەی بەهەشتی دایە، تەواو ئۆقرەی لێ بڕا دەیوت: ئەوە یەشتا لەسەر زەویم و دەژیم، چونکە لەم خاکی بەدرەدا نێوانی ئەو و بەهەشت تەنها مردنە، خۆی بۆ نەگیرا دەیزانی پانتاییەکەی هێندەی زەوی و ئاسمانەکانە کە مانای گەردوونە بە ملیۆن و ملیار کیلۆمەتر هەژمار ناکرێ، چەند خورمایەکی

---

٨٦ ـ (مِنْ سَأَلَ اَللَّهُ تَعَالَى اَلشَّهَادَة بِصِدْقٍ بَلَغَهُ اَللَّهُ مَنَازِلَ اَلشُّهَدَاءِ وَإِنْ مَاتَ عَلَى فِرَاشِهِ أخرجه الدارمي (٢٧٠/٢، رقم ٢٤٠٧) وأبو داود (٨٥/٢، رقم ١٥٢٠) والترمذي (١٨٣/٤، رقم ١٦٥٣) وقال: حسن غريب. (ولو ترد فلن تنال أجر الشهادة حتى لو فتح لک ألف باب للجهاد).

٨٧ ـ (فَقَالَ رَسُولُ اَللَّهِ صَلَّى اَللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ : قُومُوا إِلَى جَنَّةٍ عَرْضِهَا اَلسَّمَوَاتِ وَالْأَرْضَ) صحيح مسلم، رقم ١٩٠١.

٨٨ ـ (مَا يَحْمِلُكَ عَلَى قَوْلِكَ بَخٍّ بَخٍّ ؟)



بەدەستەوە بوو، تا بۆ هێزو چالاکی جەستەی بیخوات و برسی نەبێت، بەڵام بیری کردەوە لە خۆشی بەهەشت و خواردن و خواردنەوەو پەلەوەرو گۆشتی بەهەشت و حەوزی بەهەشت، خێرا خورماکانی فڕێداو وتی: کەی کاتی ئەوەم هەیە ئەم چەند دەنکە خورمایە بخۆم، بەڕاستی کاتێکی دوورو درێژە، ئەگەر تا ئەو خورمایە بخۆم ژیان دوورو درێژتر دەبێتەوە.[٨٩] خۆی هەڵدایە نێو جەرگەی جەنگەکەو دەستی کرد بە جیهاد تا شەهید بوو، یەقینی هەبوو دەچێتە بەهەشت، چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرموو: تۆ لە ئەهلی بەهەشتی، خەڵکی دونیا وا دەزانن عومەیر دۆڕاو مردو کۆتایی هات و وەکو خەڵکی دەڵێن: جوانەمەرگ بوو. بەڵام پێوەری ڕاستی وا نییە، چونکە ڕۆحی شەهیدەکان لەنێو جەرگەی بەهەشتدا دەفڕن وەکو باڵندەی ڕەنگی سەوزی جوان وان کە بە دارەکانی بەهەشتەوە هەڵدەنیشن، یاخود لە بەروبوومی بەهەشت دەخۆن.[٩٠]

عومەیر تەمەنی تەنها شازدە ساڵ بوو کە بەپێوەری نەتەوە یەکگرتووەکان لە هەژدە ساڵییەوە منداڵ نییە، ئەو بە منداڵ هەژمار دەکرێت، بەڵام لە ئیسلامدا بە پێناسەی ئەهلی ئیسلام ئەو گەورە و پیاو و پێشەوای ئەو ئوممەتەیە.

بەدڵنیاییەوە هاتبوو بۆ جەنگ لەگەڵ پیاوانی موجاهیدا، بەڵام ئەو دەترسا لەوەی نەمرێت، پێغەمبەری خوا ﷺ بیگێڕێتەوە، بە بچووک و منداڵ تەماشای نەکات، تەماشای ئەو کۆمەڵگایە بکە چۆن پەروەردە بوو لە چ نیعمەتێکی خۆش عیزەت و سەربەرزیدان.

یەکێکی دیکە لە گەنجەکان لەناو جەنگەکەدا خۆی دەشاردەوە، تا براکەی هات وتی: ئەمە بۆ خۆت دەشارییەوە؟

براکەی یەکێک بوو لە قارەمان و ئازاو چاونەترسەکان ناوی سەعدی کوڕی ئەبی وەقاس بوو، پوورزای پێغەمبەری خوایە ﷺ برا بچووکەکەی ناوی عومەیری کوڕی وەقاسە وتی: وەڵاهی دەترسم پێغەمبەری خوا ﷺ بە بچووک تەماشام بکات و بمگێڕێتەوە و لەم جیهادە بێبەش بم، بەڵکو خوای گەورە شەهیدی بکاتە نسیبم، چونکە پێشتریش لەنێو شاری مەدینە لەنێو سوپاکەدا دەستی کرد بە خۆشاردنەوە، تا پێغەمبەری خوا

---

٨٩ ـ (قَالَ : لَا وَٱللَّهُ يَا رَسُولُ ٱللَّهِ ، إِلَّا رَجَاءَهُ أَنْ أَكُونَ مِنْ أَهْلِهَا ، قَالَ : فَإِنَّكَ مِنْ أَهْلِهَا ، فَأَخْرَجَ تَمَرَاتٍ مِنْ قَرْنِهِ ، فَجَعَلَ يَأْكُلُ مِنْهُنَّ ، ثُمَّ قَالَ : لَإِنْ أَنَا حَيِيتُ حَتَّى آكُلَ تَمَرَاتِي هَذِهِ إِنَّهَا لَحَيَاةٌ طَوِيلَةٌ).

٩٠ ـ (إِنَّ أَرْوَاحَ ٱلشُّهَدَاءِ فِي جَوْفِ طَيْرٍ خُضْرٍ تَعَلَّقَ مِنْ ثِمَارِ ٱلْجَنَّةِ) أخرجه مسلم (١٥٠٢/٣، رقم ١٨٨٧)، والترمذي (٢٣١/٥، رقم ٣٠١١) وقال: حسن صحيح.



ﷺ بانگی کرد پێی فەرموو: بگەڕێوە تۆ منداڵی، عومەیر دەستی کرد بە گریان وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ حەزدەکەم لەگەڵتان دەرچم، بەڵکو خوای گەورە ڕزق و ڕۆزی شەهیدیم پێ ببەخشێ.

تا پێغەمبەری خوا ﷺ بەزەیی پێدا هاتەوە لەگەڵ خۆیدا بردی بۆ جەنگ، ئەویش تەنها شازدە ساڵ تەمەنی بوو، چونکە ڕاستگۆ بوو خوای گەورە پلەی شەهیدی دایەو چووە بەهەشت، لەگەڵ شێخ و پیاوچاکان و گەورەکانی ئیسلامدا هەژمار دەکرێت با تەمەنی منداڵ بێت، بەڵام لەچاوی ئوممەت و ئەو ئیسلامەدا گەورەیە، مەنهەجێک پەروەردەی کردووە جیاوازترە لە هەموو مەنهەجەکانی ژیان، ڕێک پێچەوانەی هەموو مەنهەجەکانی دیکە، دەگری نەک لەبەر ئەوەی لە مردن دەترسێ، بەڵکو بۆ ئەوەی مردنی لەدەست نەڕوات، خۆی دەشارێتەوە نەک لەبەر ئەوەی لەدوژمن دەترسێ، بەڵکو دەترسێ لەوەی ڕووبەڕووی دوژمن نەبێتەوە، چ مەنهەجێکی ڕاقی و بەرزە، ئەم ئیسلامە چۆن پیاو پەروەردە دەکات و کارگەی دروستکردنی پیاوە، ئەم مەنهەجی ئیسلامە خەڵکی مەردانەو جوامێرانە پەروەردە دەکات.

تەماشای ئەو گەنجەی تر بکە ناوی عەوفی کوڕی حارسە، لە جەنگەکەدا پرسیاری لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد: ئەی ڕەسولی خوا ﷺ خوای گەورە چۆن پێدەکەنێ و خۆشحاڵ دەبێ بەبەندەکانی؟ (سبحان الله) لە گەرمەی شریخەی شمشێرو پێداکێشاندا خەیاڵ و بیری لای ئەوەیە کە چۆن خوا ڕازی بکات، خوای گەورە خۆشحاڵ و ببینی و پێبکەنێ؟!

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بە کەسێک کە لە دوژمن ناترسێت، لەپێناوی خواو تەنها بە شمشێرەکەی دەستی خۆی دەخاتە نێو دوژمن بەدوای مردندا دەگەڕێت.[٩١]

بە دڵنیاییەوە دوژمن لەو کەسە دەترسێت بە پێوە جەنگ دەکات گوێ بە قەڵغان و درع نادات خۆی بۆ مردن ئامادە دەکات، دوژمن لە بەردەمیدا خۆی ناگرێت، داوای مەرگ لە دوژمن دەکات لێیان دەکوژێت تا دەمرێت. عەوف ڕاستی کرد، جەنگی کرد تا توانی لە کافرانی کوشت و پاشان خۆی شەهید بوو و چووە بەهەشت.

-٩١ ـ (حَدَّثَنِي عَاصِمْ بْنُ عُمَرْ بْنُ قَتَادَة : أَنَّ عَوْفَ بْنَ ٱلْحَارِثْ ، وَهُوَ ابْنُ عَفْرَاءَ قَالَ : يَا رَسُولُ ٱللَّهِ ؛ مَا يَضْحَكُ ٱلرَّبُّ مِنْ عَبْدِهِ ؟ قَالَ : غَمْسُهُ يَدَهُ فِي ٱلْعَدُوِّ حَاسِرًا ، فَنَزَعَ دِرْعًا كَانَتْ عَلَيْهِ فَقَذَفَهَا ثُمَّ أَخَذَ سَيْفَهُ فَقَاتَلَ حَتَّى قُتِلِ) سيرة إبن هشام، ج١، ص٦٢٧.



هەرگیز باسی بەهەشت لە چاو و گوێ و مێشکی هاوەڵاندا ون نەدەبوو، بۆ بەهەشت کاریان کردو لە ژیانیشدا سەرکەوتن. لەدوای بەدریش هەر بەدوای بەهەشتەوە بوون.

تەمەشای ئەو بنەماڵەیە بکە، پێش دەرچوونیان بۆ جەنگی بەدر پێش ئەوەی سوپا بکەوێتە ڕێ بۆ بەدر، (سەعدی کوڕی خەیسەمە)و باوکی خەیسەمە، هەردووکیان دەیانویست بۆ جەنگ دەربچن و جیهاد بکەن، بەڵام خەیسەمە کچی زۆر بوو دەبوو یەکێک لەماڵەوە بمابایەوە بۆ سەرپەرشتی کچەکان، سەرپەرشتی خوشکەکانی سەعد، هەردووکیان بەڕاستگۆیی بەدوای بەهەشتەوە بوون و بۆ شەهیدی جیهاد دەگەڕێن، هەردووکیان خۆیان ئامادە کرد، بەڵام هیچیان تەنازوول بۆ ئەوەی تر ناکات تا ناچار هەردووکیان وتیان: هەڵبژاردن دەکەین ناوی کێ دەرچوو با ئەو بڕوات، کوڕەکەی خەیسەمە دەرچوو، سەعدی باوکی زۆر خەمی خوارد وتی: کوڕم ئەم سەرەی خۆت بدە بەمن، با من بۆ جیهاد دەربچم؟ کوڕەکەی بەوپەڕی ئەدەبەوە وەڵامی دایەوەو وتی: باوکە ببوورە ئەگەر بەهەشت نەبووایە تەنازولم بۆ دەکردی. ئەمەش ماناو توانای هێزی سەرکەوتوومان پیشان دەدات، چونکە ئەم هەلە لەدەست خۆی نادات کێشەکە بەهەشتە چۆن بۆی ناڕوات، بۆیە کۆمەڵگایەکە جیاوازترە لە کۆمەڵگەی دیموکراسی و لیبڕالی و سەرمایەداری...هتد.

بەڕاستی سەعدی کوڕی خەیسەمە ڕاستگۆ بوو، بەگیان و ڕۆحەوە بەرەو جیهاد چوو، لەنێو بەدردا شەهید بوو،ساڵێک دوای بەدر باوکیشی چوو بۆ جیهاد لە جەنگی ئوحود شەهید بوو، هەردووکیان ڕاستگۆ بوون خوای گەورە شەهیدی پێ بەخشین، خستنییە بەهەشت و ماڵ و منداڵەکەیشی لەژێر چاودێری پێغەمبەری خوادا ﷺ بوون و بەجوانترین شێوە پەروەردە بوون، هەموو گەلەکە بەدوای بەهەشتەوە بوون، بۆ بەهەشت پڕۆژەیان بونیاد دەنا.

تەماشای ئەم کوڕی تاقانەو دایکی بکە دیمەنێکی زۆر جوان ئیمانییە، حارسی کوڕی سوراقە گەنجێکی تازە پێگەیشتوو بوو تاقانەی دایک و باوکی بوو، لە جەنگی بەدردا شەهید دەبێت.

دایکی هاتە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ پرسیاری کرد فەرمووی: جەنابت جێگەو مەکانی کوڕەکەم دەزانی، تەنها پێم بڵێ کوڕەم لەبەهەشتدایە یان لە دۆزەخ؟ ئەگەر لەبەهەشت بێ ئارام دەگرم، بەڵام ئەگەر لە دۆزەخدابێ ئەبینی چی دەکەم، تەماشای ئەو کۆمەڵگەیە بکە، هەموو خەم و گرنگییەکیان بۆ بەهەشتە، دایکی جەرگ سووتاو بۆ تاقانەکەی کوڕی دوای مردنی هەواڵی بەهەشت و دۆزەخ دەپرسێت، مردنەکەی سەرقاڵی نەکرد چوونی بۆ کام جێگە سەرقاڵی کرد!



هەربۆیە پێغەمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰٓ ءَالِهِۦ وَسَلَّمَ وەڵامی دایەوەو فەرمووی: (ئەی دایکی حارس، ئەو نەک لە بەهەشتدایە، بەڵکو لە چەند بەهەشتێکدایە یاخود لەچەند باخ و باخاتێکدایە).[٩٢] بەڕاستی کوڕەکەی فیردەوسی بەرزی خوای پەروەردگاری بەدەست هێنا.

چۆن ئەو جێگایەی بەدەست هێناوە لەپێناوی خوادا جەنگاوەو شەهید بوو، لەڕووبەڕووبوونەوەدا پشتی نەکردۆتە دوژمن و هەڵنەهاتووە.

دایکی حارس زۆر ئارام بوویەوە و مردنی کوڕەکەی زۆر بە ئاسایی وەرگرت، بەڵکو دڵخۆش و خۆشحاڵ بوو کە کوڕەکەی بەرزترین پلەی بەهەشتی بەدەست هێناوە. بۆیە هەوڵبدەین خۆشەویستامنان بۆ بەهەشت هەنگاو هەڵبهێننەوە، دایکان منداڵەکانیان وەکو دایکی حارس پەروەردە بکەن بۆ فیردەوسی ئەعلا.

ماکوان: ئەو کۆمەڵە خەڵکە ئەهلی بەدرن و لەو جەنگەدا شەهید بوون، بەشدار بوون چەندە جوان و نموونەیین، سیفاتیان جوانەو سوپایەکن بەڕاستی ئیماندارن، ئیمان و یەقینی تەواویان بە پەروەردگاریان هەیە، هەروەها بە پێغەمبەرەکەی و بەبەهەشت، ئەگەر ئیمان و یەقینت بەمانە نەبێ زۆر ئەستەمە سەرکەوتن بێت.

خۆشەویستی بەهەشت و مەنهەجی پەروەردەیی ئەو پرسە شتێکی هەروا ئاسایی نییە، یاخود جۆرێک بێت لە بابەتەکانی فیکرو جوانی فەلسەفە یاخود چیرۆکێکی بەرئاگردان بێت، یان ڕووداوێکی مێژویی بێت و واقیعی نەبێت لە ژیانی خەڵک بدا، بەڵکو دەمانەوێت وەکو هاوەڵان لە ئێستاشدا ماڵ، منداڵ، ژن، پیر و گەنج لەسەر ئەو مەنهەجە پەروەردە بێت. واتە: هەر گەلێک لەسەر مەنهەجی پەروەردەی بەهەشت پەروەردە بوو نازانێ دۆڕان و زەلیلی چییە.

بەبێ ئەم بیروباوەڕە هیچ چاکسازییەک ناکرێت واز لە مەنهەجی شەرق و غەرب، مەنهەجی خەیاڵی چاکسازی لەسەر بنەمای دنیایی دامەزراوە، هەمووی داواکاری دونیاو باسی ژیانی خۆش و ئارەزوومەندییە لە ژیانی خەڵکانی دیکە، ئەم مەنهەجانە بێجگە لە گومڕایی و خەمۆکی و کەئابە هیچی تری لێ ناپچڕێت، کۆتاییەکەشی سەرگەردانییە لەڕۆژی ئاخیرەتدا.

---

٩٢ ـ (فَقَالَ ٱلنَّبِيُّ صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَا أُمَّ حَارِثَةَ إِنَّهَا جِنَانٌ فِي جَنَّةٍ وَإِنَّ ٱبْنَكَ أَصَابَ ٱلْفِرْدَوْسَ ٱلْأَعْلَى وَٱلْفِرْدَوْسُ رَبْوَةُ ٱلْجَنَّةِ وَأَوْسَطُهَا وَأَفْضَلُهَا) أحمد (٣/٢٦٠، رقم ١٣٧٦٧)، والبخاري (٣/١٠٣٤، رقم ٢٦٥٤).



هەرگیز وا بیر مەکەنەوە کە ڕۆژئاواو وڵاتانی دیکەی زلهێز خۆشبەخت و خۆشحاڵن لە ژیانیاندا لەبەر ئەوەی خاوەنی تەکنەلۆجیاو سەروەت و سامانن، هەرگیز بە چاوی سەرتان هەڵمەخەڵەتێن تەمەشای گوزەرانی دەروونیان بکەن کە ڕووخاون. ئەوەی ماڵەکەی لەدەست ئەدات خۆکوژی دەکات، ئەوەی منداڵەکەی یان عاشقەکەی دەمرێت یان جێی دەهێڵێت، تووشی دابڕان دەبێ لە کۆمەڵگە، ئەوان کە تووشی موسیبەتێک دەبن وا دەزانن دونیا کۆتایی پێهاتووە، ئەوەی هەژارەو لە خانەوادەی هەژارە زۆر ڕقنە بەرانبەر کۆمەڵگەکەی خۆی حەسوودی و ئێرەیی زۆر بە دەوڵەمەندەکان دەبات، یان زۆربەیان دزو جەردەو دەستدرێژی دەکەنە سەر منداڵ و خەڵکی بەگشتی، دەرمان فرۆش لە مادە هۆشبەرەکان ژیانێکی تاوانبارانە دەژین. جا لەبەر ئەوە کۆمەڵگەی ڕاستەقینەی ئیسلام و ئیمان بە کۆمەڵگەی ماددی و پراگماتیکی پێوەر ناکرێت.

نومێر: ڕاستە باوەڕ بکە هەژارەکانیش لەو کۆمەڵگەیە بەجۆرێک بەدوای بەهەشتدا دەگەڕان کە جێگەی سەرنجە، لەوان زیاتر دەوڵەمەندەکان بوون بەدوای بەهەشتەوە بوون، پیاوان، منداڵان، کوڕان، کچان، ژنان، هەموو چین و توێژەکان دەهاتنە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ من پیاوێکی ڕەش و ناشیرینم و بۆگەنم لێدێت، دەموچاویشم زۆر ناقۆڵایە، خاوەنی هیچ سەروەت و سامانێکیش نیم ئەگەر لەو جەنگەدا بجەنگم و بکوژرێم من جێگام لەکوێیە؟

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بەهەشتە.

کەسەکە ڕۆیشت جەنگاو شەهید بوو، پاشان کە پێغەمبەری خوا ﷺ بەسەر شەهیدەکاندا گەڕا ئەو کەسە ڕەشەی بینییەوە، فەرمووی: خوای گەورە دەموچاوی سپی کردەوە و بۆنی خۆش کرد، ماڵ و سەروەت و سامانی پێبەخشی، لەبەر ئەوەی چووە بەهەشت موڵکی کۆتا کەسی ئەهلی بەهەشت دە ئەوەندەی ئەو دونیایەیە کە تێیدا دەژین، هەرچەند پێوەر ناکرێت بەڵام بۆ تێگەیشتن وا دەڵێم. کەلیمەی بەهەشت هەرگیز بەدونیا پێوەر ناکرێت.[٩٣]

---

٩٣ ـ (أَنَّ رَجُلاً أَسْوَد أَتَى اَلنَّبِيُّ صَلَّى اَللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ : يَا رَسُولُ اَللَّهِ إِنِّي رَجُلٌ أَسْوَدَ مُنْتِنِ اَلرِّيحِ قَبِيحْ اَلْوَجْهِ لَا مَالَ لِي ، فَنَّ أَنَا قَاتَلَتْ هَؤُلَاءِ حَتَّى أُقْتُلْ فَأَيْنَ أَنَا ؟ قَالَ : فِي اَلْجَنَّةِ . فَقَاتَلَ حَتَّى قَتْلِ . فَأَتَاهُ اَلنَّبِيُّ فَقَالَ : قَدْ بَيَّضَ اَللَّهُ وَجْهَكَ ، وَطَيَّبٌ رِيحَكَ ، وَأَكْثَرُ مَالِكْ وَقَالَ لِهَذَا أَوْ لِغَيْرِهِ فَقَدَ رَأَيْتُ زَوْجَتُهُ مِنْ اَلْحُورِ اَلْعَيْنِ نَازَعَتْهُ جُبَّةٌ لَهُ مِنْ صُوفٍ ، تَدَخُّلٌ بَيْنَهُ وَبَيْنَ جُبَّتِهِ .) أخرجه الحاكم (١٠٣/٢، رقم ٢٤٦٣).

ماکوان: بەهەشت پڕیەتی لە خۆشی، شادی و شیرینی بۆ ئیمانداران هەمووی پاداشتە بۆ ئیمانداران کە لە دونیادا کاریان بۆ کردووە، پاداشتی ئەو هەموو ماندووبوون و زوڵم و زۆرەیە کە لێیان کراوە پاداشتی ئەو ماندووبوون و شەونخوونییە کردوویانە بۆ چاکسازی خەڵکی، بەهەشت ئارامی خستە دڵی دایکی حارس و دەیانی وەکو عومەیری کوڕی حەمام، هەروەها عومەیری کوڕی ئەبی وقاص و سەعدی کوڕی خەیسەمە و حارسی کوڕی سوراقە. بەهەشت وای کرد کە حەبابی کوڕی مونزیر ڕای خۆی بڵێت و موسڵمانان سوودی لێوەربگرن، بەهەشت وای کرد هەرچی مەکرووهە خۆشەویست و مەحبووب بێت مردن داواکراو بێت.

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: کێن ئەوانەی بەهەشتیان خۆش دەوێت، بۆتان باس بکەم بەهەشت چۆنە، بەهەشت لە خۆشییەکانیدا بەخەیاڵی هیچ کەسێکدا نەهاتووە (هیچ نموونەیەک نییە بۆ بەهەشت)، سوێند بەخوای کەعبە نوورێکە دەدرەوشێتەوە، بۆنی وەکو ڕێحانە دێت و دەڕوات، کۆشك وتەلاری بەرزو جوانی تێدایە، پڕیەتی لە ڕووباری جۆراو جۆری مەی کراو میوەی جۆراو جۆر پێگەیشتووە، خێزان و هاوسەری جوان و نازەنینی تێدا دەژی، پڕیەتی لە دوورگەو هەور و کەمالیاتی جوان، جێگەیەکی نەبڕاوە و پڕ خۆشییە، تا چاو بڕ بکات پڕیەتی لە ناسکی و جوانی بەرز نەخشێنراوە جێگاکانی جوان پڕ لە دیمەنی دڵڕفێنە، هاوەڵان توانای ئەوەیان نەبوو ئارام بگرن هەموو داوای بەهەشتیان دەکرد نەیاندەتوانی لێی جیا ببنەوە.

وتیان: ئەی ڕەسوڵی خوا ﷺ ئێمە ئەوانە بووین کە بەهەشتمان خۆش دەوێت، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ان شاء الله، پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ باسی جیهادی بۆ کردن.[٩٤]

ئەگەر لەو مەنهەجە تێگەیشتین ئەوە دڵنیابن سەردەکەوین وەکو چۆن پێغەمبەرو موسڵمانان سەرکەوتن لەبەدردا، ئەوکات خاوەن دەوڵەت و سەروەری خۆمان دەبین، گەلانی تر ملکەچی فەرمانەکانمان دەبن، نەک پێچەوانەکەی کە ئێستا لەوپەڕی نشێو و شکست و لاوازیدا بدات.

---

٩٤ ـ ( أَلَا مُشَمِّرٌ لِلْجَنَّةِ فَإِنَّ الْجَنَّةَ لَا خَطَرَ لَهَا هِيَ وَرَبِّ الْكَعْبَةِ نُورٌ يَتَلَأْلَأُ وَرَيْحَانَةٌ تَهْتَزُّ وَقَصْرٌ مَشِيدٌ وَنَهَرٌ مُطَّرِدٌ وَفَاكِهَةٌ كَثِيرَةٌ نَضِيجَةٌ وَزَوْجَةٌ حَسْنَاءُ جَمِيلَةٌ وَحُلَلٌ كَثِيرَةٌ فِي مَقَامٍ أَبَدًا فِي حَبْرَةٍ وَنَضْرَةٍ فِي دُورٍ عَالِيَةٍ سَلِيمَةٍ بَهِيَّةٍ، قَالُوا نَحْنُ الْمُشَمِّرُونَ لَهَا يَا رَسُولَ اللَّهِ قَالَ قُولُوا إِنْ شَاءَ اللَّهُ ثُمَّ ذَكَرَ الْجِهَادَ وَحَضَّ عَلَيْهِ) أخرجه ابن ماجه (١٤٤٨/٢، رقم ٤٣٣٢).



ماکوان: سەرکەوتنی بەدر سیفاتەکانی زۆر گرنگن کە هەموو کەسێکی خواناس بزانێت و شارەزای بێت، لەبەر ئەوەی هەرکات موسڵمانان ویستیان بەجەنگ بێن دەبێت پێوەری سوپای سەربازی بەدریان لەبەرچاوبێت بۆ سەرکەوتن، سیفات و پێناسەکانی سوپای بەدر و سوپای سەرکەوتوو بەگشتی بریتین لە:

یەکەم: ئیمان بەخوای موتەعال و پێغەمبەرەکەی و ڕۆژی دوایی، هیچ سەرکەوتنێک نایەت کە پشت و پەنایان خوای پەروەردگار نەبێت، لەبەر ئەوەی تەنها خوای گەورە بەندەکانی سەردەخات خوای پەروەردگار دەفەرمووێت:

﴿وَإِنَّ جُندَنَا لَهُمُ ٱلۡغَٰلِبُونَ ﴾ [الصافات]

خوای پەروەردگار ئاگادارمان دەکاتەوە کە ئەوەی لە پارتی خوایەو تەرەفی خوایە ئەوانە سەرکەوتوون، جێگا دەستیان دیار دەبێت و ڕزگار دەبن لەدەستی کافران، هیچ مەنهەجێک سەرناکەوێت تەنها قورئان و سوننەت نەبێت تەنها سەرکەوتن بۆ ئەو مەنهەجەیە.

دووەم: کردار بە ڕاستگۆیی بۆ گەیشتن بە بەهەشت، کار بۆ نیعمەتەکانی بەهەشت دەکات تا پێدەگات، ئەویش دانەبڕانی سەرۆک و سەرکردەیە لەسەربازەکانی، حاکمە لەژێر دەستەکانی و سوپایەکی چالاک و گەشبینە، ئازاو چاونەترس پێک دەهێنێت و لەمردن ناترسێت، ڕووبەڕووی هەموو ئەگەرێکی ترسناک دەبێتەوە لەهەر کوێ بێت، چونکە لەپێناوی خوادا تێدەکۆشێت لەپێناوی خودا دەمرێت.

سێیەم: شووراو ڕاوێژکردن، هەموو سوپایەک بە ڕاوێژ کاردەکات بۆ بەدەستهێنانی سەرکەوتن و گەیشتن بە حەق، شووراو ڕاوێژ لەسەر ئەوە دەکرێت کە هیچ دەقێکی لەبارەوە نەهاتووە

﴿... وَأَمۡرُهُمۡ شُورَىٰ بَيۡنَهُمۡ وَمِمَّا رَزَقۡنَٰهُمۡ يُنفِقُونَ ﴾ [الشورى]

واتە: با کاروباریان بەڕاوێژ بێت لەنێوان خۆیان.

خوای گەورە دەفەرمووێت:

﴿... وَشَاوِرۡهُمۡ فِي ٱلۡأَمۡرِۖ ... ﴾ [آل عمران]

واتە: لەکاروو بارەکاندا ڕاوێژیان پێ بکە.



فەرمانی خوای پەروەردگارە بۆ ڕاوێژکردن بە موسڵمانان لەکاتێکدا کە هیچ دەقێکی لەسەر نەهاتووە، کارکردن بە ڕاوبۆچوونی تەندروست و دابەزین و دڵنیاو کارپێکردنی دەستبەجێ، هەروەکو پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ ڕاوێژی بە موسڵمانان دەکرد لەهەموو شتێکدا کە دەقی لەسەر نەهاتووە، وەکو ڕاوێژی حەبابی کوڕی مونزیر، بەگۆڕینی جێگەی جەنگەکەو نەهێشتنی خواردنەوەی ئاو بۆ موشریکەکان، چونکە ڕاوبۆچوونی حەبابی کوڕی مونزیر هۆکارێک بوو بۆ سەرکەوتن.

چوارەم: کۆکردنەوەی هێزی ماددی و مەعنەوی بۆ جەنگ لە چەک و پلان و ڕاهێنان بۆ بەدەستهێنانی سەرکەوتن خوای پەروەردگار دەفەرمووێت:

﴿وَأَعِدُّواْ لَهُم مَّا ٱسۡتَطَعۡتُم مِّن قُوَّةٖ وَمِن رِّبَاطِ ٱلۡخَيۡلِ تُرۡهِبُونَ بِهِۦ عَدُوَّ ٱللَّهِ وَعَدُوَّكُمۡ وَءَاخَرِينَ مِن دُونِهِمۡ لَا تَعۡلَمُونَهُمُ ٱللَّهُ يَعۡلَمُهُمۡۚ وَمَا تُنفِقُواْ مِن شَيۡءٖ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ يُوَفَّ إِلَيۡكُمۡ وَأَنتُمۡ لَا تُظۡلَمُونَ﴾ [الأنفال]

ڕستەی سەرەتای ئایەتەکە لە زمانی عەرەبی نەکیرەیە ﴿وَأَعِدُّواْ لَهُم مَّا ٱسۡتَطَعۡتُم مِّن قُوَّةٖ﴾

واتە: ئاماژەیە بۆ شتێکی گشتی، بەواتای هێزو توانای بیرووباوەڕو هێزی لاشەی و هێزی چەک و هێزی زانست و هەرچی جۆرە هێزێک هەیە دەتوانن کۆی بکەنەوە. جا ئیبن عەبباس دەفەرمووێت: ﴿... تُرۡهِبُونَ بِهِۦ عَدُوَّ ٱللَّهِ وَعَدُوَّكُمۡ...﴾ [الأنفال]

واتای بوغزاندنی دوژمنەکانی خواو دوژمنەکانتانە.

پێنجەم: خۆشەویستی و بەستنی پەیوەندی ئیمان و وەحدەتی بیروباوەڕو ئولفەتی برایەتی، ئەو سوپایەی کۆکردبووەوە، هەموو وەکو یەک جەستە کاری دەکرد، هەموو لەبەر خوا یەکتریان خۆش دەویست، ئەوەی ئەوانی فەرمانڕەوایی دەکرد وەحی پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ پرەنسیپی عەقیدە و ئیسلام بوو پەیوەندی نێوانی ڕێکخستبوو، هیچ کەس وەکو مرۆڤ فەزڵی زیاتر نەبوو لەوی دی، جیاوازی لەنێوان و عەرەب عەجەمدا نەبوو. هەروەها جیاوازی لەنێوان عەشیرەت و شارگەراییدا نەبوو، ئەنسارو موهاجیر پشت و پەنای یەکتر بوون، ئیتر ئەوانەی موهاجیر بوون نەیاندەوت من عەدنانیم و مەدینەییەکانیش بڵێن: ئێمە قەحتانین، لەدوو بەرەبابی جیاوازی عەرەب، ئەوەی بەتەواوی هەموویانی کۆکردەوە



تەنها یەک پەیوەندییە ئیسلام کە ڕەحم و خۆشەویستی و برایەتی خستۆتە نێوانیان، هەرگیز نابینی سەلمانی فارسی یاخود سوهەیبی ڕۆمی خۆی بەنامۆو غەریب بزانێت لەناو ئەو کۆمەڵگەیەدا بەپێچەوانەوە پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمووێت: سەلمان لە ئێمەیە و ئەهلی بەیتی منە.

بیلال هیچ کات هەستی بە غوربەت و ناڕەحەتی نەکردووە لەنێو عەرەبی موسڵماندا با ئەو حەبەشی بێ، تەماشای بیلال بکە لەو جەنگی بەدرەدا چۆن لەنێو موسڵماناندا سەرکردەو سەییدانە مامەڵە دەکات، لە جاهیلیدا کۆیلەی قوڕەیش بوو.

لەم جەنگەدا لەدوای دۆڕانی قوڕەیش بیلالی حەبەشی ئەوەی کە ئازاری دابوو لەنێو جەنگەکەدا هەردووکیانی بینییەوە بەناوی (ئومەییەی کوڕی خەلەف و کوڕەکەی) لەهەمان کاتدا عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوف، هەردووکیانی بینی بەڵام عەبدوڕەحمان هەندێک درع و شمشێری کۆکردبووەوە وەکو غەنیمەت و ئەنفال لە جەنگەکە دا، لەهەمانکاتدا ئومەییەی کوڕی خەلەف هاواری کرد لە عەبدوڕەحمان وەرە بیگرەو بیکە ئەسیری خۆت زۆر لەو درع و شمشێرانە باشترەو زیاترت دەست دەکەوێت، دەیزانی عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوف دەیپارێزێت.

چونکە ئەگەر ببێتە ئەسیری عەبدوڕەحمان فیدیەی ئەسیرییەکەی وەردەگرێت پارەی زۆرتری دەست دەکەوێت، عەبدوڕەحمانیش ڕازی بوو درعەکانی فڕێداو هەردووکیانی ئەسیر کرد، دەیزانی سەدان وشتر وەردەگرێت، بەڵام کە بیلال ئومەیەی کوڕی خەلەفی بینی سەرۆکی کوفری مەککەو چەندەها جار ئازاری بیلالی داوەو بیلالیش هاواری کرد: (أحدٌ، أحدٌ) هاواری کرد: ئەی ئومەییەی کوڕی خەلەف نەجات بوونیش لەدەستم نەجاتت نادا، عەبدوڕەحمان دەڵێت: وتم: بیلال ئەوانە ئەسیری منن.

بیلال هەر دەیوت: نەجاتبوونیش لەدەستم نەجاتت نادات.

عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوف هەر بە بیلالی دەوت: ئەوە ئەسیری منە، من گرتوومە، ئەویش بەدەنگی بەرز دەیووت: (لا نجوت إن نجا)، هاواری لە ئەنسارەکان کرد، ئەی ئەنسارەکانی خوا فریاکەوون، ئەوە سەرۆکی کوفرە، هەموو ئەنسار لەدەوری بیلال کۆبوونەوە گرتیان، خۆیان و کوڕەکەیان پارچە پارچە کرد، عەبدوڕەحمان دەڵێ گوێم لە قیژەی ئومەییە بوو قیژەو هاواری زۆر سەیر بوو، پاشان دەڵێ: ڕەحمەتی خوا لە بیلالی برام بێت، ئەسیرەکانی لەدەست دەرکردم و درعەکانیشم لەدەست دەرچوو.



عەبدورەحمان دەیزانی بیلال باری دەروونی چۆنەو چۆن بەدەستی ئەو تاغوتانە ئازارو ئەشکەنجە دراوە، دەیزانی چەندەها جۆر ئەشکەنجە لەسەر بیلالی برای تاقیکراوەتەوە، ئەی بیلال چۆن دەهێڵێت بە ئەسیری بگیرێت، دوایی بە هەندێ پارەو سامان خۆی دەرباز بکات، لەدوای کوشتنیشی دەیوت: دەبا ماڵ و سامانت لە مەرگ ڕزگارت بکات، پێشتر پەیوەندی عەشیرەت هەبوو دەیانوت: براکەت سەربخە ئەگەر زوڵمی لێ کراو زوڵمی کرد، ئەمە قسەیەکی جاهیلی بوو، بەڵام پێغەمبەری خوا ﷺ بۆی ڕاست کردنەوە فەرمووی: ئەگەر براکەت زوڵمی کرد دەستی بگرە با زوڵم نەکات

نەشهێڵن زوڵم لە براکانتان بکرێت، لێرە ئوممەییەی کوڕی خەلەف و عەبدورەحمان یەک عەشیرەت بوون، بەڵام بیلال خەڵکی حەبەشە بوو پەیوەندی ئیمان بەهێزترە تا پەیوەندی عەشیرەت، بۆیە حەق لای بیلال بوو ئیتر زۆر بە ئاسایی وەریگرت.[٩٥]

هەموو بیرە جاهیلییەکەی بەوپەڕی فیکری جوانی و دیدێکی فراوان بۆ چاک کردن، لە بنەڕەتدا براکەت سەردەخەیت تەنها لەوەی زوڵمی لێ بکرێت، کە زوڵمی کرد دەستی دەگریت بۆ ئەوەی کاری نەشیاو و خراپ نەکات، ئەویش سەرخستنییەتی. لەدونیاشدا گەورەترین زوڵم شیرک و هاوبەشدانانە بۆخوای گەورە، خوای پەروەردگار لە قورئاندا دەفەرموویێت:

﴿وَإِذۡ قَالَ لُقۡمَٰنُ لِٱبۡنِهِۦ وَهُوَ يَعِظُهُۥ يَٰبُنَيَّ لَا تُشۡرِكۡ بِٱللَّهِۖ إِنَّ ٱلشِّرۡكَ لَظُلۡمٌ عَظِيمٌ﴾ [لقمان]

واتە: ئینجا لوقمان بە کوڕەکەی خۆی وت: لەکاتێکدا کە ئامۆژگاری دەکرد کوڕە شیرینەکەم نەکەی شتێک یان کەسێک بە هاوتاو هاوبەشی خوا بڕیار بدەیت، چونکە بەڕاستی هاوتاو هاوبەش بڕیاردان ستەمێکی زۆر گەورەو ناڕەوایە.

شەشەم: هۆکاری سەرکەوتنی سوپای بەدر کێ خاوەنی توانایە بەگوێرەی توانای خۆی کاری داوەتێ، بەزمانی سەردەم واتە:سوپایەکی بەهێزی (تەکنۆکراتە) کەفووئە، چونکە ئەمانەتە هەموو کاری ئیسلامی لە بانگەوازی لە جیهادی لە فیکرو بیروباوەڕی، خەڵکی تایبەتمەند بەکاری خۆی هەڵدەستێ، ناکرێ ئەو کەسەی شارەزایی هەیە لە تەفسیری قورئان

---

٩٥ ـ (عن أَنَسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ انْصُرْ أَخَاكَ ظَالِمًا أَوْ مَظْلُومًا فَقَالَ رَجُلٌ يَا رَسُولَ اللَّهِ أَنْصُرُهُ إِذَا كَانَ مَظْلُومًا أَفَرَأَيْتَ إِذَا كَانَ ظَالِمًا كَيْفَ أَنْصُرُهُ قَالَ تَحْجُزُهُ أَوْ تَمْنَعُهُ مِنْ الظُّلْمِ فَإِنَّ ذَلِكَ نَصْرُهُ) البخاري: ٦٥٥٢.



شارەزا بێت لە بواری سەربازیدا، ئەگەر تەماشا بکەین ئەوانەی لە بواری سەربازیدا شارەزان دەوری میحوەری لە جەنگەکەدا دەبینن، نموونەی: (حەمزە، عەلی، حوبابی کوڕی مونزیرو سەعدی کوڕی عەباد...هتد).

بۆیە لە ئێستادا ئەو ئوممەتی ئیسلامە تووشی دەردێکە خەڵکی بەتواناو تایبەتمەند لەبواری خۆیدا کار ناکات، کەسێک هاتە خزمەتی پێغەمبەری خوا صَلَّىٱللَّهُعَلَيْهِوَعَلَىٰآلِهِوَسَلَّمَ وتی: ڕۆژی قیامەت کەی دێت؟

پێغەمبەری خوا صَلَّىٱللَّهُعَلَيْهِوَعَلَىٰآلِهِوَسَلَّمَ فەرمووی: ئەو کاتە دێت ئەمانەت ون دەبێت کە ئەمانەت ون بوو چاوەڕێی قیامەت بکە، پاشان پیاوەکە وتی: چۆن ون دەبێت؟ پێغەمبەری خوا صَلَّىٱللَّهُعَلَيْهِوَعَلَىٰآلِهِوَسَلَّمَ فەرمووی: ئەگەر کارێک درایە دەستی کەسێک لە کارەکەی نەزانی، ئەوکات قیامەت هەڵدەستێت.[٩٦]

تەنانەت خوای گەورە لە قورئاندا فێرمان دەکات خەڵکی بەتوانا کارەکان بگرنە ئەستۆ، نەک لەبەر حیزبایەتی و خزمایەتی و نەتەوایەتی

﴿قَالَتۡ إِحۡدَىٰهُمَا يَٰٓأَبَتِ ٱسۡتَـٔۡجِرۡهُۖ إِنَّ خَيۡرَ مَنِ ٱسۡتَـٔۡجَرۡتَ ٱلۡقَوِيُّ ٱلۡأَمِينُ ۝﴾ [القصص]

واتە: یەکێک لە کچەکانی وتی: بابە بۆ بەکرێی ناگریت چونکە بەڕاستی چاکترین کەسێک کە تۆ بەکرێ بیگریت ئەو پیاوە بەهێزو ئەمین و دەست پاک و دەروون پاکەیە.

خاوەن هێز لە بوارەکەیدا دەست پاک و سەرڕاستەیە لەهەموو بوارەکانی ژیاندا جا کشتوکاڵ بێت پیشەسازی بێت بواری سەربازی بێت...هتد.

جا بۆیە سوپای بەدر سوپایەکی بەهێزو بەتوانا لە بوارەکانیدا و پاراستنی ئەمانەت بۆیە بەجوانترین شێوە ئەدای کارەکەی خۆیان کردو نازناوی سوپای سەرکەوتوویان لێنرا.

حەوتەم: خاوەن بڕیارو بێ دوودڵی کارەکان ئەنجام دەدەن، هاوەڵان بۆ ئێمە پێشەنگێکن تا قامی قیامەت ژیانیان ئەدرەوشێتەوە وەکو ئەستێرە بەدەوری مانگ، نووری ئەو مانگەش

---

٩٦ ـ (عن أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ بَيْنَمَا النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي مَجْلِسٍ يُحَدِّثُ الْقَوْمَ جَاءَهُ أَعْرَابِيٌّ فَقَالَ مَتَى السَّاعَةُ فَمَضَى رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُحَدِّثُ فَقَالَ بَعْضُ الْقَوْمِ سَمِعَ مَا قَالَ فَكَرِهَ مَا قَالَ وَقَالَ بَعْضُهُمْ بَلْ لَمْ يَسْمَعْ حَتَّى إِذَا قَضَى حَدِيثَهُ قَالَ أَيْنَ أُرَاهُ السَّائِلُ عَنِ السَّاعَةِ قَالَ هَا أَنَا يَا رَسُولَ اللَّهِ قَالَ فَإِذَا ضُيِّعَتْ الْأَمَانَةُ فَانْتَظِرْ السَّاعَةَ قَالَ كَيْفَ إِضَاعَتُهَا قَالَ إِذَا وُسِّدَ الْأَمْرُ إِلَى غَيْرِ أَهْلِهِ فَانْتَظِرْ السَّاعَةَ) صحيح البخاري: (٣٣٥٩)



پێغەمبەری خوایە صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ بۆ ئێمەی موسڵمان خوای پەروەردگار فێری کردن خاوەن بڕیار بن، بێ دوودڵی

﴿فَبِمَا رَحْمَةٍ مِّنَ اللَّهِ لِنتَ لَهُمْ ۖ وَلَوْ كُنتَ فَظًّا غَلِيظَ الْقَلْبِ لَانفَضُّوا مِنْ حَوْلِكَ ۖ فَاعْفُ عَنْهُمْ وَاسْتَغْفِرْ لَهُمْ وَشَاوِرْهُمْ فِي الْأَمْرِ ۖ فَإِذَا عَزَمْتَ فَتَوَكَّلْ عَلَى اللَّهِ ۚ إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُتَوَكِّلِينَ﴾ [آل عمران]

واتە: کەوابوو ئەی موحەممەد صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ بەهۆی ڕەحمەتی خواوەیە تۆ نەرم و هێمن بوویت لەگەڵیاندا، خۆ ئەگەر تووڕەو قسە ڕەق و بێبەزەیی بوویتایە ئەوە هەموو لەدەورت بڵاوەیان دەکرد، کەواتە: چاوپۆشیان لێبکەو لێیان ببوورە داوای لێخۆشبوونیان بۆ بکە، لەکارو پێشهاتدا پرس و ڕایان پێ بکە، (دوای ئەوە) ئەگەر بڕیارت دا (کارێک ئەنجام بدەیت ئەنجامی بدە)وپشت بەخوا ببەستە، چونکە بەڕاستی خوا ئەوانەی خۆش دەوێت کە پشتی پێ دەبەستن.

چونکە دوودڵی و دڵەڕاوکێ وات لێ دەکات کە بڕیاری ناتەندروست بدرێ و ئەو بڕیارەی هەڵەیە کۆتاییەکەی بە شکستی موسڵمانان تەواو دەبێت.

هەشتەم: سوپای سەرکەوتوو ئیماندار بەهیچ شێوەیەک بونیاد لەسەر هێزی کافرو بێباوەڕدا نابێت و پشتی تەواوەتی بەهێزی خۆی دەبەستێت لەڕۆژی بەدردا پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ بەتەواوەتی ڕەتی کردەوە بێجگە لە ئیمانداران خەڵکی موشریک هاوکاریان بکات، پێش گەیشتنیان بە ناوچەی بەدر لە جێگەیەکدا کە ناوی (بِجَرَّة الوبرة) پیاوێکی موشریکیان لێ پەیدا بوو خەڵکی شاری مەدینە بوو، کەسێکی ئازاو بە جورئەت بوو نازناوی جوامێری جەنگ یارمەتیدەری جەنگی لێنرا بوو، چاوەڕوانی سوپاکەی دەکرد ئەوەندە ئازاو لێهاتووبوو کە هاوەڵان بینیان زۆر دڵخۆش بوون، هاتە خزمەتی پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ وتی: هاتووم بۆ هاوکاریتان لەگەڵتان بجەنگم، پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ فەرمووی: ئیمانت بە خواو پێغەمبەرەکەی هەیە؟

ئەویش وتی: نەخێر تەنها بۆ خاتری قەومەکەم دەجەنگم، پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ فەرمووی: بگەڕێوە من هاوکاری لە موشریک وەرناگرم.

پاشان کەسەکە ڕۆیشت سوپا بەردەوام بوو دیسان لای درەختێک چاوەڕوانی سوپاکەی دەکردو هاتەوە خزمەتی پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ و وتی: حەزدەکەم لەگەڵتان بجەنگم،



پێغەمبەری خوا ﷺ هەمان قسەی بۆ دووبارە کردەوە کە یارمەتی لە کەسی موشریک وەرناگرێت، دیسان کابرا ڕۆیشت، ماوەیەکی تری پێچوو لە ناوچەی (بەیدا) تووشی سوپاکە بوویەوە، هەمان قسەی دووبارە کردەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئیمانت بەخواو پێغەمبەرەکەی هەیە؟ ئەمجارە وتی: بەڵێ، شایەتمانی هێنا، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: لەگەڵمان وەرە ئێستا تۆ موجاهیدی.[97]

با بەهێزو خاوەن توانا بێت بەڵام مادەم خواناس و ئیماندار نییە، دەشێ لەڕێگەی ئەوەوە خیانەت دروست بێت، یاخود شکست و هەڵهاتن ڕووبدات، لەبەر ئەوە ڕێگەی پێ نادرێت. خۆ دەشێت ئیمانداری لاوازو بێهێز بێت، هەر ناگونجێت. پێغەمبەری خوا ﷺ چەندین کەسی گەڕاندەوە کە هاتبوون بۆ جیهاد.

نۆیەم: پشتبەستن بە لاوەکانی ئیسلام و بەگەڕخستنی تواناکانیان، بەشداری کردنیان لە بوارە جیاجیاکاندا، بەتایبەت لەبواری سەربازی. ڕاستە هەندێکیان لەبەر بچووکی تەمەن و لاوازییان پێغەمبەری خوا ﷺ گەڕاندنییەوە نەیهێشت بێنە نێو سوپاکە، وەکو: (عەبدوڵڵای کوڕی عەمر، بەرائی کوڕی عازب)، بەڵام ڕێگەیدا بە هەندێکی دیکەیان بەهۆکاری بەهێزی لاشەو توانای سەربازیان، وەکو: (عومەیری کوڕی ئەبی وەقاس، موعازی کوڕی عەمری کوڕی جەمووح، مەعووزی کوڕی عەفرا)، تەواوی سوپاکە گەنجایەتی پێوە دیار بوو، یاخود زۆربەی هەرە زۆری سوپاکەی بەدر لاوەکان بوون. هەمووی لە هەرەتی لاوێتیدا بوون، ئەگەر بە وردی تەماشای سوپاکە بکەین، زۆبەی زۆری سوپاکە تەمەنیان لە (٢٥-٣٠) ساڵ بوو، بۆیە بانگەوازو خەباتی ئیسلامی پێویستی بە لاوەکانە.

تەنانەت پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی:[98]

واتە: لاوەکان سەریان خستم و پیرەکانیش جێیان هێشتم و بەجێیان هێڵام.

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

٩٧ ـ (عَنْ عَائِشَةَ زَوْجِ النَّبِيِّ ﷺ أَنَّهَا قَالَتْ خَرَجَ رَسُول اللَّهِ ﷺ قِبَلَ بَدْرٍ فَلَمَّا كَانَ بِحَرَّةِ الْوَبَرَةِ أَدْرَكَهُ رَجُلٌ قَدْ كَانَ يُذْكَرُ مِنْهُ جُرْأَةٌ وَنَجْدَةٌ فَفَرِحَ أَصْحَابُ رَسُول اللَّهِ ﷺ حِينَ رَأَوْهُ فَلَمَّا أَدْرَكَهُ قَالَ لِرَسُول اللَّهِ صَلَّى ﷺ جِئْتُ لِأَتَّبِعَكَ وَأُصِيبَ مَعَكَ قَالَ لَهُ رَسُول اللَّهِ ﷺ تُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَرَسُولِهِ قَالَ لَا قَالَ فَارْجِعْ فَلَنْ أَسْتَعِينَ بِمُشْرِكٍ قَالَتْ ثُمَّ مَضَى حَتَّى إِذَا كُنَّا بِالشَّجَرَةِ أَدْرَكَهُ الرَّجُلُ فَقَالَ لَهُ كَمَا قَالَ أَوَّلَ مَرَّةٍ فَقَالَ لَهُ النَّبِيُّ ﷺ كَمَا قَالَ أَوَّلَ مَرَّةٍ قَالَ فَارْجِعْ فَلَنْ أَسْتَعِينَ بِمُشْرِكٍ قَالَ ثُمَّ رَجَعَ فَأَدْرَكَهُ بِالْبَيْدَاءِ فَقَالَ لَهُ كَمَا قَالَ أَوَّلَ مَرَّةٍ تُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَرَسُولِهِ قَالَ نَعَمْ فَقَالَ لَهُ رَسُول اللَّهِ ﷺ فَانْطَلِقْ) صحيح مسلم: ١٨١٧.

٩٨ ـ (نَصَرَنِي اَلشَّبَابُ وَخَذَلَنِي اَلشُّيُوخُ) سيرة ابن اسحاق ـ تفسير طبري.



زۆربەی شەهیدەکانی بەدر لاوەکان بوون، تەنانەت قیاداتی سەربازی هەڵگرانی ئاڵای موهاجیرەکان عەلی کوڕی ئەبو تاڵیب بوو تەمەنی (٢٥) ساڵ بوو، پاشان هەڵگری ئاڵای ئەنسار سەعدی کوڕی موعاز بوو تەمەنی (٣٢) ساڵ بوو، هەڵگری ئاڵای سوپای بەدری موسڵمانان بەگشتی موحەممەدی کوڕی عومەیر بوو تەمەنی (٣٦) ساڵ بوو، هەموو تواناکان لاوەکان بوون، ئەگەر بێتو لاوانی ئەو ئیسلامە بەشتی باش و جوان ئاڕاستە بکرێن، بەدڵنیاییەوە سەرکەوتنی گەورە بەدەست دەهێنن، بەڵام بەداخەوە لە ئێستادا سەرقاڵ کراون بەشتی بێ ماناو هیچ و پووچ.

لەلایەکی دیکەوە ئەمە مانای ئەوە نییە کە تواناو هێزی پیرەکان بەکەم لەبەرچاو بگرین، نا بەڵکو پێویستە ئەزموون و کاری ئەوانیش بەزۆر ڕابگرین و سوود لە ڕاو بۆچوون و ئەزموونیان وەربگرین و تواناکانی ئەوانیش بەهێزکردنی لاوەکانە، لەنێو ئەو ئوممەتەدا خیبرەو ڕایان جێگای مشاوەرەو دەست خۆشییە.

دەیەم: گیانی سەرکەوتن و گەشبینی و یەقین بەوە خوای پەروەردگار سەریان دەخات سیمای ئەو سوپایە بوو، خوای گەورە دەفەرمووێت:

﴿... وَمَا ٱلنَّصۡرُ إِلَّا مِنۡ عِندِ ٱللَّهِۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ﴾ [الأنفال]

واتە: سەرکەوتن هەر لەلای خوایەوەو هەر خۆیشی دەیبەخشێت، چونکە بەڕاستی هەر خوا خۆی باڵادەست و دانایە.

﴿... كَم مِّن فِئَةٖ قَلِيلَةٍ غَلَبَتۡ فِئَةٗ كَثِيرَةَۢ بِإِذۡنِ ٱللَّهِۗ وَٱللَّهُ مَعَ ٱلصَّٰبِرِينَ﴾ [البقرة]

واتە: چەندەها جار دەستەی کەم زاڵ بوون بەسەر دەستەی زۆردا بە فەرمانی خوا، خوا یارو یاوەری خۆگرو ئارامگرانە.

ئەوەی زۆر گرنگە باسم کرد لەم دە خاڵە، ئەگەر موسڵمانان یەک خاڵ لەو دە خاڵە فەرامۆش بکەن هەرگیز نابێت چاوەڕوانی سەرکەوتن بن، بەدڵنیاییەوە لە جەنگی ئوحود دا دەبینین کە هۆکاری موسیبەت و شکستی موسڵمانان چییەو کام خاڵیان فەرامۆش کردووە، خۆ ئەگەر موسڵمانان پابەند بوون بەو دە خاڵەی باسم کرد ئەوا خوای پەروەردگار سەرکەوتن و نیعمەتی خۆی بەسەریاندا دەڕژێنێت بەو مەرجەی پشت نەکەنە دوژمن.



﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا لَقِيتُمُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ زَحْفًا فَلَا تُوَلُّوهُمُ ٱلْأَدْبَارَ ١٥﴾ [الأنفال]

واتە: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە کاتێک بەرەنگاری ئەوانە بوونەوە کە بێباوەڕ بوون لەکاتی لەشکر کێشیدا ئەوە پشتیان تێمەکەن و ڕامەکەن.

﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا لَقِيتُمْ فِئَةً فَٱثْبُتُواْ وَٱذْكُرُواْ ٱللَّهَ كَثِيرًا لَّعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ٤٥﴾ [الأنفال]

واتە: ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان هێناوە کاتێک دەگەنە دەستەیەک ڕووبەڕووتان دەبنەوە دەبێت خۆڕاگر بن و سەنگەر چۆڵ نەکەن، زۆر یادی خوا بکەن لێی بپاڕێنەوە، بۆ ئەوەی سەرفرازو سەرکەوتوو بن.

ئەگەر ئەو دە خاڵە لە سوپاکەداو سەرکردەکاندا پیادە کرا، ئەوا خوای گەورە حەتمەن سەرکەوتنیان پێ دەبەخشێت، بەشێوەیەک کە موسڵمانان هەرگیز پەییان پێ نەبردووە و بە خەیاڵیاندا نەهاتووە، بۆ ئەوەشە کە موسڵمان بزانێت سەرکەوتن لای خوای پەروەردگارە نەک هێزو بازووی خۆیان.

﴿وَمَا جَعَلَهُ ٱللَّهُ إِلَّا بُشْرَىٰ وَلِتَطْمَئِنَّ بِهِۦ قُلُوبُكُمْ ۚ وَمَا ٱلنَّصْرُ إِلَّا مِنْ عِندِ ٱللَّهِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ١٠﴾ [الأنفال]

چونکە هەندێک لە موسڵمانان حەزیان بە جەنگ نەبوو، جەنگەکەیان پێ خۆش نەبوو، خوای گەورە **دەفەرموێت:**

﴿كَمَآ أَخْرَجَكَ رَبُّكَ مِنۢ بَيْتِكَ بِٱلْحَقِّ وَإِنَّ فَرِيقًا مِّنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ لَكَـٰرِهُونَ ٥﴾ [الأنفال]

وەک چۆن پەروەردگارت بە حەق و ڕاستی لەنێو ماڵەکەت دەریهێنایت لەکاتێکدا بەڕاستی کۆمەڵێک لە بڕواداران پێی دڵگران بوون.

وایان دەزانی مەرگ تاکە ڕێگەیانەو شکست خواردوو دەبن، بەڵام ئەوەی بە خەیاڵیاندا نەهاتووە ئەوەبوو کە جوبرەئیل و فریشتەکان هاوڕێ و جەنگاوەری ئەو جەنگە بوون.

ئەو سوپایە سوپایەکی خاوەن بیروباوەڕو مەبدەئی ڕاستەقینە بوون لەگەڵ خواو خۆیاندا، بەتەواوەتی پڕپڕ بوون لە هێزی ئیمانی لەبەرخوا جەنگاون، نموونەی عومەری کوڕی خەتاب - ڕەزامەندی خوای لەسەر بێت- کە خزمایەتی عەشیرەتی هەموو وەلاناو لەبەر بیروباوەڕو



پڕەنسیپی ئیسلام جەنگی دەکرد، کاتێک خاڵی خۆی بینی ئاگات لێبوو چۆن پەلاماری داو کوشتی، لەبەر ئەوە سۆزو عاتیفەی خزمایەتی هیچ کاریگەر نەبوو، ئەبو بەکری سدیق -ڕەزامەندی خوای لەسەر بێت- بەشوێن عەبدوڕەحمانی کوڕیدا دەگەڕا بەدەستی خۆی بیکوژێت. تەنانەت پێغەمبەری خوا ﷺ ئەبو بەکری بە هاوشێوەی پێغەمبەر ئیبراهیم عَلَيْهِ السَّلَامُ باسیکرد، چونکە کوشتنی کوڕ هەروا شتێکی سادەو سانا نییە.

هەرچەندە دواتر عەبدوڕەحمان -ڕەزامەندی خوای لەسەر بێت- موسڵمان بوو، زۆرترین ناڕەحەتی و ناهەمواری بەسەر پێغەمبەراندا دێت، پاشان ئەوانەی شوێن پێغەمبەران کەوتوون هەر لەو ڕۆژەدا براکەی موسعەبی کوڕی عومەیر ناوی (ئەباعەزیز) بەدیل گیرا، بەدەستی کەسێکی ئەنساری بوو موسعەب چووە لای ئەنسارەکەو وتی: ئەم کەسە دەناسم، هەروا بە ئاسانی ئازادی نەکەی زۆر دەوڵەمەندە، دایکی یەکێکە لەهەرە دەوڵەمەندەکانی شاری مەککە، ئەبا عەزیزیش وتی: ئاوا ئاگات لێدەبێ من براتم؟ لە وەڵامدا موسعەب وتی: ئەنسارەکە برامە نەک تۆ، ئەمەش هێزو توانای بیروباوەڕ و ئیمانی هاوەڵانمان بۆ دەردەخات کە بە هیچ شتێک پێوانە ناکرێت، چونکە هەست و سۆزی برایەتی و خۆشەویستی موسعەب -ڕەزامەندی خوای لەسەر بێت- لەبەر خوا دروست دەبێت، چۆن کەسێک بە برای خۆی دەزانێت دژی خواو پێغەمبەری خوایە ﷺ، ئەو خوا ڕازی دەکات نەک خزم و براو دایک، بەڵام لەبیرمان نەچێت ئەمەی کە باسی دەکەین گۆڕەپانی جەنگە بۆ کوشتنی یەکتری هاتبوون، بەڵام لە واقیعی تردا هەموو خاوەن ڕەحم و بەجوانترین شێوە سیلەی ڕەحمییان پیادە دەکرد، چونکە مامەڵە موسڵمان لەگەڵ دایک و باوک و کەسوکاردا وەکو حەزرەتی لوقمان فێری کوڕەکەی و ئێمەش دەکات و دەفەرمووێت:

﴿وَإِن جَٰهَدَاكَ عَلَىٰٓ أَن تُشْرِكَ بِى مَا لَيْسَ لَكَ بِهِۦ عِلْمٌ فَلَا تُطِعْهُمَا ۖ وَصَاحِبْهُمَا فِى ٱلدُّنْيَا مَعْرُوفًا...﴿١٥﴾﴾ [لقمان]

واتە: ئەگەر دایک و باوکت کۆششیان لەگەڵتا کرد تا بەبێ هیچ بەڵگەو زانیارییەک هاوەڵ بۆمن پەیدا بکەیت بە قسەیان مەکە، لە دونیاشدا هاوڕێ و هاوەڵ و خزمەتکارێکی چاک بە بۆیان لەهەموو بارووذۆخێکدا.

چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ بەهەموو هاوەڵانی دەوت: بەجوانترین شێوە مامەڵە لەگەڵ کەسوکارو خزمەکانیاندا بکەن، بە سەعدی کوڕی ئەبی وەقاس -ڕەزامەندی



خوای لەسەر بێت- وت: فەرمانی پێکرد ئەگەرچی دایکی موشریک بوو فەرمووی: لەگەڵی بە نەرم و ئیحترامەوە مامەڵەی لەگەڵ بکە ئەگەرچی ئەویش پێچەوانەی تۆ بێت ئازارت بدات!

کەواتە: پرسیارەکە ئەوەیە کە ئەوان هەموو خاڵی سەرکەوتنیان لەخۆیاندا پیادە دەکرد، ئەی سەرکەوتنی خوایی و سەربازەکانی خوای چی بوون لە جەنگی بەدردا؟

بۆ وەڵامی ئەو پرسیارە خوای پەروەردگار بەشێوەی قورئان و وەحی ئەو بوارو حاڵەتەمان بۆ باس دەکات دەفەرمووێت:

﴿وَمَا جَعَلَهُ ٱللَّهُ إِلَّا بُشْرَىٰ وَلِتَطْمَئِنَّ بِهِۦ قُلُوبُكُمْ ۚ وَمَا ٱلنَّصْرُ إِلَّا مِنْ عِندِ ٱللَّهِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ﴾ [الأنفال]

ئەم یارمەتییەش جگە لە موژدەیەکی خوایی شتێکی تر نەبوو، تا دڵەکانیشتان ئارام بگرێت و دڵنیا بن بەو یارمەتییە، چونکە بەڕاستی خوا هەر خۆی باڵادەست و دانایە.

هەروەکو وتم: سەرکەوتن لە جێگەیەکەوە دەبێت هەرگیز مرۆڤ پەی پێ نەبردووە و بە خەیاڵیاندا نەهاتووە، فەلسەفەی سەرکەوتن تەنها لەلای خوای پەروەردگارە لە ئیسلامدا، لەڕێگەی سەربازو جوندییەکانییەوە، جوندییەکانی خوای پەروەردگار کێن و چین، تەنها خۆی دەزانێت بۆ سەرخستنی بەندەکانی دەبینرێت، خوای گەورە دەفەرمووێت:

﴿... وَمَا يَعْلَمُ جُنُودَ رَبِّكَ إِلَّا هُوَ ۚ وَمَا هِيَ إِلَّا ذِكْرَىٰ لِلْبَشَرِ﴾ [المدثر]

واتە: کەس ژمارەی سەربازانی پەروەردگارت نازانێ جگە لە خۆی، ئەو ئایەت و فەرموودانە تەنها ئامۆژگارین بۆ ئادەمیی.

﴿ثُمَّ أَنزَلَ ٱللَّهُ سَكِينَتَهُۥ عَلَىٰ رَسُولِهِۦ وَعَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ وَأَنزَلَ جُنُودًا لَّمْ تَرَوْهَا وَعَذَّبَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا ۚ وَذَٰلِكَ جَزَآءُ ٱلْكَٰفِرِينَ﴾ [التوبة]

واتە: پاشان خوای گەورە ئارامی و ئاسوودەیی دابەزاندە سەر پێغەمبەرەکەی و سەر ئیمانداران و سەربازانێکی دابەزاند کە نەتاندیتبوو، سزای ئەوانەشی دا کە بێباوەڕ بوون ئەوەش سزا و پاداشتی بێباوەڕانە.



﴿إِذۡ تَقُولُ لِلۡمُؤۡمِنِينَ أَلَن يَكۡفِيَكُمۡ أَن يُمِدَّكُمۡ رَبُّكُم بِثَلَٰثَةِ ءَالَٰفٖ مِّنَ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةِ مُنزَلِينَ﴾ [آل عمران]

واتە: یادیان بهێنە کاتێک بە ئیماندارانت دەوت: ئایا ئەوەندە بەس نییە کە پەروەردگارتان بە سێ هەزار فریشتە کۆمەکتان بکات و دایانبەزێنێت؟

قۆناغی یەکەم: بەهەزار فریشتە خوای گەورە لە بەدردا بەشداری پێکردن و پاشان.

قۆناغی دووەم: بەسێ هەزار فریشتە.

قۆناغی سێیەم: بە پێنج هەزار فریشتە.

خۆ یەک فریشتە بەس بوو بۆ ئەوەی ئەو سوپایە لەناو بەرێت، ئەی بۆ خوای پەروەردگار ئەو ژمارە زۆرەی نارد؟ لەبەر ئەوەی خۆشی و شادی بخاتە دڵی ئیمانداران، پێیان بڵێت: خوای گەورە سەری خستن

﴿وَلَقَدۡ نَصَرَكُمُ ٱللَّهُ بِبَدۡرٖ وَأَنتُمۡ أَذِلَّةٞۖ فَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ لَعَلَّكُمۡ تَشۡكُرُونَ ۝ إِذۡ تَقُولُ لِلۡمُؤۡمِنِينَ أَلَن يَكۡفِيَكُمۡ أَن يُمِدَّكُمۡ رَبُّكُم بِثَلَٰثَةِ ءَالَٰفٖ مِّنَ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةِ مُنزَلِينَ ۝ بَلَىٰٓۚ إِن تَصۡبِرُواْ وَتَتَّقُواْ وَيَأۡتُوكُم مِّن فَوۡرِهِمۡ هَٰذَا يُمۡدِدۡكُمۡ رَبُّكُم بِخَمۡسَةِ ءَالَٰفٖ مِّنَ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةِ مُسَوِّمِينَ ۝﴾ [آل عمران]

واتە: بێگومان خوا لە غەزای بەدردا سەرکەوتووی کردن، هەرچەندە ئێوە (لە ژمارە و چەکدا) لاواز و کەم بوون، دەی کەواتە: لەخوا بترسن، بۆ ئەوەی سوپاسگوزار بن، (یادیان بهێنەوە کاتێک) بە ئیماندارانت وت: ئایا ئەوەندە بەس نییە کە پەروەردگارتان بەسێ هەزار فریشتە کۆمەکتان بکات و دایانبەزێنێت؟ بەڵێ ئەگەر خۆڕاگربن و پارێزگار بن هەر ئێستا دێن بۆ لاتان و پەروەردگارتان پێنج هەزار فریشتەی نیشانەدارتان بۆ ڕەوانە دەکات، بۆ ئەوەی کۆمەکتان بکەن.

بێئەوەی دڵیان ئارام بکا و دڵنیابن لەسەرکەوتن، فریشتەیش مەخلووقێکی نامۆ و عەجیبن خوای گەورە لەبارەیانەوە دەفەرمووێت:

﴿... عَلَيۡهَا مَلَٰٓئِكَةٌ غِلَاظٞ شِدَادٞ لَّا يَعۡصُونَ ٱللَّهَ مَآ أَمَرَهُمۡ وَيَفۡعَلُونَ مَا يُؤۡمَرُونَ ۝﴾

[التحريم] واتە: سەرپەرشتیارانی ئەو دۆزەخە جۆرە فریشتەیەکن کە زۆر دڵڕەقن توند و تیژن،



نافەرمانی خوا ناکەن لەهیچ شتێکدا کە فەرمانی پێ بدات، هەرچی فەرمانێکیان پێ بدرێت ئەنجامی دەدەن.

فریشتە توانایەکی بێوێنەیان هەیە، هێزو توانای ئەوان بە ئەتۆم و هیچ جۆرە چەکێکی ناوەکی پێوانە ناکرێت، تەماشای حەزرەتی جوبریل بکە لەهێز و توانایدا هەموو گەلی لووطی لەناو بردو جێگەو مەکانەکەیانی بەرز کردەوە بۆ ئاسمان، تەنانەت خەڵکی ئاسمان و فریشتەکان گوێیان لە هاوارو ناڵەی خەڵک و سەگەکانیان بوو، پاشان هەڵیگێڕانەوە و خاپووری کردن. جوبریل هاتە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: چۆن سەربازانی بەدر تەماشا دەکەن، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: باشترین موسڵمان و فریشتەن کەواتە: هەردووکیان وەکو یەک پێوانە کراون، موسڵمانان و فریشتەکانی ئەهلی بەدر.[٩٩]

هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ بە ئەبو بەکری -ڕەزامەندی خوای لەسەربێت- فەرموو: موژدەت بدەمێ وا جوبریل بەخۆی و ئەسپەکەیەوە هات لەگەڵ چەک و کەرەستەی جەنگەکەی.[١٠٠]

خودی جوبریل بەشدار بووە لە جەنگی بەدر بەخۆی و ئەسپەکەیەوە هەزارەها فریشتەی تریش ئەوانیش شمشێریان دژی کافران وەشاندووە.

خوای پەروەردگار دەفەرمووێت:

﴿وَمَا جَعَلَهُ ٱللَّهُ إِلَّا بُشْرَىٰ لَكُمْ وَلِتَطْمَئِنَّ قُلُوبُكُم بِهِۦ ۗ وَمَا ٱلنَّصْرُ إِلَّا مِنْ عِندِ ٱللَّهِ ٱلْعَزِيزِ ٱلْحَكِيمِ﴾ [آل عمران]

واتە: ئەو (هاوکاری) فریشتانە لەلایەن خواوە تەنها مژدەیەک بوو بۆتان تا دڵەکانتان پێی دامەزراوتر بێت، ئەگینا سەرکەوتن تەنها لەلایەن خوای باڵادەست و دانایە و هەر ئەو دەیبەخشێت.

---

٩٩ ـ (جَاءَ جِبْرِيلُ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ فَقَالَ مَا تَعُدُّونَ أَهْلَ بَدْرٍ فِيكُمْ قَالَ مِنْ أَفْضَلِ الْمُسْلِمِينَ أَوْ كَلِمَةً نَحْوَهَا قَالَ وَكَذَلِكَ مَنْ شَهِدَ بَدْرًا مِنْ الْمَلَائِكَةِ) البخاري ١٢٢١.

١٠٠ ـ (عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ يَوْمَ بَدْرٍ هَذَا جِبْرِيلُ آخِذٌ بِرَأْسِ فَرَسِهِ عَلَيْهِ أَدَاةُ الْحَرْبِ) البخاري ٣٧٧٣.



هەروەها هاوەڵان لە جەنگی بەدردا هەواڵیان پێگەیشت کە فریشتە دابەزیوون بۆ هاوکارییان، هەیانبوو بەگوێی خۆی گوێی لە قامچی و دەنگی ئەسپی فریشتەکان بوو، لەناویاندا بەچاوی خۆی فریشتەی بینیوە.

هەروەها ئیبن عەبباس دەگێڕێتەوە ڕۆژی بەدر بینیمان یەکێک لە موسڵمانان شوێن کەسێکی موشریک کەوتوون بۆ جەنگ و لەپڕ موشریکەکە لەبەردەمیدا کەوت، گوێی لە دەنگی قامچییەک بوو پێیدا کێشراوە، هەروەها گوێی لە دەنگی فریشتەکە بوو کە بە ئەسپەکەی دەوت: بڕۆ پێشەوە (حەیزووم)، پاشان هاوەڵەکە دەڵێ: کە چوومە پێشەوە بینیم جێگەی قامچییەک بە دەمووچاوییەتی و جێگاکەی دیارەو سەوز بووە، دەموچاوی کردووە بەدوو کەرتەوە و شەقی کردووە، هەر هەمان هاوەڵ هاتە خزمەت پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ و ڕووداوەکەی بۆ گێڕایەوە، پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ فەرمووی: ڕاستت کرد، ئەوە یارمەتی خوایی بوو لە ئاسمانی سێیەمەوە.[١٠١]

تەنانەت هاوەڵان زانییان جێگەی پێداکێشانی فریشتەکان سەوز دەبێت بەلاشەی کافرەکانەوە، هاوەڵێکی تر بەناوی ئەبو داودی مازنی[١٠٢] -ڕەزامەندی خوای لەسەر بێت- دەفەرموێت: ڕۆژی بەدر شوێن موشریکێک کەوتم بۆ جەنگ و ڕووبەڕوبوونەوە ویستم پێیدا بکێشم، کەچی سەری پەڕیە بەردەمم من تەنانەت شمشێرەکەشم نەیدەگەیشتێ زانیم کەسێکی تر کوشتی، بەڵام من نەمبینی.[١٠٣]

هەروەها عەلی کوڕی ئەبو تاڵب -ڕەزامەندی خوای لەسەر بێت- دەڵێ: ڕۆژی بەدر عەبباسی مامم بەدەستی ئەنسارییەکی بچووک لاشە و لاواز بەدیل گیرا، لەکاتێکدا عەبباس مامی پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ زۆر بەهێز و بەتوانا و لاشە گەورە بوو، کاتێک هێنایە خزمەت پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ عەبباس وتی: ئەی پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ

---

١٠١ ـ (ابْنُ عَبَّاسٍ قَالَ بَيْنَمَا رَجُلٌ مِنَ الْمُسْلِمِينَ يَوْمَئِذٍ يَشْتَدُّ فِي أَثَرِ رَجُلٍ مِنَ الْمُشْرِكِينَ أَمَامَهُ إِذْ سَمِعَ ضَرْبَةً بِالسَّوْطِ فَوْقَهُ وَصَوْتَ
الْفَارِسِ يَقُولُ أَقْدِمْ حَيْزُومُ فَنَظَرَ إِلَى الْمُشْرِكِ أَمَامَهُ فَخَرَّ مُسْتَلْقِيًا فَنَظَرَ إِلَيْهِ فَإِذَا هُوَ قَدْ خُطِمَ أَنْفُهُ وَشُقَّ وَجْهُهُ كَضَرْبَةِ السَّوْطِ فَاخْضَرَّ ذَلِكَ أَجْمَعُ فَجَاءَ الْأَنْصَارِيُّ فَحَدَّثَ بِذَلِكَ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ صَدَقْتَ ذَلِكَ مِنْ مَدَدِ السَّمَاءِ الثَّالِثَةِ) مسلم.

١٠٢ ـ أبو داود المازني.

١٠٣ ـ قَالَ أَبُو دَاوُدَ الْمَازِنِيُّ حَدَّثَنَا يَزِيدُ أَنْبَأَنَا مُحَمَّدُ بْنُ إِسْحَاقَ عَنْ أَبِيهِ قَالَ قَالَ مُحَمَّدٌ فَحَدَّثَنِي أَبِي عَنْ رَجُلٍ مِنْ بَنِي مَازِنٍ عَنْ أَبِي
دَاوُدَ الْمَازِنِيِّ وَكَانَ شَهِدَ بَدْرًا قَالَ قَالَ إِنِّي لَأَتْبَعُ رَجُلًا مِنْ الْمُشْرِكِينَ لِأَضْرِبَهُ إِذْ وَقَعَ رَأْسُهُ قَبْلَ أَنْ يَصِلَ إِلَيْهِ سَيْفِي فَعَرَفْتُ أَنَّهُ قَدْ قَتَلَهُ غَيْرِي) (أحمد).



سوێند بەخوا ئەو كەسە منی بەدیل نەگرتووە، بەڵكو سوارچاكێك منی ئەسیر كرد لە ئێوە نەدەچوو، ئەسپێكی تەوێڵ ڕەش و سپی پێ بوو، پیاوێكی پاڵەوان و چوارشانە بوو لەباشترین كەسی جەنگاوەران بوو، لەژیانمدا كەسی وام نەدیووە لەم گەل و هۆزەش نییە.

ئەنسارییەكە وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ من دیلم كردووە.

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بێدەنگ بە! تۆ نەبوویت، بەڵكو خوای گەورە هاوكارت بووە بە فریشتەیەكی بەڕێز.

عەبباسی مامی پێغەمبەر ﷺ -ڕەزامەندی خوای لەسەر بێت- بەزۆر هێنابوویان بۆ جەنگەكە، پێدەچێت ئەو هەر لەو سەردەمەوە لەشاری مەكەوە موسڵمان بووبێت، بەڵام وەكو گواستنەوەی زانیاری لەشاری مەككە مابوویەوە و بۆ ئەوەی هەواڵ بداتە پێغەمبەری خوا ﷺ لەكردار و چالاكی قوڕەیش.

چۆن فریشتە بەشدار بوون لەجەنگی موسڵماناندا، بەهەمان شێوە شەیتان و خودی ئیبلیس لە جەنگی بەدردا بەشدار بوو، وازی نەهێنا بە وەسوەسە و خۆ خستنە سەر شێوەی سوراقەی كوڕی مالیك كە دەریان پەڕێنن بۆ جەنگ، بەڵكو خۆی بەشدار بوو لە جەنگەكەدا بوو بە هاویشتی سوپای موشریكی قوڕەیش، بینی فریشتە بەشداری دەكات، چونكە ئەو باش فریشتەكان دەناسێت. ماوەیەكی دوورودرێژ لەگەڵیاندا ژیاوە، خۆی لەسەر شێوەی سوڕاقە دانابوو جەنگی دەكرد، یەكێك لە جەنگاوەرە موشریكەكان بینی سوراقە ڕادەكات، وتی: بۆ كوێ ڕادەكەیت ئەی سوراقەی كوڕی مالیك؟ ئەو موشریكە ناوی (حارسی كوڕی هیشام) بوو، ئەی تۆ نەتوت: من پشتیوانتانم، لەگەڵتاندا دەجەنگم؟! ئیبلیس وتی: ئەوەی من دەیبینم ئێوە نایبینن، من لەخوای خۆم دەترسم.

﴿وَإِذْ زَيَّنَ لَهُمُ ٱلشَّيْطَٰنُ أَعْمَٰلَهُمْ وَقَالَ لَا غَالِبَ لَكُمُ ٱلْيَوْمَ مِنَ ٱلنَّاسِ وَإِنِّي جَارٌ لَّكُمْ فَلَمَّا تَرَآءَتِ ٱلْفِئَتَانِ نَكَصَ عَلَىٰ عَقِبَيْهِ وَقَالَ إِنِّي بَرِيٓءٌ مِّنكُمْ إِنِّيٓ أَرَىٰ مَا لَا تَرَوْنَ إِنِّيٓ أَخَافُ ٱللَّهَ وَٱللَّهُ شَدِيدُ ٱلْعِقَابِ﴾ [الأنفال]

واتە: كاتێكیش شەیتان (بە وەسوەسە و خەیاڵ) هەموو كردەوە ناپەسند و ناڕەواكانی بۆ ڕازاندنەوە وتی: ئەمڕۆ هیچ كەس دەرەقەتی ئێوە نایەت، دڵنیابن منیش پشت و پەنام بۆ ئێوە، جا كاتێك ئەو دوو لەشكرە یەكتریان بینی دەستبەجێ شەیتان پاشە و پاش گەڕایەوە و



وتی: بەڕاستی من بەریم لە ئێوە، چونکە بەڕاستی ئەوەی من دەیبینم ئێوە نایبینن، بێگومان من لەخوا دەترسم، خوایش زۆر سەخت و بەزەبرە لە تۆڵەدا.

﴿وَقَالَ ٱلشَّيْطَٰنُ لَمَّا قُضِيَ ٱلْأَمْرُ إِنَّ ٱللَّهَ وَعَدَكُمْ وَعْدَ ٱلْحَقِّ وَوَعَدتُّكُمْ فَأَخْلَفْتُكُمْ ۖ وَمَا كَانَ لِيَ عَلَيْكُم مِّن سُلْطَٰنٍ إِلَّآ أَن دَعَوْتُكُمْ فَٱسْتَجَبْتُمْ لِي ۖ فَلَا تَلُومُونِي وَلُومُوٓا۟ أَنفُسَكُم ۖ مَّآ أَنَا۠ بِمُصْرِخِكُمْ وَمَآ أَنتُم بِمُصْرِخِيَّ إِنِّي كَفَرْتُ بِمَآ أَشْرَكْتُمُونِ مِن قَبْلُ ۗ إِنَّ ٱلظَّٰلِمِينَ لَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴾ [إبراهيم]

واتە: (کاتێک هەموو شت تەواو دەبێت بەهەشتییەکان دەچنە بەهەشت و دۆزەخییەکانیش بۆ دۆزەخ) شەیتان (بەفەرمانی خوا) دێتە قسە و (ڕوو بە پەیڕەوانی) دەڵێت: بەڕاستی خوا بەڵێنی ڕاست و دروستی پێ ڕاگەیاندبوون، منیش بەڵێنی درۆ و نادروستم پێدان جا توانیم گومڕاتان بکەم و لە ڕێبازی ڕاست وێڵتان بکەم، وەنەبێت من هیچ زۆر و دەسەڵاتێکم بەسەر ئێوەدا هەبووبێت، جگە لەوەی (بە وەسوەسەو خەتەرەو خەیاڵ) بانگم کردن (بۆ خوانەناسی و تاوان) ئێوەش بەدەممەوە هاتن و بەقسەتان کردم، ئیتر سەرزەنشت و لۆمەی من مەکەن، بەڵکو سەرزەنشت و لۆمەی خۆتان بکەن (کە ئاوا گێلانە بێ بیرکردنەوە بە قسەتان کردم ئەمڕۆ) من ناتوانم بەهاناو هاواری ئێوە بێم ئێوەش ناتوانن بەهاناو هاواری منەوە بێن، بێگومان من باوەڕم نەبوو بەوەی کە کاتی خۆی منتان کردبووە شەریک و هاوبەش لە پێشدا، بەڕاستی ئەمڕۆ ستەمکاران سزای زۆر بەئێش دەدرێن.

ئەوەش پلانی شەیتانە خەڵکی هەڵدەنێت و هیواو ئارەزووی زۆریان پێ دەدات لە کۆتاییدا بەجێیان دەهێڵێت، خۆ ئەگەر شەیتان عیلمی غەیبی بزانیبایە ڕۆژی بەدر لەگەڵ کافرەکاندا بۆ جەنگ دەرنەدەچوو.

کەواتە: بێجگە خوای گەورە هیچ مەخلووقێک عیلمی غەیب نازانێت، سەربازی خوای پەروەردگار زۆر لەوە زیاترە کە ئێمە بیری لێ دەکەینەوە

﴿... يَعْلَمُ جُنُودَ رَبِّكَ إِلَّا هُوَ ۚ وَمَا هِيَ إِلَّا ذِكْرَىٰ لِلْبَشَرِ ﴾ [المدثر]

خوای پەروەردگار سەربازی لە ئاگر و ئاو هەوا و هەموو مەخلووقاتی پێکهاتووە.



﴿وَلِلَّهِ جُنُودُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَكَانَ ٱللَّهُ عَزِيزًا حَكِيمًا﴾ [الفتح]

**واتە: هەرچی سەربازان هەیە لە ئاسمانەکان و زەویدا، هەر خوا خۆی خاوەنیانە و لەژێر فەرمانی ئەودان، هەمیشە و بەردەوام ئەو خوایە باڵادەست و دانایە.**

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱذْكُرُواْ نِعْمَةَ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ إِذْ جَآءَتْكُمْ جُنُودٌ فَأَرْسَلْنَا عَلَيْهِمْ رِيحًا وَجُنُودًا لَّمْ تَرَوْهَا وَكَانَ ٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرًا﴾ [الأحزاب]

**واتە: ئەوانەی کە ئیمان و باوەڕتان هێناوە یادی نیعمەتی خوا بکەنەوە لەسەرتان (مەبەست جەنگی خەندەقە کە خوای گەورە فریای ئیمانداران کەوت)، کاتێ کە سەربازانی (کوفر) هاتنە سەرتان ئێمەش ڕەشەبایەکی بەهێز و سەربازانێکمان ناردە سەریان کە نەتان دەبینین، خوای گەورە بینا بوو بە هەوڵ و کۆششتان (چۆن پاسەوانیتان دەکرد، چۆن ئەو چاڵە قووڵ و درێژەتان هەڵکەند...هتد).**

﴿فَلَمْ تَقْتُلُوهُمْ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ قَتَلَهُمْ وَمَا رَمَيْتَ إِذْ رَمَيْتَ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ رَمَىٰ وَلِيُبْلِيَ ٱلْمُؤْمِنِينَ مِنْهُ بَلَآءً حَسَنًا إِنَّ ٱللَّهَ سَمِيعٌ عَلِيمٌ﴾ [الأنفال]

**لە جەنگەکانی تردا دەبینین کە چەندە سەربازانی خوای پەروەردگار زۆرن**

﴿وَمَا جَعَلَهُ ٱللَّهُ إِلَّا بُشْرَىٰ لَكُمْ وَلِتَطْمَئِنَّ قُلُوبُكُم بِهِۦ وَمَا ٱلنَّصْرُ إِلَّا مِنْ عِندِ ٱللَّهِ ٱلْعَزِيزِ ٱلْحَكِيمِ﴾ [آل عمران]

**واتە: ئەو (هاوکاری) فریشتانە لەلایەن خواوە تەنها مژدەیەک بوو بۆتان تا دڵەکانتان پێی دامەزراوتر بێت، ئەگینا سەرکەوتن تەنها لەلایەن خوای باڵادەست ودانایە و هەر ئەو دەیبەخشێت.**

**لێرەدا تێگەیشتنی عەلی کوڕی ئەبو تالیب -ڕەزامەندی خوای لەسەر بێت- باس دەکەین کە دەڵێ: خوای گەورە عوتبە و شەیبەی برای کوڕی ڕەبیعەی کوشت لەگەڵ وەلیدی کوڕیاندا، ئەمە ئەوە دەردەخات کە سەرکەوتن لەلای پەروەردگارەوەیە، نەک مرۆڤ و موسڵمانان بەگشتی، هەروەها عوبادەی کوڕی سامت -ڕەزامەندی خوای لەسەر بێت- دەڵێ: لە خزمەت پێغەمبەر ﷺ دا دەرچووین بۆ جەنگی بەدر ڕووبەڕووی دوژمن بووینەوە و**



خوای گەورە دوژمنی شکاند، ئەمەش پەنادانی سەرکەوتنە بۆ خوای گەورە، هەرکات مرۆڤ بەخۆیدا نەنازی و سەرکەوتنی دایە پاڵ خوای گەورە ئەوە دڵنیابن سەرکەوتن هەمیشە نزیکە.

جا ئەگەر فریشتە و سەربازانی خوای پەروەردگار بن، هەڵهاتنی شەیتان هۆکاری شکستی کافران بێت، ئەوا سەربازێکی تری خوای پەروەردگار بریتییە لە ترس و بیم بۆ دڵی کافران.

ترس سەربازێکی گەورەی ڕەحمانە، پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمووێت: بەترس خستنە ناو دڵی دوژمن سەرکەوتووم ئەگەرچی مانگە ڕێیەك لێیان دووربووبم.[١٠٤]

واتە: پێش ئەوەی سوپای پێغەمبەری خوا ﷺ ناوچەی دوژمن مانگە ڕێگایەک لێیان دووربووە ئەوان بگاتە ناوچەی دوژمن ترسیان لێ نیشتووە و ترس خراوەتە دڵیان، بەهێز لەلاواز ترساوە بەفەرمانی خوای پەروەردگار، هەروەها خوای پەروەردگار ترسی خستۆتە دڵی زۆرەوە، تا لەکەم بترسن یاخود ترس و ناڕەحەتی خستۆتە دڵی خەڵکی پڕ چەک و هێز بەرانبەر خەڵکی بێ چەک و لاواز، ئەبینن منداڵێکی فەڵەستینی بەبەرد سەربازێکی پڕ چەکی یەهوودی ڕاو دەنێت.

خوای گەورە لەبەرانبەر سەربازی ترسی خۆیدا دەفەرمووێت:

﴿إِذۡ يُوحِي رَبُّكَ إِلَى ٱلۡمَلَٰٓئِكَةِ أَنِّي مَعَكُمۡ فَثَبِّتُواْ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْۚ سَأُلۡقِي فِي قُلُوبِ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ ٱلرُّعۡبَ فَٱضۡرِبُواْ فَوۡقَ ٱلۡأَعۡنَاقِ وَٱضۡرِبُواْ مِنۡهُمۡ كُلَّ بَنَانٖ ١٢﴾ [الأنفال]

(ئەی موحەممەد ﷺ لەیادەت نەچێت): کاتێك پەروەردگارت وەحی و نیگای کرد بۆ فریشتەکان کەمن یار و یاوەرتانم، ئێوە ئیمانداران پابەند و پایەدار بکەن منیش ترس و بیم فڕێ دەدەمە دڵی کافران و بێباوەڕانەوە، دە ئیتر لە گەردنە (ناپاکەکان) بدەن، دەست بوەشێنن لەهەموو سەرپەنجە (یاخییەکان تا شمشێریان پێنەگیرێت).

بینیمان سوپای سۆڤیەت ڕووبەڕووی ئەفغانی ڕەش و ڕووت بوویەوە بە چ دەردێک چوو، پاشان ئەمریکا چۆن دژایەتی تاڵیبانی کرد دوایی ناچار ملی شۆڕ کردو تاڵیبان دەوڵەتی دامەزراند. لە عێراق سەری پێ شۆڕکرا، ئەگەر پێوەری بکەین بە چەک و تەقەمەنی پێشکەوتووی ئەمریکا هەرگیز ئەو سەرکەوتنە گەورەیە دروست نابێت، ئەگەر دەستی خوای گەورەی لەپشتەوە نەبێت، سوپای کافرانی قوڕەیش سێ ئەوەندەی سوپای موسڵمانان

-----

١٠٤ ـ (نُصِرْتُ بِالرُّعْبِ مَسِيرَةَ شَهْرٍ) أخرجه البخاري (٢٤٠٥/٥، رقم ٦٢٠٨)، ومسلم (١٧٩٣/٤، رقم ٢٢٩٢).

دەبوون، بەچ دەردێک چوون و خوای گەورە لەناوی بردن، دڵی پڕکردن لە ترس و لەرز و بەسەر شۆڕی گەڕانەوە.

پێچەوانەی ترس بۆ موسڵمانان بوو کە سەربازی خوای پەروەردگارە، ئەویش دڵئارامی و هێمنییە بۆ خواناسان، چونکە دڵەکان لەنێوانی پەنجەی خوای پەروەردگاردایە، چۆنی بووێت هەڵیدەسووڕێنێت.

﴿إِذْ يُغَشِّيكُمُ ٱلنُّعَاسَ أَمَنَةً مِّنْهُ وَيُنَزِّلُ عَلَيْكُم مِّنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً لِّيُطَهِّرَكُم بِهِۦ وَيُذْهِبَ عَنكُمْ رِجْزَ ٱلشَّيْطَٰنِ وَلِيَرْبِطَ عَلَىٰ قُلُوبِكُمْ وَيُثَبِّتَ بِهِ ٱلْأَقْدَامَ ﴿١١﴾﴾ [الأنفال]

واتە: ئەو موژدە و ئارامی دڵە کاتێک بوو کە خوای گەورە بەوەنەوز دایگرتن، بۆ ئەوەی هێمنییەک بێت بۆتان لەلایەن خۆیەوە و ئاوێکیش لە ئاسمانەوە و بەسەرتاندا باراند بۆ ئەوەی خاوێنتان بکاتەوە و پیس و پۆخڵی شەیتانتان لێ دوور بخاتەوە، (تا لە ڕووی جەستە و دڵ و دەروونەوە خاوێن بن)و دڵەکانتان بەهێز و دامەزراو بکات بیانبەستێت بە خواوە و بەو ئاوە پێیەکانیشان جێگیرو قایم بکات.

خوای گەورە چۆن ترسی دابەزاندە دڵی کافرەکان، ئاوا ئارامی و هێمنی دابەزاندە دڵی ئیمانداران.

بارانیش بەهەمان شێوە سەربازانی خوای پەروەردگار بوو، بەدوو ئاراستە کاری دەکرد، بۆ موسڵمانان هێمنی و لەسەرخۆیی، بۆ کافران بە لێزمەو بەخوڕ دەباری، خوای گەورە دەفەرمووێت:

﴿وَهُوَ ٱلَّذِى يُنَزِّلُ ٱلْغَيْثَ مِنۢ بَعْدِ مَا قَنَطُوا۟ وَيَنشُرُ رَحْمَتَهُۥ ۚ وَهُوَ ٱلْوَلِىُّ ٱلْحَمِيدُ ﴿٢٨﴾﴾ [الشورى]

واتە: خوا ئەو زاتەیە کە باران دەبارێنێت و دەگەیەنێتە فریایان دوای ئەوەی نائومێد بوون هەروەها ڕەحمەت و بەخششی خۆی پەخش دەکاتەوە لەبەر ئەوە هەرخۆی پشتیوان و فریادڕەسە و شایستەی سوپاسە.

باران بۆ موسڵمانان ڕەحمەت و بەزەیی خوا بوو، بەڵام بۆ کافران بەڵا بوو، نارەحەتی بوو. سەربازانێکی گرنگی تر لەم جەنگەدا بریتیبوون لە کەمی ژمارەی هەردوولا، سبحان الله خودا وایکرد سوپای زۆر و ژمارەی کافران زۆر کەم بن لەبەرچاوی ئیمانداراندا بۆ ئەوەی جەنگەکە



ئەنجام بدرێت، تەنانەت خودی پێغەمبەری خوا صَلَّىٰ اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ خوای گەورە وا نیشانیدا سوپای کافران زۆر نین و دەتوانن ڕووبەڕوویان ببنەوە، لە خەودا بینی ژمارەیان کەمە بۆ ئەوەی زیاتر حەز بە جیهاد بکەن و ترسیان لە ژمارەی زۆری کافرەکان نەبێت، هەروەها کافرەکانیش موسڵمانانیان لەژمارەی خۆیان زۆر بەکەمتر دەبینی، بۆیە خوای گەورە دەیویست و ویستی لەسەر بوو جەنگ ڕووبدات، خوای پەروەردگار دەفەرمووێت:

﴿إِذْ يُرِيكَهُمُ ٱللَّهُ فِى مَنَامِكَ قَلِيلًا ۖ وَلَوْ أَرَىٰكَهُمْ كَثِيرًا لَّفَشِلْتُمْ وَلَتَنَـٰزَعْتُمْ فِى ٱلْأَمْرِ وَلَـٰكِنَّ ٱللَّهَ سَلَّمَ ۗ إِنَّهُۥ عَلِيمٌۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ﴾

کاتێک خوا ئەوانی لە خەودا بەکەم نیشان دەدا خۆ ئەگەر ئەوانی بەژمارەیەکی زۆر نیشانت بدابایە ئەوە ئێوە لاواز دەبوون و تووشی نەهامەتی و کێشە دەبوون لەبارەی جەنگ کردنەوە، بەڵام خوا بە سەلامەتی و سەر کەوتوویی لەو ترس و کێشەیە ڕزگاری کردن، چونکە بەڕاستی ئەو زاتە زانایە بەهەرچی لەناو دڵ و دەروون و سینەکاندا حەشار دراوە.

پێچەوانەکەی خوای گەورە لەهەمان سوورەتدا دەفەرمووێت:

﴿وَإِذْ يُرِيكُمُوهُمْ إِذِ ٱلْتَقَيْتُمْ فِىٓ أَعْيُنِكُمْ قَلِيلًا وَيُقَلِّلُكُمْ فِىٓ أَعْيُنِهِمْ لِيَقْضِىَ ٱللَّهُ أَمْرًا كَانَ مَفْعُولًا ۗ وَإِلَى ٱللَّهِ تُرْجَعُ ٱلْأُمُورُ﴾ [الأنفال]

واتە: جا ئیتر کاتێك کە (لەگۆڕەپانی جەنگدا) بەیەکگەیشتن لەبەرچاوی ئێوە ئەوان کەم دیاربوون وە ئیوەشی کەم نیشان دەدا لەبەرچاوی ئەوان، بۆ ئەوەی هەر ئەوە پێش بێت کە خوا بڕیاری لەسەر داوە، بێگومان هەموو کار و کردەوەیەک بەدەست ئەو زاتەیە و بەبێ ویستی ئەو پێش نایەت.

هۆکاری دابەزینی ئەو ئایەتە: عەبدوڵلای کوڕی مەسعود دەڵێ: لەکاتی جەنگدا پیاوێک لە تەنیشتمەوە بوو پێموت: سوپای قوڕەیش حەفتا کەس دەبن؟ ئەویش وتی: هەست دەکەم بگەنە سەد کەس، هەروەها موشریکەکان وتیان: موسڵمانان لە سەد کەس زیاتر تێپەڕ ناکەن، ئیتر ئایەتی (٤٤)ی ئەنفال دابەزی.

ئەبو جەهل دەیوت: موسڵمانان سەد کەس تێپەڕ ناکەن، یان کەمترن، خوای پەروەردگار دەفەرمووێت:



﴿قَدْ كَانَ لَكُمْ ءَايَةٌ فِي فِئَتَيْنِ ٱلْتَقَتَا فِئَةٌ تُقَـٰتِلُ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ وَأُخْرَىٰ كَافِرَةٌ يَرَوْنَهُم مِّثْلَيْهِمْ رَأْيَ ٱلْعَيْنِ وَٱللَّهُ يُؤَيِّدُ بِنَصْرِهِۦ مَن يَشَآءُ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَعِبْرَةً لِّأُوْلِي ٱلْأَبْصَـٰرِ﴿١٣﴾﴾ [آل عمران]

واتە: ئەی موحەممەد صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ بەو خەڵکە بڵێ: بێگومان لەو دوو دەستەیەی کە لە جەنگی بەدردا ڕووبەڕووی یەکتر وەستان نیشانە و پەندێکی گەورە بووە بۆتان، دەستەیەکیان لەپێناوی خوادا دەجەنگان دەستەکەی تریان بێباوەڕ بوون، ئیمانداران لەبەرچاویاندا دوو ئەوەندەیان دەنواند، (لە مەیدانی جەنگدا بەچاوی بینین) (خوا فریشتەی دابەزاند بۆ یارمەتی ئیمانداران) خوا پشتگیری هەر کەسێک و هەر دەستەیەک بیەوێت دەکات، بەڕاستی لەو یارمەتییەدا پەند و ئامۆژگاری هەیە بۆ ئەوانەی کە بینایی خۆیان بەکاردەهێنن، بەوردی بیردەکەنەوە، (کە چۆن کۆمەڵێکی کەم زاڵ بوون لەسەر کۆمەڵێکی زۆر).

ئەمە سەرەتا بوو پێش دەست پێکردنی جەنگەکە هەردوولا یەکتریان بەکەم دەبینی، بەڵام کە جەنگ دەستی پێکرد و موسڵمانان ڕژانە ناو سوپای کافران، ئەوکات ڕەوشەکە گۆڕا موشریکەکان ترسیان لێنیشت و وتیان: خۆ موسڵمانان دووجار ئەوەندەی ئێمە سوپاکەیان گەورەیە، واتە: ژمارەیان دەچێتە دوو هەزار موجاهید، خوای گەورە وتەی کافرەکانمان بۆ باس دەکات، دەفەرمووێت:

﴿قَدْ كَانَ لَكُمْ ءَايَةٌ فِي فِئَتَيْنِ ٱلْتَقَتَا فِئَةٌ تُقَـٰتِلُ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ وَأُخْرَىٰ كَافِرَةٌ يَرَوْنَهُم مِّثْلَيْهِمْ رَأْيَ ٱلْعَيْنِ وَٱللَّهُ يُؤَيِّدُ بِنَصْرِهِۦ مَن يَشَآءُ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَعِبْرَةً لِّأُوْلِي ٱلْأَبْصَـٰرِ﴿١٣﴾﴾ [آل عمران].

واتە: ئەو دوو دەستەیەی کە لە (جەنگی بەدردا) ڕووبەڕووی یەک وەستان نیشانە و پەندێکی (گرنگیان) دەبەخشی: دەستەکەی تریان لە پێناوی خوادا دەجەنگان، دەستەکەی تریان بێباوەڕبوون، ئیمانداران لەبەرچاوی (بێباوەڕان) دوو ئەوەندەیان دەنواند (لە مەیدانی جەنگ)دا، (خوا فریشتەیشی دابەزاند بۆ یارمەتی ئیمانداران)، خوا پشتگیری (هەر دەستەیەک) و هەرکەسێک بیەوێت دەیکات، بەڕاستی ئا لەو ڕووداوەدا پەند و ئامۆژگاری هەیە بۆ ئەوانەی کە بینایی خۆیان بەکاردێنن وبە وردیی بیر دەکەنەوە (کە چۆن کۆمەڵێکی کەم زاڵبوون بەسەر کۆمەڵێکی زۆردا).



ئەم جۆرە سەرباز و جوندیانەی خوا بەسە بۆ کەسێک لە سەرکەوتنی خوایی تێبگات و خاوەن ئەقڵ و مێشکی کراوە دڵی پاک بێت.

سەربازێکی گرنگی خوای پەروەردگار بریتی بوو لە جیابوونەوەی بەشێکی زۆر لە سوپای کافران لە ڕێگادا بەرەو بەدر، ئەمەش بۆخۆی کاریگەری زۆری خستە دڵ و دەروونی کافرەکانی مەککە، لەوکاتەی کە ئەخنەسی کوڕی شورەیق لە مەیدانەکەدا گەڕایەوە بە (٣٠٠) سەربازەوە، زۆر ئەرێنی بوو بۆ ئیمانداران و نەرێنی بوو بۆ کافرەکان.

بەرەکەت سەربازێکی خودا بوو بۆ موسڵمانان کە کۆمەڵێکی زۆر کەم بوون، بەڵام ئامانجێکی زۆر گەورە و سەرسوڕهێنەر بۆ ئیمانداران، پێغەمبەری خوا ﷺ دەستی خستە نێو خاک و چەند وردە بەرد و خۆڵێکی هەڵگرت، فەرمووی: خوا گیان! چاویان کوێر بکە و لەناویان بە و خۆڵ و وردە بەردی تێدەگرتن، چەندەها بەو وردە بەرود و خۆڵە کوژران، هەر دەیفەرموو: (شاهت الوجوه).

سوپاکە بەو وردە خۆڵ و بەردە شکستیان هێنا، خوای پەروەردگار دەفەرمووێت:

﴿فَلَمْ تَقْتُلُوهُمْ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ قَتَلَهُمْ ۚ وَمَا رَمَيْتَ إِذْ رَمَيْتَ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ رَمَىٰ ۚ وَلِيُبْلِىَ ٱلْمُؤْمِنِينَ مِنْهُ بَلَآءً حَسَنًا ۚ إِنَّ ٱللَّهَ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴿١٧﴾﴾ [الأنفال]

واتە: کەوابوو ئەی ئیمانداران وەنەبێ ئێوە کافرانتان کوشتبێ، بەڵکو خوا کوشتنی و لەناوی بردوون، تۆش ئەی موحەممەد ﷺ کاتێک مشتێک خۆڵت ڕوو بەکافران فڕێدا ئەو کارە تەنها تۆ نەتکرد، بەڵکو خوا فڕێیدا (خۆڵی خستە چاوی کافرانەوە) تا ئیمانداران تاقیبکاتەوە بە تاقیکردنەوەیەکی چاک، چونکە بەڕاستی خوا بیسەری (دوعا و نزایە) زاناشە بە نیەتی (دڵیان).

ئاخر خۆ لەهیچ قانوونێکدا و هیچ پرۆفیشناڵێکی ستراتیژی سەربازی ناتوانێت تەفسیری ئەوە بکات بڵێ: ئەو خۆڵ و وردە بەردانە چی بووە جگە لە بەرەکەتی خوای پەروەردگار، ئەنجامێکی زۆر گەورەی بۆ موسڵمانان بەدەست هێنا.



## چۆنیەتی کوشتنی ئەبو جەهل

کوشتنی ئەبو جەهل گەورەترین بەرەکەتی تێدا بەدی دەکرێت، چونکە ئەبو جەهل یەکێک بوو لە سوارچاکانی عەرەب، کەسێکی بەهێزو ناسراو بوو، سەرکردەی گشتی سوپای بەدری موشریکەکان بوو، لەگەڵ ئەو هەموو توانا و پاسەوانەی هەیبوو بەدەستی دوو لاوی زۆر منداڵ و لاواز لەناو دەچێت و دەکوژرێت.

عەبدورەحمانی کوڕی عەوف -ڕەزامەندی خوای لەسەر بێت- دەڵێ: لەڕۆژی جەنگی بەدردا لەڕیز وەستابووم، تەماشای ئەولا و ئەملای خۆم دەکرد، دوو لاوی زۆر تەمەن منداڵ لە تەنیشتمەوە بوون، هەردووکیان لە ئەنسار بوون، لاوە کەم تەمەنەکان یەکێکیان بەگوێمدا چرپاندی وتی: مامە ئەبو جەهل دەناسیت؟

منیش وتم: بەڵێ، دەیناسم تۆ کارت بە ئەبو جەهل چییە، گەنجەکە وتی: بیستوومە لەشاری مەککە قسەی بە پێغەمبەری خوا ﷺ وتووە، سوێند بەوەی گیانی منی بەدەستە، ببینم لاشەم لە لاشەی جیا نابێتەوە تا یەکێکمان دەمرین، عەبدورەحمان -ڕەزامەندی خوای لەسەر بێت- دەڵێ: زۆر موعجیب بووم بەو گەنجە. لەپڕدا ئەوەی تر هەر لە تەنیشتییەوە چرپاندی بەگوێمدا وتی: مامە ئەبو جەهل دەناسیت؟ تەماشای ئەبو جەهلم کرد، یەک کەتیبە پاسەوانی لێ دەکرد، منیش وتم: ئەمە ئەو کەسەیە ئێوە بەشوێنیدا دەگەڕێن و پرسیاری بۆ دەکەن، کە نیشانمدان هەردووکیان شمشێرەکانیان دەرهێنا و ڕوو بە ئەبو جەهل ڕۆیشتن کوشتیان، بەپەلە گەڕانەوە لای پێغەمبەری خوا ﷺ (هەردووکیان وتیان: یا رسول الله ئەبو جەهلمان کوشت پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی کامتان کوشتان؟

هەردووکیان وەڵامیان دایەوە کە کوشتوویانە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: با شمشێرەکانتان ببینم ئەگەر خوێنەکەیتان نەسڕیبێتەوە، هەردووکیان وتیان: نەمانسڕیوەتەوە، کە پێغەمبەری خوا ﷺ بینی فەرمووی: هەردووکتان کارەکەتان ئەنجام داوە، بەهاوکاری یەکتر کوشتووتانە، یەکێکیان ناوی (موعازی کوڕی عەمری کوڕی جەمووح) ئەوی تریان ناوی (موعازی کوڕی عەفرائە) -ڕەزامەندی خوا لەسەر هەردووکیان بێت- پێغەمبەری خوا ﷺ دانی نا بە کوشتنی ئەبو جەهل لەلایەن هەردووکیانەوە، تەماشای ئەو بەرەکەتە گەورەیە بکە، دوو لاوی بچووک گەورەترین سوارچاکی عەرەب دەکوژن، ئەو دوو گەنجە سوێند دەخۆن بۆ کوشتنی ئەبو جەهل گەورەو سەرکردەی قورەیش چونکە ئەوان لەسەر مەنهەجی ئیسلام پەروەردە بوون، لەو کەسانە نین



کە قسە بە پێغەمبەر بووترێت ﷺ و بێدەنگ بن، بەکاری خۆیانی دەزانن. موعازی کوڕی عەمری کوڕی جەمووح خۆی دەگێڕێتەوە و دەڵێ: بیستبووم لەشاری مەککە ئەبو جەهل ئازاری پێغەمبەری خوای ﷺ داوە بۆیە لە سوپاکەم پرسی ئەبو جەهل کامەیە ئازاری پێغەمبەری ﷺ داوە؟ کە پیشانیان دام لە دارێک دەچوو کە خەڵکی زۆر بەدەوریدا کۆببوونەوە، پاسەوانیان دەکرد و هەموو دەیانوت: ئاگاتان لە ئەبولحەکەم بێت زەفەری پێ نەبەن، کە زانیم کامە خۆیەتی بۆی کشام تا خۆم گەیاندێ، شمشێرێکم کێشا بە قاچیدا و قاچیم پەڕاندو کەوت.[١٠٥]

ئەمەش بەرەکەتی خوایە هێزێکی وا دەبەخشێتە لاوێک قاچی گەورەترین سوارچاکی عەرەب بپەڕێنێت، یاخود چۆن توانی دەستی خۆی بگەیەنێتە ئەو کەسە، ئەگەر بەرەکەتی خوای گەورەی لەگەڵدا نەبێت، لەکاتێکدا سێ جۆر هەڵگری چەکی سەردەمی خۆی پاسەوانیان دەکرد، تیرو کەوان و ڕەمح و شمشێر لەدەوریدا ئاڵاون، لەوانەیە زۆر بەئاسانی پێیدا بکێشن، بەڵام خوای پەروەردگار ئەنجامەکەی گەورە کردووە بۆ ئەو لاوە.

هەموو پرۆسە و کارەکە جێگەی سەرنج و تێڕامانە، تەنها مرۆڤی ئیماندار دەتوانێت لەو کارانە تێبگات، ئەویش لەبەر ئەوەی خاوەنی ئیمانە.

سەربازێکی دیکەی خوای پەروەردگار بریتییە لە خەو بینین، ڕەحمەتێکی خوایە و مەسجێکی پێش وەختە بۆ ئیمانداران، ئیمانداران خەونیان دەبینی خوای گەورە وەکو مژدەدان مژدەی سەرکەوتنی پێدان، لەهەمان کاتدا موشریکەکان خەونیان دەبینی هەموو ئاماژە بوو بۆ شکست و لەناوچوونیان. خەو کاریگەری هەیە لەسەر دڵ ودەروونی مرۆڤەکان بەگشتی، بۆ مرۆڤی موسڵمان زۆر گرنگە مەعنەویات و ڕۆحی جەنگاوەری و هێزی پێ وەردەگرێت بە پێچەوانەوە کافرەکان زۆر کاریگەری خراپیان دەکەوێتە سەر ترس و بیم و دڵەڕاوکێ لایان دروست دەبێت. ئەمەش ڕەنگدانەوەی هەبوو لەهەموو مێژووی ئیسلامیدا لەسەر کافرو موسڵمان.

لە خەونی کەسێکی نزیکی پێغەمبەر ترسی ﷺ یەکێک کە موشریک و کافر بوو لە خەوندا ڕاپەڕی و لێ نیشتبوو، هەموو گیانی عارەق بوو ناوی (جوهەیمی کوڕی

---

١٠٥ ـ (قَالَ مُعَاذُ بْنُ عَمْرُو بْنُ ٱلْجَمُوْحْ أَخُو بَنِّي سَلَمَهْ : سُمِعَتْ ٱلْقَوْمَ وَأَبُو جَهْلٍ فِي مِثْلِ ٱلْحَرِجَةِ وَهُمْ يَقُولُونَ : أَبُو ٱلْحَكَمْ لَا يَخْلُصُ إِلَيْهِ . فَلَمَّا سُمْعَتهَا جَعَلَتْهُ مِنْ شَأْنِي فَصَمَدَتْ نَحْوَهُ ، فَلَمَّا أَمْكَنَنِي حَمَّلَتْ عَلَيْهِ فَضَرَبَتْهُ ضَرْبَةٌ أَطْنَتْ قَدَّمَهُ بِنِصْفِ سَاقِهِ ، فُو ٱللَّهِ مَا شَبَّهَتْهَا حِينَ طَاحَتْ إِلَّا بِالنَّوَاةِ تُطِيحُ مِنْ تَحْتِ مَرْضِخَةٍ ) ٱلسِّيرَةُ ٱلنَّبَوِيَّةُ لِابْنِ كَثِيرٍ ، ج ٢ ، ص ٤٤٠.



سەڵتی کوڕی موتەلیبە)، هاواری دەکرد ئەو سوارچاکەم بینی سێ جار ئەم قسەیەی دووبارە کردەوە، پاشان وتی: ئەو سوارچاکە (ئەبو جەهل و شەیبە و عوتبە و زەعمە و ئەبو بوختەری و ئومەییەی کوڕی خەلەف)ی کوشت لەگەڵ چەند گەورەیەکی دیکەی قوڕەیشدا، وتیان: جوهەیمی شێت بوو، لەوەڵامدا وتی: شێت نەبووم خەونم بینیوە، بەڵام باسی مەکەن با بڵاو نەبێتەوە.

بەڵام زۆری پێنەچوو خەونەکە لەشاری مەککەدا بڵاو بووەوە، گەیشتەوە لای ئەبو جەهل. ئەبو جەهل وتی: ئەمەیش هەر پێغەمبەرێکە لە نەوەی عەبدولموتەلیب، وەکو گاڵتە پێکردن وتی: سبەینێ دەبینی کێ کێ دەکوژێ، بەڵام گومانی تێدا نییە کە زۆر کاریگەری هەبوو لەسەر کافرەکان و ترسیان لێ نیشتبوو.

هەروەها (عاتیکەی کچی عەبدولموتەلیب) ئەویش پووری پێغەمبەری خوایە ﷺ، ڕاستی ئەوەیە موسڵمان نەبووە مردووە، پێش ئەوەی نوێنەرەکەی ئەبو سوفیان بگاتە مەکە بەسێ ڕۆژ کە هەواڵ بدات سوپای موسڵمانان لەسەر ڕێگەی کاروانی ئەبو سوفیانن واتە: پێش ئەوەی (زەمزەمی کوڕی عەمری غەفاری) بەسێ ڕۆژ بگات، ئەوەی هەواڵی بگاتە قوڕەیش کە عاتیکە خەونی بینی لە خەو ڕاپەڕی و ترسی لێ نیشتبوو، ناردی بەشوێن عەبباسی برایدا و خەونەکەی بۆ گێڕایەوە و وتی: سوێند بەخوا براکەم ئەمشەو خەونێکم دیووە زۆر ترساوم، دەترسم هۆزەکەمان تووشی نارەحەتی و ناهەمووارییەکی زۆر بێت. موسیبەتێکی زۆر گەورە ڕووی تێکردووین، بەڵام خەونەکەم بۆ کەس مەگێڕەوە من بۆتۆی دەگێڕمەوە، عەبباس -ڕەزامەندی خوای لەسەر بێت- فەرمووی: بۆم باس بکە چیت دیووە؟

عاتیکە وتی: لە خەومدا سوارێک بەسواری وشتر وەستا لەسەر ناوچەی ئەبتەح، بەدەنگی بەرز هاواری دەکرد ئەی شاری مەککە، ئەی خەڵکی شاری مەککە ئەوە دەرناچن بۆ مردن، دوای سێ ڕۆژ لە خەونەکەمدا خەڵکی لێ کۆبوویەوە و خۆی کرد بە مزگەوتی حەرامدا خەڵکی شوێنی کەوتبوون، پاشان وەکو ئەوەی بە وشترێکەوە چووە سەر کەعبە، وەکو یەکەمجار هاواری کرد خەڵکی مەکە دەرچن بۆ مردن و لەناو چوونتان، دوای سێ ڕۆژی تر پاشان بە وشترەکەی چووە سەر کێوی ئەبو قوبیەیش، بۆ جاری سێیەم هاواری کردەوە هەمان قسەی دووبارە کردەوە، پاشان بەردێکی هەڵگرت و فڕێیدایە خواری شاخەکە و بەرەو شاری مەککە غلۆر بوویەوە تاکو زەمین لەرزە دەستی پێکرد، هیچ ماڵێک نەما لەشاری مەککە شەقی تێنەکات، درزی تێنەچێت.



عەبباس وتی: سوێند بەخوا ئەم ڕوئیا و خەونە دێتە دی، لای کەس باسی مەکە و بیپۆشە. پاشان عەبباس لەماڵی عاتیکە چووە دەرەوە لە ڕێگەدا وەلیدی کوڕی عوتبەی بینی، هەردووکیان بەیەکەوە ڕەفیق بوون، خۆی پێنەگیراو خەونەکەی بۆ وەلید گێڕایەوە، وتی: لای کەس باسی مەکە.

پاشان وەلید چووە لای باوکی و بۆی باس کرد، بەهەرحاڵ خەونەکە لەتەواوی شاری مەککە بڵاو بوویەوە، پاشان عەبباس دەڵێ: چووم بەدەوری کەعبەدا تەوافم کرد، ئەبو جەهل لەگەڵ کۆمەڵێک لە پیاوانی قوڕەیش دانیشتبوون قسە و باسیان دەکرد، ڕێک باسی خەونەکەی عاتیکەیان دەکرد!

کاتێک ئەبو جەهل منی بینی وتی: ئەی ئەبو فەزڵ ئەگەر لەتەواف تەواو بوویت وەرە لامان دابنیشە، کارم پێتە، عەبباس نازناوی ئەبو فەزڵ-ە، دەڵێ: تەواو بووم چوومە لایان دانیشتم، پاشان ئەبو جەهل وتی: ئەی هۆزی عەبدولموتەڵیب ئەو پێغەمبەرایەتییە لە کەیەوە لەناوتاندا دەستی پێکردووە؟

عەبباس : باسی چی دەکەیت؟ عەبباس ویستی خۆی هەڵە بکات لە قسەکەی.

ئەبو جەهل: خەونەکەی عاتیکەی خوشکت کە بینیویەتی.

عەبباس : جا چی دیوە؟

ئەبو جەهل: (بەگاڵتەپێکردنەوە) ئەی هۆزی عەبدولموتەڵیب باشە وتمان: پیاوان لە ئێوە دەبێت بە پێغەمبەر، وا ئێستا ئافرەتەکانیشتان داوای پێغەمبەرایەتی و بانگەشەی پێغەمبەر بوون دەکەن، ئیتر خەونەکەی وەکو خۆی گێڕایەوە بۆ ئەبو جەهل کە عاتیکە چی بینیوە.

لە کۆتاییدا ئەبو جەهل ویستی جنێو و تانە و تەشەر لە خۆی و لە بنەماڵەی پێغەمبەری خوا ﷺ بدات، وتی: ئێوە درۆزنترین هۆزی عەرەبن، ئەی نەوەکانی موتەڵیب. عەبباس وەڵامی نەدایەوە، چونکە ئەبو جەهل لە بەنی مەخزوم بوو حەزی بەوە دەکرد پێغەمبەر لەوان بێت، نەک لە نەوەکانی عەبدولموتەڵیب، بەهەرحاڵ سێ ڕۆژ بەسەر خەونەکەدا تێپەڕی (زەمزەمی کوڕی عەمری غەفاری) لەشاری مەککە هاواری کرد و وتی: فریای کاروانەکەتان بکەون موحەممەد بۆی دەرچوو.[١٠٦]

١٠٦ ـ (وَقَدْ رَأَتْ عَاتِكَةُ بِنْتُ عَبْدِ الْمُطَّلِبِ، قَبْلَ قُدُومِ ضَمْضَمٍ مَكَّةَ بِثَلَاثِ لَيَالٍ، رُؤْيَا أَفْزَعَتْهَا. فَبَعَثَتْ إلَى أَخِيهَا الْعَبَّاسِ بْنِ عَبْدِ الْمُطَّلِبِ فَقَالَتْ لَهُ: يَا أَخِي، وَاَللَّهِ لَقَدْ رَأَيْتُ اللَّيْلَةَ رُؤْيَا أَفْزَعَتْنِي، وَتَخَوَّفْتُ أَنْ يَدْخُلَ عَلَى قَوْمِكَ مِنْهَا شَرٌّ وَمُصِيبَةٌ، فَاكْتُمْ عَنِّي مَا أُحَدِّثُكَ بِهِ، فَقَالَ لَهَا: وَمَا رَأَيْتِ ؟ قَالَتْ: رَأَيْتُ رَاكِبًا أَقْبَلَ عَلَى بَعِيرٍ



ئەم جۆرە خەونانە لەنێو پاشاکانی تری دونیادا ڕوویداوە لە کیسرا و قەیسەر و ڕۆستەم، کە موسڵمانان سەردەکەون لەخاکی فارس-دا، هەروەها خەونی هەرقل لەدەرچوونی سوپاکەی لە شام و جارێکی تر نابینێتەوە.

لەلایەن موسڵمانانەوە خەونی خۆش و موژدەی سەرکەوتیان پێ دەدرا و پێغەمبەری خوا صَلَّىٰ اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ خەونی بینی و خوای گەورە دەفەرمووێت:

﴿إِذْ يُرِيكَهُمُ ٱللَّهُ فِي مَنَامِكَ قَلِيلًاۖ وَلَوْ أَرَىٰكَهُمْ كَثِيرًا لَّفَشِلْتُمْ وَلَتَنَٰزَعْتُمْ فِي ٱلْأَمْرِ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ سَلَّمَۚ إِنَّهُۥ عَلِيمٌۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ﴾ [الأنفال]

واتە: ئەو کاتە خوا (دوژمنانی) لەخەوتا بەکەم نیشان دایت، خۆ ئەگەر ئەوانی بە زۆر نیشان بدایتایە سەرکەوتوو نەدەبوون، تووشی نەهامەتی و کێشە دەبوون، بەڵام خوا بەسەلامەتی و سەرکەتوویی لەو غەزایەدا دەربازی کردن چونکە بەڕاستی ئەو زاتە زانایە بەهەرچی لەناو دڵ و دەروون و سینەکاندا حەشاردراوە.

خەونەکە هەمووی موژدە و نیشانەی سەرکەوتن بوو.

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

لَهُ، حَتَّى وَقَفَ بِالْأَبْطَحِ، ثُمَّ صَرَخَ بِأَعْلَى صَوْتِهِ: أَلَا انْفِرُوا يَا لَغُدُرَ لِمَصَارِعِكُمْ فِي ثَلَاثٍ، فَأَرَى النَّاسَ اجْتَمَعُوا إلَيْهِ، الجزء الأول ثُمَّ دَخَلَ الْمَسْجِدَ وَالنَّاسُ يَتْبَعُونَهُ، فَبَيْنَمَا هُمْ حَوْلَهُ مَثَلَ بِهِ بَعِيرُهُ عَلَى ظَهْرِ الْكَعْبَةِ، ثُمَّ صَرَخَ بِمِثْلِهَا: أَلَا انْفِرُوا يَا لَغُدُرَ لِمَصَارِعِكُمْ فِي ثَلَاثٍ: ثُمَّ مَثَلَ بِهِ بَعِيرُهُ عَلَى رَأْسِ أَبِي قُبَيْسٍ، فَصَرَخَ بِمِثْلِهَا. ثُمَّ أَخَذَ صَخْرَةً فَأَرْسَلَهَا. فَأَقْبَلَتْ تَهْوِي، حَتَّى إذَا كَانَتْ بِأَسْفَلِ الْجَبَلِ ارْفَضَّتْ، فَمَا بَقِيَ بَيْتٌ مِنْ بُيُوتِ مَكَّةَ وَلَا دَارٌ إلَّا دَخَلَتْهَا مِنْهَا فِلْقَةٌ، قَالَ الْعَبَّاسُ: وَاَللَّهِ إنَّ هَذِهِ لَرُؤْيَا، وَأَنْتِ فَاكْتُمِيهَا، وَلَا تَذْكُرِيهَا لِأَحَدِ.

ثُمَّ خَرَجَ الْعَبَّاسُ، فَلَقِيَ الْوَلِيدَ بْنَ عُتْبَةَ بْنِ رَبِيعَةَ، وَكَانَ لَهُ صَدِيقًا، فَذَكَرَهَا لَهُ، وَاسْتَكْتَمَهُ إيَّاهَا. فَذَكَرَهَا الْوَلِيدُ لِأَبِيهِ عُتْبَةَ، فَفَشَا الْحَدِيثُ بِمَكَّةَ، حَتَّى تَحَدَّثَتْ بِهِ قُرَيْشٌ فِي أَنْدِيَتِهَا.

مَا جَرَى بَيْنَ أَبِي جَهْلٍ وَالْعَبَّاسِ بِسَبَبِ الرُّؤْيَا مَا جَرَى بَيْنَ أَبِي جَهْلٍ وَالْعَبَّاسِ بِسَبَبِ الرُّؤْيَا قَالَ الْعَبَّاسُ: فَغَدَوْتُ لِأَطُوفَ بِالْبَيْتِ وَأَبُو جَهْلِ بْنُ هِشَامٍ فِي رَهْطٍ مِنْ قُرَيْشٍ قُعُودٌ يَتَحَدَّثُونَ بِرُؤْيَا عَاتِكَةَ، فَلَمَّا رَآنِي أَبُو جَهْلٍ قَالَ: يَا أَبَا الْفَضْلِ إذَا فَرَغْتَ مِنْ طَوَافِكَ فَأَقْبِلْ إلَيْنَا، فَلَمَّا فَرَغْتُ أَقْبَلْتُ حَتَّى جَلَسْتُ مَعَهُمْ، فَقَالَ لِي أَبُو جَهْلٍ: يَا بَنِي عَبْدِ الْمُطَّلِبِ، مَتَى حَدَثَتْ فِيكُمْ هَذِهِ النَّبِيَّةُ ؟ قَالَ: قُلْتُ: وَمَا ذَاكَ ؟ قَالَ: تِلْكَ الرُّؤْيَا الَّتِي رَأَتْ عَاتِكَةُ؛ قَالَ: فَقُلْتُ: وَمَا رَأَتْ ؟ قَالَ: يَا بَنِي عَبْدِ الْمُطَّلِبِ، أَمَا رَضِيتُمْ أَنْ يَتَنَبَّأَ رِجَالُكُمْ حَتَّى تَتَنَبَّأَ نِسَاؤُكُمْ، قَدْ زَعَمَتْ عَاتِكَةُ فِي رُؤْيَاهَا أَنَّهُ قَالَ: انْفِرُوا فِي ثَلَاثٍ، فَسَنَتَرَبَّصُ بِكُمْ هَذِهِ الثَّلَاثَ، فَإِنْ يَكُ حَقًّا مَا تَقُولُ فَسَيَكُونُ، وَإِنْ تَمْضِ الثَّلَاثُ وَلَمْ يَكُنْ مِنْ ذَلِكَ شَيْءٌ، نَكْتُبْ الجزء الأول عَلَيْكُمْ كِتَابًا أَنَّكُمْ أَكْذَبُ أَهْلِ بَيْتٍ فِي الْعَرَبِ.

وَإِذَا هُوَ قَدْ سَمِعَ مَا لَمْ أَسْمَعْ صَوْتَ ضَمْضَمِ بْنِ عَمْرٍو الْغِفَارِيِّ، وَهُوَ يَصْرُخُ بِبَطْنِ الْوَادِي وَاقِفًا عَلَى بَعِيرِهِ، قَدْ جَدَّعَ بَعِيرَهُ، وَحَوَّلَ رَحْلَهُ، وَشَقَّ قَمِيصَهُ، وَهُوَ يَقُولُ: يَا مَعْشَرَ قُرَيْشٍ، اللَّطِيمَةَ اللَّطِيمَةَ، أَمْوَالُكُمْ مَعَ أَبِي سُفْيَانَ قَدْ عَرَضَ لَهَا مُحَمَّدٌ فِي أَصْحَابِهِ، لَا أَرَى أَنْ تُدْرِكُوهَا، الْغَوْثَ الْغَوْثَ. قَالَ: فَشَغَلَنِي عَنْهُ وَشَغَلَهُ عَنِّي مَا جَاءَ مِنْ الْأَمْرِ. جَهْزُ قُرَيْشٍ لِلْخُرُوجِ تَجَهُّزُ قُرَيْشٍ لِلْخُرُوجِ) سيرة إبن هشام، ج٢، ص ٢٩٥.



لە کۆتاییدا هەروەکو فیرعەون کە مووسا لەدەریاوە پەڕیەوە فیرعەون خۆی و جوندییەکانی بەناو دەریادا برد تا هەموو لە دەریادا خنکان، بەهەمان شێوە ئەبو جەهل کاروانەکەی پاراست بەڵام ئەبو جەهل هەموو سەربازەکانی خۆی بەکوشتدا و بەسەرشۆڕی سوپای شکست خواردوو گەڕایەوە خۆشی وەکو فیرعەون لەناوچوو.

ئەمەش شیکاری من بوو لەسەر واقیعی سەرکەوتنی جەنگی بەدر و هۆکارەکانی، جا نازانم بەدڵتە یان زیاد و کەمی دەکەیت؟!

نومێر: نەک بەدڵمە، بەڵکو کەلێنت لێ بڕیووە، ئەوەی تۆ باست کرد ئەوە شیکاری سیاسی ئیمانی سەربازی بوو.

ماکوان: یەکجار واش نییە، تۆ پێم بڵێ ئەی کاریگەری ئەم جەنگە چی بوو یاخود ئەم سەرکەوتنە چی بوو لەنێو شاری مەدینە چوار دەورو عەرەب بەگشتی؟

نومێر: سوپاکە دەگەڕێتەوە بۆ مەدینە با ئێمەش شوێنیان بکەوین، لەوێ زۆر گۆڕانکاری ڕوودەدات ڕەوشێکی نوێ دێتە پێشەوە گرووپێکی زۆر ترسناک دژی موسڵمانان زیاد دەبێت.

## کاریگەری جەنگی بەدر

نومێر: جەنگی بەدر لەگەڵ ئەوەی لە جێگەیەکی زۆر بچووک ڕوویدا، سوپاکەی هەردوولا بە پێوەری ئەو سەردەمە سوپایەکی زۆر بچووک بوون، بەڵام ئەتوانیت بە گەورەترین جەنگ و غەزوەی دابنێین لە مێژووی ئیسلام و موسڵماناندا، خوای پەروەردگار ناوی ناوە جیاکەرەوەی حەق و باتڵ (الفرقان)، هەروەها جیاکەرەوەی دوو قۆناغەکە دەتوانین بڵێین لە بانگەوازی ئیسلامییەوە چووە قۆناغی ئوممەتی ئیسلامی، شارستانییەت و ژیارو دەوڵەت و سەروەری.

دەبێت بەو چاوە تەماشا بکەین بزانین حاڵ وگوزەرانی موسڵمانان چۆن بووە پێش بەدر و دوای بەدر چۆنە؟

بەدڵنیاییەوە جیاوازییەکی یەکجار زۆر فراوان هەیە لەو نێوەندەدا، جەنگی بەدر تەنها کاریگەری نەبوو لەسەر شاری مەککە و مەدینە و ناوچەی عەرەبی، بەڵکو کاریگەری لەسەر هەموو جیهاندا دانا و لەو سەردەمەدا تا ڕۆژی قیامەت.

ماکوان: ئەم قسەیەم زۆر لەلا گرنگە، دەفەرمووێت: قۆناغی بانگەواز گوازرایەوە بۆ قۆناغی ئوممەت زۆر جوانە ئەم وتەیە، چونکە کە دەڵێیت ئوممەت خەڵکی زۆر کەم لەو



وشە تێدەگات نازانێت وشەی ئوممەت داینەمۆی گۆڕانکاریە و مانای (خەڵک و خاک و مەنهەجە) ئەم سێ پێکهاتەیە بەزمانی ئەمڕۆ ئایدۆلۆژیا هەر ئەم سێ پێکهاتەیە دەبێتە گۆڕانکاری، کەواتە: کە دەڵێین: قۆناغی ئوممەت واتە: گۆڕانکاری بنەڕەتی، بە خەڵک و خاک و مەنهەج، جا خەڵک لەسەر بنەمای مەنهەجێک کۆ دەبنەوە و وەحدەتی فیکر و بیروباوەڕیان بۆ دروست دەبێ، لەسەر خاکێک تا ژیارو شارستانی و ژیان و دەوڵەت دامەزرێنێت، بۆیە لێرەدا لام گرنگە قۆناغی بانگەواز و گوازراوە بۆ قۆناغی ئوممەت لەنێو ئەم ئوممەتەدا بانگەواز دەست پێدەکاتەوە.

جا بۆیە دەڵێم: ئەگەر دەکرێت خاڵبەندی بۆ بکەین بزانین بەچەند خاڵ لەم باسەی کاریگەری جەنگی بەدر دەردەچین.

نومێر: زۆرباشە قسەکە جێگەی خۆیەتی واتە: دەڵێت کاریگەری جەنگی بەدر پێکهاتووە لە چەند خاڵ و میحوەرێک کە بووە هۆکاری گۆڕانکاری لە سەردەمی پێغەمبەرەوە تا ئەمڕۆ و تا ڕۆژی قیامەت ئەویش بریتییە؟

خاڵی یەکەم: لەدایک بوونی ئوممەت و دەوڵەتی ئیسلامی و سەروەریەکانی. ئەم کاریگەرییە زۆر گەورە بوو دامەزراندنی دەوڵەت و ئوممەت بەسەرکردایەتی پێغەمبەری خوا ﷺ لەسەر شانی سوپای بەدر، هاوەڵان پێگەیشتن هۆکاری سوپای سەرکەوتوو کامانەن، لێکۆڵینەوەیان لەسەر کرد لەبواری مەیدانی و تێگەیشتن یەک خاڵ لەو سیفاتانە فەرامۆش بکەن سەرکەوتن نایەت پێچەوانەی ڕووئەدات کە شکستە.

پاشان بووە پێوەرو شایەت بۆ سوپای موسڵمانان بەگشتی لەهەموو سەردەم و زەمانێکدا ئەگەر سیفاتەکان پەیدا دەکەیت حاڵیان وەکو هاوەڵانی بەدر دەبێت و فەزڵ و منەتی خوای گەورەیە بەسەر موسڵمانانەوە بۆ ئەم سیفاتانە کە زانیمان.

لەدوای ئەم جەنگە هەموو نیوەدوورگەی عەرەبی تا ڕادەیەک وڵاتانی دراوسێ دەیانەوێ لە هەواڵی موسڵمانان بزانن هەموو لە دەوڵەتی ئیسلامی و موسڵمانان و ئیسلامیان دەپرسی، کێن و چین و داوای چی دەکەن، پێشتر خەڵکی وایان دەزانی جەنگی ناوخۆ هەیە لەشاری مەککەدا لەنێوان عەشیرەتەکان، بەڵام ئێستا ڕەوشەکە گۆڕاوە هەموو لە ئیسلام دەپرسن، گومانی تێدا نییە ئەمەش دەبێتە هۆکاری کردنەوەی دڵەکان و هیدایەت وەرگرتنی خەڵکێکی زۆر بەو هۆکارە کاریگەری ئیسلامیان زانی و بوونە موسڵمان، کاریگەرییە گەورەکە وا ڕەنگیدایەوە ئێستا لەنێو نیوەدوورگەی عەرەبی دەوڵەتی ئیسلامی و ئوممەتەکەی ناسراون خاوەنی سەروەری و ڕێز و ئیحتیرام و هەیبەتن.



خاڵی دووەم: کاریگەری لەسەر خەڵکی شاری مەدینە بەگشتی و موسڵمانەکانی بە تایبەتی کە هەواڵی سەرکەوتنی موسڵمانان گەیشتە شاری مەدینە، خەڵکی زۆر خۆشحاڵ بوون هەست و سۆزو شادی بە سەرکەوتنەکەی پێغەمبەر صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰٓ آلِهِۦ وَسَلَّمَ پێیانەوە دیار بوو، ئەوەی کە بەشدار نەبوو زۆر پەشیمان بوو کە لەم سەرکەوتنە گەورەدا بەشدار نەبووە، خەڵکی شاری مەدینە لەدەوری موژدەدەرەکەی پێغەمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰٓ آلِهِۦ وَسَلَّمَ کە ناردیەوە کۆبوونەوە، ئەویش (زەیدی کوڕی حارس) بوو، هەواڵی سەلامەتی پێغەمبەر صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰٓ آلِهِۦ وَسَلَّمَ و سوپای سەرکەوتووی دایە خەڵکەکە، پێغەمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰٓ آلِهِۦ وَسَلَّمَ سێ شەو و سێ ڕۆژ وەکو کەلتووری ئەو سەردەمە لە خاکی بەدردا مایەوە، چونکە سوپای سەرکەوتوو دەبوو ئەو ماوەیە لە جێگەی جەنگەکەیدا بمێنێتەوە، ئەوەش مانای ئەوەیە کە سوپاکە ترسنۆک نییە، بەتەواوەتی سەرکەوتنی بەدەست هێناوە.

دوای سێ ڕۆژ پێغەمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰٓ آلِهِۦ وَسَلَّمَ گەڕایەوە شاری مەدینە و خەڵکی پێشوازی گەرمیان کرد لە پێغەمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰٓ آلِهِۦ وَسَلَّمَ و سوپاکەی، زۆرێک لە خەڵکی داوای لێبووردنیان لە پێغەمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰٓ آلِهِۦ وَسَلَّمَ کرد کە پەییان نەبردووە شەڕ ڕوودەدات، بەڵکو وایان زانیووە تەنها بۆ ڕێگە گرتن لە قافڵەکە دەرچوون، ڕاستگۆبوون لەگەڵ پێغەمبەر صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰٓ آلِهِۦ وَسَلَّمَ و خۆشیاندا، چونکە بەتەمای جەنگ نەبوون، لەنێو ئەوانەدا کە پێی وانەبوو جەنگ ڕوودەدات (ئوسەیدی کوڕی حەزیر) بوو هاتە خزمەتی پێغەمبەر صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰٓ آلِهِۦ وَسَلَّمَ و فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰٓ آلِهِۦ وَسَلَّمَ سوپاس بۆ خوا کە سەرکەوتووین، خوای گەورە دڵ و چاوی بەم سەرکەوتنە شادی و خۆشی پێ بەخشین، سوێند بەخوا ئەی پێغەمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰٓ آلِهِۦ وَسَلَّمَ نەمزانی جەنگ ڕوودەدا، دەنا حەتمەن لەگەڵ جەنابت دەردەچووم، دژی دوژمنەکانمان دەبوومەوە، لەبەدردا، تەنها وا پەیم برد کە بۆ کاروانەکە دەرچوونە. پێغەمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰٓ آلِهِۦ وَسَلَّمَ فەرمووی: ڕاست دەکەیت.

ئەم سەرکەوتنە کاریگەری وای خستە دڵی ئەنسار و موهاجیرەکان کە بەشدار نەبووبوون، خۆزگەیان دەخواست کە بەشدار بوونایە، ڕۆحی جیهاد و قیتال لەنێوانیاندا بڵێسەی سەندبوو، ئاواتە خوازی جەنگێکی تر بوون لەگەڵ دوژمنەکانیاندا، کاریگەرییەکی زۆر باش و ئەرێنی لەسەر موسڵمان دروست کرد.

خاڵی سێیەم: کاریگەری خراپ و نەرێنی زۆری دروستکرد لەسەر موشریکەکانی شاری مەککە کە هەواڵەکەیان بیست ئازاری گەیاندە دڵی هەموویان بووە باسوخواسی ناو خەڵکی و تەنانەت هەندێک هەر بڕوای نەدەکرد.



کەرامەت و عیزەتی قوڕەیش کەوتە نێو خاک و قووڕاو، بەتەواوەتی هەیبەتی نەما لەکاتێکدا قوڕەیش هەموو عەرەب لێی دەترسا، هەموو هۆزەکانی عەرەب ڕێزیان لە قوڕەیش دەگرت، بەڵام لەدوای بەدر کەرامەتیان ڕووشا و بەو چاوەی جاران تەماشا نەدەکران، (٧٠) کەسیان لێ کوژرا و (٧٠) کەسیشیان لێ بەدیل گیرا، جگە لە سەدەها بریندارو بەرکەوتەی جەنگ، ئەوەشی کە کوژراوە هەمووی قیاداتی گەورەی قوڕەیشن، فیرعەون و تاغووتەکانن، لەوانە ئەبو جەهل لەعنەتی خوای لێبێت، وەلیدی کوڕی موغیرە، عوتبەی کوڕی ڕەبیعە، شەیبەی برای و وەلیدی کوڕی، نەزری کوڕی حارس، عوقبەی کوڕی ئەبی موعیت، ئومەییەی کوڕی خەلەف و زۆری تر لە قیاداتیان کە هەواڵ گەیشتە شاری مەککە بڕوایان نەدەکرد.

کاتێک هەواڵەکە لە ڕێگەی (حەسیمانی کوڕی عەبدوڵڵای خوزاعی) گەیشتەوە شاری مەکە لێیان پرسی هەواڵ چییە؟

ئەویش وتی: ئەبو جەهل، عوتبە، شەیبە، وەلید، ئەمە و ناوی هەموو قیاداتی قوڕەیش کە کوژراون وت کاتێک لە قسەکانی تەواو بوو (سەفوانی کوڕی ئومەییەی کوڕی خەلەف) وتی: سوێند بەخوا ئەو قسەیە ڕاست نییە و ناچێتە عەقڵەوە، کردی بە گاڵتەو وتی: من نەچووم بۆ جەنگ بزانە ناڵێت سەفوانیش کوژراوە!

کە وای وت: حەسیمان توڕەبوو وتی: ئەوە سەفوانە دانیشتووە و قسە دەکات، بەڵام سوێند بەخوا باوک و براکەیم بینی کە چۆن کوژران.

هەواڵەکە وەکو زەمینلەرزە وابوو بۆیان، وەکو هەورە برووسکە لێیدان و هەموویان تووشی شۆک بوون، وتیان: پەلە مەکەن با کەسێکی تر بێجگە حەسیمان بێت لەو دەپرسین.

چاوەڕوانی هەواڵهێنەرێکی دیکەیان دەکرد، بۆ ئەوەی هەواڵی ڕاست و دروست و یەقینیان پێ بگات، بڕوایان نەدەکرد لە ڕۆژێکدا ئەو هەموو سوارچاکەی کوفر بکوژرێت، پاشان ئامۆزایەکی پێغەمبەری خوا ﷺ کە لە جەنگەکەدا بەشدار بوو، ناوی (ئەبو سوفیانی کوڕی حارس) بوو برای (عوبەیدوڵڵای کوڕی حارس) ئەوەی یەکەم جار بینی، (ئەبو لەهەب) بوو وتی: وەرە بزانم چیت پێیە لە هەواڵ چی ڕوویداوە، کەسەکەم؟! (چونکە ئەبو لەهەب ترسنۆک بوو دەرنەچوو بۆ جەنگی بەدر) (ئەبو سوفیانی کوڕی حارسی کوڕی عەبدولموتەڵیب) وتی: دوای ئەوەی کە ڕووبەڕووی سوپای ئامۆزای من و برازاکەی تۆ بووینەوە هیچمان پێنەکرا، پشتمان تێکردن ئەوانیش بە ئارەزووی خۆیان دەیانکوشتین و ئەسیریان دەکردین. ئێمەش هیچ توانامان نەبوو پاشان ڕستەیەکی زۆر سەرسوڕهێنەری وت کە گوایە لۆمەی هیچکام لە سوپای کافران ناکات، لەبەر ئەوەی خەڵکێک لە جەنگەکەدا



دەجەنگین هەموو سپی بوون، ئەسپەکانیان جوانترین ڕەنگی مارۆنی بوون، ئەو خەڵکە سپییەی کە دەجەنگین لە ئاسمان و زەوییەوە بۆیان دەردەچوون، هیچ شتێک لەبەردەمیان خۆی نەدەگرت!

ئەبو سوفیان بەو شێوە ڕاشکاوە بۆی باس کردن، کەچی ئیمانیان نەهێنا و گوێیان بۆ نەگرت، تا لەنێو مەجلیسەکەدا کەسێکی تێدا بوو موسڵمان بوو، بەڵام خۆی ئاشکرا نەکردبوو، ناوی (ئەبو ڕافیع) بوو خزمەتکاری عەبباسی مامی پێغەمبەر ﷺ بوو.

عەبباسیش بە دیل گیرابوو لە دەستی موسڵماناندا بوو، ئەو هاواری کرد سوێند بەخوا ئەوانە فریشتە بوون، دووجار بەدەنگی بەرز دووبارەی کردەوە. ئەبو ڕافیع خۆی دەڵێت: ئەبو لەهەب دەستی بەرزکردەوەو کێشای بە دەموچاومدا تا پڕیکرد لە خوێن بەردەوام بوو لە پێداکێشانم، منیش کەسێکی لاواز بووم لە زەویدا کەوتم، ئەو هەر لێیدەدام تا دایکی فەزڵ هات واتە: خێزانی عەبباسی کوڕی عەبدولموتەلیب، ئەویش هەر موسڵمان بووبوو، بەڵام خۆی ئاشکرا نەکردبوو، کە بینی لێم دەدا گۆچانێکی درێژی هەڵگرت، کێشای بەسەری ئەبو لەهەب، سەری پڕکرد لە خوێن و پاڵی نا بە ئەبو لەهەبەوە و وتی: ئەوە لەبەر ئەوەی خاوەنەکەی لێرە نییە ئاوا لێی دەدەی؟

جا ئەبو لەهەب پیاوێکی زۆر ترسنۆک بوو، هیچی نەوت زەلیل کەوت، دوای حەوت ڕۆژ لەو ڕووداوە ژیا و ئەو گۆچانەی کە دایکی فەزڵ کێشای بەسەریدا تووشی نەخۆشی (عەدەسە) یاخود (قوڕحە)ی کرد کە جۆرێکە لە خێزانی نەخۆشی تاعوون، کەسوکار و کوڕەکانی چاڵێکیان بۆ هەڵکەندو دوای سێ ڕۆژ لە حەوت ڕۆژەکە بەدارێکەوە بەستیانەوە تاوەکو مرد و خستیانە نێو چاڵەکە.

هەموو قوڕەیش لۆمەی کوڕەکانیان دەکرد کە بۆچی بەو شێوەیە فڕێیان داوەتە دەرەوە، لەماڵەوە لەسەر جێگە نەمردووە، لە وەڵامدا وتیان: ئێمەیش تووش دەبووین؟

پاشان خەڵکی وتیان: باوکتان بشۆن لەو چاڵە دەری بهێننەوە نەیانکرد، بە چەند کۆیلەیەک بردیان بۆ شاخێکی بەرز لەوێ چاڵێکی دیکەیان بۆ هەڵکەندو بەبەردو خۆڵ پڕیان کردەوە، ئەوەیش کۆتایی ئەبو لەهەب بوو، ژنەکەشی چوو بۆ دار کۆکردنەوە ئەو دارەی بە شان هەڵیدەگرت لە ملی ئاڵاو خنکاندی!



﴿تَبَّتْ يَدَآ أَبِي لَهَبٍ وَتَبَّ ۝ مَآ أَغْنَىٰ عَنْهُ مَالُهُۥ وَمَا كَسَبَ ۝ سَيَصْلَىٰ نَارًا ذَاتَ لَهَبٍ ۝ وَٱمْرَأَتُهُۥ حَمَّالَةَ ٱلْحَطَبِ ۝ فِي جِيدِهَا حَبْلٌ مِّن مَّسَدٍ ۝﴾ [المسد].

ئیتر کێشەی زۆر لەسەر موشریکەکانی مەککە کەڵەکە بوو، کێشە لەدوای کێشە ڕووبەڕووی ئەو کۆمەڵگەیە دەبوویەوە لەوانە:

یەکەم: کێشەی سیاسی: قوڕەیش هەموو غیرەت و کەرامەت و ڕێزی خۆی لەدەستدا، لەنێو هەموو عەرەبەکانداو لەناوچەکەدا بەگشتی.

دووەم: کێشەی کۆمەڵایەتی: ماڵ نەما لەنێو قوڕەیشدا بریندار و کوژراوی یەک یان دووانی نەبێت.

سێیەم: کێشەی ئابووری: گەورەترین کێشەی قوڕەیش بوو، هەموو پشت و پەنای ئابووری قوڕەیش بازرگانی بوو، لەنێوان شام و یەمەندا، بەهاوین و زستان دەبوو دوو کاروانی گەورە بەشامدا بڕۆن، دەوڵەتی بەهێزی پێغەمبەری خوا ﷺ کۆنترۆڵی هەموو ناوچەکانی شامی کردبوو، لە هاتن و چووندا ڕێگری تەواوی کردبوو لە چوونی بازرگانی قوڕەیش بۆ شام، هەموو بازرگانی شام لەدەست بازرگانی مەککە دەرچوو. ئەمەش کاریگەری خۆی دەبێت لەسەر بازرگانییەکەی، چونکە قوڕەیش زنجیرەی پەیوەندیداری بازرگانی بوو لە یەمەنەوە بۆ شام کەرەستەی دەبرد، بە پێچەوانەشەوە لە شامەوە کەرەستەی بۆ یەمەن دەبرد کە ڕێگەیەک لە شام دابخرێت بەدڵنیاییەوە ڕێگەی یەمەن هیچ ئەرزشی نامێنێ بۆ قوڕەیش، بازرگانییەکە بەتەواوی وەستا و بێجگە لەوەی کە لە مەحرەز و سریەی (نەخلە) کاروانێکی گەورەی قوڕەیش دەستی بەسەردا گیرا، ڕاستە کاروانەکەی ئەبو سوفیانی کوڕی حەرب دەرچوو، بەڵام ڕێگەی چوونیان بۆ شام لێ بەسترا.

ئەمەش بارو گوزەرەکانی شاری مەککە بوو لەدوای جەنگی بەدر، بەدڵنیاییەوە خەڵکی شاری مەککەش هەروا بێدەنگ نابن لەدوای ئەو هەموو کوشتار و زەرەرو زیانەی لێیان کەوتووە.

خاڵی چوارەم: کاریگەری ئەنفال و خۆشویستنی دونیا و ڕەوشتی هاوەڵانی تێکدا، هۆکاری دەستکەوت و ئەنفال و غەنیمەت هاوەڵان دونیا چووە دڵیانەوە، خەریک بوو جەنگی ناوخۆ



دروست بێ. ئەم ڕەوشە هاوەڵی بەڕێز عوبادەی کوڕی سامت -ڕەزامەندی خوای لەسەر بێت- بۆمان باس دەکات دەڵێ: کە دەستکەوت و ئەنفال هات ئەخلاقی هەمووومانی تێکدا.[١٠٧]

لەکاتێکدا خۆی باسی سیفاتی سوپای سەرکەوتوو دەکات کە خاوەن سیفاتی جوان و گەورەن، بەڵام دەڵێ: کە ئەنفال هات ئەخلاقمان تێکچوو.

ئینجا با بزانین چیرۆکی ئەنفال چییە؟

لەدوای کۆتایی هاتنی جەولەی یەکەم لە جەنگ و غەزوەی بەدر، سەرەتای دەرکەوتنی سەرکەوتنێکی زۆر بەهێز بوو بۆ موسڵمانان. موشریکەکان وردە وردە لە مەیدانی جەنگدا هەڵدەهاتن، هەرچی شتومەک و کەلوپول و خواردن هەبوو لەدوایاندا بەجێما، بەهەموو ئەو شتانە دەوترێت: ئەنفال.

واتە: دەستکەوتنی جەنگ بۆ ئەم حاڵە پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ سوپاکەی کرد بەسێ بەشەوە، بەشی یەکەم مەفرەزەیەکی کەم بوو لەدەوری پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ کۆبوونەوە، لەوەی نەوەک یەکێک لە موشریکەکان لەپڕ زەرەر بە پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ بگەیەنێ و بیکوژێت.

بەشی دووەم زۆرینە بوون و شوێن سوپای هەڵهاتووی قوڕەیش کەوتن، بەشی سێیەم سەرقاڵی هەڵگرتنەوەی دەستکەوتەکان بوون، کە لەدوای سوپای شکستخواردووی قوڕەیش بەجێمابوو (ئەنفال) یاخود (غەنیمە) لەم بارەوە هیچ حوکمێکی خوایی دانەبەزیبوو، ئەوانەی کە کەرەستەکانیان کۆکردەوە لەگەڵ ئەوانی تردا ڕای جیاواز کەوتە نێوانیان، دەیانوت: تەنها ئێمە خاوەنی ئەو دەستکەوتانەین، ئەوانەش شوێن دوژمن کەوتبوون وتیان: ئێوە حەقی ئەوەتان نییە، بەڵکو هەموو بۆ ئێمەیە چونکە ئێمە شوێن سوپای قوڕەیش کەوتووین و ڕاومان ناون.

ئەوانەی پاسەوانی پێغەمبەر صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ بوون وتیان: ئێمەیش خاوەنین، چونکە لە دەوری پێغەمبەر صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ بووین، بۆ ئەوەی ئیغتیال نەکرێت، بەم شێوەیە لەنێو خۆیاندا بووە دەمەقاڵە و جۆرێک لە دەنگ بەرز کردنەوەو ڕاجیایی.

---

١٠٧ ـ (فَكَانَ عُبَادَةُ بْنُ الصَّامِتِ - فِيمَا بَلَغَنِي - إِذَا سُئِلَ عَنْ الْأَنْفَالِ، قَالَ: فِينَا مَعْشَرَ أَهْلِ بَدْرٍ نَزَلَتْ، حِينَ اخْتَلَفْنَا فِي النَّفَلِ يَوْمَ بَدْرٍ، فَانْتَزَعَهُ اللَّهِ مِنْ أَيْدِينَا حِينَ سَاءَتْ فِيهِ أَخْلَاقُنَا، فَرَدَّهُ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ ؟ فَقَسَمَهُ بَيْنَنَا) السيرة النبوية لابن هشام، ج٢، ص٣٣٩.



پێویستە ئەوە بڵێم ماکوانی برام مانای ئەوە نییە ئەو سوپایە هەموو پێکهاتەکانی سوپای سەرکەوتووی تێدایە، بەڵام هەڵە ناکەن ئەوانە هەموو مرۆڤن و هەڵە دەکەن، پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموویێت: هەموو مرۆڤێک خاوەنی هەڵەیە، باشترین مرۆڤ ئەوەیە کە هەڵە دەکات، هەست بە هەڵەکەی خۆی دەکات و دەگەڕێتەوە بۆ لای خوای گەورەو تۆبە دەکات.[١٠٨]

بەڵێ ئەم ئیختیلاف و خیلافە گەورەیە کەوتە نێوانیان، دوای سەرکەوتن هەموو حەزیان بەدەستکەوت بوو، ئەمەش حاڵەتێکی زۆر سروشتی یە کە دونیا خۆشەویستە، گومانمان لەوە نییە کە ئیمانداران لە جەنگەکەدا لەپێناوی قیامەتیان دەجەنگان، داوای مەرگیان دەکرد بۆ ئەوەی لە ئاخیرەتدا خۆشبەخت بن، کە سەرکەوتن هات ژیان و خۆشی ژیان سەری لێدانەوە، سێزدە ساڵ لەشاری مەککە لەژێر ئازار و ئەشکەنجە و جۆرەها ناڕەحەتی برسێتی و تینوێتی و دەربەدەریدا بوون و فەقیریی زۆریان چەشتبوو، لەشاری مەدینەش لەوپەڕی ناڕەحەتی و ناهەمواریدا بوون، بە ئەنسارو موهاجیرەوە شارێکی هەژارو بێدەرەتان بوون. یەکەمجار بوو ئەو هەموو دەستکەوت و ئەنفالە دەبینن، ئیتر لە مەدینە لە حاڵەتی هەژاری و نەداریدا بوون تا ڕادەیەک، پێغەمبەری خوا ﷺ لە نزا و دوعایەکیدا دەفەرموویێت: خودایە ئەوانەی لەگەڵمان هەموو برسین تێریان بکە، پێ پەتین هەڵیانبگرە، کە چیتر ڕووتوڕەجاڵ نەبن، بێ جلوبەرگن خوایە دایانپۆشە.[١٠٩]

ئێستا وا لەخاکی بەدردا دەستکەوتێکی یەکجار زۆر کەوتۆتە دەست موسڵمانان، هەموویان موحتاجن بۆ ئەو دەستکەوتانەی لەو نێوەندەدایە کە خەریکی دەمەقاڵە و سەرقاڵی دونیا بوون، قورئان دابەزی لەسەر چۆنییەتی دابەشکردنی دەستکەوت و غەنیمەکانیان، بەڵام پێش وەخت وانەیەکی وایان وەرگرت کە زۆر گرنگ بوو تێبگەن کە ئەنفال و غەنیمەت شتێکی قێزەونی دونیایە، خواناسی و تەقوا گرنگترە.

---

١٠٨ ـ كُلُّ ابْنِ آدَمَ خَطَّاءٍ ، وَخَيْرُ الْخَطَّائِينَ التَّوَّابُونَ ) أخرجه أحمد (١٩٨/٣، رقم ١٣٠٧٢).

١٠٩ـ (اللَّهُمَّ إِنَّهُمْ حُفَاةٌ فَاحْمِلْهُمْ اللَّهُمَّ إِنَّهُمْ عُرَاةٌ فَاكْسُهُمْ اللَّهُمَّ إِنَّهُمْ جِيَاعٌ فَأَشْبِعْهُمْ) أبو داود برقم (٢٧٤٧).



﴿يَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلْأَنفَالِ ۖ قُلِ ٱلْأَنفَالُ لِلَّهِ وَٱلرَّسُولِ ۖ فَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَأَصْلِحُوا۟ ذَاتَ بَيْنِكُمْ ۖ وَأَطِيعُوا۟ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥٓ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ۝١ إِنَّمَا ٱلْمُؤْمِنُونَ ٱلَّذِينَ إِذَا ذُكِرَ ٱللَّهُ وَجِلَتْ قُلُوبُهُمْ وَإِذَا تُلِيَتْ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتُهُۥ زَادَتْهُمْ إِيمَٰنًا وَعَلَىٰ رَبِّهِمْ يَتَوَكَّلُونَ ۝٢ ٱلَّذِينَ يُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ وَمِمَّا رَزَقْنَٰهُمْ يُنفِقُونَ ۝٣ أُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُؤْمِنُونَ حَقًّا ۚ لَّهُمْ دَرَجَٰتٌ عِندَ رَبِّهِمْ وَمَغْفِرَةٌ وَرِزْقٌ كَرِيمٌ ۝٤ كَمَآ أَخْرَجَكَ رَبُّكَ مِنۢ بَيْتِكَ بِٱلْحَقِّ وَإِنَّ فَرِيقًا مِّنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ لَكَٰرِهُونَ ۝٥ يُجَٰدِلُونَكَ فِى ٱلْحَقِّ بَعْدَ مَا تَبَيَّنَ كَأَنَّمَا يُسَاقُونَ إِلَى ٱلْمَوْتِ وَهُمْ يَنظُرُونَ ۝٦ وَإِذْ يَعِدُكُمُ ٱللَّهُ إِحْدَى ٱلطَّآئِفَتَيْنِ أَنَّهَا لَكُمْ وَتَوَدُّونَ أَنَّ غَيْرَ ذَاتِ ٱلشَّوْكَةِ تَكُونُ لَكُمْ وَيُرِيدُ ٱللَّهُ أَن يُحِقَّ ٱلْحَقَّ بِكَلِمَٰتِهِۦ وَيَقْطَعَ دَابِرَ ٱلْكَٰفِرِينَ ۝٧ لِيُحِقَّ ٱلْحَقَّ وَيُبْطِلَ ٱلْبَٰطِلَ وَلَوْ كَرِهَ ٱلْمُجْرِمُونَ ۝٨﴾ [الأنفال]

واتە: ئەی موحەممەد ﷺ پرسیارت لێ دەکەن لەبارەی دەستکەوتەکان تۆ بڵێ هەموو دەستکەوتەکان هی خوا و پێغەمبەرن، کەواتە لەخوا بترسن و چاکسازی لەنێوانی خۆتاندا بکەن، فەرمانبەرداری خوا و پێغەمبەرەکەی بن ئەگەر ئێوە ئیماندارن، بێگومان ئیماندارانی ڕاستەقینە تەنها ئەوانەن (یەکەم) کاتێک ناوی خوا برا دڵەکانیان دەترسێت و دەهەژێت، (دووەم) کاتێکیش ئایەت و فەرمانەکانی ئێمەیان بەسەردا بخوێنرێتەوە ئەوە ئیمان و باوەڕیان زیاد دەکات، (سێیەم) لەهەموو کاروبارێکدا پشت بە پەروەردگاریان دەبەستن، (چوارەم) ئەوانەی نوێژەکانیان بەچاکی ئەنجام دەدەن، (پێنجەم) هەندێک لەو ڕزق و ڕۆزییەی پێمداون دەیبەخشن و سەرفی دەکەن، ئا ئەوانە خۆیان ئیماندارانی ڕاستەقینەن چەندەها پلە و پایەی بەرزیان بۆ هەیە لەلای پەروەردگاریان لێخۆشبوون و ڕزق و ڕۆزی هەمیشەیی لەگەڵ ڕێزدا.

هەموو ئایەتەکان جۆرێک بوو لە تووڕەیی خوایی، یاخود جۆرێک لە لۆمەکردن کە ئێوە لەپێناو خوای گەورە دەرچوون بۆ خێرا دڵتان بۆ دونیا گۆڕا، دەستکەوتەکەی سەرکەوتنێکی گەورەتان بەدەست هێناوە، بەهۆکاری بیرکردنەوەتان لە قیامەت و لە ئاخیرەت، بۆ هەندێک ئەنفال لەدەستی مەدەن با سەرکەوتنەکەتان لەکیس نەچێت، ئەم ئایەتە دابەزییە سەر موسڵمانان بەوەی کە خێرا گوێبیستی بوون گەڕانەوە بۆ لای خوای گەورە، ڕوشد و تێگەیشتنیان بۆ گەڕانەوە و ئەوکات سەرلەنوێ یەکیان گرتەوە برایەتییان نوێ کردەوە، ڕازی



بوون بە فەرمانی خوای پەروەردگار، فەرمانی خوا و پێغەمبەری خوایان ﷺ نەشکاند.

موسڵمانان لە بەدردا هەموو مرۆڤ بوون، وتمان مرۆڤیش هەڵە دەکات وەک هەر مرۆڤێک بەگشتی، بەڵام کە بە ئایەتی قورئان بیرت خستەوە خێرا دەستبەجێ بۆ فەرمانی خوای گەورە گەردن کەچ دەبێت، بەڵام لەزۆر جێگەی تردا هەمان هەڵە دەکات و ناگەڕێنەوە بۆ لای خوای پەروەردگار، خوای پەروەردگار شکستیان پێ دەهێنێ، چونکە ئەنفال و دونیا و پارە و سەروەت و سامان، بەڵاو موسیبەتە لە داهاتوودا زیاترمان بۆ دەردەکەوێت، لە جۆری بەڵا و موسیبەتەکان. لە بەدردا هەموو موسڵمانان ڕازی بوون بە فەرمانی خوای پەروەردگار.

عوبادەی کوڕی سامت دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ خومس-ی بۆ دەوڵەتەکەی هەڵگرتووە، چوار بەشی خومس درایە سوپاکە، واتە: ئەگەر هەموو دەستکەوتەکان بکرێت بە پێنج بەش، لەنێو ئەو پێنج بەشەدا پێنج بەشی تری لێ جیا دەکرێتەوە، تەنها پێغەمبەر ﷺ بەشێک لە پێنج بەشە جیاکراوەکە دەبات، واتە: نزیکەی ٥/١ی برد، ئەوەی تر بە دادپەروەری بەسەر هەموو سوپاکەدا دابەش کرا، ئەوەی کە حەقی دەوڵەت بوو پێغەمبەری خوا ﷺ حەقی هەبوو چۆن دابەشی دەکات، ئەمەش تا ڕۆژی قیامەت یاساو حوکمی دەستکەوتە، بەو شێوەیە دابەش دەکرێت، واتە: چوار خومس بۆ سوپایە تەنها خومسێک بۆ دەوڵەتە، هەڵبەتە ئەو یاسایە لە فیقهی ئیسلامیدا شیکاری زیاتری بۆ کراوە.

ئەم کاریگەرییە زۆر گرنگە وانەیەکە بۆ موسڵمانان لە داهاتوودا لەبیریان دەچێتەوە تووشی شکست و بەڵا و موسیبەت دەبن بەهۆکاری هەمان کردار.

خاڵی پێنجەم: کاریگەری بەدر بووە هۆکاری ئەوەی کە موسڵمانان ناوچەیەکی زۆر بەرفراوان لە نیوەدوورگەی عەرەبیدا کۆنترۆڵ بکەن.

موسڵمانان توانیان پانتاییەکی زۆر ناوچەیەکی زۆر لە نیوەدوورگەی عەرەبی بخەنە ژێر ڕکێفی خۆیان، ئەو ڕەوشەش لە مەفرەزە و سریەکەی زەیدی کوڕی حاریس دا زیاتر دەردەکەوێت.

لەدوای جەنگی بەدر موسڵمانان دەستیان گرت بەسەر تەواوی باکووری مەککەی موکەڕەمە و ڕێگای شام، زۆربەی ڕێگاکانی شام لەسەر قورەیش داخرابوو، بیریان لەوە دەکردەوە بۆ شاری مەککە زۆر ترسناک بوو، شادەماری داهاتی ئەو شارە بازرگانی بوو



بەتایبەت لەگەڵ شامدا، گەورەپیاوانی قوڕەیش هەڵسان بەئەنجامدانی کۆبوونەوەیەک لەنێو دارنەدوەدا کە پەرلەمانی قوڕەیش بوو، بۆ ئەوەی بزانن چی بکەن؟

سەفوان لەنێو کۆبوونەوەکەدا دەستی کرد بەقسەکردن، چونکە بۆ ساڵی داهاتوو دەبوو ئەو سەرۆک کاروانی بازرگانی قوڕەیش بێت، ئەو سەرکردایەتی دەکات وتی: موحەممەد ﷺ و هاوەڵانی هەموو ڕێگاکانیان لێ تەنیوین و کوێرە ڕێگەیەکیشیان بۆ نەهێشتووینەتەوە، نازانم چی بکەین، هاوەڵانی ئەو کەناری دەریای سوور جێناهێڵن و بەتەواوی دەستیان بەسەر ئەو ناوچەیە گرتووە، خەڵکی ناوچەی کەناری دەریا هەموو لەگەڵ ئەواندان و زۆربەیان موسڵمان بوون، جا نازانم چ ڕێگا و کام ڕێگا بگرینە بەر، خۆ ئەگەر هەر لەماڵەوە دابنیشین ئەوە دڵنیابن هەموو سەرمایەکەمان دەخۆین هیچمان بۆ نامێنێتەوە! خۆشمان لەناو دەچین، چونکە ژیانمان لەم شارەدا لە هاویندا بازرگانییە لەگەڵ شام و لە زستاندا لەگەڵ یەمەن.

لە مەجلیسەکەدا (ئەسوەدی کوڕی عەبدولموتەڵیب) هەڵسا و بە سەفوانی وت: ئەوانەی ئامادەی کۆبوونەوەکە بوون واز لە ڕێگەی شام بهێنن، لە ڕێگەی کەناری دەریای سوور بەڵکو لە عێراقەوە بڕوات بۆ شام!

ئەو ڕێگەیەش زۆر دوور و درێژە و دەبێ بەنێو هەموو بیابانی نەجد دا ڕێگا ببڕێت، بە ڕۆژهەڵاتی شاری مەدینەدا تێپەڕێت، ئەویش ڕێگەیەکی زۆر گران و ناڕەحەتە، قوڕەیش هیچ شارەزای ئەو ڕێگەیە نەبوو، ئەگەر هەر کەس بەو ڕێگەیەدا ڕێگای بکردایە دەبوو دەلیلێکی چاوکراوەو وریای لەگەڵ بێت تا دەگاتە شام.

لەکۆتاییدا قوڕەیش ئەو ڕێگەیەی هەڵبژارد دەلیلێکی چاوکراوە و وریایان پەیدا کرد بەناوی (فوڕاتی کوڕی حەیانی) لە هۆزی (بەنی بەکر کوڕی وائیل) بوو. کاروانی قوڕەیش بەسەرکردایەتی سەفوانی کوڕی ئومەییەی کوڕی خەلەف دەرچوون بۆ شام لەو ڕێگا نوێیەوە، زۆر بەخێرایی دەزگای هەواڵگری پێغەمبەر ﷺ زانیان ئەو کاروانە بە ڕێگەی عێراق دا تێپەڕ دەکات بۆ شام، پێغەمبەری خوا ﷺ دەستبەجێ سریەیەکی پێکهێنا بە سەرکردایەتی زەیدی کوڕی حارس ژمارەی سریەکە بریتی بوو لە (١٠٠) سوار، بەپەلە کەوتنە ڕێ، بۆ ڕێگە گرتن لەو کاروانەی قوڕەیش، زۆر بەزوویی گەیشتنێ و کاروانەکەیان گرت. سەفوانی کوڕی ئومەییە هەڵهات و کاروانەکەی بەجێهێشت، ئەوەی لەگەڵیبوون هەمووی هەڵهاتن دەلیلەکەیان بەدیل گیرا، هەموو کاروانەکە بەتەواوەتی کەوتنە دەست سریەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ کە کەرەستە و شتومەکی زۆری لەگەڵ



خۆیدا هەڵگرتبوو، پێکهاتبوو لە قاپو قاچاغی زیوو کەرەستەی ناو ماڵ کە مەزەندە دەکرا بە ١٠٠ هەزار دیناری ئاڵتوون، لەگەڵ فوراتی کوڕی حەیان هێنایانەوە بۆ شاری مەدینە، پاشان فوراتی کوڕی حەیان موسڵمان بوو و بووە هاوەڵی بەڕێزی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو نەکسە و موسیبەتە دیسان بەسەر قورەیشدا هاتەوە، لەدوای بەدر گەورەترین لێدانی ئابووری بەرکەوت لە ڕێکەوتی (جەمادی کۆتایی) ساڵی سێی کۆچی ڕوویدا، واتە دوای (١٠) مانگ لە غەزوەی بەدر.

بەو شێوەیە سوپای موسڵمانان و دەوڵەتی ئیسلامی دەستی گرتبوو بەسەر ئەو ناوچانەدا بەگشتی، ئیتر قورەیش بیری لەوە کردەوە کە هێرشێکی پاککەرەوە بکات بۆ شاری مەدینە، ئەوەش پێشەکییەکە بۆ جەنگێکی نوێ.

خاڵی شەشەم: پاشان لە جەنگی بەدردا موسڵمانان (٧٠) دیلیان دەست بەسەرکردبوو، نەیاندەزانی چۆن مامەڵە لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ بکەن، تا ئەم ساتە وەختە هیچ یاسا و تەشریعێک دانەبەزی بوو لەو بارەوە.

کەواتە: مادەم هیچ یاسا و ڕێسا و دەقێکی قورئانی و وەحی نییە لەو بارەوە، بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ دەستی کرد بە ڕاوێژ لەگەڵ وەزیر و ڕاوێژکارەکانیدا، مەجلیسێکی ڕاوێژکاری پێکهێنا لە ئەبو بەکر و عومەر و سەعدی کوڕی موعازو...هتد - ڕەزامەندی خوا لەسەر هەموویان بێت- بێگومان کۆمەڵێکی زۆر لە هاوەڵان بەشدار بوون.

ڕاوێژکاری یەکەم و وەزیری پێغەمبەر ﷺ ئەبو بەکر -ڕەزامەندی خوای لەسەر بێت- فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوانە هەموو ئامۆزا و کەسوکارمانن و عەشیرەتێکین، من وای دەبینم فیدیەی دیلی لەهەموویان وەربگرین و ئازادیان بکەین، بەڵکو لەداهاتوودا خوای گەورە هیدایەتیان بدات و بێنە ناو ئیسلام، ببنە پشت و پەنایەک بۆمان.

ئەبو بەکر -ڕەزامەندی خوای لەسەر بێت- هەمیشە لایەنی بەزەیی و ڕەحمەتی بەکارهێناوە، مادەم کەسوکارن دەوڵەتی ئیسلامی پێویستی بە پارە و سامانە ئازادیان بکە بەپارە و سامان، لەوە باشترە بیانکوژین. پاشان لەوانەیە موسڵمان بن، بۆ بەکافری بمرن، هەڵبژاردەی ئەبو بەکر بەتەواوی نزیک بوو لە بیروڕای پێغەمبەری خوا ﷺ چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ هەمیشە لایەنی ڕەحمەتی زاڵ بوو بەسەر لایەنی



هێزیدا، جا بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ وەسف و پێناسەی ئەبو بەکر بە بەزەییترین و بەڕەحمترین کەس دەکات بۆ ئوممەتەکەی.[110]

پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ ڕوویکردە عومەری کوڕی خەتاب -ڕەزامەندی خوای لەسەر بێت- فەرمووی: تۆ چی دەڵێی ئەی کوڕی خەتاب؟ عومەر فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوەی ئەبوبەکر دەفەرمووێت من وای نابینم باش بێت، وەرن با هەر حەفتا کەسەکەیان بکوژین، ئەوەی نزیکە لەتۆوە جەنابت و عەلی بیانکوژن، منیش فڵان و فڵان دەکوژم، بۆ ئەوەی لەدڵی ئیمانداراندا هیچ وەلائو خۆشەویستییەک بۆ موشریک لەدڵماندا نەبێت و خۆشەویستی خوا و پێغەمبەری خوا ﷺ لەدڵماندا بێت، ئەمەش ڕای عومەری کوڕی خەتاب بوو، پێغەمبەری خوا ﷺ لەبارەی عومەرەوە فەرمووی: قورسگیرترین کەسی ئوممەتەکەمە لە بەجێهێنانی فەرمانی خوای پەروەردگار.[111]

ئەم دوو ڕایە لەنێو هاوەڵاندا پەیدا بوو، هەردووکیان لەسەر بنەمای خۆشەویستی بۆ خوا و دین و شەریعەت و دەوڵەتەکەی پێغەمبەر ﷺ هاوەڵانی کرد بە دوو بەش، زۆرینە لەگەڵ ڕای ئەبو بەکر بوون، عومەرو سەعدی کوڕی موعاز ئەوانیش خاوەنی ڕای دووەم بوون، هەردوو لاشیان زۆر لەیەک جیاواز بوون، یەکێک دەڵێ: فیدیە وەربگرین، ئەوی تر دەڵێ: هەموو دیلەکان بکوژین.

عومەر خۆی دەفەرمووێت: پێغەمبەری خوا ﷺ ڕاکەی ئەبو بەکری پەسند کرد، ڕاکەی منی فەرامۆش کرد، پاشان فیدیەی لێ وەرگرتن، بۆ بەیانی چوومە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ و ئەبو بەکری سدیق، هەردووکیان دەگریان وتم: بۆچی دەگرین؟ چی ڕوویداوە ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بۆچی خۆت و هاوڕێکەت بەو شێوەیە دەگرین بەمنیش بڵێن، با منیش لەگەڵتاندا بگریم. خۆ ئەگەر گریانم نەهات، بۆ گریانەکەتان هەر دەگریم.

تەماشای ئەو هەست و سۆز و خۆشەویستییەتی نێوان هاوەڵان بکە، بەتایبەت عومەری کوڕی خەتاب. پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەو هاوەڵانەی کە ئاماژەیان کرد

---

١١٠ ـ (أَرْحَمُ أُمَّتِي بِأُمَّتِي أَبُو بَكْرٍ) أحمد (٢٨١/٣، رقم ١٤٠٢٢)، والترمذي (٦٦٥/٥، رقم ٣٧٩١) وقال: حسن صحيح.

١١١ ـ (وَأَشَدُّهُمْ فِي أَمْرِ اللَّهِ عُمَرُ).



بۆ ئەوەی فیدیە لە دیلەکان وەربگرم، بەڵام پێم نیشان دراوە کە دەبوو هەموویان لای ئەو دارە بکوژم، ئاماژەی بۆ دارەکە کرد.[112]

ئنجا ئایەتەکانی (٦٧ و ٦٨)ی سوورەتی ئەنفالی خوێندەوە

﴿مَا كَانَ لِنَبِيٍّ أَن يَكُونَ لَهُۥٓ أَسْرَىٰ حَتَّىٰ يُثْخِنَ فِي ٱلْأَرْضِ ۚ تُرِيدُونَ عَرَضَ ٱلدُّنْيَا وَٱللَّهُ يُرِيدُ ٱلْـَٔاخِرَةَ ۗ وَٱللَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴿٦٧﴾ لَّوْلَا كِتَـٰبٌ مِّنَ ٱللَّهِ سَبَقَ لَمَسَّكُمْ فِيمَآ أَخَذْتُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ ﴿٦٨﴾﴾ [الأنفال]

واتە: خۆ ئەگەر بڕیاردادەی خوا نەبووایە لەسەر (ئەو شتانەی کە) وەرتان گرت (لەبەرانبەر ئازادکردنی دیلەکانەوە) تووشی سزایەکی زۆر سەخت دەبوون.

پاشان فیدیە و پارە لێ وەرگرتن بووە تەشریع و موسڵمانان دەتوانن پارە و فیدیەیان لێ وەربگرن، خوای گەورە لە سوورەتی موحەممەد ئایەتی چوار حوکمەکەی دابەزاند

﴿فَإِذَا لَقِيتُمُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ فَضَرْبَ ٱلرِّقَابِ حَتَّىٰٓ إِذَآ أَثْخَنتُمُوهُمْ فَشُدُّوا۟ ٱلْوَثَاقَ فَإِمَّا مَنًّۢا بَعْدُ وَإِمَّا فِدَآءً حَتَّىٰ تَضَعَ ٱلْحَرْبُ أَوْزَارَهَا ۚ ذَٰلِكَ وَلَوْ يَشَآءُ ٱللَّهُ لَٱنتَصَرَ مِنْهُمْ وَلَـٰكِن لِّيَبْلُوَا۟ بَعْضَكُم بِبَعْضٍ ۗ وَٱلَّذِينَ قُتِلُوا۟ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ فَلَن يُضِلَّ أَعْمَـٰلَهُمْ ﴿٤﴾﴾ [محمد]

واتە: (ئەم فەرمانە بۆ کاتی ڕووبەڕووبوونەوەیە لە گۆڕەپانی جەنگدا) کاتێک گەیشتن بەوانەی کە بێباوەڕن، بێنە دەست لێیان و لە گەردنیان بدەن، (ئەگینا ئەوان ئێوە دەکوژن)، (هەرکاتێ یەخسیریتان کرد) ئەوکاتە پەیمانی توندییان لێ وەرگرن و یەکێک لەم دوو کارەیان لەگەڵدا بکەن: یان بە پیاوەتی و منەتنان، یاخود (دیل بە دیل) ئازادیان بکەن، تا شەڕ ئاسەواری نامێنێت، خوا خۆی ئەگەر بیەوێت خۆی دەتوانێت بەسەریاندا سەربکەوێت، بەڵام دەیەوێت هەندێکتان بەهەندێکتان تاقی بکاتەوە، بەڵام بێگومان ئەوانەی لەپێناوی خوادا شەهید بوون هەوڵ و کۆششیان بەزایە نادات.

هەرچەندە سەعدی کوڕی موعاز لەنێو مەیدانی جەنگەکەدا هاواری کرد با دیلەکان بکوژین، لەنێو جەنگەکەدا پێغەمبەری خوا ﷺ تەماشای سەعدی کرد کە هاواری دەکرد با دیلەکان بکوژین پێویست ناکات ئەسیریان بکەین.

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

١١٢ ـ (فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أَبْكِي لِلَّذِي عَرَضَ عَلَيَّ أَصْحَابُكَ مِنْ أَخْذِهِمْ الْفِدَاءَ لَقَدْ عُرِضَ عَلَيَّ عَذَابُهُمْ أَدْنَى مِنْ هَذِهِ الشَّجَرَةِ شَجَرَةٍ قَرِيبَةٍ مِنْ نَبِيِّ اللَّهِ ﷺ).



تەنانەت پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەی سەعد وا دەبینم ئەو ئەسیرکردنەت پێ خۆش نییە کە سوپاکە دەیکات؟

سەعد فەرمووی: بەڵێ، ئەی ڕەسوڵی خوا ﷺ هیچ پێم خۆش نییە با بیانکوژین ئەوانە سەرکردەی کوفرن، کوشتنیان باشترە لە مانەوەیان.

لەکۆتاییدا ڕای گشتی موسڵمانان لەسەر مانەوەی دیلەکان بوو و بە فیدیە ئازادیان بکەن کە قورئان دابەزی ئینکاری فیدیەکەی نەکرد، بەڵام کوشتنەکە باشترە خوای پەروەردگار بڕیاریدا فیدیەیان لێ وەربگرن، بەڵام کوشتنیان باشتر بوو، ئیتر موسڵمانان بڕیاری خوای پەروەردگاریان هەڵبژارد بۆ وەرگرتنی پارە لە دیلەکان، فیدیەکە بریتی بوو لە (١٠٠) بۆ (٤٠٠) درهەم بۆ هەریەک لە دیلەکان، بەگوێرەی دەوڵەمەندی و هەژاریان.

لە نێوانی پێغەمبەری خوا ﷺ و عەباسی مامی کە بەدیل گیرابوو ڕووداوێکی زۆر جوان و خۆش ڕوویدا، هەرچەندە عەباس بەزۆر هاتبوو بۆ جەنگ بە نهێنی موسڵمان بووبوو، ئەمەش ئەوەمان بۆ دەردەخات کە لە دەوڵەتی ئیسلامیدا ڕەشوە و بەرتیل و خزمایەتی هیچ ئەرزشێکی نییە، بۆ نزیک و خزم و کەسوکار و عەشیرەت.

عەباس وتی: ئەیٰ پێغەمبەری خوا ﷺ من موسڵمانەتیو ئیسلامەتییەکەم شاردبووەوە ئیتر بۆچی دەبێت فیدیە بدەم؟

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: خوای پەروەردگار زانایە لەسەر ئیسلام بوونەکەت، ئەگەر ئەوەی دەیڵێیت ڕاست بێت خوای پەروەردگار لەسەر ئیسلامبوونەکەت پاداشتت دەداتەوە، بەڵام لە ڕووکەشدا تۆ دوژمنمان بوویت و هاتیت بۆ دژایەتیمانو جەنگایت، دەی فیدیەی خۆتو ئامۆزاکانت بدە (نەوفەلی کوڕی حارسی کوڕی عەبدولموتەڵیب و عەقەیلی کوڕی ئەبو تاڵیبی کوڕی عەبدولموتەڵیب)، حەلیفەکەشت بدە بەناوی (عوتبەی کوڕی عەمر) بەخۆتەوە دەبێ فیدیەی ئەو سێ کەسەیش بدەیت!

عەباس وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بەڵام ئەوەندەم نییە؟!

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەی کوا ئەو پارەیەی لەگەڵ دایکی فەزڵ خستتە چاڵو پێت وت: ئەگەر لەو سەفەرەم شتێکم لێ بەسەرهات، ئەو پارەیە بۆ فەزڵو عەبدوڵڵا و قەسەمی کوڕم؟!



عەباس وتی: سوێند بەخوا ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ من دڵنیام تۆ پێغەمبەری خوایت، ئەو کارەی کردوومە بێجگە لە منو دایکی فەزڵ هیچ کەسی تر نایزانێت، حیسابی بکە بۆم لەوانەشی لەگەڵمدان کە بیست ئۆقییە لەسەروەتەکەم بدەم.

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەو نیعمەتە خوای پەروەردگار پێی بەخشیویت کە لەتۆی وەردەگرین.

بۆ ئەوەی عەباس هیچ جۆرێک لە بیرکردنەوەی بۆ دروست نەبێت لەبەر خاتری برازاکەی دەیبەخشێت، بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەوە بەخشینی پەروەردگارە بۆ ئێمە لەلایەن تۆوە، ئیتر ئایەتی حەفتای سورەتی ئەنفال لەبارەی عەباس دابەزی

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ قُل لِّمَن فِيٓ أَيۡدِيكُم مِّنَ ٱلۡأَسۡرَىٰٓ إِن يَعۡلَمِ ٱللَّهُ فِي قُلُوبِكُمۡ خَيۡرٗا يُؤۡتِكُمۡ خَيۡرٗا مِّمَّآ أُخِذَ مِنكُمۡ وَيَغۡفِرۡ لَكُمۡۚ وَٱللَّهُ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ٧٠﴾ [الأنفال]

واتە: ئەی پێغەمبەر بەو دیلانە بڵێ کە لەبەر دەستتدان، ئەگەر خوا خێر لە دڵەکانتاندا بەدی بکات ئەوە زۆر لەوە باشترتان پێ دەبەخشێت کە لێتان وەرگیراوە، ئەگەر باوەڕ بهێنن لێتان خۆش دەبێت، خواش لێخۆشبوو میهرەبانە.

پاشان عەباس لەدوای ئەوەی ئازاد بوو ئەو فیدیەیەی دام لەجیاتی ئەوە کە بریتی بوو لە (٢٠) ئوقییە، خوای پەروەردگار (٢٠) ئەوەندەی پێ بەخشیم، هەر هەموویان دەست ڕەنگینو خاوەن پیشەو کاسبکار بوون، ئەو ڕووداوە ئەوەمان بۆ دەردەخات کە پێغەمبەری خوا ﷺ یاسا لەسەر هەموو کەسێکدا پیادە دەکات، تەنانەت عەباسی مامی، هاوەڵان زۆریان لەلا سەیر بوو کە هیچ ڕەحمێک بە عەباس ناکات، ئەنسار دڵێکی زۆر بەبەزەییان هەبوو کە عەباسیان بینی بەو شێوەیە فیدیەی لێ وەردەگیرێ، ئەو مامەیەی کە خۆشی دەویستو لە پەیمانی عەقەبەی دووەمدا لە پشتی وەستاو زۆر نزیک بوو لەدڵی پێغەمبەری خواوە ﷺ وەکو ئەبو لەهەب نەبوو.

بۆیە ئەنسار بەنی نەجاڕ بەوپەڕی ئەدەبو خۆشەویستیو ئیمانەوە هاتنە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ عەباسی مامت بۆ ئێمە بەجێ بهێڵە، ئەوە کوڕی خوشکمانەو با فیدیە نەدات، هەرچۆنێک بووە عەفووی بکە، بەڵام پێغەمبەری خوا ﷺ ڕەتی کردەوە، بەڵکو (٤٠٠٠) درهەمی لێوەرگرتو لە هەموویان زیاتری لێوەرگرت.



یاخود عەباس بەرزترین فیدیەی دا بە ئازادکردنی خۆیو برازاو هاوپەیمانەکەی بۆ ئەوەی ببێتە وانەیەك بۆ هەموو دەسەڵاتدارێک کە خزمایەتیو عەشیرەتگەرایی وەکو جۆرێک لە بەرتیلو ڕەشوە بەکار نەهێنێت.

ڕووداوێکی تر لەنێو ئەسیرەکاندا بریتی بوو لە (سوهەیلی کوڕی عەمر)، سوهەیل یەکێک بوو لە سەرکردەکانی قوڕەیش بەوە ناسرابوو کە خاوەن زمانێکی پاراوەو هانی سوپای قوڕەیشی دەدا بۆ جەنگو لە بەیانو قسە کردندا زۆر زمان پاراو بوو، ئەو کاتەی فیدیەکەیان هێنا عومەری کوڕی خەتاب فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ با هەردوو ددانی پێشەوەی سوهەیل بشکێنم بۆ ئەوەی جارێکی تر قسە نەکاتو خەڵکی لە ئێمە هان نەدا.

پێغەمبەری خوا ﷺ نەیهێشت کاری وا ئەنجام بدات، فەرمووی: ئەی عومەر بەڵکو خوای پەروەردگار هیدایەتی بداتو ئەو زمان پاراویەی بۆ ئێمە بەکار بهێنێت، ڕۆژێک لە ڕۆژان لە جێگەیەکدا کە ئاواتی پێ بخوازێت.[113]

بەڕاستی ئەمەش ڕوویدا دواتر سوهەیل موسڵمان بوو، لەکاتی هەڵگەڕانەوەی عەرەب ئەو هۆکارێک بوو لەوەی خەڵکی مەککە لەسەر ئیسلامەتی خۆیان مانەوە، وتارێکی بۆ خەڵکی شاری مەککە دا و هەموویانی هێنایەوە نێو ئیسلام.

وتی: ئەی خەڵکی مەککە! وا مەبن لەکۆتا کەس بوون کە هاتنە نێو ئیسلام، ئەوەڵ کەسیش مەبن بۆ هەڵگەڕانەوە لە دینی خوای پەروەردگار.

ئەمە وێنایەکی کەم بوو لە فیدیەی دیلەکان بەپارە، هەندێک لە دیلەکان هەژارو بێ پارە بوون، پێغەمبەری خوا ﷺ وای بەباش زانی هەندێک لەوان خوێندەوار بوون (١٠) موسڵمان فێری نووسینو خوێندنەوە بکەن، ئازاد دەکرێن، فیدیەکەیان فێرکردنی (١٠) موسڵمانە لە نووسینو خوێندنەوە، چونکە خوێندەواری لەو سەردەمەدا زۆر کەم بوو، تەماشای تێگەیشتنی قووڵو بیرکردنەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ دەیزانی ئەم ئوممەتە ئوممەتی خوێندنەوەو نووسینو زانستە، یەکەم کاری ئوممەتەکەی خوێندنەوەو نووسینو زانستە، تا ببنە خاوەن کەرامەت، لەنێو دیلەکاندا هەندێکیان خۆیان بە فیدیەی فێرکردنی خوێندنەوەو نووسین ئازاد کرد.

---

١١٣ ـ (عسى أن يقوم مقاما لا تذمنه) سيرة إبن كثير (ج٨، ص١٦٠).



هەندێک لە دیلەکان پێغەمبەری خوا ﷺ هەروا ئازادی کردن بێ فیدیەو هیچ بەرانبەرێک، لەوانە کەسێک بەناوی: (ئەبو عیزەت جەمحی) پیاوێکی هەژار بوو هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ و وتی: هیچ پارەم نییەو منداڵم زۆرە ببەخشە، منداڵەکانم پێویستییان بەمنە، پێغەمبەری خوا ﷺ بەخشی پەیمانی لێ وەرگرت جارێکی دیکە دژی موسڵمانان نەجەنگێت، بەڵام بەداخەوە پەیمانەکەی شکاندو لەدواییدا بە سزای خۆی گەیشت.

هەروەها هەندێک لەو ئەسیرانە کە دوو کەس بوون تەنها مردن ئەیگرتنەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی کرد بەکوشتنیان ئەوانیش: (عوقبەی کوڕی ئەبو موعیت) و (نەزیری کوڕی حارس) دوو تاوانباری گەورەو سەرەکی قورەیش بوون لەشاری مەککە زۆر ئازاری پێغەمبەر ﷺ و موسڵمانانیان دەدا، هەمیشە دژی بانگەوازی خواو پێغەمبەرەکەی ﷺ بوون، هەروەها تاوانباری جەنگ بوون.

کەواتە: یاساو ڕێسا لە قورئاندا ئەهاتە خوارەوە بریتیی بوو لە هەڵبژاردەی سەرۆک یاخود ئەمیر... هتد، بەچوار شێوە لەبەرانبەر دیلدا.

یەکەم: فیدیە وەرگرتن بەپارەو بە وەرگرتنی زانستو فێرکردنی زانستو یاخود دیل بەدیل، گۆڕینەوەی دیل.

دووەم: کوشتنی تاوانبارانی جەنگو ئاشووبو فەساد یاخود دوژمنانی ئیسلام، ئەگەر دیلیان کوشت لە بەرانبەردا دیلەکان دەکوژێتەوە، تا دوژمنەکەت لە کوشتنی دیل بووەستێت.

سێیەم: بەخشین بێ فیدیەو هیچ بەرانبەرێک.

چوارەم: هێشتنەوەی دیل دەست بەسەر کردنیان یاخود کار پێکردنیان بۆ ماوەیەکی دیاری کراو کە خەلیفە یاخود سەرۆک یان ئەمیر دیاری دەکات تا پێداویستی موسڵمانان کۆتایی دێت.

بەڵام شتێکی تر لەگەڵ ئەو ئەحکامانەدا هات کە زۆر گرنگ بوو دەفەرمووێ: ئەگەر دیلت هێشتەوە، گومانی تێدا نییە دەبێت ڕێزی بگرین و بەباشترین شێوە مامەڵەی لەگەڵدا بکرێت، خواردنو خواردنەوەی باشی بۆ دابین بکرێت، بەهەرحاڵ ئەوەی کە گونجاوە لەگەڵ ڕەوشی ئیسلامیدا مامەڵەی لەگەڵ دەکەیت.



﴿وَيُطْعِمُونَ ٱلطَّعَامَ عَلَىٰ حُبِّهِۦ مِسْكِينًا وَيَتِيمًا وَأَسِيرًا ۝٨﴾ [الإنسان]

واتە: هەروەها نانو خۆراک بەهەژارو هەتیوو دیلەکان دەبەخشن، ئەگەرچی خۆشەویستیش بێت لەلایان.

پێغەمبەری خوا ﷺ ئەم ڕەوشتە جوانەو ئاکارە بەرزانەی لەنێو موسڵمانانندا بڵاوکردەوە، تا بەباشترین شێوە ڕەفتار لەگەڵ دیلەکاندا بکەن، فەرمووی[114]: بەباشترین شێوە ڕەفتار لەگەڵ دیلەکاندا بکەن

یەکێک لە دیلەکان بەناوی (ئەبو عەزیزی کوڕی عومەیر) دەڵێ: لەماڵێکی ئەنساردا بووم، بەباشترین شێوە مامەڵەیان لەگەڵدا دەکردم، خۆیان خورمایان دەخواردو نانی گەرمیان بۆمن دروست دەکرد.

هەر ئەم جوان مامەڵە کردنە بوو لەدوای ئازادبوونی لەدیلی، گەڕاوە خزمەت پێغەمبەر ﷺ و شایەتمانی هێناو باوەشی کردەووە بە (موسعەبی کوڕی عومەیر)ی برای، چونکە (ئەبو عەزیزو موسعەب) برا بوون.

هەروەها (ئەبو عاسی کوڕی ڕەبیع) ئەویش دیل بوو، لەماڵی ئەنساردا بوو بەباشترین شێوە خزمەتیان دەکرد، ئەبو عاس زاوای پێغەمبەری خوا ﷺ بوو، هاوسەری زەینەب بوو.

ماکوان: ئەزانی چۆن پێغەمبەری خوا ﷺ ئازادی کرد، نومێر ئەبو عاس؟

نومێر: بەڵێ، دەزانم.

ماکوان: بۆم باس بکە.

نومێر: بەسەرچاو، بەڵام نەگریت.

ماکوان: هەوڵ دەدەم.

نومێر: لەڕاستیدا زەینەب کاتێک زانی هاوسەرەکەی گیراوە، دایکی، واتە: خاتوو خەدیجە بۆ شووکردنەکەی ملوانکەیەکی ئاڵتوونی پێشکەشی خاتوو زەینەب کردبوو، ئەویش وەکو خۆی هەڵیگرتبوو، کاتێک بۆ ئازادبوونی هاوسەرەکەی ناردی، پێغەمبەری خوا

---

١١٤ ـ (استوصوا بالأُسارَى خيرًا) أخرجه الطبراني الكبير برقم (٩٧٧)، وفي الصغير برقم (٤٠٩). قال الهيثمي (٨٦/٦): إسناده حسن.



صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ ملوانەکەی بینی زانی ئەوە هی خەدیجەیە، کاتی خۆی پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ بەدیاری بۆی کڕیبوو!

پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ دەستبەجێ هەڵوەستەیەکی کردو چووە لای بەیتول مال ـ بیلالی حەبەشی -ڕەزامەندی خوای لەسەر بێت- سەرۆکی بەیتولمالی موسڵمانان بوو، داوای ئەو ملوانکەیەیەی کردەوە کە کاتی خۆی بۆ هاوسەرەکەی کڕیووە لە خومس خۆی بەشی خۆی هەڵبگرێتەوە، ناردییەوە بۆ زەینەبی کچی! نەموت مەگری ماکوان؟!

ماکوان: ناتوانم خۆم پێڕاناگیرێ لە ئاستی ئەم هەڵوێستەی پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ، چەندە وەفا و خۆشەویستی بۆ خاتوو خەدیجە هەبووە.

نومێر: ڕاستە، بەهەرحاڵ زۆرێکی تر لە دیلەکان هەمان وتەیان دووپاتکردۆتەوە، لەچاکە و مامەڵەی لەگەڵ دیلەکاندا، لەوانەش وەلیدی کوڕی موغیرە، باوکی خالیدی کوڕی وەلید، دەڵێ: ئەگەر کەسێک بریندار بوایە یان نەخۆش بەوپەڕی خۆشەویستی و ڕێزەوە هاوکاریان دەکرد و تیماریان دەکرد، لەکاتی هەڵگرتنیدا زۆر بەهێمنی وەک منداڵی خۆیان مامەڵەیان لەگەڵدا دەکردین.

هەر ئەو مامەڵە جوانەی مەنهەجی ئیسلام وا فێری خەڵکی موسڵمانی کرد، لەدواییدا بووە هۆکاری موسڵمان بوونی (ئەبو عاص و ئەبو عەزیز و سابیتی کوڕی عوبەید و وەلیدی کوڕی وەلید)، ئەمەش کاریگەری پێنجەم بوو لە جەنگی بەدردا و هاتنە خوارەوەی تەشریعی ئیسلامیی بوو لەبارەی دیلەکانی جەنگی بەدر.

خاڵی شەشەم: کاریگەری جەنگی بەدر ئەوەبوو کە قوڕەیش هێرش بکاتە سەر شاری مەدینە، هەوڵی تیرۆر و کوشتنی پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ بدەن، چەند جارێک قوڕەیش هەوڵیدا پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ بکوژێت و هێرش بکەنە سەر مەدینە، لەوانە:

هەوڵی (عومەیری کوڕی وەهەبی جەمحی)، کوڕەکەی عومەیر بەناوی (وەهەبی کوڕی عومەیری کوڕی وەهەب) دیل بوو لای موسڵمانان، باوکی عومەیر دەیویست ئازادی بکات، لەگەڵ ئەوەشدا عومەیر ڕقێکی زۆری لەدڵدا دژی پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ هەڵگرتبوو، ڕۆژێک لەگەڵ سەفوانی کوڕی ئومەییەدا لەناو حەوشەی کەعبەدا دانیشتبوون، باسی کوژراوەکانی خۆیانی دەکرد لە جەنگی بەدر، سەفوان باوک و براکەی کوژرابوون دەیوت: وەڵاهی دوای ئەوان ژیان هیچ مانا و تامێکی نەماوە، ئەوە کەی ژیانە ئێستا ئێمە دەیکەین بێ ئازیزان و کەس و کارمان.



عومەیر وتی: سوێند بەخوا ڕاست دەکەیت، ئەگەر قەرزم لەسەر نەبوایە و قەرزاری خەڵک نەبوومایە، چونکە چاوەڕێی دانەوەی قەرزەکانمە، دەترسم منداڵەکانم بە عەبد ببەن و خێزانەکەم بەگشتی تووشی ناهەمواری ئابووری بن، ئەوا دەڕۆیشتم موحەممەدم دەکوشت یان دەیانکوشتم، کوشتنی موحەممەد بۆمن ئاسان بوو، چونکە کوڕەکەم (وەهەب) لەوێیە و بەناوی ئازادکردنی دەڕۆم و دەیکوژم!

سەفوان هەلەکەی قۆستەوەو وتی: من هەموو قەرزەکەت بۆ دەدەمەوە، منداڵەکانت لەگەڵ منداڵەکانی خۆمدا بەخێو دەکەم، دەیانبەمە لای خۆم.

عومەیر: باشە دەکەواتە لای هیچ کەس ئەم باسە مەکە!

سەفوان: بەدڵنیاییەوە وا دەکەمو باسی ناکەم.

عومەیر: هەڵسا بە پلاندانان و ژەهراوی کردنی شمشێرەکەی دوای ماوەیەک هەڵسا ڕووە و مەدینە کەوتە ڕێ، کاتێک گەیشتە نێو شاری مەدینەی مونەوەرە بەلای کۆمەڵێک لە هاوەڵاندا تێپەڕی و باسی جەنگی بەدر و سەرکەوتنەکانیان دەکرد، لەنێوانیاندا عومەری کوڕی خەتابی تێدابوو عومەیری ناسییەوە، عومەر خاوەنی فەراسەت و ناسینی خەڵک بوو، وتی: ئەم سەگە دوژمنی خوایە، هاتووە شتێکی لەژێر سەردایە و شەڕی بەدواوەیە.

بەپەلە چووە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ و فەرمووی: ئەی ڕەسولی خوا ﷺ وا عومەیری کوڕی وەهەبی جەمحی هاتووە، دوژمنی خوایە، شمشێرەکەی تیژکردووە و ژەهراوییە، شتێکی لەژێر سەردایە!

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: با بێتە ژوورەوە بۆلام (فأدخله علي).

بەڵام عومەری کوڕی خەتتاب هەروا لێی نەگەڕا شمشێری خستە سەر ملی و بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ بردییە ژوورەوە، عومەر لەدواوە دەستی بەستەوە و هیچی بۆ نەکرا، بەڵام عومەر هەر بەوەندە وازی نەهێنا کەسێکی ئەنساری لەگەڵ خۆیدا بردە ژوورەوە، لای سەری پێغەمبەرەوە ﷺ پاسەوانی بکات، عومەر بردی بە ئەنسارییەکەی وت: ئاگاداری ئەم پیسە بە، چونکە لێی دڵنیا نیم و شەڕی لێ دەوەشێتەوە.

پێغەمبەری خوا ﷺ بینی ئاوا بەستوویەتییەوە فەرمووی: عومەر بیکەوە با لام دابنیشێت پاشان فەرمووی: عومەیر بزانم چیت دەوێ، قسە بکە؟

عومەیر وتی: بەیانیت باش.



پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: خوای گەورە کەرەمی لەگەڵ کردووین و سڵاوێکی پێ بەخشیوین لەو سڵاوەی تۆ زۆر جوانتر و باشترە، ئەویش سڵاوی خەڵکی بەهەشتە، پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بۆچی هاتوویت ئەی عومەیر؟

عومەیر وتی: کوڕەکەم دیلە لای ئێوە، هاتووم بۆ ئەوەی ئازادی بکەن و ئەو چاکەیەم لەگەڵ بکەن.

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەو شمشێرە چییە لەسەر ملت، (چونکە عومەر شمشێرەکەی لێ سەندبوو، هەر بە شمشێرەکەی خۆی لەسەر ملی دانابوو).

عومەیر وتی: جا خوای گەورە ئەو شمشێرە لەناو بەرێت، بۆ لە جەنگی بەدردا هیچی بۆ کردین؟

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەگەر ئەوەی تۆ بۆی هاتوویت، ئەگەر بەڕاستی پێت بڵێم موسڵمان دەبیت و بڕوام پێ دەهێنیت؟!

عومەیر: من تەنها بۆ ئازادکردنی کوڕەکەم هاتووم و هیچی تر.

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: نەخێر، بەڵکو لە حەوشی کەعبەدا لەگەڵ سەفوان دانیشتبووی باسی کوژراوەکانی خۆتان دەکرد لەدۆڵی بەدردا، پاشان وتت: ئەگەر قەرزار نەبوومایە و منداڵم ورد نەبوایە ئەوا بۆ کوشتنی موحەممەد دەردەچووم.. سەفوانیش وتی: من هەمووی دەگرمە ئەستۆی خۆم، بڕۆ موحەممەد بکوژە، خوای گەورە بێ پەردە لەگەڵتان بوو.

عومەیر وتی: "أشهد أنک رسول الله" شایەتی دەدەم تۆ پێغەمبەری خوایت، بەدرۆمان خستییەوە لەوەی کە بەوەحی لە ئاسمانەوە بۆت هاتووە، بەڵام چیتر ناتوانم بەدرۆت بخەمەوە. ئەو قسەیە کە کردوومانە من و سەفوان بووین کەس ئاگای لێ نەبووە، بەڵام ئەوا بۆم دەرکەوت ئەوەی بۆت هاتووە یەقینم هەیە لەلایەن خوای پەروەردگارەوەیە، سوپاس بۆ خوا ڕێگەی پیشاندام بۆ ئیسلام، هیدایەتەکە بووە هۆکاری فێرکردنم لەم ڕاستی و دروستی و ئایینە و ئەم ڕێگایەم بۆ هیدایەت بڕیووە.

سبحان الله عومەیر هات بۆ کوشتنی پێغەمبەر ﷺ، بەڵام بوو بەیەکێک لە گەورە هاوەڵی بەڕێزی پێغەمبەری خوا ﷺ، ئەمەش مانای قەزا و قەدەری خوایە بەڕاستی تەرتیبێکی سەیر و عەجیب بوو.



لەدوای ئەوەی شایەتومانی هێنا بەڕاستی و دروستی پێغەمبەر صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ، پاشان پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ فەرمووی: بڕۆن براکەتان فێری قورئان بکەن و بەدیاری دیلەکەشی بۆ ئازاد بکەن، ئەوانیش وایان کرد.

لە تەڕەفی ئەولا سەفوان چاوەڕێی هەواڵی خۆش بوو، کاتێک عومەیر لەنێو قوڕەیش دەرچوو دەیوت: موژدەتان دەدەمێ هەواڵێکی خۆش دەبیستن، لە ڕووداوێکدا هەر بەخەیاڵتاندا نەهاتووە.

ڕۆژانە دەردەچوو بۆ ئەوەی هەواڵ بزانێت لەو کەسانەی کە سەفەریان دەکرد بۆ شاری مەدینە، تا هەواڵی پێگەیشت کە عومەیری کوڕی وەهەب موسڵمان بووە! ئیتر سوێندی خوارد لە ژیانیدا قسەی لەگەڵ نەکات، هیچ هاوکاریشی نەکات، ئەم کارەی ئەنجامدا هەتا فەتحی مەککە قسەی لەگەڵ نەکرد.

پاشان خۆی کەسێکی ئازا و چاونەترس بوو زۆر خاڵی ئەرێنی لەگەڵ خۆیدا هەڵگرتبوو، گەورەی (بەنی جەمحی) بوو هۆز و عەشیرەت و تیرەکەی زۆر بەهێز بوون لەوەش دەترسا بڵێن: بۆ پارە موسڵمان بووە، بۆیە داوای لە پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ کرد بگەڕێتەوە شاری مەککە، لەوێ بانگەواز بکات، بە پێغەمبەری خوای صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ وت: بەدرێژایی هاتنت من دژایەتیم کردوویت، بگەڕێمەوە تا بانگەواز بکەم بەڵکو خوای گەورە هیدایەتی خەڵکی بدات لەسەر دەستم.

زۆر ئازاری هاوەڵانتم داوە بۆیە دەگەڕێمەوە بۆ شاری مەککە تا لەوێ زیاتر خزمەتی ئایینی ئیسلام بکەم، لەگەڵ ئەوەی ماوەیەکی زۆرکەم لەشاری مەدینە بوو، چەند ئایەتێکی قورئانی دەزانی، بەڵام گەڕایەوە زۆر چالاکانە دەستی کرد بە بانگەواز، خەڵکێکی زۆر لەسەر دەستی موسڵمان بوون، هۆز و عەشیرەتەکەشی پاراستییان هەتا فەتحی مەککە زۆر کاری باشی بۆ ئیسلام کرد و هەر ئەویش بوو بووە هۆکاری هێنانەوەی سەفوان بۆ ناو باوەشی ئیسلام، خوا لەهەموویان ڕازی بێت. ئەمەش یەکێک بوو لە هەوڵە شکست خواردووەکانی قوڕەیش بۆ کوشتنی پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ ئەنجامەکەی بە موسڵمان بوونی (عومەیری کوڕی وەهەبی جەمحی) هات.



## هەوڵێکی تر لەلایەن ئەبو سوفیانی کوڕی حەڕبەوە

یەکێکی تر لە هەوڵە ترسناکەکانی قوڕەیش بۆ کوشتنی پێغەمبەری خوا ﷺ لەکاتی گەڕانەوەی ئەبو سوفیان سەرکردەی هەموو قوڕەیش، بڕیاریدا بەهەرجۆرێک بێت ئەو سەروەت و سامانەی کە لە قافڵەی بەدردا بەسەرکەوتوویی ڕزگاری کردووە، پارەکەی بەکار بهێنێت بۆ غەزای شاری مەدینە، موسڵمانانی لێوەدەر بهێنێت، لەهەمان کاتدا سوێندی خوارد کە خۆی ناشوات و ئاو بەلاشەی ناکەوێت تا غەزای شاری مەدینە نەکات و موحەممەد نەکوژێت تا ئەو سوپایە کۆدەکاتەوە، بەدڵنیاییەوە ئەبو سوفیان کاتی دەوێت بەڵام بۆ ئەوەی خۆی بشوات و سوێندەکەی بباتە سەر، بڕیارێکی ترسناکیدا لەبەرئەوەی هیچ نەبێت تۆزێک باری دەروونی قوڕەیش بەرز بکاتەوە، ئەو ڕێز و کەرامەتەی هەیبوو بۆی بگەڕێتەوە لەنێو نیوەدوورگەی عەرەبدا.

ئەبو سوفیان هەڵسا بە کۆکردنەوەی (٢٠٠) سوار و سوپایەکی پێکهێنا بۆ ئەوەی سوێندەکەی نەکەوێت، بەرەو شاری مەدینە کەوتە ڕێ، کاتێک گەیشتە نزیک شاری مەدینە نەیوێرا بڕواتە ناوی بەڕۆژ مایەوە تا شەو، لەشەودا هێرشێکی کردە سەر شاری مەدینە و دوو ئەنساری شەهید کرد و هەندێک مەڕ و ماڵاتی لەگەڵ خۆی برد و بەپەلە گەڕایەوە بۆ شاری مەککە، ئەمەش هەوڵێکی زۆر هەرزەکارانە و منداڵانە بوو.

پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ خێرا هاوەڵانی کۆکردەوە و کەوتنە شوێن سوپاکەی ئەبو سوفیان، سوپاکەی قوڕەیش جۆرێک لە ئاردی پێبوو خواردنی خۆیان بوو کە قورس بوو بۆ هەڵگرتن لەتاواندا ئەوەندە بەپەلە ویستیان بگەڕێنەوە هەموو ئارد و کەرەستەکانیان فڕێدا بۆ ئەوەی زوو بگەنەوە شاری مەککە، ئەم خواردنەش زۆر لەوە زیاتر بوو کە بەجێیان هێشت لەوەی لەگەڵ خۆیان بردبوویان، هەر بۆیە ئەم غەزا ناونرا بە غەزای ئارد (السويق) خەڵکی مەدینە سوودی زۆریان لێ بینی، ئەم جەنگەش لەساڵی (٢)ی کۆچی لەمانگی (ذولحيجه)دا ڕوویدا، واتە: دوو مانگ دوای جەنگی بەدر. ئەمەش هەوڵێکی تری قوڕەیش بوو!

خاڵی حەوتەم: کاریگەری جەنگی بەدر لەسەر ئەعراب و دەشتەکییەکان

هەروەکو پێشتر ئاماژەم پێدا بەگشتی ژیانی ئەعراب لەسەر چەتەیی و دزی و ڕێگری بوو لە ناوچەکە، بانگەوازی ئیسلامی بانگەوازێکی ئەخلاقی بوو، گومانی تێدا نییە دەوڵەتێکی



بەهێزی وەکو دەوڵەتی مەدینە کاریگەری لەسەر کارە قێزەونەکانی ئەوان دەکات، بەتایبەتیش دوای سەرکەوتن لە جەنگی بەدر.

بۆیە ئەعراب بەگشتی بیریان لەوە کردەوە پێویستە هەوڵ بدەن بۆ ڕێگری لە سوپای موسڵمانان ئەو هێزە نەهێڵن.

بۆ ئەو مەبەستە هۆزی گەورەی ئەعراب بەناوی (بەنی سولەیم) دەستیان کرد بە پلان دانان بۆ کۆکردنەوەی سوپا بۆ سەر شاری مەدینە، موخابەراتی پێغەمبەر ﷺ بەهەوڵەکەیان زانی، دەستبەجێ پێغەمبەری خوا ﷺ سوپایەکی گەورەی پێکهێنا، پێش وەخت هەڵیکوتایە سەر بەنی سولەیم کە زانییان سوپاکە هاتۆتە سەریان هەموویان ڕایانکردە سەر شاخەکانی دەوروبەریان، پێغەمبەری خوا ﷺ دەستکەوتێکی باشی لێیان گرت، نزیکەی (٥٠٠) وشتری لێگرتن و دابەشی کرد بەسەر سوپاکە، ئەم ڕووداوە بە (٧) ڕۆژ دوای جەنگی بەدر ڕوویدا، ئیتر بەتەواوی ترس و بیم کەوتە دڵی چەتە و ڕێگرەکان و هەیبەت و هێز و توانای موسڵمانان لە ناوچەکەدا زیاتر بوو، بەتایبەت لەنیوەدوورگەی عەرەبی. بێجگە لەم هەوڵانە زۆر هەوڵی تر درا، بەڵام موسڵمانان سەرکەوتن لەدوای سەرکەوتنیان بەدەست هێنا.

خاڵی هەشتەم: جەنگی بەدر بووە هۆکاری گۆڕینی گرووپەکان لەنێو مەدینەدا

پێش جەنگی بەدر گرووپەکانی نێو شاری مەدینە پێکهاتبوون لە سێ جۆر: (موسڵمان، موشریک و یەهوود)، بەڵام لە دوای سەرکەوتنی جەنگی بەدر تەنها دوو گرووپ مانەوە: ئەویش موسڵمانان و یەهوودییەکان بوون، موشریکی مەدینە بوون بەدوو بەش، بەشێکیان بەدڵ و گیان موسڵمان بوون و بەشێکی دیکەیان بوونە دووڕوو (مونافیق).

هەمیشە وایە کاتێک موسڵمانان شان و شەوکەتیان بەهێز بوو، مونافیق زۆر دەبێت هەروەها بە پێچەوانەوە کاتێک موسڵمانان لاواز بوون کوفر و ئیلحاد زۆر دەبێت، لەهەر کاتێک مونافیق زۆربوو ئەوە نیشانەی بەهێزی موسڵمانانە، چونکە کاتێک لاواز بوو موشریکەکان ئاشکرا بوون و باکیان بە موسڵمانان نەبوو.

سەرکردارەتی ئەو گرووپە نوێیە کەسێک دەیکرد زۆر ڕقی لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو، پێشتر سەرۆکی موشریکەکان بوو وا ئێستا بووە بە سەرۆکی مونافیقەکان، ئەویش (عەبدوڵلای کوڕی ئوبەی کوڕی سەلوول)ە، هەموو ئەو موشریکانەی پێشتر هاتن و بانگەشەی موسڵمانبوونی خۆیان کرد لەڕووکەش وەکو موسڵمانان بوون،



لەژێرەوە دژی موسڵمانان کاریان دەکرد و هەموویان کافربوون بە ئیسلام، بێگومان ئەمانەش کە بوونە مونافیق کاریگەری خراپ لەسەر شاری مەدینە دادەنێت.

نومێر لە قسەکانی بوویەوە بەدەم قسەکانییەوە گەیشتینەوە لای دەوارەکەی خۆمان و بەمنی وت: بڕۆ پشوو بدە، چاوم نا بەیەکدا کە بەئاگا هاتم لە کەرەنتینەی زیندانی ئیتاڵیا بووم.

ڕووداوەکان زۆر سەرنج ڕاکێش بوون، بەهەرحاڵ لەدوای ئەوەی کە شەڕم کردبوو لەگەڵ پۆلیسەکاندا دوای دوو هەفتە بردمیانەوە بۆ ئەو بەشەی خۆم کە مامۆستا کرێکاری لێبوو، بۆ ئێوارەکەی مامۆستا خواردنی ئامادە کردبوو چوومە خزمەتی لەژووری زیندانەکەیدا خەریکی نووسینی تەفسیری سوورەتی فاتیحە بوو و ئەو شەوە تەفسیرەکەی تەواو کرد، دڵخۆشبوو بۆیە دایە من بیخوێنمەوە، ماوەی چەند هەفتەیەک بەیەکەوە بووین، ڕۆژێکی هەینی مامۆستا وتاری بۆمان دەدا لەحەوشی زیندانەکەوە بانگی من کرا وتیان: کەریم با بێت، منیش بە پاسەوانەکانم وت: دوای نوێژ، لە نوێژی هەینی تەواو بووین، مامۆستا وتی: بڕۆ بزانە چییە، بەڵام شەڕ مەکە.

کە چووم بینیم نامەیەکم بۆ هاتبوو حکومەتی ئیتاڵی لەسەر داوای حکومەتی نەرویجی بڕیاریداوە بتگەڕێنێتەوە بۆ نەرویج، جا پێویستمان بە ڕەزامەندی تۆ هەیە ئایا دەگەڕێیتەوە بۆ نەرویج یان هەر لە ئیتاڵیان دەبیت؟

خەریک بوو بڵێم: ئای کە چەندە کەر و بێعەقڵن، بەڵام قسەکەی مامۆستام لە بەرچاوگرت، وتم: با نەڵێت قسەی شکاندووم، تۆزێک بوغزاندمن، وتم: چۆن منتان هێناوە، ئاواش دەبێ بمگەڕێننەوە. هاتمەوە زۆر دڵخۆش بووم بەڵام دڵم نەدەهات بە مامۆستا بڵێم.

مامۆستا بانگی کردم وتی: چی بووە؟

ماکوان: بانگیان کردم وتیان: دەتەوێ بگەڕێیتەوە نەرویج، منیش وتم: بەڵێ.

مامۆستا کرێکار: ئێ شتێکی زۆر باشە کاتیان دیاری کردبوو؟

ماکوان: نەوەڵڵا هەر ئەوەندەیان وت.

مامۆستا کرێکار: هەرچەندە درۆزنن هەتا بڕیارەکەت بەدەست نەگات باوەڕ مەکە.

ماکوان: بەڵێ ڕاستە، من بڕیارەکەم بەدەست گەیشتبوو بەڵام کاتی تێدا دیاری نەکرابوو، ئیتر بۆ حورمەتی مامۆستا نەمووت: بڕیارەکەم بەدەست گەیشتووە، هەرچەندە بڕیارەکەش بە



ئیتاڵی نووسرابوو نەمدەزانی نیشانی کام لە هاوڕێکانمی بدەم، وا نزیکی یەک ساڵ و هەشت مانگە چاوەڕێی ئەو بڕیارەم، تا ئێوارەیەک چووم بۆ لای سەمیر و وتم: سەمیر ئەو نامەیەم بۆ بخوێنەوە با کەس نەزانێت، خوێندییەوە دەستی کرد بە پێکەنین وتی: تەواو بوویت لێرە، چاوەڕوانی کات بە بۆ گەڕانەوەت بۆ نەرویج.

ماکوان: سەمیر لەبەر مامۆستا کرێکار باسی مەکە، باشە.

سەمیر: زۆرباشە، بۆچی پێی ناخۆشە؟

ماکوان: نەوەڵڵا هەرگیز پێی ناخۆش نییە، بەڵام خۆ دەبێت بار و گوزەرانی ئەویش ڕابگرم، خۆی و زاواکەی لێرەن. نەرویج هەموومانی ڕادەستی ئیتاڵیا کردووین، وا بڕیار دراوە و من دەگەڕێمەوە، جا لەبەر ئەوە بۆ حورمەتی ئەوان، لەکاتێکی تردا خۆم پێیدەڵێم کە گونجاو بێت.

سەمیر: زۆرباشە بێخەم بە، دوای چەند ڕۆژێک لەگەڵ مامۆستا پیاسەم دەکرد وتم: مامۆستا نامەیەکم بۆ هاتووە نازانم بیدەمە کێ بیخوێنێتەوە، نازانم چی تێدا نووسراوە، نامەکەم دایە دەست خۆی، وتی: دەیدەینە دەست عەبدوسەلام ئیتاڵییەکەی باشە، کە خوێندییەوە من وتم: بڕواناکەم هەمووی درۆیە، بەو شێوەیە مامۆستا بە هەواڵەکەی زانی و زۆر خۆشحاڵ بوو.

من هەر لەبەر دڵی ئەو دەمووت: ئەوانە هەمووی درۆزنن و جێگەی متمانە نین، مامۆستاش دەیوت: مادەم بووە بە بڕیار بێخەم بە، دەگەڕێیتەوە نێو ماڵ و منداڵی خۆت، ئێمە وا پەیمان دەبرد کە بگەڕێمەوە نەرویج زیندانم ناکات، سەرەتا ئەمە بڕوای من بوو.

بەهەرحاڵ ڕۆژانم دەژمارد بۆ ئەوەی کەی دەمگەڕێننەوە، دەنگ نەبوو چوومەوە سەر کتێبەکەی فەرغەلیو گەڕامەوە بۆ ژیانی نێو هاوەڵان و پێغەمبەری خوا ﷺ. نومێر بانگی کردم چاوم کردەوە وتی: ماکوان هەڵسە با بڕۆین بۆ شاری مەدینە و جەنگ لەگەڵ جوولەکەکان.

ماکوان: کێ جەنگ لەگەڵ جوولەکەکان دەکات؟

نومێر: بەدڵنیاییەوە موسڵمانان لەگەڵ یەهوود جەنگیانە.

خاڵی نۆیەم: کاریگەری جەنگی بەدر لەسەر جوولەکەکان:



وەک باسمان کرد لەشاری مەدینەدا سێ هۆزی گەورەی یەهوودییەکان دەژیان، هۆزی بەنی قەینقاع و هۆزی بەنی نەزیر و هۆزی بەنی قورەیزە، باسی ئەوەشمان کرد لەگەڵ پێغەمبەری خوادا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ پەیماننامەیان مۆرکرد، بەڵام هەموو جارێک پەیمانەکەیان دەشکاند، پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ هەرگیز نەیدەویست ڕووبەڕوویان ببێتەوە، خۆی لەشەڕیان لادەدا، هەر دانی بەخۆیدا دەگرت و ئارامی دەبەخشییە هاوەڵان، بۆ ئەوەی دان بەخۆیاندا بگرن، بەڵام لەدوای سەرکەوتنی بەدر و گەڕانەوەی سوپای پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ بەهێزو سەربەرزی و عیززەتەوە، بەڵام یەهوود زۆر بوغزن و دڵپیس بوون بە سەرکەوتنی پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ کاردانەوەیان زۆر سەیر بوو، لەجیاتی ئەوەی خۆشحاڵ بن و هاوکاری هاوکارەکەیان بکەن، کەچی ڕێک پێچەوانەکەی دەرکەوت، تانە و تەشەریان لە موسڵمانان دەدا و دەیانوت: ڕووبەڕووی قورەیش بوونەتەوە، ئەوان لەجەنگ نازانن توانای جەنگیان نییە. ئێمەی یەهوود لە جەنگدا بەهێزین و بەوە هەڵمەخەڵەتێن کە ڕووبەڕووی چەند سەرێک لە قورەیش بوونەتەوە، ئەوان لەجەنگ نازانن.

زۆر ئازاری پێغەمبەر صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ و موسڵمانانیان دەدا بە قسەی ناشیرین، تەنانەت کار لەوە زیاتر بوو قسەیان بەخوا دەوت! بۆیە پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ چووە بازاڕەکەیان و ویستی پێیان ڕابگەیەنێت بۆچی وا سەرکێش و پەیمان دەشکێنن هەمیشە ڕاستگۆ نین، دەم پیس و کاری بەدڕەوشتی دەکەن، فەرمووی: ئەی خەڵکی یەهوود موسڵمان بن، پێش ئەوەی ئەمەی تووشی قورەیش بوو، تووشی ئێوەیش ببێ.

مەبەستی پێغەمبەری خوا ئەوە نەبوو بەزۆر بانگیان بکات بۆ ئیسلام، بەڵکو دەیویست ئەوەیان پێ بڵێت: دژایەتی خوا و پێغەمبەرەکەی صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ مەکەن، با وەکو قورەیشتان بەسەر نەیەت.

ئەوانیش بەوپەڕی لووتبەرزی و بێئەدەبی وتیان: ئەی موحەممەد! بەوە هەڵمەخەڵەتێ چەند کەسێکت لە قورەیش کوشتووە، ئەوانە لەڕووی سەربازییەوە نەزانن منداڵن و جەنگ نازانن. ئەگەر لەگەڵ ئێمە بجەنگیت ئەوکات دەزانی ئێمە چ جۆرە خەڵکێکین، لە ڕووبەڕووبوونەوەدا هەرگیز خەڵکی وەکو ئێمەت نەدیوە.[١١٥]

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

١١٥ ـ (عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ لَمَّا أَصَابَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قُرَيْشًا يَوْمَ بَدْرٍ وَقَدِمَ الْمَدِينَةَ جَمَعَ الْيَهُودَ فِي سُوقِ بَنِي قَيْنُقَاعَ فَقَالَ يَا مَعْشَرَ يَهُودَ أَسْلِمُوا قَبْلَ أَنْ يُصِيبَكُمْ مِثْلُ مَا أَصَابَ قُرَيْشًا قَالُوا يَا مُحَمَّدُ لَا يَغُرَّنَّكَ مِنْ نَفْسِكَ أَنَّكَ قَتَلْتَ نَفَرًا مِنْ قُرَيْشٍ كَانُوا أَغْمَارًا لَا يَعْرِفُونَ الْقِتَالَ إِنَّكَ لَوْ قَاتَلْتَنَا لَعَرَفْتَ أَنَّا نَحْنُ النَّاسُ وَأَنَّكَ لَمْ تَلْقَ مِثْلَنَا) أبو داود: (٣٠٠١).



لێرەدا یەهوودی بەنی قەینووقاع بە ئاشکرا بانگەوازی جەنگیان کرد دژی پێغەمبەری خوا ﷺ و موسڵمانان، ئەمەش سەرپێچییەکی دیکەی ئەوانەی کە هاوکاری موسڵمانانیان نەکرد، بەڵکو دژایەتیان دەکەنو هاوکات بۆ هاوکاری قورەیش بۆ غەزای شاری مەدینە لەوانە (کەعبی کوڕی ئەشرەف).

ئەمەش سەرەتای بانگەشەی جەنگی یەهوود بوو لەنێو شاری مەدینەی پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێک یەهوودی بەنی قەینووقاع بەو شێوەیە لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ دا بەرخوردیان کرد، خوای پەروەردگار ئایەتی لەسەر دابەزاندن و فەرمووی:

﴿قُل لِّلَّذِينَ كَفَرُواْ سَتُغْلَبُونَ وَتُحْشَرُونَ إِلَىٰ جَهَنَّمَ وَبِئْسَ ٱلْمِهَادُ ۝ قَدْ كَانَ لَكُمْ ءَايَةٌ فِى فِئَتَيْنِ ٱلْتَقَتَا فِئَةٌ تُقَٰتِلُ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ وَأُخْرَىٰ كَافِرَةٌ يَرَوْنَهُم مِّثْلَيْهِمْ رَأْىَ ٱلْعَيْنِ وَٱللَّهُ يُؤَيِّدُ بِنَصْرِهِۦ مَن يَشَآءُ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَعِبْرَةً لِّأُوْلِى ٱلْأَبْصَٰرِ ۝﴾ [آل عمران]

واتە: ئەی موحەممەد بڵێ: بەوانەی باوەڕیان نەهێناوە سەرەنجام تێکدەشکێن و ژێر دەخرێن، (لەدونیا و لە ڕۆژی دواییشدا) کۆدەکرێنەوە و ڕاپێچ دەکرێن بۆ ناو دۆزەخ کە ناخۆشترین جێگەیە، ئەی موحەممەد بەو خەڵکە بڵێ: لەو دوو دەستەیەی کە لە جەنگی بەدردا بەرەو ڕووی یەکتر وەستان نیشانە و پەندێکی گەورەبوو بۆتان، دەستەیەکیان لەپێناوی خوادا دەجەنگان، دەستەکەی تریان بێباوەڕ بوون. ئیمانداران لەبەرچاوی ئەواندا دوو ئەوەندەیان دەنوواند، لە مەیدانی جەنگدا بەچاوی بینایی و بینین خوا فریشتەی دابەزاند بۆ یارمەتی ئیمانداران، خوا پشتگیری هەر دەستەیەک هەر کەسێک بیەوێت دەکات، بەڕاستی لەو یارمەتیدانە پەندو ئامۆژگاری هەیە بۆ کەسانێک بینایی خۆیان بەکار دەهێنن و بەوردی بیر دەکەنەوە.

ئەمەش لەماوەی داهاتوودا ستراتیژی نێوان یەهوود و موسڵمانانە، هەرچەندە یەهوود کوێراییان داهاتبوو، ئەگینا هیچ تێنەدەگەیشتن، بەڵام لەحاڵی خۆیاندا نەوەستان، بەڵکو زیاتر پێیان ڕاکێشا و ئازار و پیلان و فێڵیان دژی موسڵمانان ئەنجامدا.



# سەرەتای جەنگ لەگەڵ یەهوودی بەنی قەینووقاع

نومێر: ئافرەتێکی موسڵمان چووە بازاڕی بەنی قەینووقاع لای زێڕینگەرێکی یەهوودی کڕین و فرۆشتنی ئاڵتوونی دەکرد، یەهوودییەکان بە سروشت داوێن پیسن، داوایان کرد ئافرەتە موسڵمانەکە نیقاب و حیجابەکەی لابدات، بەڵام ئافرەتەکە ڕازی نەبوو، یەکێک لە جوولەکەکان لەدواوە بەشێک لە جلەکانی بەستەوە، بەو هۆکارە ئافرەتەکە سەرپۆش و نیقابەکەی لەسەر کەوتە خوارەوەو قیژاندی، قەدەری خوای گەورە کەسێکی موسڵمان لە بازاڕەکەدا بوو کە بینی ئەو یەهوودییە دەستدرێژی نامووس و سەرپۆشی لەسەر ئافرەتە موسڵمانەکە لاداوە، چووە سەری و کوشتی، لەناو بازاڕەکەدا هەموو یەهوودییەکان لەو پیاوە موسڵمان کۆبوونەوەو شەهیدیان کرد.

ئەمەش سەرەتای دەستپێکی جەنگی یەهوود بوو لەگەڵ موسڵماناندا دوو تاوانیان ئەنجامدا، دەستدرێژی بۆ سەر ناموسی ئافرەتێکی موسڵمان و کوشتنی هاوەڵێک.

هەواڵ گەیشتە پێغەمبەری خوا ﷺ، پێغەمبەری خوا ﷺ دەستبەجێ بۆ حورمەتی ئەو ئافرەتە موسڵمانە سوپای کۆکردەوە و هاوەڵانی بانگ کرد، خێرا بەرەو قەڵا و جێگەی بەنی قەینوقاع کەوتنە ڕێ، بەنی قەینوقاعیش کە پێشتر باسی ئازایەتی و جوامێری خۆیان دەکرد، هەموو لە ترساندا چوونە نێو قەڵاکانیان، وەکو مار و مێروو خشۆکەکان خۆیان لە قەڵاکانیاندا شاردەوە!

پێغەمبەری خوا ﷺ جەختی کردەوە لەسەر قەڵا و مەتەرێزەکانی بەنی قەینوقاع، تاکو ملکەچی فەرمانی خوا و پێغەمبەرەکەی دەبن.

ماکوان: پێغەمبەری خوا ﷺ سوپایەکی خستەڕێ، لەپێناو حورمەتی ئافرەتێکی موسڵمان، کە دەستدرێژی ناموسی کرابووە سەر، بزانە ئێستا چەندە حورمەتی ئافرەتی موسڵمان دەبەزێنرێت و هیچ کەسێک لە موسڵمانان نەک دەنگی لێبەرز نابێتەوە، بەڵکو هەر بەخەیاڵیشیدا نایەت، تەنانەت دەگاتە ئەوەی کە ناموسیان دەبەزێنن و دەیانکوژن، بەڵام لەم جیهانی ئیسلامییەدا هیچ باس و هەواڵێک بۆ غیرەتی موسڵمانان بەگوێرەی پێویست نابیستی، بەڵام ئەو پێغەمبەرەمان ڕابەر و تاجی سەرمان ﷺ چۆن بەخێرایی بۆ ئافرەتێک سوپایەکی ئامادەکرد؟! بەڕاستی مرۆڤ شەرم دەکات لەباسی واقیعی ئێستا و پێوانەکردنی بە ژیانی پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵان.



تەمەشای غیرەت و کەرامەتی دەوڵەتی ئیسلامی بکە، یەهوود دەستدرێژی کردە سەر ئافرەتێک چۆن پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ بەجددی وەریگرت و سوپای ڕێکخست، گەمارۆی قەڵا و بارەگای یەهوودی دا. لەکاتێکدا ئەوان خاوەنی چەک و قەڵا و هێز و مەتەرێزی بەهێز بوون، پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ هەموو ئەوانەی لەبەرچاودا هیچ بوو بۆ بەدەستهێنانەوەی سەروەری، سەربەستی، غیرەت و کەرامەتی دەوڵەتی ئیسلامی لەشاری مەدینە.

ئەی گەمارۆکە چەندی خایاندو چی ڕوویدا؟

نومێر: زۆر ڕاستە گەمارۆکە لە نیوەی شەوالی ساڵی (٢)ی کۆچی بوو، بەمانگێک دوای جەنگی بەدری گەورە بوو، پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ و سوپاکەی ماوەی دوو هەفتە بەتەواوی گەمارۆی دان، تاکو دەرکەوتنی مانگی (ذولقیعدة) خوای گەورە ترس و بیمی خستە نێو دڵی جوولەکەی بەنی قەینووقاع، هەموو ملکەچ بوون بۆ فەرمانی پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ. تەواوی ئەو کارە قێزەونانەی ئەنجامیان داوە لە دەستدێژی بۆ سەر ئافرەتی موسڵمان کوشتنی هاوەڵی پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ جنێو و قسە وتن بە خوا و پێغەمبەر و موسڵمانان و بەرپاکردنی شەڕو ئاشووب و فیتنە لەنێو موسڵمانان.



## فیقهی واقیعی ئیسلامی لە کارکردنی پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ

ماکوان: کاتێک پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ زانی موسڵمانان هێزیان هەیە و توانای ڕووبەڕووبوونەوەیان هەیە لەبەرانبەر یەهوود دا، چاوەڕوانی هیچی نەکرد و ڕاستەوخۆ گەمارۆی دان، چونکە خاوەن چەک و سوپا و هێز و توانا و پارە بوون، ئەمە پێوانە ناکرێ بە ڕەوشی شاری مەککە. خاتوو سومەییە شەهید دەکرێ بەدەستی ئەبو جەهل، دایکی هاوەڵی بەڕێز عەماری کوڕی یاسر.

تەنها فەرمووی: ئارام بگرن ئەی خانەوادەی یاسر، جێگاو مەنزڵتان بەهەشتە.[١١٦] پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ کۆمەڵێک گەنجی خوێنگەرمی کۆنەکردەوە بڵێ: بڕۆن ئەبو جەهل بکوژن نەخێر، بەڵکو زۆر واقیعی بوو، دەیزانی هێزی موسڵمانان نەگەیشتۆتە ئەو ڕادەیە، بەڵام ئێستا جیهاد فەرزە و توانای مسڵمانان تا ڕادەیەک بەهێزە و فەرمانیان بە جەنگ پێ کراوە، هەربۆیە پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ بەرانبەر ئافرەتێک کە دەستدرێژی دەکرێتە سەر بڕیاری جەنگ دەدات.

کەواتە: ئەگەر ویستمان پەیوەندیمان لەگەڵ موشریک و یەهوود دا هەبێت دەبێت بەشێوەیەکی گشتی بزانین ئەوانەی دژی ئەو ئیسلامەن کەی و چۆن و لەچ کاتێکدا بڕیاری جەنگ و ئاشتی و پەیوەندی ئەدەیت، بۆیە ژیانی پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ وەکو قورئان وایە دەبێ بەجوانترین شێوە لێی بکۆڵینەوە تا بتوانین بڕیاری ڕاست و دروست بدەین لە کارەکانماندا، چونکە ژیانی پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ هەموو نموونەیەکی تێدایە بۆ ژیانی موسڵمانان لە ئاشتی، جەنگ، پەیوەندی بەستن، دروستکردنی دەوڵەت و بانگەواز و فەرمان بەچاکە و ڕێگری لە خراپە...هتد.

ژیانی پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ بۆ ئێمە چیرۆک و مێژوویەکی هەروا سادە و ئاسان نییە بۆ خوێندنەوە، بەڵکو مەنهەجی ژیانی هەموو موسڵمانانە، لە مۆریتانیاوە تا مالیزیا و هەموو گۆی زەوی، ئەمەش موعجیزەی سیرەتی پێغەمبەرە، هەروەک قورئان تا ڕۆژی قیامەت لەگەڵماندا ڕێدەکات، هەرجارە و بەخوێندنەوەی شتی نوێ و وانەی نوێی لێ فێردەبین.

---

١١٦ـ ( صَبْرًا آلَ يَاسِرٍ فَإِنَّ مَوْعِدَكُمُ الْجَنَّةَ).



## دوو ڕووەکان و یەهوودییەکان هەمیشە هاوکارن

نومێر: یەهوود ڕازی بوون بە فەرمانی پێغەمبەر ﷺ دەرچوون لە قەڵاکانیان، هەموو بەدیل گیران و پێغەمبەری خوا ﷺ بڕیاری کوشتنی بۆ سەربازە یەهوودییەکانی بەنی قەینووقاع دەرکرد، بریتی بوون لە (٧٠٠) سەرباز.

کە هەواڵ گەیشتە عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی کوڕی سەلوول هەمووی چەند ڕۆژێک بوو موسڵمانبوونی خۆی ڕاگەیاندبوو، هاوپەیمان بوو لەگەڵ بەنی قەینوقاع، داوای لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد لەگەڵیاندا چاکە بکات و نەیانکوژێت، بەڵام پێغەمبەری خوا ﷺ ڕەتی کردەوە، چونکە ئەمانە تاوانباری سەربازین و چەندین جار سەرپێچی یاسا و دەستوور و عورف و هەموو شتێکیان کردووە، هەروەها گەورەترین فیتنە بوون لەشاری مەدینە بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ بڕیاری کوشتنی هەموو چەکهەڵگرانی ئەو هۆزەی دا، جارێکی دیکە عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی کوڕی سەلوول داوای کردەوە، بەڵام پێغەمبەری خوا ﷺ ڕەتی کردەوە، بۆ جاری سێیەم دەستی خستە نێو درعەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ هەرچەندە پێغەمبەری خوا ﷺ تووڕە بوو فەرمووی: دەستت لابە و زیاتر تووڕە بوو فەرمووی: ئەی سەرگەردان مەمگرە، بەڵام ئەو مونافیقە پێغەمبەری خوا ﷺی گرت وتی: سوێند بەخوا وازت لێ ناهێنم هەتاوەکو لەگەڵ هاوپەیمانەکانم چاکە نەکەیت، ٤٠٠ شمشێر بەدەست و ٣٠٠ خاوەن زرێ (درع) منیان لە جەنگی ڕەش و سپی پاراستووە، لە ئێوارەیەکدا تۆ هەموویان دەکوژیت؟ سوێند بەخوا دەترسم ئیتر کەس نەمپارێزێت، کێشەمان بۆ دروست بێت.

ئاوا بە ڕاشکاوانە بەوپەڕی بێئەدەبی ئەو قسانەی کرد چونکە هاوپەیمانی بوون، بەنی قەینوقاع هێزی بنەڕەتی عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی کوڕی سەلوول بوون، گەورەی خەزرەج پێش هاتنی پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ مەدینە، ئەوەندە چاو قایم بوو بیر و ئینتیمای بۆ موسڵمانان نەبوو، هەر چاوەڕێی هێزی یەهوود بوو بۆ پارێزگاری، چونکە بۆ ئەو زۆر قورس بوو سوپای یەهوودییەکان لەناو بچێت، بیری لەوە نەکردەوە کە موسڵمانە و هێزی ئیسلام یەکەمە، چونکە مونافیقە و بەدوای پلاندا دەگەڕێت. دەیویست پەیوەندی توندوتۆڵی لەگەڵ یەهوود دا هەبێت، تاوەکو پێغەمبەری خوا ﷺ بەخشی لەبەر ئەوەی نوێیە و دڵی ڕازی کرد بەوەی کە نەیانکوژێت، بەڵام مەرجی لەسەر هەموویان دانا بەوەی کەوا شاری مەدینە جێبهێڵن، هیچ کام لە هۆز و تیرەی بەنی قەینوقاع لەو شارەدا وجوودیان نەمێنێت،



ئەم ڕازی کردنەی دڵی عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی کوڕی سەلوول بۆ خۆی نەبوو بەڵکو لەناو ئیسلامدا خەڵکێکی لەگەڵدابوو، ئومێدی ئەوەیان لێ دەکرا کە ئیسلامەتییان باش بکەن و واز لە دووڕوویی بهێنن.

بەنوو قەینوقاع مەرجیان لەسەر دانرا و هەموویان دەرچوون لە شارەکە و کەسیان لێ نەکوژرا، چوونە ناوچەی (ئەزرەعات) لە شام، لەماوەیەکی کەمدا تاعوون و زەمینلەرزە ڕووبەڕوویان بوویەوە و یەک کەسیان دەرنەچوون، بەمەش کۆتایی بنەڕەتی بە هۆزی بەنی قەینوقاع هات لە شانۆی مێژوودا.



# کاتی گونجاو بۆ بڕیاردانی جەنگ

ماکوان: تەماشای پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ بکە، ئەو بڕیارەی نەدا هەتا هێز و توانای گەیشتە ئاستی هێزی یەهوودییەکان لەشاری مەدینە، لەدوای ئەوەی دڵنیابوو لە ئابووری خۆی و هێزی سەربازی خۆجێیی و دامەزراندنی بازاڕی ئیسلامی بەهێز و توانای پیشەوەرانی. پێشتر هەموو شاری مەدینە ڕوویان دەکردە بازاڕی قەینوقاع.

جا بۆ وێنە ئەگەر پێشتر ئامادەکاری نەکرابایە بۆ بازاڕی موسڵمانان، داخۆ لەدوای دەرکردنی بەنی قەینوقاع چ قەیرانێک ڕووی دەکردە شاری مەدینە؟ هەر بە گەیشتن بۆ شاری مەدینە ئەو لایەنەی کە بازاڕ و ئابووری بوو پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ چارەسەری بۆ دۆزییەوە، نەیهێشت لای یەهوودەوە قۆرخ و مۆنۆپۆل بکرێت.

ئێستا ئاو موڵکی موسڵمانانە پێشتر یەهوود خاوەنی ئاو بوو لەشاری مەدینە، پێشتر باسی ڕووداوی کڕینی بیری ڕوومە (رومة)مان کرد کە عوسمانی کوڕی عەففان کڕی، ئێستا سوپای موسڵمانان تەنها پشت بەخۆیان دەبەستن و لەدەرەوەی خۆیان چاویان لەکەس نییە هاوکاریان بکات. پێکهاتوون لە موهاجیر و ئەنسار، بەڵام عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی کوڕی سەلوول تا ئەو ساتەوەختەش پشتی بە یەهوود بەستووە بۆ پارێزگاری لێکردنی.

کەواتە: کاتەکە لەبار بوو بۆیە پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ بڕیاریدا جەنگ لەگەڵ یەهوودی بەنی قەینوقاع دا بکات. خۆ ئەگەر پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ ئەو هەڵوێستەی نەنواندبایە یەهوودییەکان زیاتر پێیان ڕادەکێشا لەوەی بەرانبەر ئەو ئافرەتە کردیان و موسڵمانێکیان شەهید کرد، چەندین سەرپێچی تریشیان هەبوو، خۆ ئەگەر ئاوا لەجێی خۆیاندا ڕانەگیرانایە پێدەچوو لە قۆناغی داهاتوودا گاڵتە و گەپ بەخوا و پێغەمبەر و دەوڵەتی ئیسلامیش بکەن.

چونکە یەهوودی ئێستا و جاران و داهاتوو یەک سروشتیان هەیە لەهیچ کات و زەمانێکدا گۆڕانکاری بەسەردا نایەت هەتا لە ئاستیاندا بێدەنگ بیت، ئەوان زیاتر پێ ڕادەکێشن و هەوڵ دەدەن وجوودت نەهێڵن، خۆ ئەگەر لەجێگەی خۆیدا هەڵوێستت وەرگرت و لێت ترسان ئەوە دڵنیابە زۆر لارەمل و لەسەر ئەژنۆ بۆت دادەنیشن. لە قورئاندا بۆمان باس کراوە مێژووش زۆری لەسەریان تۆمار کردووە، بینیشمان کە چۆن سەرپێچی ئیسلامیان کردوو هەموو هیجرەتیان کرد بۆ فەڵەستین. لەکاتێکدا ئەم کارە لە یەهوودییەکان قەدەغە بوو،



چونکە موسڵمانان بێدەنگ بوون ئەوان پێیان زیاتر ڕاکێشا، پاشان گوێیان بە ئابووری فەڵەستین نەدا، وا ئێستا هەموو ئابووری فەڵەستین لەژێر دەستیاندایە، گوێیان نەدا بەوەی چەکی قورس بەکاربهێنن، وا ئێستا خاوەنی چەکی قورس و ناوەکین!

بەهۆکاری بێدەنگی موسڵمانان بڕیار لە نەتەوە یەکگرتووەکانەوە دەرچوو، بە دابەشکردنی فەڵەستین لەنێوان یەهوود و موسڵمانان، پاشان ئیسرائیل دەوڵەتی خۆی دامەزراند لەساڵی (١٩٤٨)ز. جەنگی دەستپێکرد، لەساڵانی (١٩٥٦-١٩٦٧)ز. دوایی لە (١٩٨٢)زاینی لەگەڵ لوبنان، میسر، سووریا...هتد. هەر موسڵمانان بێدەنگ بوون ئەوان بوونە خاوەن بەشێکی گەورە لەخاکی موسڵمانان.

بەڵام پێغەمبەری خوا ﷺ نەیهێشت ئەو کارەساتە ڕووبدات، بڕیاریدا بەزووترین کات گەمارۆی قەڵای بەنی قەینوقاع بدات، لەسەر ئەو سەرپێچییانەی کە خۆیان پێشتر لەگەڵ دەوڵەتی ئیسلامی هاوپەیمانێتییان مۆرکرد، هەر خۆشیان سەرپێچییان کرد، گەیشتن بە بڕیاری ساغ و سەلیمی پێغەمبەر ﷺ لە خاک و زێدی شاری مەدینە دەرکران، ئەمەش دوای دوو ساڵ لە کۆچی پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ شاری مەدینە.

پاشان کێشەی مونافیق زۆر ترسناکە لە یەهوود ترسناکترە، یەهوود دیارن و دەناسرێن، بەڵام دووڕووەکان ناو جلوبەرگیان وەکو موسڵمانانە، زۆرجار خۆیان لە ئیماندارانی ڕاستەقینە باشتر پیشان دەدەن، چونکە ئەوان کوفرەکەیان دەشارنەوە، خۆیان بە ئیسلام دەناسێنن و ڕووکەشیان موسڵمانانەیە، ئەم جۆرە خەڵکە هەمیشە پەیوەندی بەهێزی لەگەڵ یەهوود دا هەیە و ئەوان سوود لە دووڕووەکان وەردەگرن.

جا ئەو پەیوەندییە لەسەردەمی پێغەمبەری خوا ﷺ هەبووە و دەشمێنێت، لە ئێستادا بەباشترین شێوە بەدی دەکرێت تا ڕۆژی قیامەت بەردەوامە. ئەمەش چیرۆکێک نییە ماکوان دایهێنابێ، بەڵکو فەرموودەی خوای پەروەردگارە لە قورئاندا دەفەرموێت:

﴿۞ أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ نَافَقُوا۟ يَقُولُونَ لِإِخْوَٰنِهِمُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مِنْ أَهْلِ ٱلْكِتَـٰبِ لَئِنْ أُخْرِجْتُمْ لَنَخْرُجَنَّ مَعَكُمْ وَلَا نُطِيعُ فِيكُمْ أَحَدًا أَبَدًا وَإِن قُوتِلْتُمْ لَنَنصُرَنَّكُمْ وَٱللَّهُ يَشْهَدُ إِنَّهُمْ لَكَـٰذِبُونَ ﴿١١﴾﴾ [الحشر]

ئایا سەرنجت نەداوە ئەوانەی دووڕووبوون بە بێباوەڕەکانیان لەخاوەن کتێبەکان دەڵێن: ئەگەر ئێوە دەربکرێن ئێمەیش لەگەڵتاندا دەردەچین، هەرگیز دژی ئێوە بە قسەی کەس



ناکەین، خۆ ئەگەر جەنگتان دژ بکرێت ئێمە پشتیوانیتان لێدەکەین، بەمەرجێک خوا خۆی شایەتە کە ئەوانە درۆزنن.

خوای گەورە ناوی مونافیق و جوولەکە بە برای یەکتر دەبات، ئەم وانەیە زۆر گرنگە بۆ خەڵکی موسڵمانان لە سیرەتی پێغەمبەرماندا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ باش لێیتێبگەن، هەموو مونافیقێک برای یەهوودییەکە.

بەڵام با من پرسیاری ئەوە بکەم ئەی (کەعبی کوڕی ئەشرەف) بۆ کوژرا، خۆ لەهۆزی جوولەکەی بەنی قەینوقاع نەبوو، بەڵکو لە یەهوودی بەنی نەزیر بوو؟



# کوشتنی کەعبی کوڕی ئەشرەف

نومێر: لەڕاستیدا کەعبی کوڕی ئەشرەف یەکێک بوو لە ناودار و قیاداتی بەنی نەزیر، ناسراوی عەرەب و جوولەکە بوو، بەڕوون و ئاشکرا جنێوی بەخوا و پێغەمبەر ﷺ دەدا، سروود و گۆرانی و شیعری هەجووی جنێو ئامێزی دژی هاوەڵان و پێغەمبەری خوا ﷺ دادەنا، بەڵکو بەوەوە نەوەستا لەدوای جەنگی بەدر چووە شاری مەککە و هانی قورەیشی دەدا بۆ جەنگکردن و بیریی کوژراوەکانی دەخستنەوە دەیوت: بۆ لەگەڵ موسڵماناندا ناجەنگن، من چەکتان پێ دەدەم؟ لەگەڵ ئەوەی هەموو یەهوودییەکان دڵنیابوون کە موحەممەد نێردراوی خوای پەروەردگارە، کاتێک چووە شاری مەککە قورەیش پرسیاریان لێکرد: کام دیینت لەلا خۆشەویستە؟ ئێمە یان موحەممەد؟ ئەمە لەکاتێکدا قورەیش بتپەرست بوون.

لەوەڵامدا کەعب وتی دینی ئێوە ڕاسترە لە دینی موحەممەد! خوای گەورە ئایەتی لەسەر دابەزاند دەفەرمووێت:

﴿أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ نَصِيبًا مِّنَ ٱلْكِتَٰبِ يُؤْمِنُونَ بِٱلْجِبْتِ وَٱلطَّٰغُوتِ وَيَقُولُونَ لِلَّذِينَ كَفَرُوا۟ هَٰٓؤُلَآءِ أَهْدَىٰ مِنَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ سَبِيلًا ٥١﴾ [النساء]

ئایا نەتڕوانیووە ئەوانەی بەشێک لە کتێبی ئاسمانیان پێدراوە کەچی لەگەڵ ئەوەشدا باوەڕیان بە بت و جادووگەر و تاغووت هەیە، دەربارەی ئەوانەی بێباوەڕن دەڵێن: ئەوانە چاکترن و ڕێبازی ڕاستریان گرتووە، تا ئەوانەی ئیمان و باوەڕیان (بە ئایینی ئیسلام هێناوە).

کەعب بۆیە ئەو قسەیەی دەکرد تەنها بۆ ئەوەی هانییان بدات بۆ جەنگ دژی موسڵمانان، تەنانەت لە عورف و عاداتی عەرەبی جاهیلی دەرچوو کەعبی کوڕی ئەشرەف شیعر و گۆرانی بەسەر ئافرەتانی موسڵماناندا دەوت.

بەو پێیە بەنی نەزیر هاوپەیمانیان لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ دا هەبوو، بەڵام کەعب چەندین سەرپێچی لێ دەرکەوت، هەڵسا بەچەند تاوانکارییەک دژی موسڵمانان، چونکە لە دەقی پەیماننامەکەدا هاتبوو، نابێت هاوکاری قورەیش بکرێت، نابێت بەسەر موسڵماناندا سەربخرێن، زۆر کاری نەشیاوی تری ئەنجامدا وەکو پێشتر ئاماژەم پێدا.



بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ بەئاشکرا بڕیاری کوشتنیدا و فەرمووی: کێ بەکوشتنی کەعبی کوڕی ئەشرەف هەڵدەستێ، چونکە بێئەدەبی و بێڕەوشتییەکانی ئازاری خوا و پێغەمبەری خوا ﷺ دەدات؟[117]

کۆمەڵێک لە هاوەڵان خێرا دەست بەجێ و چاپووکانە هەڵسانەوە و مەفرەزەیەکیان پێکهێنا بۆ کوشتنی کەعبی کوڕی ئەشرەف، لەوانە: (موحەممەدی کوڕی مەسلەمە، عەبادی کوڕی بەشیر، ئەبو نائلە، حارسی کوڕی ئەوس، کۆمەڵێک لە هاوەڵانی ئەوسی) بەباشترین شێوە هەڵسان بە ئەنجامدانی کارەکە، بەم پاو پێوەندەش دەوڵەتی ئیسلامی کۆتایی هێنا بە ژیانی کەعبی کوڕی ئەشرەف.

ماکوان: ئەی بەنی نەزیر چی؟

نومێر: پێغەمبەری خوا ﷺ ستەمی لە هۆزەکەی نەکرد، چونکە دەیزانی هۆزەکەی پابەندن بە هاوپەیمانییەکە، تەنها بڕیاری کوشتنی کەعبی کوڕی ئەشرەفی دا، هۆزەکەی بەهیچ شێوەیەک بەشدار نەبوون لە کارە چەپەڵەکانی کەعب، تەنانەت دوای کوشتنی کەعب هۆزەکەی هاتن خۆیان لێ بێبەری کرد، پەیمانیان لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ نوێ کردەوە.

جیاوازی بەنی قەینوقاع و بەنی نەزیر ئەوەبوو، بەنی قەینوقاع هەموو بەشداربوون لە ئەنجامدانی کارەکە، بەڵکو جەنگیان گێڕا دژی موسڵمانان، بەڵام بەنی نەزیر هیچ هاوکاری کەعبیان نەکرد بەڵکو کارەکە تەنها کەعب ئەنجامیدا، بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ کارەکەی کەعبی بە فەردی وەرگرت و نەیکردە عام.

ماکوان: سبحان الله جوولەکە بەگشتی لەدونیای ئەمڕۆدا هەر خەریکی کاری فەساد و خراپەکارین، بە بەکارهێنانی ئافرەت تەنانەت لە (٨٠٪)ی فیلمی ڕووت و خراپ و پۆرن یەهوود سەرپەرشتی دەکات، هەرچی بەرنامەی ورووژاندنی سێکسییە هەر یەهوود خاوەنداری دەکات.

پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمووێت: یەکەم فیتنەی هۆزی بەنی ئیسرائیل ئافرەتە.[118]

---

١١٧. ـ (قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ : « مَنْ لِكَعْبِ بْنِ الْأَشْرَفِ ، فَإِنَّهُ قَدْ آذَى اللَّهَ وَرَسُولَهُ . فَقَامَ مُحَمَّدُ بْنُ مَسْلَمَةَ فَقَالَ : يَا رَسُولَ اللَّهِ ، أَتُحِبُّ أَنْ أَقْتُلَهُ ؟ قَالَ : نَعَمْ . قَالَ : فَأْذَنْ لِي أَنْ أَقُولَ شَيْئًا ، قَالَ : قُلْ) البخاري ومسلم كما مضى أبو عبس بن جبر.



ئەی هەڵوێستی قورەیش چی بوو، نومێر؟

نومێر: لەدوای دەرچوونی بەنی قەینوقاع و کوشتنی کەعبی کوڕی ئەشرەف تا ڕادەیەک شاری مەدینە هێمن و ئاسایشی تێیدا بەرقەرار بوو، زۆربەی خەڵکی موسڵمان بوون بەئاشکرا و ئەوەشی موشریک بوو بووە موونافیق، بەڵام ئەوەی حوکمڕانی شاری مەدینەیە بەتەواوەتی پێغەمبەری خوا صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ خاوەنی بڕیاری یەکەمە.

دوو هۆزی تێدایە بەنوو نەزیر و بەنی قورەیزە کە هەردوولا لە موسڵمانان دەترسن، بەڵام خۆیان مەڵاس داوە و چاوەڕوانی شتێکن ڕووبدات ئەویش چاوەڕێی قورەیشن هێرش بهێنێت.

---

١١٨ ـ (رَسُولُ ٱللَّهِ صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ : إِنَّ ٱلدُّنْيَا حُلْوَةٌ خُضْرَة ، وَإِنَّ ٱللَّهَ مُسْتَخْلِفكُمْ فِيهَا ، فَيَنْظُرُ كَيْفَ تَعْمَلُو نَ ، فَاتَّقُوا ٱلدُّنْيَا وَاتَّقَوْا ٱلنِّسَاءَ ، فَنَّ أَوَّلَ فِتْنَةِ بُنِيَ إِسْرَائِيلُ كَانَتْ فِي ٱلنِّسَاءِ ) . أحمد رقم (١١١٥٩).



# هەڵوێستی قورەیش لەو ماوەدا

نومێر: هەڵوێستی قورەیش زۆر خراپ بوو لەوپەڕی دژواریدا بوو، لە قەیرانێکی ئابووری زۆر گەورەدا بوون کە ڕێگەی بازرگانیان لێگیرابوو لەڕێگەی شامەوە، لە قەیرانێکی سیاسی گەورەدا بوو، کەرامەت و سەروەری لەدەست دابوو لە نیوەدوورگەی عەرەبدا، لەدوای ئەو شکستە گەورەیەی بەسەریاندا هات لە جەنگی بەدردا بەدەستی موسڵمانان، لەکاتێکدا سوپاکەیان چەندین جار گەورەتر بوو لە سوپای موسڵمانان، قەیرانی نەبوونی سەرکردە زۆر کاریگەری دروست کردبوو ئەمە جگە لەوەی بەگشتی (٧٠) کەسیان لێ کوژرابوو، هەروەها (٧٠) کەسیان لێ بەدیل گیرابوو.

زۆربەی کوژراوەکانیان قیادە و ناودارەکانیان بوو، بۆیە کەسوکاریان بەدوای تۆڵەسەندنەوە بوون، جا یەکێک دەیویست تۆڵەی دایکی بکاتەوە، یاخود براکەی یاخود هاوسەرەکەی...هتد.

هەمیشە نێوانی کوفر و ئیمان ململانێیە، ئەهلی کوفر لەهەوڵی ئەوەدایە کە ئەسڵی ئیسلام پەرە نەستێنێت، خوای گەورە دەفەرمووێت:

﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ يُنفِقُونَ أَمْوَٰلَهُمْ لِيَصُدُّواْ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِۚ فَسَيُنفِقُونَهَا ثُمَّ تَكُونُ عَلَيْهِمْ حَسْرَةً ثُمَّ يُغْلَبُونَۗ وَٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ إِلَىٰ جَهَنَّمَ يُحْشَرُونَ﴿٣٦﴾﴾ [الأنفال]

بێگومان ئەوانەی بێباوەڕن ماڵ و سامانی خۆیان بەخت دەکەن بۆ ئەوەی بەشێنەیی بەربەست دابنێن و ڕێگری بکەن لەبەردەم ئایین و ڕێبازی خوا، جا لە ئاییندەدا ماڵ و سامانیان بۆ ئەو مەبەستە بەخت دەکەن، پاشان دەبێتە پەشیمانی و داخ و حەسرەت لەسەریان و لەدواییدا شکست دەهێنن، بێگومان ئەوانیش کە بێباوەڕ بوون کۆدەکرێنەوە بۆ دۆزەخ ڕاپێچ دەکرێن.

پێغەمبەری خوا ﷺ لەشاری مەدینە و دەورووبەریدا بانگەوازەکەی بەهێز بوو، خەڵکی زۆر بەدەم بانگەوازەکەیەوە دەڕۆیشتن.

ماکوان: لە ئێستاشدا هەر وایە لەهەرکوێیەک ڕووناکی بانگەوازی ئیسلامی دەربکەوێت و پرشنگی هەبێت خێرا بە (بەناوی تیرۆر) بە هێزی لۆجستیکی و چەک و تەقەمەنی دژیان دەبنەوە، بانگەوازچییان دەخرێنە زیندان دەزانن بەوە دینی خوای پەروەردگار لاواز دەبێت، تا ئێستاش دوژمنی ئیسلام لەوە تێنەیگەیشتووە، هەرچەندە دوژمنی ئیسلام دڕندە و بەهێز بێت



لەنێو ئیسلام و موسڵماناندا زیاتر گەشەسەندن و خواناسی بڵاو دەبێتەوە. ئەی چۆن خۆیان ئامادەکرد و سوپایان کۆکردەوە؟



## قوڕەیش و کۆکردنەوەی سوپا بۆ جەنگی موسڵمانان

نومێر: لەپێشتر ئاماژەمکرد داهاتی کاروانەکەی ئەبو سوفیان دانرا بۆ ئەوەی بەکاربهێنرێتەوە بۆ جەنگ دژی موسڵمانان، بەهای ئەو کاروانە نزیکەی (٥٠) هەزار دیناری ئاڵتوون بوو، پارەیەکی زۆر زۆر بوو، هەموو ئەو پارەیە بەکاردەهێنن بۆ دژایەتی خوای پەروەردگار و دینەکەی.

قوڕەیش ئەمجارە بەوە وازی نەهێنا لەنێو شاری مەککە سوپا کۆبکاتەوە، بەڵکو لە دەورووبەر و ناوچەکانی تردا خەڵکی دەهێنا بۆ جەنگ، لەهەموو هۆز و عەشیرەتەکانی ناوەوەو دەرەوەی مەککە خەڵکی کۆکردەوە، توانیان سوپایەکی زۆر گەورە پێکبهێنن پێکهاتبوو لە (٣٠٠٠) جەنگاوەر، هەموو سەرکردەکانی قوڕەیش لەگەڵ ئەو سوپایەدا دەرچوون، سەرکردەی گشتی ئەبو سوفیان بوو جێگرەکانی بریتی بوون لە: سەفوانی کوڕی ئومەییە، عیکریمەی کوڕی ئەبو جەهل، خالیدی کوڕی وەلید، بەسێ هەزار کەسەوە (٣٠٠٠) وشتر ئامادە کرا، پاشان (٢٠٠) ئەسپ کە ژمارەیەکی یەکجار زۆرە، پاشان (٧٠٠) درع (زرێ، قەڵغان)، لەگەڵ سوپاکەدا (٢٥) ئافرەتی قوڕەیش دەرچوون یەکێک لەوانە خانمی یەکەمی مەککە بوو (هیندی ژنی ئەبو سوفیان) کچی عوتبەی کوڕی ڕەبیعەی کوژراو لە جەنگی بەدردا، لەگەڵ مامی و برایەکی، خێزانی سەفوان و عیکریمە...هتد، ئافرەتانی ناوداری قوڕەیش و ژنە سەرکردەکان بوون.

پاشان قوڕەیش دەستی کرد بەهاندانی خەڵک بۆ جەنگ و بڵێسەی ئاشووبی جەنگ، لەدڵ و دەروونیاندا گڕی سەندبوو، هەروەها جەنگی ڕاگەیاند بەسەرۆکایەتی کەسێک کە پێشتر گیرا لە بەدردا داوای لێکرا وازبهێنێت چیتر هاوکاری کافران نەبێت، پێغەمبەری خوا ﷺ لێیخۆشبوو ئازادی کرد، بەڵام ئەو بێوەفا بوو جەنگی ئیعلامی دژی موسڵمانان دەستی پێکرد.

ناوی (ئەبو عزی جەمحی) بوو ئێستا سەرپێچی پەیمانەکەی خۆی دەکات، سوپا بەم شێوەیە دابەش کرا: سەرکردەی گشتی سوپا ئەبو سوفیان بوو، سوارچاکانی ئەسپ خالید و عیکریمە بوون، هەڵگری ئاڵای سوپا کوڕانی عەبدودار بوون.

ماکوان: من وای دەبینم ئەو جەنگە بۆ موسڵمانان ئاسانتر بێ، تاکو جەنگی بەدر!

نومێر: چۆن، شیکاریت هەیە؟



ماکوان: بەڵێ، شیکاریم هەیە چوار خاڵت بۆ باس دەکەم.

خاڵی یەکەم: زۆربەی قیاداتی قورەیش لە بەدردا کوژران، ئەو سوپایە ناوی گەورە سەکردەکانی تێدا نییە وەکو: ئەبو جەهل، وەلیدی کوڕی موغیرە، عوقبەی کوڕی ئەبی موعیت، نەزری کوڕی حارس، ئوممەییەی کوڕی خەلەف و زۆری تر لەوانەی لە جەنگی بەدر کوژران.

خاڵی دووەم: موسڵمانان بەدڵنیاییەوە ئاگادارن لە هۆزی قورەیش بۆ جەنگ، ئەمجارە دەتوانن باشتر خۆیان ئامادە بکەن، چەکی جەنگ هەڵبگرن نەک وەک جارەکی تر چەکی موسافیریان پێبێت.

خاڵی سێیەم: شوێنی جەنگ یان شاری مەدینەیە یاخود نزیکی شاری مەدینەیە ئەمەش بۆ موسڵمانان ئاسانترە، چالاکی و هێزی باشیان بێ بۆ جەنگ. وەکو قورەیش نین کە (٥٠٠)کم ببڕن بەسێ هەزار کەسەوە بۆ نزیک شاری مەدینە، بەناو بیابان و تەپوتۆز ڕێگا ببڕن. موسڵمانان دەربچن بۆ ئەوان نزیکە و ماندوو نابن.

خاڵی چوارەم: باری دەروونی قورەیش لە خاکدایە و پێچەوانەکەی باری دەروونی ئیمانداران لە ئاسماندایە، قورەیش لێدانی باشیان بەدەست موسڵمانانەوە خواردووە، شکست خواردوو بوون، پێچەوانەکەی موسڵمانان لەوپەڕی غیرەت و هێزو تواناداان. قورەیش لە قەیرانی ئابووریدایە و دوو کاروانی کافران لەدەستی موسڵماناندایە، زۆر توانای تریان هەیە موسڵمانان لە گرتنی ڕێگەی بازرگانی هەبوونی دەزگای زانیاری و هەواڵگری...هتد.

بەم ئەجندایانە موسڵمانان لەباشیدان هەموو لەبەرژەوەندی سوپای موسڵماناندان، با سوپای کافران زۆربن بەڵام ئەگەری سەرکەوتنی زیاتر بۆ موسڵمانانە! ئەمە بڕوای منە نومێر ئیتر نازانم تۆ چی دەڵێی؟

نومێر: قسەکانت هەمووی واقعییە بەڵام با تەمەشای ڕووداوەکان بکەین بزانین چۆن دێتە پێشەوە و چی ڕوودەدات؟



# خۆ ئامادەکردنی موسڵمانان بۆ ڕووبەڕووبوونەوە

نومێر: پێغەمبەری خوا ﷺ زانی هەواڵی پێگەیشت لە سوپای قورەیش لەشاری مەککەوە ئامادەی دەرچوونن بۆ جەنگ. بەخێرایی مەجلیسی ڕاوێژی سازدا و لەبارەی ڕێکخستنی سوپاوە ڕاوێژ بە ڕاوێژکارەکانی بکات، ئنجا بزانین ئەم سوپایە هەموو خاڵ و خەسڵەتەکانی سوپای سەرکەوتووی تێدا بەدی دەکرێت؟ ئەوەی لە سوپای بەدردا بەدی دەکرا لەم سوپایەشدا بەدی دەکرێت؟

سەرەتا ئەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ کردی شوورا بوو، چەند خاڵێکی لەخۆ گرتبوو:

یەکەم: دڵنیابوون لەشاری مەدینە و کۆمەڵێکی لە سوپاکە پێکهێنا، پاسەوانی خۆی بکەن لەگەڵ شاری مەدینەدا ئەوەی سەرکردایەتی ئەو کۆمەڵەی دەکرد بریتی بوون لە ئەوس و خەزرەج، سێ مەفرەزەی لێ دروست کردن بەسەرکردایەتی سەعدی کوڕی موعاز، سەعدی کوڕی عوبادە، ئوسەیدی کوڕی خوزەیر، ئەم کۆمەڵە چواردەوری ماڵ و مزگەوتی پێغەمبەری خوایان ﷺ دابوو، چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ ئامانجی یەکەمی قورەیش بوو، پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ هەر کوێ بڕۆیشتایە ئەو کۆمەڵەیەی لەگەڵدابوو.

دووەم: چەند هێزێکی بچووکی دروست کرد، لەبەردەم دەروازەی شاری مەدینە کە خەڵکی بەگشتی لێوەی هاتووچۆی دەکرد، شەو و ڕۆژ پاسەوانی هاتن و چوونی لەنێو شاری مەدینەدا هەبوو.

سێیەم: چەند هێزێکی دیکەی دروستکرد، چاودێری دەرەوەی شاری مەدینەی دەکرد هەمیشە بەدەوری شاردا دەگەڕان، چاودێری سوپای موشریکی مەککەیان دەکرد و چاودێری مەککەیان دەکرد.

چوارەم: فەرمانی دەکرد لەنێو موهاجیر و ئەنساردا لەئەوس و خەزرەج، دەبێ هەموو بەچەکەوە بگەڕێن، تەنانەت لەکاتی نوێژدا دەبێ چەکیان پێ بێت. ئەمەش ئەوەمان بۆ ڕوون دەکاتەوە کە خاوەن سیفات و خەسڵەتی سەرکەوتن ئەویش کۆکردنەوەی هێزی باش و هەڵگری چەک و پاسەوانی بەهێزی سەرکردایەتی گشتی، ئامادەبوون بۆ هەموو ڕووبەڕووبوونەوەیەک، پاشان موسڵمانان بیریان کردەوە لە فاکتەر و هۆکاری



ڕووبەڕووبوونەوەیان چۆن بێت و بەچ شێوەیەک بەرەنگاری قوڕەیش ببنەوە، ئایا بڕۆنە دەرەوەی مەدینە و ڕووبەڕووی سوپای قوڕەیش ببنەوە یان چاوەڕێ بن سوپای دوژمن بێت. واتە: ئەوان دەستنیشانی خاکی جەنگ دەکەن یان موسڵمانان.

پێش گەیشتنی سوپاکە دەستنیشانکردنی جێگە و هەڵوێستییان، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: لە خەونمدا بینیوومە مانگایەک سەر دەبڕێت، سەری شمشێرەکەم پارچەیەکی بچووکی لێ دەبێتەوە، بینیم دەستم لەنێو درعێکی زۆر بەهێزدابوو، واتە: قەڵغانێکی بەهێز، ئەمەش خەونێکی چاک و پڕ خێرە.[119]

کەواتە: پێغەمبەری خوا ﷺ سێ شتی لە خەونەکەیدا بینیووە:

١- بینیویەتی مانگایەک سەردەبڕێت ئەمەش واتای ئەوەیە یەکێک لە هاوەڵانی دەکوژرێت.

٢- لێبوونەوەی پارچەیەک لە سەری شمشێرەکەی واتای بریندداربوونی یەکێک لە ئالوبەیتی.

٣- کە دەستی خستۆتە نێو قەڵغانێکی بەهێز، واتای لێکدانەوەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی شاری مەدینەیە، لەنێو شاری مەدینەدا دەجەنگێن.

کاتێک ئەم خەونەی بۆ گێڕانەوە مانای وا نەبوو کە وەحییە بڕیاری کۆتایی لەسەر دابێت، بەڵکو تەنها پێشنیار بوو لەشێوەی ڕاوبۆچوون پێشکەشی کردن.

چونکە لەڕووی ڕاوێژو پرس پێکردنەوە باسەکەی بۆ کردنەوە و وای بەباش زانی لەنێو شاردا بمێننەوە، دەرنەچنە دەرەوە بۆ جەنگ، هەموو لایەک جەنگ بکەن لە ماڵەکانی خۆیانەوە پیاوان و ژنان، پیاوان بە شمشێر و ژنان بە هەڵدانی تیرو کەوان ئەمەش شێوەیەک بوو لە جەنگی شەقام، ئەم جۆرە جەنگە زۆر قورسە بۆ سوپای دوژمن، ئەمە ڕا و بۆچوونی پێغەمبەری خوا ﷺ بوو،[120].

زۆرینەی موسڵمانان حەزیان بە دەرچوون بوو، بەتایبەت ئەوانەی بەشدار نەبوون لە جەنگی بەدر زۆر ئارەزوومەند بوون بە ڕووبەڕووبوونەوەی موشریکەکان لەدەرەوەی شاری مەدینە.

---

١١٩ ـ (إِنِّي قَدْ رَأَيْت وَاَللّهِ خَيْرًا ، رَأَيْتُ بَقَرًا ، وَرَأَيْتُ فِي ذُبَابِ سَيْفِي ثَلْمًا ، وَرَأَيْتُ أَنِّي أَدْخَلْتُ يَدِي فِي دِرْعٍ حَصِينَةٍ) سيرة إبن هشام ج٢، ص٦١.

١٢٠ ـ (فَقَالَ : يُقَاتِلَ الْمُسْلِمُونَ عَلَى أَفْوَاهِ الْأَزِقّةِ ، وَالنّسَاءُ فَوْقَ الْبُيُوتِ).



تەنانەت یەکێک لە هاوەڵان وتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وعلى آله وسلم ئێمە هیوامان خواست جارێکی تر وەکو ڕۆژی بەدر بێتەوە، وا خۆیان بەپێی خۆیان هاتوون، ئێمەش بۆیان دەردەپەڕین بۆ ئەوەی دوژمنەکەمان نەڵێن: ئەوان ترسنۆکن.[121]

لەوانەی زۆر جەختیان لەسەر دەرچوون دەکردەوە، حەمزەی مامی پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ بوو، قسەیەکی زۆر سەیری کرد و فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ سوێند بەوەی قورئانی بۆ ناردووی، دەم لە خواردن و خواردنەوە نادەم هەتا خۆم و شمشێرەکەم لەدەرەوەی مەدینەدا ڕووبەڕوویان دەبمەوە.[122]

زۆرینەی موسڵمانان لەسەر دەرچوونی سوپا بوون بۆ دەرەوەی شاری مەدینە، کەمێک لە هاوەڵان لەگەڵ بۆچوونی پێغەبەری خوا صلى الله عليه وعلى آله وسلم بوون، لەنێو ئەوانیشدا سەرۆکی مونافیقەکان عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی کوڕی سەلوول لەگەڵ ڕای پێغەمبەر صلى الله عليه وعلى آله وسلم بوو، نەک لەبەر ئەوەی قەناعەت و بڕوای بە ڕاکەی پێغەمبەر صلى الله عليه وعلى آله وسلم بێت، بەڵکو بۆ ئەو هەڵهاتن لەجەنگ لەنێو شاری مەدینەدا ئاسانتر بوو.

لە کۆتاییدا پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ ڕازی بوو بە فەرمانی شوورا فەرمووی دەچینە دەرەوەی شاری مەدینە، چونکە خەونەکەی هیچ پەیوەندی بە وەحییەوە نەبوو، بۆیە ڕاوێژی کرد بە هاوەڵان و هاوەڵانیش خاوەن ڕای جیاوازی پێغەمبەر صلى الله عليه وعلى آله وسلم بوون.

ڕۆژی هەینی بوو پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وعلى آله وسلم لە نوێژی جومعەدا ئامۆژگاری خەڵکەکەی کرد و فەرمانی پێکردن کە بایەخی تەواوەتی پێبدەن و هەوڵی خۆیان لە تواناو هێزیان بخەنە گەر، موژدەی دانێ بە سەرکەوتن ئەگەر خۆڕاگربن لە سەر ڕێگا و مەنهەجی خوا و پێغەمبەر صلى الله عليه وعلى آله وسلم بڕۆن و بگرنە بەر.

خەڵکی هەموو دڵخۆشبوون بەوەی کە دەردەچن بۆ جەنگ لەدەرەوەی شاری مەدینەدا، هەمووی بەوپەڕی چالاکی و خۆشییەوە خۆیان ئامادەکرد، لە ئێوارەی هەینی شەشی شەوالی ساڵی سێیەمی هیجری، هەرچەندە دەڵێن لەدوای بەدر بە هەشت مانگ جەنگی ئوحود ڕوویدا.[123]

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

١٢١ ـ (كنا نتمنى هذا اليوم و ندعو الله فقد ساقه الله إلينا و قرب المسير) سيرة إبن كثير، ج٣، ص١٩

١٢٢ ـ (لا أطعم طعاماً حتى أجالدهم بسيفي خارج المدينة)، السيرة الحلبية ج٤، ص٩٩

١٢٣ـ طبقات إبن سعد..



(١٠٠٠) موجاهید لەدەوری پێغەمبەر ﷺ کۆبوونەوە بۆ دەرچوون، خودی پێغەمبەری خوا ﷺ جلی سەربازی پۆشی لەگەڵ ئەبو بەکر و عومەردا کۆبوونەوەی ئەنجامدا چوونە ژوورێک هەموو پێداویستییەکانی جەنگیان ئامادە کرد، پێغەمبەری خوا ﷺ شمشێری هەڵگرت بۆ دەرچوون.

بەڵام هاوەڵان بەتایبەت کۆبوونەوە ئەنسار و کۆمەڵە پاسەوانەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ لە سەعدی کوڕی موعاز و ئوسەیدی کوڕی حوزەیر بە خەڵکەکەیان ڕاگەیان کە پێدەچێ پێغەمبەری خوا ﷺ خۆشحاڵ نەبێ بەدەرچوون با فەرمانەکە بگەڕێنینەوە دەست جەنابیان.

چونکە بۆیان دەرکەوت و دەشیانزانی کە پێغەمبەری خوا ﷺ باشترین و حەکیمترین ڕاوبۆچوونی هەیە، بۆیە بڕیارياندا کە بڕیارەکە بگەڕێننەوە بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ کە پێغەمبەری خوا ﷺ لەماڵەوە دەرچووە دەر هاوەڵان هاتنە خزمەتی و بەوپەڕی ئەدەبەوە وتیان: ئەی ڕەسولی خوا ﷺ نەدەبوو موخالەفەی جەنابت بکەین، ئەوەی تۆ پێتخۆشە ئەنجامی بدە ئێمە ڕازین!

بەڵام پێغەمبەری خوا ﷺ بڕیاری دەرچوونی دابوو بۆ دەرەوەی مەدینە، خەڵکەکەش هەموو بۆ دەرچوون خۆیان ئامادە کرد، بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ لە بڕیارداندا دوودڵ نەبوو فەرمووی: بۆ پێغەمبەران سەلامی خوایان لێبێ نەهاتووە کە پۆشاکی جەنگیان پۆشی لەگەڵ قەڵغانەکەیدا جارێکی تر دایبکەنن، هەتاکو خوای گەورە جەنگەکە یەکلا نەکاتەوە، لەبەر ئەوە بڕیاری کۆتایی درا و بێ دوودڵی، ئەمەش نموونەی سوپای سەرکەوتووە.[١٢٤]

لەدوای نوێژی عەسر خەڵکی گوێیان لە بانگی جیهاد بوو لەپێناوی خوا ئیتر هەموو دەرچوون، یەکێک لەوانە ئەو ڕۆژە هاوسەرگیری کردبوو، لەناو جێگا و لەگەڵ هاوسەری بوو کە گوێی لە بانگی جیهاد بوو خێرا بۆ جیهادکردن دەرچوو بێ خۆشۆردن!! ئەویش هاوەڵی بەڕێز (حەنزەڵەی کوڕی عامر) بوو، هەرکە بانگی جیهادی دا هەموو لەپێناوی خوای گەورە ڕاپەڕین و دەرچوون بۆ جیهاد، کۆمەڵێک لە موناfیقەکان ئەوانیش دەرچوون لەگەڵ سوپای موسڵمانان.

-----

١٢٤- (إِنَّهُ لَيْسَ لِنَبِيٍّ إِذَا لَبِسَ لَأْمَتَهُ أَنْ يَضَعَهَا حَتَّى يُقَاتِلَ) أخرجه أحمد (٣/٣٥١، رقم ١٤٨٢٩)، قال الهيثمي (٦/١٠٧): رجاله رجال الصحيح. وأخرجه النسائي في الكبرى (٤/٣٨٩، رقم ٧٦٤٧).



پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ دەستی کرد بە ڕێکخستن و ڕیزکردنی سەربازانی، هەزار کەس ئامادەبوون کەتیبەی موهاجیرەکان موسعەبی کوڕی عومەیر سەرکردایەتی دەکرد، کەتیبەی ئەوسییەکان ئوسەیدی کوڕی حوزەیر بوو، کەتیبەی خەزرەجییەکان بە سەرکردایەتی حوبابی کوڕی مونزیر بوو، سەد کەس لە سوپاکەی خاوەن قەڵغان بوون لەو جەنگەدا موسڵمانان هیچ ئەسپێکیان پێ نەبوو، ئەمەش هەژاری سوپای موسڵمانان دەردەخات.

ماکوان: دەزانی بۆچی پێغەمبەری خوا ﷺ پێشنیاری کرد لەشاری مەدینەدا بمێننەوە؟

نومێر: لەبەر خەونەکەی.

ماکوان: نا، هۆکاری سەرەکی دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی لە پەیمانی عەقەبەی دووەمدا وتیان: لەنێو شاری مەدینەدا دەتپارێزین، ویستی بەوەفا بێت بەرانبەر ئەو عەهد و پەیمانەی لەگەڵ خەڵکی شاری مەدینەدا گرتبووی پێش چەند ساڵێک لەمەوبەر، ئەنسار خۆیان چوونە دەرەوەیان هەڵبژارد، من پێموایە چوونە دەرەوەکە زیاتر پێغەمبەری خوای ﷺ خۆشحاڵ کرد.

نومێر: قسەکەت جێگەی خۆیەتی دەشێت وابێت.

کەواتە: پێغەمبەری خوا ﷺ بەگوێرەی توانای خۆیان سوپای بەهێزی ئامادەکرد، ئەوەی توانی لە چەک و هێز بەکاری هێنا، هەواڵگری ڕاستگۆ و باشی هەبوو، چونکە عەبباسی مامی بە زووترین کات هەواڵەکەی بۆ دەگواستەوە، پارێزگاری لە شاری مەدینە کردو دەرچووە دەرەوە، بەڵام ئەوەی منداڵ بوو گەڕاندنییەوە دواوە، لەوانە: عەبدوڵڵای کوڕی عومەر، زەیدی کوڕی ئەرقەم، زەیدی کوڕی سابت، ئەبو سەعیدی خودری، ئوسامەی کوڕی زەید، خوا لەهەموویان ڕازی بێت.

ئەوەی بەتواناو لێزان بووایە کاری دەدایە دەست و هێزێکی تەکنۆکرات بوو بەتەواوەتی، هەرچۆن لە بەدردا ڕوویدا تا ئەم ساتە وەختە هەموو سیفاتی سوپاکە خەسڵەتی سەرکەوتووە.

هەروەک چۆن لە بەدردا ڕەتی کردەوە موشریک هاوکاریان بێت، لەم جەنگەدا بەهەمان شێوە پێغەمبەری خوا ﷺ ڕەتی کردەوە هاوکاری لە موشریکەکان وەربگرێ، لە جەنگی ئوحود دا کەتیبەیەک لە جوولەکەکان هاتن هاوپەیمانی خەزرەج بوون، خۆیان پڕ



چەک کردبوو هاتن بۆ هاوکاری پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: موسڵمان دەبن؟ وتیان: نەخێر، تەنها هاوکاریتان دەکەین.

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: هاوکاری لە موشریک وەرناگرم.

یەکێکی تر لە سیفاتی سوپای سەرکەوتوو زۆری لاو گەنجەکانە لەناو سوپا دا، چونکە ئەوان توانای هێزی چەکداریان زیاترە، هەروەکو چۆن لە ڕابردوودا لەجەنگی بەدر بینیمان.

تەنانەت لاوەکان بۆ ئەوەی بڕۆن بۆ جیهاد دەچوونە خزمەت پێغەمبەر ﷺ خۆیان نمایش دەکرد، نەک بۆ جلوبەرگ و فاشن نا، بەڵکو بۆ هێز و توانا و ڕاکردن و شمشێر وەشاندن و تیرهەڵدان، لەو گەنجانە: (سەمرەی کوڕی جوندوب، مورەی کوڕی سینان، ڕافعی کوڕی خەدیج، سەموورە و...هتد) پێشبڕکێیان بوو بۆ جیهاد کرد، ئەوانەی هێز و بازووی جەنگیان هەبوو لە جەنگی ئوحود دا بەشداریان دەکرد لە لاوەکان.

هەروەها ئەو سوپایە ئیمانی بەخوای پەروەردگار قایم بوو گوێڕایەڵی پێغەمبەری خوا ﷺ بوون، کاریان بۆ ڕۆژی دوایی دەکرد لەپێناو خوا و پێغەمبەرو وەرگرتنی بەهەشت و دوورکەوتنەوە لە دۆزەخ دەجەنگان، دڵنیا و بێ دوودڵ بوون لە بڕیاردان، ئەوەی لەتوانایاندابوو لە هێزو چەک کۆیانکردەوە. ئەوەی لێزان بووایە لە کارەکەیدا کاری پێدەسپێرا گرنگی دا بە لاوەکان و شووراو ڕاوێژی جێبەجێکرد لەگەڵ برایەتی. هەموو سوپایەک بەو شێوەیەبێ ئەوە نیشانەی سەرکەوتنییەتی، مژدەی خوای پەروەردگارە بۆ ئیمانداران، بەو پرەنسیپ و مەبدەئانە کار بکەن.

ماکوان: ئەی دووڕووەکان چی، لەو سوپایەدا لە ڕابردوو دووڕوو، لە جەنگی بەدردا نەبوو؟



# گەڕانەوەی سوپای دووڕووەکان

نومێر: لەڕاستیدا سوپای موسڵمانان زۆریان نەمابوو بگەنە ناوچەی ئوحود، چونکە دەیانزانی سوپای کافران لەنزیک ئوحود ئەوانیش سەربازگەیان خستبوو، پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ هەوڵی دەدا لەکاتی ڕۆیشتنی سوپاکە هیچ چاوێک نەیانبینێت تا سەربازگە دەخات، هەربۆیە پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ لەکاتی ڕۆیشتنی سوپاکە ڕێگەی سەرەکی گۆڕی و بەناو کشتوکاڵدا سوپاکەی برد. لە چواردەوری ناوچەی ئوحود بوون بۆ ئەوەی ژمارە و هێزو توانایان بۆ دوژمن ئاشکرا نەبێت، پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ گەیشتە ناوچەی ئوحود، لەدوورەوە سوپای موشریکی مەککەی دەبینی واتە: سنووری نێوانیان بەچاو یەکتریان دەبینی، زۆر دوور نەدەبوون لە یەکەوە.

لەوکاتەدا عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی کوڕی سەلوول، وەکو بزووتنەوەیەکی هەڵگەراوە لە سوپاکەی پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ هەڵگەڕایەوە، گوایە ئەو بەجەنگ لەدەرەوەی مەدینە ڕازی نییە. خۆی و سێ سەد کەس لە شوێنکەوتووانی گەڕانەوە بۆ شاری مەدینە، واتە: نزیکەی سێیەکی سوپاکەی لەگەڵ خۆیدا گەڕاندەوە.

لەوکاتەدا عەبدوڵڵای کوڕی حەڕام و کوڕەکەی جابری کوڕی عەبدوڵڵا، داوایانکرد نەگەڕێنەوە، لەخاکی جەنگەکەدا بن لەپێناوی خوادا بجەنگن یان پشتمان بگرن و هاوکارمان بن وتیان: بڕوا ناکەین جەنگ ڕووبدات، عەبدوڵڵای کوڕی حەڕام زۆر هەوڵیدا لەگەڵیان، بەڵام ئەوان هەر گوێیان پێنەدا ئەویش وتی: خوای گەورە دوورتان بخاتەوە لێمان ئەی دوژمنانی خوا، خوا و پێغەمبەرەکەی صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ لێتان بێبەرییە، خوای پەروەردگار ئایەتی تایبەتی بەسەردا دابەزاندن.

﴿وَلِيَعْلَمَ ٱلَّذِينَ نَافَقُواْۚ وَقِيلَ لَهُمْ تَعَالَوْاْ قَٰتِلُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ أَوِ ٱدْفَعُواْۖ قَالُواْ لَوْ نَعْلَمُ قِتَالٗا لَّٱتَّبَعْنَٰكُمْۗ هُمْ لِلْكُفْرِ يَوْمَئِذٍ أَقْرَبُ مِنْهُمْ لِلْإِيمَٰنِۚ يَقُولُونَ بِأَفْوَٰهِهِم مَّا لَيْسَ فِي قُلُوبِهِمْۚ وَٱللَّهُ أَعْلَمُ بِمَا يَكْتُمُونَ﴾ [آل عمران]

واتە: دووڕوویی و نالەباری مونافیقەکانیش دەربخات کاتێک پێیان وترا: وەرن بجەنگن لەپێناوی خوا یان هیچ نەبێ بەرگری لەخۆتان و ماڵ و منداڵتان بکەن، وتیان: ئەگەر بمانزانیبایە شەڕ و جەنگ بەرپا دەبێت ئەوە شوێنتان دەکەوتین و دەجەنگاین، ئەوانە ئەو



ڕۆژە لە کوفرەوە نزیکترن تا لە ئیمان، بەدەمیان شتێک دەڵێن لە دڵ و دەروونیاندا نییە، خوایش زانایە بەوەی دەیشارنەوە.

لەوانەیە هەندێک وا پەی بردبێت گەڕانەوەی ئەو سێ سەد کەسە خەسارەت بێت بۆ موسڵمانان، بەڵام لەڕاستیدا پێچەوانەکەی ڕاستە، خوای پەروەردگار لەبارەی مونافیقەکانەوە دەفەرمووێت:

﴿لَوْ خَرَجُواْ فِيكُم مَّا زَادُوكُمْ إِلَّا خَبَالًا وَلَأَوْضَعُواْ خِلَٰلَكُمْ يَبْغُونَكُمُ ٱلْفِتْنَةَ وَفِيكُمْ سَمَّٰعُونَ لَهُمْ وَٱللَّهُ عَلِيمٌۢ بِٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٤٧﴾﴾ [التوبة]

واتە: ئەوانە ئەگەر دەرنەچوونایە و لەناوتان بووان بێجگە لە سستی هیچیان بۆتان زیاد نەدەکرد، دەستیان دەکرد بە چرپ و چاپ لەناوتاندا بۆ دۆزینەوەی کەلێنێک دەگەڕان بە ئاواتی ئاشووب هەڵگیرساندن، کەسانێکیش هەن لەنێو ئێوەدا گوێیان بۆ دەگرن، خوایش چاک ئاگادارە بە کار و کردەوەی ستەمکاران.

کەواتە: بوونی دووڕووەکان لەناو ڕیزی موسڵماناندا زۆر ترسناکە و خەتەرناکە، نەک لەبەر ئەوەی جاسووس و چاون بەسەر موسڵمانانەوە، یاخود ڕاوبۆچوونی فاسید و خراپ بڵاو دەکەنەوە لەهەموو ئەوانە ترساناکتر گومان لەنێو سوپاکەدا بڵاو دەکەنەوە، تا هاوەڵانی ڕاستگۆ دوودڵ بن لە جیهاد کردن.

چونکە لەناو خاکی جیهاد دا ئەوەی باسی دەکەین ڕوویدا، کاتێک عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی کوڕی سەلوول وتی: جەنگ ڕوونادات دوو گرووپ لە موسڵمانان کاریگەری قسەکانی ئەو دووڕووە چووە سەریان، ئەم دوو تایفە و گرووپە یەکێکیان لە هۆز و نەوەی حارسی ئەوسی بوو، تایفەی دووەم لە هۆزی کوڕانی سەلەمەی خەزرەجی بوون، هەردوو لایان بیریان لە گەڕانەوە دەکردەوە بۆ شاری مەدینە، سوپاس بۆ خوای پەروەردگار ئارامیان گرت خوای پەروەردگار دڵنیایی پێ بەخشین، پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ قسەی بۆ کردن و گوێڕایەڵی پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ یان کرد، خوای پەروەردگار ئایەتی بەسەر دابەزاندن.



﴿إِذۡ هَمَّت طَّآئِفَتَانِ مِنكُمۡ أَن تَفۡشَلَا وَٱللَّهُ وَلِيُّهُمَاۗ وَعَلَى ٱللَّهِ فَلۡيَتَوَكَّلِ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ﴾ [آل عمران]

**واتە: ئەوسا خەریک بوو دوو دەستە لە ئێوە پەشیمان ببنەوە لەنیوە ڕێ بگەڕێنەوە، بەڵام خوا یارو یاوەریان بوو دڵیانی دامەزراند لەسەر فەرمانبەرداری، دەبا ئیمانداران هەر پشت بەخوا ببەستن.**



## چوونە نێو خاكی ئوحود

پێغەمبەری خوا ﷺ چووە نێو خاكی ئوحود چاوی دەگێڕا بۆ جێگایەكی باش، بەكەڵكی جەنگ بێت، بەچاوێكی سەربازی و ستراتیژی جەنگ تەماشای دەكرد، تا جێگەی سەربازگەكانی بدۆزێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ بەوپەڕی وریایی و چاوی سەربازییەوە جێگەیەكی هەڵبژارد كە لە پشتیانەوە شاخی بەرز بوو، بۆ ئەوەی پاسەوانی پشتیان بكات، ئەمەش بەشی ڕاستی سوپاكەی پێغەمبەر ﷺ كەوتنە بەرزی و سوپای قوڕەیش لە نزمیدایە، ئەمەش خۆی لە خۆیدا هێزێكی زیاتر دەداتە موسڵمانان.

## گردی ڕومات (جبل الرماة)

لەبەشی باكووری سوپاكەی پێغەمبەری خوا ﷺ گردێكی بەرز هەبوو دواتر بەناوی گردی (ڕومات) یان شاخی ڕومات (جبل الرماة) ناوی دەركرد، ئەمەش سەنگەرێكی زۆر قایم بوو بۆ موسڵمانان دژی موشریكەكان بەكاری بهێنن، خۆ ئەگەر ئەو گردە وەكو سەنگەر بەكار نەهێنن، موسڵمانان بە تەواوی لە پێشەوە و لە پشتەوە دەكەونە نێو سوپای دوژمنی موشریكەوە.

هەر لەبەر ئەوەی ئەو جێگایە شوێنێكی ستراتیژی سەربازی بوو بۆ موسڵمانان، پێغەمبەری خوا ﷺ پەنجا كەسی لە تیرهاوێژە باشەكان هەڵبژارد هەموویانی لەسەر ئەو گردە دامەزراند، فەرمانی ڕاستەوخۆی پێكردن كە ئەگەر هێرشی سوارەكانی قوڕەیش هاتن ئێوە بە تیرەكانتان ڕەمییان بكەن، سەركردەی ئەو پەنجا كەسەی سەر گردی ڕومات (عەبدوڵڵای كوڕی جوبەیری بەدری) بوو، یەكێك بوو لە تیرهاوێژە بەناوبانگەكانی عەرەب.






## نەخشەسازی غەزوەی ئوحود

### فەرمانە سەربازییەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ

پێغەمبەری خوا ﷺ دەیزانی ئەو جێگەیەی بەدەستی هێناوە و چۆتە ناوی جێگەیەکی گرنگی ستراتیژییە لەڕووی سەربازییەوە، بۆیە فەرمانەکانی زۆر ڕاشکاوانە و ئاشکراو دیار بوو هیچ تەفسیرێکی هەڵنەدەگرت (نضح عنا الخيل بالنبل) بەو کۆمەڵە هاوەڵە تیرهاوێژەی لەو جێگایەدا دایناوبوون ظفەرمانی پێکردن کە پارێزەری ئەو گردە بن و جێگەی خۆیان جێنەهێڵن، بە تیری تیروکەوانەکانتان مەهێڵن سوارەکانی ئەوان لە ئێمە نزیک ببنەوە.

چەند جار دووبارەی کردەوە بۆ ئەوەی هەڵە تێنەگەن ئەوەی فەرمووی ئێوە (٥٠) کەسی تیرهاوێژن کارتان هەڵدانی تیرە بۆ دوورخستنەوەی سوارەکانی قوڕەیش، ئەو قسەیەی بۆ سەرکردە (٥٠) کەسەکە کرد لەبەرچاوی هەر پەنجا کەسەکە (لا يأتون من خلفنا).

ئەمە ئاڕاستەی یەکەم بوو بۆ سەرکردەکە، ئاڕاستەی دووەم بۆ کۆمەڵە تیرهاوێژەکە لەسەر ئەم گردە دەمێننەوە، بەتیر ناهێڵن دواوەمان لێ بگرن. بۆ جاری سێیەم هیچ لێڵی و ناڕوونی



بە ئاڕاستەکەیەوە دیار نابێت، دەفەرمووێت: لە جێگەی خۆتاندا بمێننەوە نەجووڵێن، ئەگەر سەرکەوتین یان هەڵهاتین (إن كانت لنا أو علينا فأثبت مكانك).

بۆ جاری چوارەم دڵنیای کردنەوە ڕووی کردە عەبدوڵلای کوڕی جوبەیرو فەرمووی: ئەیخاتە بەردەم بەرپرسیارەتی گەورە و دەڵێت: لەلای تۆوە پێش لە ئێمە نەگرن واتە: نابێت بە پێشی تۆدا بێن (لا نؤتين من قبلك)

بۆجاری پێنجەم پێغەمبەری خوا ﷺ وەکو وتاردان وتاری بۆ دان فەرمووی: بەو پەنجا کەسە تایبەتەکەی سەر گردی ڕومات، ئەگەر باڵندە هەڵیگرتین نابێ جێگاکانی خۆتان جێبهێڵن، تاوەکو خۆم هەواڵتان دەدەمێ. واتایەکی دیار و ڕوونە ئەگەر شکستیشمان هێنا و هەڵاتین لەجێگەی خۆتان ناجووڵێن، هەتاوەکو خۆم دەنێرم بەشوێنتاندا (إِنْ رَأَيْتُمُونَا تَخْطَفُنَا الطَّيْرُ فَلَا تَبْرَحُوا مَكانَكمْ هَذَا حَتَّى أُرْسِلَ إِلَيْكمْ).[125]

ئاڕاستەی شەشەم: پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ شەشەمین جار فەرمووی: خۆ ئەگەر ئێمە سەرکەوین بەسەریاندا ئەوان هەڵهاتن هەر جێگەی خۆتان جێناهێڵن، هەتا وەکو دەنێرم بەشوێنتاندا.[126]

کەواتە: کارەکە هیچ گومان هەڵناگرێت ئەگەر هەر سەرپێچییەک کرا واتە: بەدەستی ئەنقەست ئەنجام نەدرێت، هەر سەرپێچییەک دژی فەرمانی پێغەمبەری خوا ﷺ بوو بەدڵنیاییەوە سەرکەوتن ڕوونادات، شکست خواردوو دەبن، بەداخەوە پاش کەمێکی تر ئەو شکستە دەبینین.

لەدوای ئەو چەند جارە کە سوپای ڕوماتی ڕێکخست، پێغەمبەری خوا ﷺ هاتە خوارەوە بۆلای سوپای سەرەکی خوتبەی جیهادی بۆ دان و بەهەشتی بیرخستنەوە خواناسی و جەنگ لەپێناوی خوای پەروەردگار دا، ئنجا پێغەمبەری خوا ﷺ پێشبڕکێی خستە نێوانیان بۆ ئەوەی کامیان باشتر دەجەنگن.

پێغەمبەری خوا ﷺ شمشێرێک لە شمشێرەکانی دەرهێنا و فەرمووی: کێ حەقی ئەو شمشێرە دەدات واتە: لەنێو هاوەڵاندا بەرزی کردەوە.[127]

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

[125] ـ البخاري: (٢٨٧٤).

[126] ـ (وَإِنْ رَأَيْتُمُونَا هَزَمْنَا الْقَوْمَ وَأَوْطَأْنَاهُمْ فَلَا تَبْرَحُوا حَتَّى أُرْسِلَ إِلَيْكُمْ) البخاري (٢٨٧٤).

[127] ـ (من يأخذ هذا السيف بحقه) أخرجه أحمد (١٢٣/٣، رقم ١٢٢٥٧) وعبد بن حميد (ص ٣٩٤ ، رقم ١٣٢٧) والحاكم (٢٥٥/٣، رقم ٥٠١٨)



زۆرێک لە هاوەڵان هەڵسان هەموو وتیان: ئێمە یا رسول الله لە نموونەی عومەری کوڕی خەتاب و عەلی کوڕی ئەبو تالیب و زووبێری کوڕی عەوام...هتد.

لەنێویاندا کەسێک بەناوی (ئەبو دووجانە) ناوی ڕاستی خۆی (سەماکی کوڕی خەرشەیە) وتی: ئەی پێغەمبەری خوا صَلَّىٰٱللَّهُعَلَيۡهِوَعَلَىٰٓ آلِهِۦوَسَلَّمَ حەقی ئەو شمشێرە چییە هەتا بیدەم؟ پێغەمبەری خوا صَلَّىٰٱللَّهُعَلَيۡهِوَعَلَىٰٓ آلِهِۦوَسَلَّمَ فەرمووی: حەقی ئەو شمشێرە بریتییە لەوەی بیدەی لە گەردەن و کەللە و دەم و چاوی دوژمن تاکو نەیانهێڵن.[128]

ئەویش فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خوا صَلَّىٰٱللَّهُعَلَيۡهِوَعَلَىٰٓ آلِهِۦوَسَلَّمَ بەوپەڕی هێز و توانای خۆی من حەقی ئەو شمشێرە دەدەم.

پێغەمبەری خوا صَلَّىٰٱللَّهُعَلَيۡهِوَعَلَىٰٓ آلِهِۦوَسَلَّمَ دایە دەستی و لە گیرفانیدا پەڕۆیەکی سووری دەرهێناو بەنێوچەوانییەوە بەستی، ئەوە بوو کە بەدوای مردندا دەگەڕێت. ئنجا بە پۆز لێدان و خۆ بادان خۆی دەکرد بەنێو ڕیزی کافراندا و بەجۆرێک دەڕۆیشت زۆر تەکەبوری پێوە دیار بوو، هەموو سوپای موشریک لێی دەترسان.

پێغەمبەری خوا صَلَّىٰٱللَّهُعَلَيۡهِوَعَلَىٰٓ آلِهِۦوَسَلَّمَ فەرمووی: ئەو جۆرە ڕۆیشتن و خۆبادانە خوا و پێغەمبەرەکەی پێیان ناخۆشە، تەنها لەو جێگەیەدا نەبێت شیاوە، ئەویش لەبەر ئەوەی دوژمن پێی دەترسێت.[129]

لەدواییدا دەبینین ئەبو دووجانە چۆن حەقی ئەو شمشێرەی دەدات کە پێغەمبەری خوا صَلَّىٰٱللَّهُعَلَيۡهِوَعَلَىٰٓ آلِهِۦوَسَلَّمَ پێی بەخشی.

لەلایەکی ترەوە سوپای قورەیش ئەبو سوفیان هانیان دەدات ئامادەیان دەکات بۆ جەنگ، ڕیزەکان ڕێکدەخەن خالیدی کوڕی وەلیدی لەلای ڕاست دانا لەلای چەپیش عیکریمەی کوڕی ئەبو جەهل، هێزی مەشاتی دایە سەفوانی کوڕی ئومەییە، هێرشی ئەوانەی سوار ئەسپ نین، بەقاچی خۆیان جەنگ دەکەن، سەرکردەی تیرهاوێژەکان عەبدوڵڵای کوڕی ڕەبیعە بوو، هەڵگری ئاڵای قورەیش کوڕانی عەبدودار بوون. ئەو خانەوادە پێش ئیسلامیش هەر ئەو جێگەیەیان هەبوو، لەبەدردا هەر ئەوان هەڵگری ئاڵاکە بوون، وا لە جەنگی ئوحود دا هەر ئەوانن.

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

[128] (حتى قام إليه أبو دُجَانة سِمَاك بن خَرَشَة، فقال: وما حقه يا رسول الله؟ قال: (أن تضرب به وجوه العدو حتى ينحني) الرحيق المختوم ص٢٢١

[129] ـ «إنها مشية يكرهها الله إلا في هذا الموضع».



ئەبو سوفیان جۆرێک لە سیاسەتی ململانێ و پێشبڕکێی خستە نێو سوپاکەی و بە کوڕانی عەبدوداری وت: ئەگەر توانای هەڵگرتنی ئاڵاکەتان نییە، وەکو بەدرمان لێمەکەن بیدەنەوە دەستمان خۆمان هەڵیدەگرین، ئەمەش جۆرێک لە ڕقهەڵساندنی ئەوان بوو، ئەبو سوفیان زیاتر ناخی ورووژاندن وتی: ئەگەر ئاڵاکە بکەوێت سوپاکەیش دەکەوێت، ئەگەر ئاڵا بەرز بێت سوپا ناکەوێت. ئەوەی لە جەنگی بەدر بەسەرمان هات لەو جەنگەشدا بەسەرمان مەهێنن.

ئینجا کوڕانی عەبدودار هەموویان بە قسەکە توڕە بوون و وتیان: ئێمە ئاڵا نادەینە دەست هیچ کەسێک، دەمانبینی سبەینێ چۆن ڕووبەڕوو دەبینەوە! ئەمە هەوڵی یەکەمی ئەبو سوفیان بوو بۆ وروووژاندنی سوپاکەی دژی موسڵمانان، پاشان ژنانی موشریک دەستیانکرد بە شیعر و شانامە و پیاهەڵدان بەسەر جەنگاوەرانی قورەیش و ئامادەکردنیان و وروووژاندنی هەست و سۆزیان بۆ جەنگ دژی موسڵمانان بەتایبەت (هیندی کچی عوتبە) خێزانی ئەبو سوفیان.

پاشان هەوڵێکی تری ئەبو سوفیان بۆ پارچە پارچەکردنی موسڵمانان دەنگی بەرز کردەوە بە ئەنساری وت: ئێمە پێویستمان بە جەنگ کردن نییە لەگەڵ ئێوەدا، بگەڕێنەوە و واز لە ئامۆزاکانمان بهێنن، ئێمە کێشەمان لەگەڵ ئامۆزاکانماندا هەیە.

هەوڵێکی شکست خواردوو و زۆر منداڵانە بوو، ئەنسار لەبری ئەوەی دڵیان نەرم بێت، زیاتر ڕق ئەستوور بوون بەرانبەر موشریکەکانی مەککە.

هەوڵێکی تری ئەبو عامری فاسق، ئەویش هەوڵێکی شکست خواردووی تری قورەیش بوو، هەرچۆن بوو دەیانویست سوپای موسڵمانان پارچە پارچە بکەن، ئەبو عامری فاسق پێشتر بە ڕاهیب ناسرابوو، پێغەمبەری خوا ﷺ ناوی نا ئەبو عامری فاسق خۆی لە ئەوسییەکان بوو، هاواری لە ئەنسار کرد: ئەی هۆزی ئەوس من ئەبو عامری ڕاهیبم، حەنزەڵەی کوڕی لە ڕیزی موسڵماناندا بوو، وەڵامی دایەوە، حەنزەڵە وتی: ئەی فاسق ئەی بەخێر نەیەیتەوە، کە گوێی لە کوڕەکەی خۆی بوو وای وت، وتی: هۆزەکەم دوای من تووشی شەڕ بوون.

ئەم فاسقە لەو جەنگەدا ڕۆڵێکی سەرەکی دەبینێ بەتایبەت لە هاویشتنی بەرد بۆ سوپای موسڵمانان، ئەمەش هەوڵێکی تری شکستخواردووی قورەیش بوو بۆ تێکدانی ڕیزی موسڵمانان.



هەردوو سوپاکە گەیشتوون پاش کەمێکی تر جەنگ دەست پێدەکات، ئەم جەنگە لە سەرەتاوە هاوشێوەی جەنگی بەدر بوو، لەگەرموگوڕی موسڵمان و هێزو ئازایەتی و جوامێریان. بەڵام بەداخەوە گۆڕانکارییەک تێدا ڕوودەدات زۆر سادەیە، بەڵام هەموو سوپای موسڵمانان دەشکێت و شکست و موسیبەتیان بەسەردا دێت، سەرکەوتنەکەیان بۆ دوژمن پێچەوانە دەبێت.



# دەستپێکی جەنگی ئوحود

ڕۆژی شەممەی ساڵی سێی کۆچی مانگی حەوتی شەوال وەک ئاماژەم پێدا هەشت بۆ نۆ مانگ دوای جەنگی بەدر، جەنگی ئوحود دەستی پێکرد بەوپەڕی ڕق و کینەوە هەردوولا بەتایبەت قورەیش لە جەنگی بەدردا کەرامەتی شکابوو.

بەڵام دەستپێکی جەنگ لەدەوری ئاڵای موشریکەکان وەکو باسم کرد بەدرێژایی مێژووی عەرەب کوڕانی عەبدودار هەڵگری ئاڵای قورەیش بوون، ئەوەی ئاڵاکەی هەڵگرتبوو کەسێک بوو بەناوی: (تەلحەی کوڕی ئەبو طەلحەی عەبدەری) یەکێک بوو لە پیاوە چوار شانە و کەڵەگەتەکانی قورەیش، بە یەکێک لە سوارچاکەکانی قورەیش ناسرابوو، لەقەبی بەرانی کەتیبەی لێنرابوو لەنێو عەرەبدا هەرکەس لە پێشەوەی کەتیبەکەدا بجەنگێت نازناوی (بەرانی کەتیبەی لێ دەنرێت) بەهۆکاری ئەوەی بەران هەمیشە لە پێشەوە دەڕوات و مەڕەکان شوێنی دەکەون، دەرچوو بۆ مەیدانی جەنگ و داوای لە موسڵمانان کرد بۆی بێنە مەیدان، ئەمەش دەستپێکی جەنگ بوو، تەڵحە یەکەم کەس بوو دەرچوو بۆ جەنگ، خۆی و وشترێکی بەرزو ئاڵاکەی لەشێوەی هەیبەتی شاخدا دەردەکەوت.

زوبێری کوڕی عەوام بۆی هاتە مەیدان و بەیەکەم ڕمح لەسەر وشترەکەیەوە کوشتی، بەوەشەوە نەوەستا خۆی هەڵدایە سەر پشتی وشترەکەی و لەگەڵ خاکدا تەختی کرد. پێغەمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ ئەو ئازایەتی و چاونەترسیەی زوبەیری بینی بەو شێوەیە بەرانی (کەبشی) کەتیبەی موشریەکەکانی کوشت فەرمووی: هەموو پێغەمبەرێک خاوەنی حەوارییە، حەواری منیش زوبێری کوڕی عەوامە.[١٣٠]

پاشان جۆش و خرۆشی جەنگ زیاتر بڵێسەی سەند برای تەڵحە بەناوی عوسمانی کوڕی تەڵحە هاتە مەیدان بۆ ئەوەی تۆڵەی براکەی بکاتەوە، زوبێر ئەویشی کوشت، پاشان برای سێیەمیان بۆ تۆڵە سەندنەوە هات، حەمزەی مامی پێغەمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ بۆی چووە مەیدان و کوشتی، بەناوی (ئەبو سەعدە) پاشان برای چوارەمی چووە مەیدان بۆ ئەوەی تۆڵەی براکانی بکاتەوە، سەعدی کوڕی ئەبی وەقاس ئەویشیانی کوشت بەناوی (موسافیحی کوڕی تەڵحە) شەش برا بەدەستی زوبێرو حەمزە و سەعد کوژران، ئەوانی تر ناوەکانیان: (کیلابی کوڕی تەڵحە، جیلاسی کوڕی تەڵحە) بوو، کەسێکی تر لە بنەماڵەکەیان دەرچوو بۆ

---

١٣٠ - (إِنَّ لِكُلِّ نَبِيٍّ حَوَارِيًّا وَإِنَّ حَوَارِيَّ الزُّبَيْرُ بْنُ الْعَوَّامِ) البخاري.



جەنگ بۆ ئەوەی تۆڵە بکاتەوە، بەناوی: (ئەرتاتی کوڕی شەرحەبیل) لە نەوەی عەبدودار، عەلی کوڕی ئەبو تاڵیب ئەویشی کوشت، پاشان کەسێکی تر هەر لەو نەوەیە بەناوی (شورەیحی کوڕی قارت) گەنجێکی ئەنساری کوشتی بەناوی (قەزمان)، پاشان کەسێکی تریان لەنەوەی عەبدودار بەناوی (عەمری کوڕی عەبدولمەناف) قەزمان ئەویشی کوشت، پاشان (کوڕەکەی شەرحەبیلی کوڕی هاشم) هەر قەزمان کوشتی، ئەو گەنجە ئەنسارییە ئەوڕۆژە لە مەیدانی ئوحود شەڕێکی بێوێنەی کرد، ئەو ڕۆژە لەو بنەماڵەیە دە کەسیان لە مەیداندا کوژران و وەعدەکەی خۆیان بردە سەر کە وەعدیان دابووە ئەبو سوفیان وتبوویان: دەمانبینی ئەو ڕۆژە چ جەنگێک دەکەین، تا دەکەسیان ئاڵاکەیان هەڵگرت، ئیتر لەو بنەماڵەیە پیاوێکی تێدا نەما، خزمەتکارێکیان نەبێ بەناوی: (حەوابی کوڕی حەبەشە)، چوو بۆ تۆڵە سەندنەوەی سەییدەکانی جەنگێکی زۆر ئازایانەی کرد، موسڵمانان هەردوو دەستی و کەللەیان پەڕاند، ئاڵای موشریەکەکان کەوتە سەر خاک کەسێك لە موشریکەکان نەیانتوانی هەڵیبگرێتەوە، لە پیاوانی قورەیش (١١) کەس کوژران لە مەیداندا، ئاڵای موشریک کەوتە سەر خاک. ئیتر جەنگ و هێرشی بەربڵاو دەستی پێکرد، دروشمی ئەو جەنگە بۆ موسڵمانان بریتی بوو لە: (مردن - مردن)، سەرەتایەکی بەهێز و توانابوو بۆ موسڵمانان (١١) کەس لە مەیداندا کوژران، سەرکەوتنێکی بەرجەستە بوو بۆ موسڵمانان، موشریکەکان بەتەواوەتی لەڕووی دەروونیەوە ڕووخان، بە پێچەوانەوە موسڵمانان باری دەروونیان چووە ئاسمان، دەستپێکی جەنگی موسڵمانان بەتەواوەتی کۆنترۆڵی جەنگیان کرد بەوپەڕی هێز و توانایانەوە.

ماکوان: بەدەم قسەکردنەوە من و نومێریش گەیشتینە نێو خاکی ئوحود، لەدوورەوە بینیم ئەبو دووجانە چۆن شمشێرەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ بەکاردەهێنێت، ئەبو دووجانە بەنێو هەموو ڕیزەکانی دوژمندا وەکو هەورە برووسکە تێدەپەڕی، بە شمشێرەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ کەلاکی کافرانی دەخست، لەولاوە حەمزە هاوشێوەی نەبوو لە ئازایەتیدا، وەکو ڕەشەبا لەملاولایەوە کافران وەکو گەڵای دار دەوەرین.

زوبێری کوڕی عەوام لە دڵەوە پێی ناخۆش بوو داوای ئەو شمشێرەی کرد لە پێغەمبەری خوا ﷺ نەیدایە و دایە دەست ئەبو دووجانە، زوبێر دەڵێ: لەگەڵ ئەوەی من کوڕی سەفییەی پوری پێغەمبەر ﷺ بووم کەچی دایە دەست ئەبو دووجانە، پێشتر لەدڵی خۆمدا وتم با بزانم ئەم ئەبو دووجانەیە بەو شمشێرە چی دەکات، لەدوورەوە بینیم شەپۆلی دەریای کافرانی دەبڕی و هاواری دەکرد و بە شیعرەوە دەیوت:

من پەیمانم داوە بە هاوڕێکەم... وەکو گەڵای خورما بیانخەم



ئەم شمشێرە هەرگیز ناخەمەوە نێو کێلانی... ئەکوژم دوژمنانی خوا و پێغەمبەرەکەی.[131]

زوبێر دەڵێ: ئەو بەهەر موشریکێک بگەیشتایە ئەو ڕۆژە دەیکوشت، لەگەڵ خاکدا تەختی دەکرد، هەروەها دەڵێ: یەکێک لە پیاوەکانی موشریک دەچووە سەر موسڵمانان کە بریندار دەبوون دەیکوشتن، ئەبو دووجانەم بینی بەو توانا و هێزەوە دەجەنگێت، دوعام کرد خوایە ئەبو دووجانە پێی بگات و بیکوژێت، لەگەڵ ئەوەی زوبێر ئازا و چاونەترس بوو بەڵام تێگەیشت ئەبو دووجانە جەنگاوەر و موجاهیدی مەیدانەکەیە، دەڵێ: خۆی گەیاندە کابرای موشریک و دەست بەجێ کوشتی، تەنانەت زرێی(درعی) کافران خۆی نەدەگرت لەبەرانبەر هێزی شمشێری ئەبو دووجانە، قەڵغانی لەگەڵ ئێسقانی کافراندا دەشکاند.

ئەبو دووجانە هەموو ڕیزی کافرانی بەزاندو چووە نێو سەربازگەکەیان تا گەیشتە لای ئافرەتەکانی قورەیش کە لەدواوەی جەنگەکە بوون، دەڵێ: بینیم ئافرەتانی قورەیش خشەخشی ئاڵتوون و ملوانکەکانیان دێ، شمشێرم دەرهێنا یەکێکیان قیژاندی، ئیتر دڵنیابووم ئافرەتە و ناسیمەوە کە هیندی کچی عوتبە بوو، لەبەر ڕێزی شمشێرەکەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وعلى آله وسلم نەمویست ئافرەتی پێ بکوژم!

تەماشای حەمزەی کوڕی عەبدولموتەلیبم کرد، وەکو شێر لەنێو هەردوو سوپاکەدا کافرانی بەملا و ئەولای خۆیدا هەڵدەدا، هیچ کام لە موشریکەکان نەیاندەوێرا نزیکی ببنەوە، بەهەرکەس لە کافرەکان بگەیشتایە دەیکوشت، بەڵام یەکێک لە بەندەکانی قورەیش بەناوی (وەحشی کوڕی حەرب) لەدواوە ڕمحێکی کرد بە پشتیدا و لە سنگییەوە دەری پەڕاند، لەڕوویدا هیچ کەس توانای ڕووبەڕووبوونەوەی نەبوو، بەڵام بەداخەوە لە پشتەوە شەهید کرا، وەحشی کوڕی حەربی حەبەشی خۆی دەگێڕێتەوە دەڵێ: من خزمەتکار و بەندەی ماڵی: (جوبەیری کوڕی موتعیم) بووم مامی جوبەیر لە بەدردا کوژرا، سوپای ئوحود ئامادە کرا جوبەیر هات وتی: ئەگەر حەمزەی مامی پێغەمبەر صلى الله عليه وعلى آله وسلم بکوژیت ئەوا ئازاد دەکەم، منیش تەنها بۆ ئازادبوونی خۆم دەرچووم لەگەڵیاندا کەسێکی بەتوانابووم لە هەڵدانی چەقۆ و ڕمدا، هەرگیز لە پێکانی ئامانج هەڵەم نەدەکرد. لەو جەنگەدا تەنها بەدوای حەمزەوە بووم، لەنێو خەڵکەکەدا چاوم بۆ گێڕا هەتا دۆزیمەوە، وەکو وشتری (ئەورەق) جۆرێکە لە بەهێزترین و گەورەترین جۆری وشتر خەڵکەکەی بەملاو ئەولای خۆیدا هەڵدەدا، هیچ شتێک لەبەردەمیدا خۆی

---

[131]ـ أنا الذى عاهدني خليلي ... ونحن بالسفح لدى النخيل.

أن لا أقوم الدهر في الكيول ... أضرب بسيف الله والرسول (سيرة إبن كثير ج٣، ص٣٢).



هەڵنەدەگرت، منیش پشتم لێ گرت و ڕمێکم بۆ هەڵدا لە پشتیم چەقاند و لە سنگی هاتە دەرەوە، وەحشی دەڵێ: بەجێمهێشت هەتا حەمزە مرد، بێجگە لەو کارە هیچ کارێکی دیکەم نەبوو، لەو جەنگەدا بۆ ئەوە کوشتم کە ئازادی خۆمی پێ بکڕم، پاشان گەڕامەوە بۆ سەربازگەکە لەوێ لێی دانیشتم.

بەڕاستی بە شەهیدبوونی شێرێک لە شێرەکانی سوپای موسڵمانان کارەساتێکی زۆر گەورەبوو، بەڵام لەگەڵ شەهیدبوونی حەمزە کە خەسارەتێکی یەکجار گەورەبوو، موسڵمانان کۆنترۆڵی تەواوی جەنگەکەیان کردبوو.

ئەو ڕۆژە هەموو هاوەڵان زۆر ئازایانە بێوێنە جەنگیان کرد، ئەبوبەکر وەکو هەڵۆ پەلاماری دەدا، عومەری کوڕی خەتتاب بەولاولای خۆیدا هەڵدەخولاو لێی دەکوشتن، عەلی کوڕی ئەبو تاڵیب ڕەشەبا ئاسا هەڵمەتی دەبرد، زوبێر وچانی نەبوو، موسعەبی کوڕی عومەیر هەڵگری ئاڵای ئیسلام لەنێویاندا بە ئاڵاوە دەیخستن و دەیکوشتن، تەڵحەی کوڕی عوبەیدوڵڵا وێنەی نەبوو لە چاپووکی و ئازایی و چاونەترسی و خێرایی، وەکو گەڵای دار دەیوەراندن، عەبدوڵڵای کوڕی جەحش یاری بە شمشێرەکەی دەکرد لە دەستی ڕاستی بۆ دەستی چەپی، بەهەردوو لادا لێی دەکوشتن، سەعدی کوڕی موعاز وەکو پڵنگ هێرشی دەبرد و لاوانی ئیسلام هەموو بەیەکەوە هەورە برووسکە بوون بۆسەر سوپای قوڕەیش، قوڕەیش شەکەت و ماندوبووبوون بەدەست موسڵمانانەوە، کەس لە کافران خۆیان بۆ نەدەگیرا بەرانبەر موسڵماناننددا.

## هەوڵی خالیدی کوڕی وەلید

ماکوان: خالیدی کوڕی وەلید سەرکردەیەکی سەربازی گەورە و زیرەکی قوڕەیش بوو، تا ئەو کاتەش موشریک بوو، کە سەنگەری بەهێزی موسڵمانانی بینی زۆر هەوڵیدا پشت لە موسڵمانان بگرێت، بەڵام نەیدەتوانی چووە پشت گردی ڕومات خۆی کۆمەڵەکەی بۆ ئەوەی پشتی موسڵمانان بگرێت خێرا کەتیبەی ڕومات بەتیرهاوێژی وەڵامیان دەداوە نەیدەتوانی هەنگاو هەڵبێنێتەوە.

چەند جار هەوڵیدا نەیدەتوانی هێرش بەرێت، بەتیرهاویشتن دەیانخستە دواوە و دەگەڕاوە، خالیدی کوڕی وەلید بەلێزانی و تواناى خۆی نەیتوانی سەنگەری کەتیبەی ڕومات ببەزێنێت، ناچار گەڕایەوە و دواوە و هەوڵەکانی شکستی دەخوارد.



## سەرکەوتنی موسڵمانان لە جەولەی یەکەمی ئوحود دا

شکست وردە وردە ڕووی کردە موشریکەکانی مەککە، (٣) هەزار کەس وردە وردە پاشەکشەیان کرد و دەستیانکرد بەهەڵهاتن بەرەو شاری مەککە، لەگەڵ ئەوەی کە سوپای موسڵمانان کەم بوون بەڵام وەکو ئەوە وابوو لەگەڵ (٣٠) هەزار کەسدا سوپای قوڕەیش دەجەنگێت.

بەتەواوەتی سوپای قوڕەیش بیری لە هەڵهاتن کردەوە، هەموو ڕایان کرد و تەنانەت ئافرەتەکانیان بینرا لە دوایانەوە ڕایان دەکرد، هەموو کەلوپەل و کەرەستەیەکیان لەدوای خۆیان بەجێهێشت، زوبێری کوڕی عەوام دەڵێ: چاوم لە خزمەتکارەکەی هیندی کچی عوتبە بوو بە جلوبەرگی سەماکەیەوە ڕای دەکرد بێ ئەوەی کەمو زۆر لەگەڵ خۆی هیچ بەرێت.

سەرکەوتنێکی زۆر ناوازە و بەهێزبوو بۆ موسڵمانان، ئەوەندەی سەرکەوتنی بەدر دڵخۆشکەر بوو خوای گەورە دەفەرمووێت:

﴿وَلَقَدْ صَدَقَكُمُ ٱللَّهُ وَعْدَهُۥٓ إِذْ تَحُسُّونَهُم بِإِذْنِهِۦ ۖ حَتَّىٰٓ إِذَا فَشِلْتُمْ وَتَنَٰزَعْتُمْ فِى ٱلْأَمْرِ وَعَصَيْتُم مِّنۢ بَعْدِ مَآ أَرَىٰكُم مَّا تُحِبُّونَ ۚ مِنكُم مَّن يُرِيدُ ٱلدُّنْيَا وَمِنكُم مَّن يُرِيدُ ٱلْءَاخِرَةَ ۚ ثُمَّ صَرَفَكُمْ عَنْهُمْ لِيَبْتَلِيَكُمْ ۖ وَلَقَدْ عَفَا عَنكُمْ ۗ وَٱللَّهُ ذُو فَضْلٍ عَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿١٥٢﴾﴾ [آل عمران]

واتە: سوێند بێت بەڕاستی خوای گەورە وادەی خۆی بۆ ئێوە بردە سەر، (لەسەرەتای جەنگی ئوحود) هەر بە مۆڵەت و یارمەتی ئەو (دوژمنانتان) بە گیرهێنا و تێکتان شکاندن هەتا ئەو کاتەی ساردی ڕووی تێکردن، بوو بە کێشەتان لەسەر هەندێک شت و یاخی بوون (لە فەرمانی پێغەمبەر سەنگەرتان چۆڵ کرد) دوای ئەوە هەندێک شتی نیشاندان کە حەزتان لێدەکرد، هەتانە دنیا دەوێت و هەتانە قیامەتی مەبەستە، لەوەودوا دەستی ئێوەی کۆتا کرد (لە دوژمنان) تا تاقیتان بکاتەوە سوێند بێت بەڕاستی خوا چاوپۆشی لێکردن لێتان خۆشبوو و خوا فەزڵ و ڕێزی هەیە بۆ ئیمانداران.

خوای گەورە هەمیشە پەیمان دەدا بە ئیمانداران ئەگەر سەر ڕاست و ڕاستگۆ بن و ئارام بگرن و شوێن کەوتووی فەرمانی پێغەمبەر بن دڵیایان دەکاتەوە لەسەرکەوتن لە بەدرو ئوحود، هەموو جەنگەکانی تردا.



هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ لەشاری مەدینە موژدەی سەرکەوتنی پێدان بەومەرجەی پابەند بن بە مەنهەجەوە وەکو چۆن لەبەدردا پابەند بوون، تا ئەو ساتە وەختە لە ئوحود موسڵمانان سەرکەوتنێکی بێوێنەیان بەدەست هێنا.

ئەو دە خاڵ و خەسڵەتەی کە لە سوپای بەدردا کۆببووەوە بەهەمان شێوە لەسوپای ئوحود دا کۆبوبوەوە، هەر لە ئیمان بەخوا و پێغەمبەر ﷺ و ڕۆژی ئاخیرەت، داوای بەهەشتیان دەکرد، شوورایان پیادە دەکرد، توانا و هێزیان بەباشترین شێوە کۆکردەوە، سەقامگیر و خاوەن بڕیار بوون بێ دوو دڵی، سوپاکە پشتی بە لاوەکان بەستبوو، سەرکردە لەگەڵ سەربازەکانیدا دەژیا و لێیان جیا نەدەبووەوە، برایەتی لەپێناوی خوادا بەرجەستە بووبوو لەنێوانیاندا هیوا و یەقینیان بە سەرکەوتنی خوا هەبوو، ئەوەی خاوەنی توانا بوو بەگوێرەی توانای خۆی کاری وەرگرتبوو، کەواتە: ئەم دە خاڵە هەرکەس پیادەی بکات سەرکەوتنی مسۆگەرە.



## لە شکۆی سەرکەوتنەوە بۆ موسیبەت و شکست

ماکوان: بەداخەوە لەدوای ئەو سەرکەوتنەگەورە و ڕاکردنی هەموو سوپای قورەیش، موسڵمانان وازیان لە یەک سیفات لەو دە خاڵە هێنا، ڕەوشەکە بەتەواوەتی گۆڕا. موشریکەکان هەڵاتن بەرەو مەککە هەموو کەرەستە و کەلوپەلەکانیان لەدوای خۆیان بەجێهێشت. زۆرێک لە خواردن و چەک و ئەسپ و وشتر لەدوایان بەجێما، ئەوانەی لەسەر گردەکە بوون شادەماری سوپا و پارێزەری سوپاکە بوون لە پشتەوە، دونیا کەوتە بەرچاویان ئەو هەموو دەستکەوتە بەجێمابوو لەدوای سوپای قورەیش، هەموو جێگاکانی خۆیان بەجێهێشت و فەرمانی پێغەمبەری خوایان ﷺ فەرامۆش کرد و غەنیمەت چاوی کوێرکردن، ئەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرمووبوون هەموویان لەبیرکرد، هەرچەندە عەبدوڵڵای کوڕی جوبەیر ئەمیریان بوو گوێیان بۆ ئەو نەگرت، ڕۆیشتن بۆ کۆکردنەوەی غەنیمەت، عەبدوڵڵا هاواری لێکردن لەبیرتان چوو پێغەمبەری خوا ﷺ چی پێ فەرموون؟ بەڵام ئەوان هەر دەیانوت: غەنیمەت، غەنیمەت.

ئەم سەرپێچییە بەدەستی ئەنقەست بوو هیچ پاساوێک هەڵناگرێت، سەرپێچییەکی ڕوون و ئاشکرایە بۆ فەرمانی پێغەمبەری خوا ﷺ پاشان ئەمیرەکەشیان، ڕاستەوخۆ (٤٠) کەسیان دابەزینە خوارەوە بۆ دەستکەوت و غەنیمەت و ئەنفال تەنها دە کەس لەسەر گردەکە مانەوە.

خالیدی کوڕی وەلید لەدوورەوە بینی گردەکەیان چۆڵکرد، ئەویش کەسێکی بەتوانای سەربازییە، زانیی سەنگەری بەرگری موسڵمانان چۆڵ کردوە، پێشتر کە شکست خواردوو بوو، بەهۆکاری ئەو سەنگەرە بوو موسڵمانان پابەندبوون بە فەرمانی رسول الله ﷺ، ئیتر خالیدی کوڕی وەلید هەلەکەی قۆستەوە و خێرا بەکۆمەڵ چواردەوری شاخەکەی داو پشتی لە موسڵمانان گرت، کارەسات لێرەوە دەست پێدەکات. ئەو دە کەسە زۆر هەوڵیاندا ئەو کۆمەڵەی خالید بە تیر هاویشتن ڕاوەدوو بنێن، بەڵام چارە نەبوو ئەوان کەم بوون و سوپاکەی خالید زۆربوون، بۆیان سەرکەوتنە سەر گردەکە، هەر دە کەسەکەیان شەهید کرد، عەبدوڵڵای کوڕی جوبەیریش لەناویاندا کە ئەمیرەکەیان بوو.

خالید پشتی گرت لە موسڵمانان بەدەنگی بەرز هاواری دەکرد و بانگی دەکردنەوە، سوپا هەڵهاتووەکە خالیدیان بینی پشتی موسڵمانانی گرتووە و بەدەنگ بانگەکەی خالیدەوە هاتن،



جەنگ جارێکی تر جۆش و خرۆشی سەندەوە، سوپای موسڵمانان کەوتە نێوان بەرداشی سوپای خالید و لەدواوە لەگەڵ سوپای گشتی قورەیش لەپێشەوە.

بەپەلە ئافرەتێکی موشریک بەناوی (عیمرە کچی عەلقەمە) ئاڵای قورەیشی بەرزکردەوە لەخاکی جەنگدا، موشریکەکان لەدەوری کۆبوونەوە، حەماسی جەنگ گرتنی بەجۆش و خرۆش و ڕقەوە باسی یادگاری بەدرەوە کە چۆن شکستیان خواردووە، دەستیان کردەوە بە جەنگ لەخاکی ئوحود دا، بەتەواوەتی فشاریان بۆ موسڵمانان هێنا.

پێغەمبەری خوا صَلَّىٰ اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ لەکۆتایی سوپا کەدا بوو کە سوپای موشریک هەڵهاتن، خەریکی سەرلەنوێ ڕیزکردن و ڕێکخستنەوەی سوپاکە بوو، خالیدی کوڕی وەلیدیش لەدواوە هات یەکەم کۆمەڵ پێی دەگات کەتیبەیەکە لەگەڵ پێغەمبەردان، لەبەردەم پێغەمبەری خوادا صَلَّىٰ اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ دوو بژاردە هەیە:

یەکەم: هەڵهاتن و خۆ ئامادە کردنەوە بۆ جەنگ.

دووەم: یاخود بڕیاردانی جەنگ لەبەرانبەر ئەو کۆمەڵە زۆرەدا هەموو بە ئەسپەوە دەجەنگان، کە ڕووبەڕووبوونەوەیان زۆر ئەستەمە. لە ئازایەتییەکەی بێوێنەی پێغەمبەردا صَلَّىٰ اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ بژاردەی دووەمی هەڵبژارد دەبێت جەنگ بکات، هاواری کرد موسڵمانان وەرن بۆ لای پێغەمبەرەکەتان، ئەو هاوارەش زۆر ترسناک بوو. چونکە بەشوێنی پێغەمبەر صَلَّىٰ اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ یان زانی هەموو بۆ کوشتنی چوون، بەڵام پێغەمبەری خوا صَلَّىٰ اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ گوێی بەوە نەدا و هاواری دەکرد ئەی بەندەکانی خوا وەرنە لای پێغەمبەرەکەتان.[١٣٢]

چەند جار بەدەنگی بەرز بانگی کردن بەڵام موسڵمانان زۆر شڵەژان و کافران لە چالاکییەکی زۆر ناوازەدا بوون بۆ جەنگ، بەڵام بەڕاستی کارەسات ڕوویدا و تراژیدیایەکی زۆر خەمناک بوو. خالید گوێی لە دەنگی پێغەمبەر صَلَّىٰ اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ بوو، چواردەوری پێغەمبەری صَلَّىٰ اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ گرت، خودی پێغەمبەر صَلَّىٰ اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ جەنگێکیان کرد لەگەڵ کۆمەڵەکەی لەگەڵیاندا بوو، دوژمنەکانیشیان پێی سەرسام بوو، پێغەمبەری خوا صَلَّىٰ اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ لەناویاندا دەیفەرموو، هانی دەدان و خۆشی شمشێری دەوەشاند، هەرکەس بتوانێت بەرگری بکات بەهەشتی مسۆگەرە، یاخود دەیفەرموو: کێ بەرگری دەکات و دووریان دەخاتەوە لەگەڵمدا

---

[١٣٢] ـ إلي فقال إلى عباد الله، إلى عبادالله، أنا رسول الله.



لەبەهەشتدا. ئەوەندە بەهێزەوە جەنگیان دەکرد (٧) لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ شەهید بوون، هەموویان لە ئەنسار بوون.[١٣٣]

یەکەم جەنگی موسڵمانانە ئافرەتان تێیدا بەشدار بن، پاشان دایکی عیمارە و خودی (عیمارەی کوڕی یەزید) لە تەنیشت پێغەمبەر ﷺ دەستیانکرد بە جەنگ، لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ وا دەجەنگی، پێغەمبەری خوا ﷺ زۆر پێی سەرسام بوو، تا لە کۆتاییدا ئەویش شەهید بوو کەوتە سەر زەوی، خۆی نزیک خستەوە لە پێغەمبەر ﷺ و ڕوومەتی خستە سەر قاچی موبارەکی پێغەمبەر ﷺ، پێغەمبەری خوا ﷺ زۆر پێی بێتاقەت بوو، تەنانەت فەرمووی: هاوەڵانم درێخییان نەکرد قاچی ڕوومەتی ئەو گەنجەی لەسەر بوو لەوکاتەدا پێغەمبەری خوا ﷺ کاریگەری کوشتنی ئەوەی لەسەربوو بەردیان هەڵدا بۆ پێغەمبەر ﷺ سەری موبارەکی پڕبوو لەخوێن.

بەڵام ئەو شێر ئاسا و وەک ڕەشەبا بوو لەناویاندا وەکو هەورە برووسکە بوو کەسیان نەیاندەوێرا لێی نزیک ببنەوە تا بەپەلە هاوەڵانی دیکە گەیشتن لە تەڵحەی کوڕی عوبەیدوڵڵا و سەعدی کوڕی ئەبی وەقاس، ئەم دوو هاوەڵە بەتەنها وەکو سوپایەک بوون، بەڵام پێغەمبەری خوا ﷺ زۆر ماندوبوو، کەسێک لە موشریکەکان بەناوی (عەبدوڵڵای کوڕی شەهابی زوهەری) لەدواوە کێشای بەسەری موبارەکی پێغەمبەر ﷺ داو پڕی کرد لەخوێن و درزی کردە سەری موبارەکی، لەدوای ماندووبوونی ئەو لێدانە پاشان کافرێکی تر هات بەناوی (عەبدوڵڵای کوڕی قمئە) بە شمشێر کێشای بە پشتی پێغەمبەر ﷺ دا، پێغەمبەری خوا ﷺ تاکوو یەک مانگ ئازاری هەبوو بەهۆی ئەو برینانە.

کافران زۆربوون پێغەمبەری خوا ﷺ فریایان دەکەوت، هەر لەدواوە زەفەریان پێ دەبرد و دەیانکێشا بە کڵاوی سەری کە ئاسن و زنجیری ئاسن بوو، دوو زنجیر چوون بە ڕوومەتی موبارەکەیدا، ئەوەی ئەو کارەی کرد عەبدوڵڵای کوڕی قمئە بوو، ئەیکێشا بەسەریدا وتی: بگرە ئەی موحەممەد من کوڕی قمئەم، پێغەمبەری خوا ﷺ بۆی دەرچوو ئاوڕی لێداوە ڕایکرد، بەڵام پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەی خوا لەناوت ببا، هەر ئەو کەسە لەدوای قسەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ چووە سەر شاخەکە و لەوێ کەوتە خوارەوە و مرد.

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

[١٣٣] ـ (من يدرهم عنا له الجنة من يدرهم عنا وهو رفيقي في الجنة).



پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵانی لە جەنگێکی زۆر سەخت دابوون، لەنێو سەدان کەسدا ئەمان دەجەنگن، پێغەمبەری خوا ﷺ لەدوای ئەو هەموو برینداری و ئازارە هەر دەجەنگا و دەیفەرموو: چۆن ئەو هۆز و نەتەوەیە ڕزگاریان دەبێ سەری پێغەمبەرەکەیان ﷺ شکاندووە،[١٣٤] خوای پەروەردگار ئایەتی دابەزاندو فەرمووی:

﴿لَيْسَ لَكَ مِنَ ٱلْأَمْرِ شَىْءٌ أَوْ يَتُوبَ عَلَيْهِمْ أَوْ يُعَذِّبَهُمْ فَإِنَّهُمْ ظَٰلِمُونَ﴾ [آل عمران]

واتە: بێگومان تۆ هیچ شتێکت لەکاروباری بەندەکان بەدەست نییە، ئەگەر تەوبە و پەشیمانییان لێ وەربگرێت، یان سزا و ئازاریان بدات (سەربەستە) چونکە ئەوانە ستەمکارن.

لەو کاتەدا تەڵحەی کوڕی عوبەیدوڵلا و سەعدی کوڕی ئەبی وەقاس، ئەوەندەی سوپایەک بەرگریان لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد، چونکە کارەکە زۆر سەخت بوو گرووپێکی پڕ چەک بە ئەسپ دەوری پێغەمبەر ﷺیان دابوو لەگەڵ ئەوەدا دەجەنگان، سەعد بە تیر هاویشتن دووری خستنەوە، ئەوەندە سەرسام بوو پێغەمبەری خوا ﷺ ئەیفەرموو: بیهاوێژە دایک و باوکم بەقوربانت بێ، سەعد ئەدائی جەنگی ئەوەندە بەهێز بوو.[١٣٥] تا ئەو ڕۆژەی خستیانە نێو گۆڕ سەعد شانازی بەو فەرمایشتەی پێغەمبەری خوا ﷺ دەکرد، دەیوت: تاکە کەسم پێغەمبەری خوا ﷺ دایک و باوکی بەقوربان کردووە.

پاشان تەڵحە هیچی کەمتر نەبوو لە سەعد، جەنگێکی وای کرد خۆی کردە قەڵغان بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ، لەگەڵ ئەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ سەرقاڵی جەنگ بوو تەڵحە بەچواردەوری پێغەمبەری خوا ﷺ دەجەنگا، تەنانەت ئەو ڕۆژە برینی جەستەی گەیشتە (٣٩) برین، لەگەڵ ئەو هەموو ئازار و برینداریيەدا یەشتا لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ دەجەنگا، ئەوانیش لە دوورەوە دەستیان کرد بە تیر هەڵدان توانایان نەبوو لێیان نزیک ببنەوە، تەڵحە دەستی کردبوو بە قەڵغان و پشتی قەڵغان بوو، لەدوورەوە تیرێکی بەدی کرد هات بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ دەستی خستە بەری و پێغەمبەری خوا ﷺی پاراست، بەو تیرە دەستی تووشی شەلەل بوو.

---

[١٣٤]ـ (كَيْفَ يُفْلِحُ قَوْمٌ شَجُّوا وَجْهَ نَبِيِّهِمْ) مسلم (١٧٩١).

[١٣٥]ـ (ارْمِ سَعْدُ فِدَاكَ أَبِي وَأُمِّي) الترمذي (٣٧٥٥).



کۆمەڵێک لە موهاجیرو ئەنسار بەرگرییەکی وایان کرد نە پێنووس نە وەسف نە زمان توانای نووسین و پێناسەو باسکردنی نییە، تەنها مەگەر بڵێم: بەڕاستی هاوەڵی پێغەمبەری خوا ﷺ بوون.

لەدوای ئەو جەنگە کە دەوری پێغەمبەریان ﷺ دابوو، کۆمەڵێک لە هاوەڵان بە پەلە گەیشتنە لای پێغەمبەر ﷺ، ئەبوبەکر دەڵێ: کەسێکم بینی لەدەوری پێغەمبەردا ﷺ لەگەڵیدا دەجەنگێت، وتم: خوایە تەڵحە بێت، هەر دووبارەی دەکردەوە دەیوت: خوایە تەڵحە بێت، دایک و باوکم بەقوربانت بێت، زانی تەنها تەڵحە ئەو ئازایەتییەی لێ دەوەشێتەوە، خێرا ئەبوبەکر خۆی گەیاند و جەنگێکی بێوێنەی کرد، پاشان عومەر گەیشت وەکو شێر و ئەژدیها پەلاماری دەدان، ئەبو عوبەیدەی کوڕی جەڕاحیش گەیشت، زۆرێک لە هاوەڵان گەیشتن.

وتیان: هەندێک ماندوویّتی پێغەمبەری خوا ﷺ دەربچێت، ئەبوبەکر وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ دەموچاوت ڕوومەتی تەلی کڵاوەکەی پیاچووە با دەری بهێنم، تەمەشای ئەو ڕەوشە بکەن چەندە دژوارە، هەموو گیانیان برینە، ئەبو عوبەیدە بە ئەبوبەکری وت: داوات لێدەکەم ئەو کارە بەمن بسپێرە، لێی دەزانم و ناهێڵم ئازاری پێ بگات، پاشان بەدان تەلەکانی لە ڕوومەتی پێغەمبەری خوا ﷺ دەرهێنا تا دانێکی شکا، بەڵام تەلێک هەر لەڕوومەتی پێغەمبەری خوا ﷺ مایەوە.

بۆ جارێکی تر ئەبوبەکر گەڕاوە کە تەلەکە دەربهێنێت، چونکە دانی ئەبو عوبەیدە شکا بۆ هاوکاری ئەو هات، بەڵام داوای لە ئەبوبەکر کرد وازی لێ بهێنێت تا ئەوی دیکەشیان دەربهێنێت و حەڵقەی کڵاوەکەی دەرهێنا و دانێکی تریشی شکا.

پێغەمبەری خوا ﷺ چاوی لە تەڵحە بوو هەر دەجەنگی، لەگەڵ ئەو هەموو ئازار و ماندووبوونەی خۆیدا هاواری کرد بڕۆن هاوکاری براکەتان بکەن، ئەو درێخی ناکات لە جەنگ[١٣٦]، بەداخەوە ئەویش لەدوای برینداربوون و جەنگێکی زۆر هێزی نەما و کەوتە سەر خاک.

کۆمەڵێکی تر لە هاوەڵان لەدەوری پێغەمبەری خوا ﷺ کۆبوونەوە لەوانە: ئەبو دووجانە و مالیکی کوڕی سینان و باوکی ئەبو سەعیدی خودری و حاتبی کوڕی ئەبی بەلتەعە، بەڵام ئەوەی گرنگە ئەو ئافرەتە دایکی عیمارە لە پیاوان زیاتر بەهێز و ئازاو خاوەن

---

[١٣٦] ـ (دونكم أخاكم، دونكم أخاكم، فقد أوجب).



غیرەت بوو. ئەو جەنگەی ئەو دەیکرد، لەگەڵ ئەوەی لەبەرچاویدا دوو کوڕی شەهید بوون شتی وام لە خەیاڵیشدا نەبینیوە، ئەو هاوەڵە ئافرەتەی پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ ئەوەندە بەهێز بوو.

پاشان ئەبو تەڵحەی ئەنساری خۆی کردە مەتەرێز و قەڵغان بۆ پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ بۆ ئەوەی تیری بەرنەکەوێت. دیسان پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ کەوتەوە جەنگکردن دەستی کرد بە تیرهاویشتن کە تیری هەڵدەدا ئەبو تەڵحە دوای هەڵدانی تیرەکان دەهاتە بەردەمی پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ و پێی دەوت: تۆ خۆت دەرمەخە با تیرێکت بەرنەکەوێ، بەخوا پێت خۆشبێت یان نا لاشەم لە لاشەت جیا ناکەمەوە.

پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ دەفەرمووێ: لەکاتی جەنگدا تەماشای لای چەپی خۆم دەکرد هەر دایکی عیمارە بوو، لەلای ڕاستم هەر ئەو بوو لە پێشمەوە هەر ئەو بوو، لەدوامەوە هەر دایکی عیمارە بوو، نەمدی بەبێ جەنگ کردن هەمیشە لە جەنگدابوو، پارێزگاری لێ دەکردم.

بەداخەوە پیاوانی ئێستا تەنها چاوەڕوانی خواردن دروست کردنن لە ژنەکانیان، دیارە پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ زۆر سەرسام بوو بەم شێرە ژنە، لەکاتێکدا ئەو تەکلیفی شمشێر وەشاندنی لەسەر نییە، لەکاتێک پیاوانێک ڕایانکرد کەچی ئەو درێخی نەکرد لە جەنگدا.

پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ سەرسامی خۆی دەربڕی بۆی، وەکو دڵنەوایی دڵنەوایی کرد بۆ کوڕەکانی، دایکی عیمارە وتی: خۆزگە سێیەمیشم هەبووایە و لەپێناو ئەم ئیسلامەدا شەهید بووایە! ئەمە چ عەزەمەتێکە ئەم ئافرەتە تەمەشای پلەی ئیمانی بکە، داوای شەهیدانە و غەنیمەت ناکات، دەڵێت: ئەی پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ لەخوای پەروەردگار داواکارم خۆم و کوڕەکانم لە بەهەشتدا لەگەڵ تۆبین. پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ فەرمووی: ئێوە لەگەڵ منن لە بەهەشت.[١٣٧]

خۆی و هاوسەرەکەی و منداڵەکانی لە جەنگی ئوحود دا بەشدار بوون، دوو کوڕی هەبوو، هەردووکیان شەهید بوون، پاشان حاتەبی کوڕی ئەبی بەلتەعە لە جەنگەکەدا ئەو کەسەی کوشت کە دەمووچاوی پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَی بریندار کرد، برای سەعدی کوڕی

[١٣٧] ـ (فقالت يا رسول الله أدع الله أن نكون معك في الجنة، فقال أنتم معي في الجنة).



ئەبی وەقاس بوو، بەناوی عوتبەی کوڕی ئەبی وەقاس، بەردی هەڵدەدا بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ.

لەکارەساتێکی تردا پێغەمبەری خوا ﷺ هەڵسایەوە بۆ جەنگ، چووە نێو جەنگەکە بە فێڵ ئەسپەکانی خالیدی گەڕاندەوە دواوە، کەمینێکیان دانا چاڵێک بوو بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ کەوتە شوێنیان، کەوتە نێو چاڵەکە! ئامانجی موشریکەکان ئەوەبوو پێغەمبەری خوا ﷺ بکەوێتە ناوی و تیربارانی بکەن و لەوێدا بیکوژن، بەڵام ئەبو دووجانە خێرا خۆی خستە سەر چاڵەکە و پشتی کردە قەڵغان بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ چەندین تیر بە پشتی ئەبو دووجانە کەوت، موهاجیر و ئەنسار کۆبوونەوە درێخیان نەکرد لە جەنگ کردن و بەرگری کردن لە پێغەمبەری خوا ﷺ.

موسعەبی کوڕی عومەیر هەڵگری ئاڵای موهاجیرەکان بوو ئەویش درێخی نەکرد لە جەنگ، لەچواردەوری پێغەمبەری خوا ﷺ جەنگی کرد تاوەکو دەستی ڕاستی پەڕی، بەدەستی چەپی ئاڵاکەی هەڵگرت، بۆ ئەوەی نەکەوێت، بەڵام لەدواوە موشریەکەکان لێیاندا و شەهیدیان کرد، کەوتە سەر خاك و ئەو ئایەتەی دووبارە دەکردەوە:

﴿وَمَا مُحَمَّدٌ إِلَّا رَسُولٌ قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِهِ ٱلرُّسُلُ ۚ أَفَإِيْن مَّاتَ أَوْ قُتِلَ ٱنقَلَبْتُمْ عَلَىٰٓ أَعْقَٰبِكُمْ ۚ وَمَن يَنقَلِبْ عَلَىٰ عَقِبَيْهِ فَلَن يَضُرَّ ٱللَّهَ شَيْـًٔا ۗ وَسَيَجْزِى ٱللَّهُ ٱلشَّٰكِرِينَ﴾ [آل عمران]

واتە: (موحەممەد ﷺ) تەنها پێغەمبەرێک نەبووە وەفات بکات بێگومان پێغەمبەرانی پێش ئەویش وەفاتیان کردووە، ئایە ئەگەر وەفاتی کرد، یان کوژرا و شەهید بوو ئێوە پاشگەز دەبنەوە و هەڵدەگەڕێنەوە؟ خۆ ئەوەی هەڵگەڕێتەوە و پاشگەز بێتەوە ئەوە هەرگیز زیان بەخوا ناگەیەنێت، لەداهاتوویێکی نزیکدا خوای گەورە پاداشتی سوپاسگوزاران دەداتەوە.

خوای گەورە هەمیشە پەیمان دەدا بە ئیمانداران ئەگەر سەرڕاست و ڕاستگۆبن و ئارام بگرن شوێنکەوتووی فەرمانی پێغەمبەر ﷺ دڵیان دەکاتەوە لەسەرکەوتن لە بەدر و ئوحود، هەموو جەنگەکانی تردا.

هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ لەشاری مەدینە موژدەی سەرکەوتنی پێدان بەو مەرجەی پابەند بن بە مەنهەجەوە وەکو چۆن لەبەدردا پابەند بوون، تا ئەو ساتە وەختە لە ئوحود موسڵمانان سەرکەوتنێکی بێوێنەیان بەدەست هێنا.



ئەو دە خاڵ و خەسڵەتەی کە لە سوپای بەدردا کۆببوەوە بەهەمان شێوە لەسوپای ئوحود دا کۆبووبووەوە، هەر لە ئیمان بەخوا و پێغەمبەر صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ و ڕۆژی ئاخیرەت و داوای بەهەشتیان دەکرد، شووراپان پیادە دەکرد، توانا و هێزیان بەباشترین شێوە کۆکردەوە، سەقامگیر و خاوەن بڕیار بوون، بێ دوودڵی، سوپاکە پشتی بە لاوەکان بەستبوو، سەرکردە لەگەڵ سەربازەکانیدا دەژیا و لێیان جیا نەدەبووەوە، برایەتی لەپێناوی خوادا بەرجەستە بوو، لەنێوانیاندا هیوا و یەقینیان بە سەرکەوتنی خوا هەبوو، ئەوەی خاوەنی توانا بوو بەگوێرەی توانای خۆی کاری وەرگرتبوو، کەواتە: ئەم دە خاڵە هەرکەس پیادەی بکات سەرکەوتنی مسۆگەرە.

## هەواڵی بڵاوبوونەوەی کوشتنی پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ

ماکوان: کاتێک موسعەبی کوڕی عومەیر شەهید بوو شێوەی زۆر نزیک بوو لە پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ، موشریکەکان وایان زانی پێغەمبەری خوا کوژراوە صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ، ئەوەی موسەعەبی لەدواوە شەهید کرد، (ئیبنوو قمئە) بوو وتی: موحەممەدم کوشت! لە مەیدانی جەنگ هەواڵەکە بڵاو بوویەوە گوایە پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ کوژراوە، هەواڵەکە گەیشتە هەردوو لا لە موسڵمانان و موشریکەکان، ئەمەش کارەساتێکی گەورەی لەلای ئیماندارن دروست کرد، لەکاتی بڵاوبوونەوەی هەواڵەکە پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ کەوتبووە چاڵەکە، لەتاو ئازار بێهۆش کەوتبوو، هاوەڵان ناتوانن بێ پێغەمبەری خوا بژین، ئەوەیان لەلا دروست بوو چۆن پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ دەکوژرێت، هێشتا ئەرکی کۆتایی پێنەهاتووە و پەیامەکەی تەواو نەبووە، لەو کاتەدا پرسیاری زۆر بەمێشکی هاوەڵاندا دەهات، شەیتانیش لە مەیدانەکەدا وجودی هەیە، تا وای لێهات زۆرێک لە هاوەڵان تووشی بێ ئومێدی بوون، هاوەڵان ئەم دید و تێڕوانینەیان زۆر هەڵەبوو بۆ پێغەمبەر صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ، خۆ پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ شمشێری بەرز نەکردۆتەوە بەرگری لە نەفسی خۆی بکات یان تەنها بەرگری لە موسڵمانان بکات، ئەمە جیهادە لەپێناوی خوای پەروەردگاردا، خۆ خوای گەورە ماوە و هەرگیز نامرێت، هەروەکو: (سابتی کوڕی دەحداح) لە مەیدانی جەنگدا وتی: ئەو نائومێدی و هیوا بڕانەتان لە چییە؟ چونکە خاوەنی ئیمانێکی قووڵ و تێگەیشتنی تەندروست بوو، خۆ ئەگەر موحەممەد مردووە، خوای پەروەردگار زیندووە و نامرێت، لە مەیداندا جەنگی کرد هەتا شەهید بوو، بەهەمان شێوە یەکێکی دیکە لە هاوەڵان بەناوی (ئەنەسی کوڕی نەزر) کە بینی ئەو نائومێدی و بێهواییە ڕووی کردۆتە هاوەڵان، لە جێگەی خۆیاندا چەقبوون، هەموو ڕۆحێکی جەنگاوەری و



جیهادییان لەدەست داوە، توانای بەرەنگاربوونەوەیان نییە، فەرمووی: دەی باشە چاوەڕێی چین، ئەگەر پێغەمبەرەکەتان کوژراوە ئێوەش هەڵسن با بکوژرێن لەپێناوی ئەو شتەی پێغەمبەرەکەتانی لەسەر کوژراوە، بەوپەڕی ئازایەتی و دڵگەرمییەوە ئەو قسەیەی کرد، دەستی بەرزکردەوە بۆ ئاسمان و فەرمووی: خوایە من داوای لێبوردن دەکەم بۆ ئەوەی کە پێغەمبەرەکەتیان کوشت، مەبەستی موشریکەکان بوو کە هەواڵی کوشتنی پێغەمبەریان ﷺ بڵاو کردەوە.

پاشان بە گەرموگوڕی و نەڕەی تەکبیرەوە بەرەو ڕووی کافرەکان ڕۆیشت، سەعدی کوڕی موعاز وتی: بۆ کوێ دەچیت ئەی باوکی عومەر؟ مەبەستی ئەنەسی کوڕی نەزر بوو، ئەویش وتی: بۆنی خۆشی بەهەشت دەکەم، وا بەرەو بەهەشت دەڕۆم، جەنگێکی زۆر ناوازە و ئازایانەی کرد، زۆری لە موشریکەکان کوشت، لەکۆتاییدا خۆی شەهید بوو ڕاستەوخۆ بۆ بەهەشت، (٨٠) جێگەی شمشێری پێوەبوو، کەس نەیزانی ئەو لاشەیە کێیە هەتا خوشکەکەی هات بە نیشانەیەک لەسەری نینۆکەکانیدا ناسیەوە.

پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ لە چاڵەکە هاتە دەرەوە و لەمەیدانی جەنگەکەدا هاوەڵی بەڕێز (کەعبی کوڕی مالیک) بینی و هاواری کرد: موسڵمانان پێغەمبەری خوا ﷺ زیندووە، چەند جار هاواری کرد خێرا (٣٠) کەس ئاگادار بوونەوە بەرەو ڕووی پێغەمبەر ﷺ ڕۆیشتن، هاوەڵان هەموو دەنگیان بەرز کردەوە پێغەمبەری خوا ﷺ زیندووە، بەڵام پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی بێدەنگ بن، تا جارێکی تر گەلەکۆمەکییان لێ نەکەنەوە، موشریکەکان و زۆرێک لە هاوەڵان کۆبوونەوە، عومەری کوڕی خەتاب مەفرەزەی دروست کرد پێغەمبەری خوا ﷺ بەشێوەیەکی سەربازی و ڕێکخستن وردە وردە سەنگەری خۆی گەیاندە شاخی ئوحود.

ئیتر پێغەمبەری خوا ﷺ هاواری لە هاوەڵان کرد: وەرنە لام، ئەی بەندەکانی خوا. هاوەڵان لێی کۆبوونەوە، بەڵام بەداخەوە هەندێک نەک هەر کۆنەبوونەوە بەڵکو لەخاکی جەنگەکەدا ڕایانکرد، ڕاکردن لە جەنگ نەک موسیبەتە، بەڵکو یەکێکە لە تاوانە هەرە گەورەکان، وەکو: (زینا و ڕیبا و ماڵی هەتیو خواردن و سیحرو کوشتنی خەڵک بەناهەق) هەرچی پێغەمبەری خوا ﷺ بانگی کردن ئەوان هەر ڕایان دەکرد، بەڵام زۆربەی لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ چوونە سەر شاخی ئوحود، ئەوانەیشی کە بانگی کردن گوێیان لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو، بەڵام گوێیان پێ نەدا و گەڕانەوە بۆ شاری مەدینە. خوای پەروەردگار باسی ئەو ڕاکردنەی موسڵمانان دەکات، دەفەرمووێت:



﴿۞ إِذْ تُصْعِدُونَ وَلَا تَلْوُۥنَ عَلَىٰٓ أَحَدٍ وَٱلرَّسُولُ يَدْعُوكُمْ فِىٓ أُخْرَىٰكُمْ فَأَثَٰبَكُمْ غَمًّۢا بِغَمٍّ لِّكَيْلَا تَحْزَنُوا۟ عَلَىٰ مَا فَاتَكُمْ وَلَا مَآ أَصَٰبَكُمْ ۗ وَٱللَّهُ خَبِيرٌۢ بِمَا تَعْمَلُونَ ﴾ [آل عمران]

واتە: ئیتر ئەوەبوو کە (بەگیر هاتن و کشانەوە و شپرزە و پەرشو بڵاو بوون)، خۆتان بەکێوی ئوحود و دەوروبەریدا هەڵدەگێڕا، ئاوڕتان لەکەس نەدەدایەوە لەکاتێکدا پێغەمبەریش لەدواوە بانگی دەکردن، لەلاکەی ترەوە: (ئەی بەندەکانی خوا بگەڕێنەوەو ڕامەکەن)، جا ئەوەبوو ئێوە خەم و خەفەتتان خستە دڵی پێغەمبەرەوە (بەنافەرمانیتان خوای گەورەش) خەمو پەژاری خستە دڵی ئێوەوە (بەدەنگوباسی برینداربوونی پێغەمبەر و شەهیدبوونی) تاوەکو خەفەت نەخۆن بۆ ئەوەی لەدەستتان چووە، ئەوەشی خوا تووشی کردوون بەسەری هێنان خواش ئاگادارە بەو کار و کردەوانەی ئەنجامی دەدەن.

پێغەمبەری خوا ﷺ خۆی لە دامێنی شاخەکەدا وەستابوو، سوپاکەی ئەناردە بەرزی شاخی ئوحود، لەدوورەوە یەکێک لە گەورە سەرکردەکانی قورەیش پێغەمبەری خوا ﷺی بینی، بەناوی (ئوبەی کوڕی خەلەف)، پێغەمبەری خوا ﷺ کە هەموو سوپاکەی خستە سەر شاخ، خۆی دەستی کرد بە ڕۆشتن، بەڵام ئەو موشریکە زانی پێغەمبەری خوایە و لەدامێنی شاخەکەدایە، هاواری کرد ئەی موحەممەد کەس لەدەستم ڕزگارت ناکات، کەس لەدەستم ڕزگارت ناکات، یەکێک لە هاوەڵان گەڕایەوە بەوانی تری وت: ئەوە بەزەییتان بەو کابرایەدا دێتەوە، بۆ یەکێکتان نایکوژن؟

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: وازی لێ بێنن با لێم نزیک بێتەوە، ئەوانی هەموو نارد، خۆیشی چاوەڕێی ئوبەی کوڕی خەلەفی کرد، کە نزیک بوویەوە لێی پێغەمبەری خوا ﷺ شمشێرەکەی دەرهێنا و زۆر بەسووکی برینداری کرد، کەچی دەیقریشکاند و هاواری ئەکرد موحەممەد کوشتمی، وەڵاهی موحەممەد کوشتمی، هەموو موشریکەکان لایان سەیر بوو، وتیان بۆ وا لەخۆت دەکەیت، زۆر برینێکی سادەیە لە ملت، ئەوەندەی ناوێت هاواری بۆ دەکەیت، وتی: ئاخر ئێوە نازانن کاتی خۆی لە مەککە پێی وتم: ئوبەی من دەتکوژم، سوێند بەخوا بەس شمشێرەکەیم بەربکەوێت، برینداریش نەبم دەمکوژێت![١٣٨]

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

١٣٨ ـ فقال النبي ﷺ دعوه، ولما دني من النبي تناول رسول الله ﷺ حربته وضربة قد خدشت فيه خدشا بسيطا جداً، وصرخ أبي بن خلف وصرع على الأرض، وقام يجري وهو يقول: قتلني والله محمد، واستعجب المشركون، وقالوا: ذهب والله فوآدك، والله ما بك من بأس، فهو خدش



ئەوەش حاڵی موشریک بوو کە بەئاستەم شمشێرەکەی پێغەمبەری خوا ﷺی بەرکەوت، لەخاکەکە کەوتوو پاشان ڕای کرد وتی: موحەممەد کوشتمی، وەڵلاهی موحەممەد کوشتمی، ئەو قسەیەی ئوبەی کوڕی خەلەف دەلالەتە لەسەر ئەوەی چەندە بڕوایان بە قسەی پێغەمبەر ﷺمە، دەیانزانی ڕاستگۆترین مرۆڤە، ئەوان تەنها لەبەر بەرژەوەندی خۆیان بەدرۆیان دەخستەوە، ئارەزوو و هەوا و نەفس وای لێکردبوون (لەعنەتی خوایان لێبێت).

## پاشەکشەی سوپای ئیسلام بۆ سەر چیای ئوحود

پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ سەرکەوتە سەر چیای ئوحود، پێغەمبەری خوا ﷺ لەچەند لاوە بریندار بوو، کە بۆ سەرچیاکە سەرکەوت زۆر شەکەت و ماندوو بوو، بەردێکی گەورە هاتە ڕێگەی نەیتوانی بەسەریدا سەرکەوێ، لەوکاتەدا تەڵحەی کوڕی عوبەیدوڵلا بەو هەموو ئازار و برینەیەوە هاتە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ و کردیە کۆڵ، لەکاتێکدا خۆی لە (٣٩) جێگەوە بریندار کرابوو، پێغەمبەری خوا ﷺی سەرخست، پێغەمبەری خوا ﷺ هێز و توانای تەڵحەی بینی فەرمووی: "بەڕاستی تەڵحە تۆ درێخیت نەکرد"، خۆیشی کەسێک بوو لەو دە کەسەی موژدەی بەهەشتیان پێدراوە، هەرکات باسی جەنگی ئوحود بکرایە، ئەبوبەکر دەیوت: هەموو کات و ساتەکانی تەڵحە خاوەنی بوو، ئەو ڕۆژە درێخی نەکرد خوا لێی ڕازیبێت.

زانرا پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەڵ سوپاکەیدایە و زیندووە، پاشەکشەی کردۆتە سەر چیای ئوحود، خالیدی کوڕی وەلید و ئەبو سوفیان خۆیان کۆکردەوە بۆ هێرشێکی تر، بەڵام پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: (اللهم إنه لا ينبغي لهم أن يعلونا)[139] مەفرەزەکەی عومەری کوڕی خەتاب دەستیان کرد بە تیر هاویشتن، سوپاکەی قورەیش بەهیچ شێوەیەک نەیانتوانی یەک هەنگاو بەرەو چیاکە پێش بکەون ناچار گەڕانەوە، پێغەمبەری خوا ﷺو هاوەڵان خۆیان باش قایم کرد لەسەر چیاکە و لەناو بەردەکاندا حەشارگەیان دروست کرد و مانەوە.

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

بسيط، فقال إنه وقد قال لي بمكة: أما أقتلك فوالله لو بصق علي لقتلني). السيرة النبوية، إبن كثير، ج٥، ص٨٣.

[139] سبل الهادي والرشاد في سيرة خير العباد، (ج٤، ص٢١٠).



پاشان موشریکەکان گەڕانەوە چوونە سەر تەرمی شەهیدانی موسڵمانان و کە لە خاکی ئوحود دا شەهید بوون، ئافرەتانی قورەیش گوێچکە و لووتی هاوەڵانیان دەبڕی و دەیانکردە ملوانکە و دەیانکردە ملیان، پاشان خێزانی ئەبو سوفیان چووە سەر تەرمی شێری خوا و جگەرەکەی دەرهێنا و ویستی بیخوات، بەڵام نەیتوانی زۆر داخ لەدڵ بوو، باوکی و مامی و براکەی و کوڕەکەی لە جەنگی بەدردا کوژرا بوون، کوڕەکەی ناوی (حەنزەڵەی کوڕی ئەبو سوفیان) بوو، ئەو کارەی کردیان تێکدانی لاشەی موسڵمانان و یاریکردن بە لاشەی شەهیدانی بەدر، دەری دەخات کە چەندە داخ لەدڵ و ڕقن بوون بەرانبەر بە موسڵمانان.

لەدوای سەرکەوتنی پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ سەر چیای ئوحود خوێن لەسەری دەڕۆیشت بەبەردەوامی، هاوەڵان ئاویان کرد بەسەری موبارەکی، بەڵام چارەی نەبوو خوێن هەر لەسەری دەهات، پاشان فاتیمەی کچی بەشدار بوو لە جەنگی ئوحود دا، حەسیرێکی هێنا و سوتاندی سۆتەکەی خستە سەر برینی پێغەمبەر ﷺ سوپاس بۆ خوا نەزیفی خوێنی سەری پێغەمبەری خوا ﷺ وەستا.

موسڵمانان لە بەرەبەیانەوە جەنگیان کرد هەتاکوو نیوەڕۆ، بۆ نوێژی نیوەڕۆ پێغەمبەری خوا ﷺ نەیتوانی بەپێوە نوێژ بکات، بە دانیشتنەوە نوێژی کرد و هاوەڵانیش هەموویان بەدانیشتنەوە لەدوای پێغەمبەرەوە ﷺ نوێژیان کرد، (ئیقتیدا)یان بە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد.

زۆرێک لە موشریکەکان بڕوایان وابوو پێغەمبەری خوا ﷺ کوژراوە، هەروەها موسڵمانان بەشێکی لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ بوون لە کێوی ئوحود، بەشێکی شەهید بوون، بەشێکی تری لە چیاکاندا خۆیان مەڵاس دابوو، کۆمەڵێک لە موسڵمانان بۆ شاری مەدینە ڕایان کرد، بەڵام بەگشتی لە تراژیدیایەکی زۆر خەمناکدا بوون، ئەبو سوفیان نزیک شاخی ئوحود بوویەوە زانی زۆربەی موسڵمانان لەوێدان، کۆمەڵێکی زۆری موشریکەکانی لەگەڵدا بوو، ویستی قسە بە موسڵمانان بڵێ، دەیویست دڵنیابێ لەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ کوژراوە یان زیندووە. هاواری کرد وتی: ئایا موحەممەدتان تێدایە؟

پێغەمبەری خوا ﷺ ئاماژەی کرد وەڵامی مەدەنەوە بۆ ئەوەی جێگەکانتان ئاشکرا نەبێ.

پاشان ئەبو سوفیان وتی: ئەی کوڕەکەی ئەبو قووحافەتان تێدایە؟ مەبەستی ئەبو بەکری سدیق بوو، بەهەمان شێوە پێغەمبەری خوا ﷺ ئاماژەی بۆ کردن وەڵامی مەدەنەوە، کەس وەڵامی نەدایەوە.



هەر وازی نەهێنا وتی: ئەی عومەر لەژیاندایە؟

دەیزانی ئەو سێ کەسایەتییە گرنگن، دوانیان وەزیری پێغەمبەرن صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ.

دیسان پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ فەرمووی: هیچ وەڵامی مەدەنەوە.

ئەبو سوفیان زیاتر سەرکەوت بۆ شاخەکەو وتی: ئەو سێ کەسەی ناوم هێنان بەسە کە لەناوچوون، ئەوە ئامانجمان بوو، خۆ ئەگەر لەژیاندا بوونایە وەڵامیان دەداوە.

کە وای وت: عومەری کوڕی خەتاب خۆی بۆ نەگیرا و هەڵسایەوە و وتی: ئەی دوژمنی خوا ئەو سێ کەسەی ناوت بردن بەکوێرایی چاوت هەرسێکیان زیندوون.

پاشان بۆ ئەوەی زیاتر ڕقی موسڵمانان هەڵسێنێ وتی: ئەو لاشانەی کە شێواون لە مردووەکانتان من فەرمانم پێ نەکردوون، بەڵام پێم ناخۆش نییە و هیچ کاریگەری لەسەرم نییە، پاشان وتی: (هوبەل) بەرز ڕاگرن، هاوەڵان بێدەنگ بوون، پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ فەرمووی: وەڵامی بدەنەوە، فەرموویان: بەچی وەڵامی بدەینەوە؟

پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ فەرمووی: بڵێن: خوای ئێمە بەرز و پیرۆزە و لەسەرووی هەموو بەرزەکانەوەیە.

ئەبو سوفیان وتی: ئێمە خاوەنی (عوزا)ین ئێوە عوزاتان نییە.

پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ فەرمووی: وەڵامی بدەنەوە.

هاوەڵان وتیان چۆن وەڵامی بدەینەوە؟

پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ فەرمووی: بڵێن: ئێمە خوامان هەیە، ئێوە کێتان هەیە؟

ئەبو سوفیان وتی: ئەو سەرکەوتنەبەرامبەر بەدرە، جەنگیش یان بۆ ئێوەیە یان بۆ ئێمەیە.

پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ بەعومەری فەرموو: بڵێن، هەرگیز جەنگی ئێمە وەکو جەنگی ئێوە نییە، مردووەکانی ئێمە لە بەهەشتن، مردووەکانی ئێوە لە دۆزەخ.

ئەبو سوفیان: عومەر تا لای من وەرە کارم پێتە!

پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ فەرمووی: بڕۆ بزانە چی دەڵێ، کە عومەر چوو، ئەبو سوفیان وتی: عومەر سوێندت دەدەم بە (الله) پێم بڵێ: موحەممەدمان کوشتووە؟

عومەر فەرمووی: سوپاس بۆ خوا نەخێر، وا گوێی لە قسەکانتە.



ئەبو سوفیان: بەڕاستی عومەر تۆ ڕاستگۆی لای من تاکو کوڕەکەی (قمئه)، ئەو کەسە بوو کە وتی: موحەممەدم کوشت، ئەمەش مانای ڕێزی موسڵمانانە تەنانەت لای دوژمنەکانیشیان، بەم قسانە جەنگ کۆتایی هات، ئەبو سوفیان سوپاکەی گەڕاندەوە شاری مەککە.

## شەهیدەکانی ئوحود

لە نزیکی عەسردا موسڵمانان لە چیای ئوحود دابەزین بۆ ئەوەی شەهیدەکانیان بنێژن، تراژیدیا و کارەسات بوو زۆر ڕەوشێکی ناخۆش بوو، بەلای لاشەی (٧٠) لە باشترین موسڵماناندا تێپەڕین کە شەهید بووبوون، لەخاکی مەیدانی جەنگدا لەوانە: (حەمزەی کوڕی عەبدولموتەڵیب، عەمری کوڕی جەمووح، عەبدوڵڵای کوڕی حەڕام، موسعەبی کوڕی عومەیر، خەیسەمە) زۆرێکی تر لە هاوەڵانی بەڕێزی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وعلى آله وسلم.

کە پێغەمبەری خوا بینی زۆر دڵتەنگ بوون فەرمووی: ئەی پەروەردگارم من شاهیدی ئەدەم ئەوانە شەهیدن، هەرکەسێک لەم شەهیدانە و هەر شەهیدێک لەپێناوی زاتی بەرزت شەهید بووبێت ئەوا ڕۆژی قیامەت بەو جێگایەی کە پێکراوە و خوێنی لێ دەچۆڕێت، ئەو ڕۆژە ڕەنگی خوێنە و بۆنیشی بۆنی میسک.[١٤٠]

پاشان هەندێک لە هاوەڵان شەهیدەکانیان هەڵگرت بۆ ئەوەی بیانبەنەوە بۆ شاری مەدینە و بیاننێژن، بەڵام پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وعلى آله وسلم فەرمانی پێکردن کە هەر لەخاکی ئوحود دا بنێژرێن، بێ ئەوەی پێویست بکات بیانشۆن و کفنیان بکەن، بەڵکو بە جلەکانی خۆیانەوە بیاننێژن، تەنها بەرگی درع و قەڵغانەکانیان لێ بکەنەوە.

پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وعلى آله وسلم دوو دوو، سێ سێ، لە یەک گۆڕدا دەیشاردنەوە، دەیفەرموو: کامیان زیاتر قورئانی لەبەرە ئەو زووتر بخەنە نێو گۆڕ، چەند جار دووبارەی کردەوە دەیفەرموو: خوایە من شاهیدم لەسەر ئەو خەڵکە لەپێناوی تۆدا شەهید بوون.

ئەگەر دوو لەهاوەڵان دۆست و نزیک بووان، ئەوا بەیەکەوە دەیخستنە نێو گۆڕ بۆ نموونە: (عەبدوڵڵای کوڕی عەمری کوڕی حەڕام و عەمری کوڕی جەمووح). کاتێک چووە سەر تەرمی حەمزەی مامی زۆر بۆی گریا و زۆر خەفەتبار بوو، عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود دەڵێ: هیچ کاتێک پێغەمبەری خوامان صلى الله عليه وعلى آله وسلم نەبینیوە بەو شێوەیە بگری.

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

[١٤٠] (أنا الشهيد على هؤلاء يوم القيامة ما من جريح يجرح في الله إلا الله يبعثه يوم القيامة وجرحه يثعب دما اللون لون الدم والريح ريح مسك) أخرجه الطبراني (٨٢/١٩، رقم ١٦٧) قال الهيثمي (١١٩/٦): رجاله رجال الصحيح. والبيهقي (١١/٤، رقم ٦٥٩٠).



پێغەمبەری خوا ﷺ هەموو شەهیدانی ڕووە و قیبلە دانا و نوێژی مردووی لەسەر کردن، پێغەمبەری خوا ﷺ و هاوەڵانی کاتێک موسعەبی کوڕی عومەیریان دەشاردەوە جلوبەرگەکەی هێندە و سادە و کۆن و کورت بوو سەری و پێیەکانی نەدەشاردەوە، تا ناچار پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: سەری بە جلەکانی داپۆشن، قاچیشی بە پووش و پەڵاش! لەکاتێکدا کوڕی دەوڵەمەندی شاری مەککە بوو، بەهەر جێگایەکدا بڕۆیشتایە دەیانزانی موسعەب بەو جێگایەدا تێپەڕیووە، لەبەر ئەوەی بۆنی زۆر خۆشی بەکار دەهێنا و دایکی جل و بەرگی لە یەمەنەوە بۆ دەکڕی، عەتری لە شامەوە بۆ دەکڕێ، بەڵام لەپێناوی خوادا شەهید بوو، بەدڵنیاییەوە خوای پەروەردگار لە بەهەشتدا لەوانە زیاتری پێدەبەخشێ. هەموو ئەو ڕەوشە کارەساتبار و پڕ ناسۆر و برینە لەبەر هەڵەیەکی موسڵمانان بوو کە غەنیمەت و دونیا چووە دڵیان.

## سوپاسگوزاری پێغەبەری خوا ﷺ بۆ پەروەردگاری

ماکوان: لەگەڵ ئەو هەموو نارەحەتی و ئازارە پێغەمبەری خوا ﷺ هاوەڵانی کۆکردەوە، فەرمووی: بەڕێز بوەستن، هەموو وەک ڕیزی نوێژ وەستان پاشان پێی فەرموون: سوپاسگوزاری خوای پەروەردگار دەکەم.[١٤١]

هەموو موسڵمانان لەدوایەوە ئامینیان دەکرد بۆ دوعاکانی پێغەمبەری خوا ﷺ، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی:

(اللَّهُمَّ لَكَ الْحَمْدُ كُلُّهُ، اللَّهُمَّ لاَ قَابِضَ لِمَا بَسَطْتَ، وَلاَ بَاسِطَ لِمَا قَبَضْتَ، وَلاَ هَادِيَ لِمَنْ أَضْلَلْتَ، وَلاَ مُضِلَّ لِمَنْ هَدَيْتَ، وَلاَ مُعْطِيَ لِمَا مَنَعْتَ، وَلاَ مَانِعَ لِمَا أَعْطَيْتَ، وَلاَ مُقَرِّبَ لِمَا بَاعَدْتَ، وَلاَ مُبَاعِدَ لِمَا قَرَّبْتَ، اللَّهُمَّ ابْسُطْ عَلَيْنَا مِنْ بَرَكَاتِكَ، وَرَحْمَتِكَ، وَفَضْلِكَ، وَرِزْقِكَ، اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ النَّعِيمَ الْمُقِيمَ الَّذِي لاَ يَحُولُ وَلاَ يَزُولُ، اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ النَّعِيمَ يَوْمَ الْعَيْلَةِ، وَالأَمْنَ يَوْمَ الْخَوْفِ، اللَّهُمَّ إِنِّي عَائِذٌ بِكَ مِنْ شَرِّ مَا أَعْطَيْتَنَا وَشَرِّ مَا مَنَعْتَنَا، اللَّهُمَّ حَبِّبْ إِلَيْنَا الإِيمَانَ وَزَيِّنْهُ فِي قُلُوبِنَا، وَكَرِّهْ إِلَيْنَا الْكُفْرَ وَالْفُسُوقَ وَالْعِصْيَانَ، وَاجْعَلْنَا مِنَ الرَّاشِدِينَ، اللَّهُمَّ تَوَفَّنَا مُسْلِمِينَ، وَأَحْيِنَا مُسْلِمِينَ، وَأَلْحِقْنَا بِالصَّالِحِينَ غَيْرَ خَزَايَا وَلاَ مَفْتُونِينَ، اللَّهُمَّ قَاتِلِ الْكَفَرَةَ الَّذِينَ يُكَذِّبُونَ رُسُلَكَ،

---

[١٤١] (اسْتَوُوا حَتَّى أُثْنِيَ عَلَى رَبِّي) أحمد (١٥٠٦٦).



وَيَصُدُّونَ عَنْ سَبِيلِكَ، وَاجْعَلْ عَلَيْهِمْ رِجْزَكَ وَعَذَابَكَ، اللَّهُمَّ قَاتِلِ الكَفَرَةَ الَّذِينَ أُوتُوا الْكِتَابَ، إِلَهَ الْحَقِّ)[١٤٢]

هەموو ئەو دوعا و نزایانە بۆ سوپاسکردنی خوای پەروەردگار بوو، لەهەموو کات و ساتێک، لەکاتی موسیبەت و بەڵا و ناڕەحەتی و خۆشی شادیدا، کە خۆت بەگەردن کەچ و هەژار دەکەیت زەلیلی بن دەستی خوای خۆتدا.

خوای پەروەردگار دەیتوانی بەسەربازانێک موسڵمانان بەئاسانی سەربخات، بەڵام سوننەتی ئەم کەونە تێکنادات. ئەوەی کە یاسای سەرکەوتنە دەبێ پیادە بکرێت، خۆ ئەگەر سەرپێچی یاساکانی کرا پێچەوانەکەی ڕوودەدا، دوعاکەی هەموو دژی ئەوانە بوو کە ڕێگری لەدینی خوای گەورە دەکەن بڵاو بێتەوە.

## گەڕانەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ شاری مەدینە

هەرچی داوام لە نومێر کرد قسەم بۆ بکات، بەڵام ئەوەندە گریا و ئەوەندە خەفەتبار بوو، قسەی بۆ نەدەکرا، ئێمەیش شوێن سوپاکەی پێغەمبەری خوا ﷺ کەوتین گەڕاینەوە بۆ شاری مەدینە، کاتێک پێغەمبەری خوا ﷺ گەیشتە شاری مەدینە خەڵکی بەوپەڕی خەفەتبارییەوە پێشوازییان لێکرد، بەڵام چ خەفەتبارییەک.

هەموو ماڵەکانی شاری مەدینە تەعزیە بوو، شەهید و برینداری هەبوو، ئەوانەی سەرەتا پێی گەیشتن و کەسوکاریان شەهید بووبوو سەرەخۆشی لێکردن، یەکەم کەس: (حیمنەی کچی جەحش) بوو، سەرەخۆشی براکەی لێکرد و داوای لێخۆشبوونی بۆ کرد، پاشان بە خێزانی (موسعەبی کوڕی عومەیر) گەیشت، بەهەمان شێوە سەرەخۆشی لێکرد و دوعای بۆکرد، بەڵام خێزانی موسعەب هاوار و واوەیلای لێ هەڵساو هاواری دەکرد، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بەڕاستی بۆ ئافرەت هاوسەرەکەی پشت و پەنایە.

لەدواییدا ئافرەتێکی بەنی دینار بە پێغەمبەری خوا ﷺ گەیشت، هاوسەرەکەی و براکەی و باوکی شەهید بووبوون. سەرەخۆشی هەموویانی لێکرد، پێش ئەوەی ئەو ئافرەتە بەڕێزە بە پێغەمبەری خوا ﷺ بگات، هاوەڵان هەواڵی باوک و براو هاوسەرەکەیان پێدا و سەرەخۆشیان لێکرد، بەڵام ئەو بەدوای شتێکی تردا دەگەڕا! کە

---

[١٤٢] أخرجه أحمد (٤٢٤/٣ رقم ١٥٥٣١) والبزار (١٧٥/٩ رقم ٣٧٢٤). وأخرجه أيضًا: النسائي فى الكبرى (١٥٦/٦، رقم ١٠٤٤٥)، والطبراني (٤٧/٥، رقم ٤٥٤٩)، والحاكم (٢٦/٣، رقم ٤٣٠٨) وقال: صحيح على شرط الشيخين.



واتای خۆشەویستی ئیمان و ڕۆحی بەرزی خواناسییە لەدڵ و دەروونیدا، ئەو ئافرەتە فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ چۆنە؟ وتیان: ئەی دایکی فلان سوپاس بۆ خوا ئەو باشە، وەکو ئەوەیە کە تۆ پێت خۆشە.

ئافرەتەکە فەرمووی: کوا با بڕۆم بۆلای ببینم، لەدوای ئەوەی پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ ی بینی وتی: مادەم پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ سەلامەتە هەموو بەڵاو موسیبەتێک دەڕەوێتەوە واتە: لەدوای پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ هەموو شتێک بچووک و سادەیە. ئەمەش هەست و سۆزی ئەو خەڵکە بوو بەرانبەر پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ لەگەڵ ئەو هەموو خەسارەتەی لێیان کەوتبوو.

## شیکارییەکی واقیعی بۆ جەنگی ئوحود

پێویستە هەڵوەستەیەک بکەین لەسەر ئەو ڕووداوانە، من ئەو ڕووداوانە هەرگیز بە شکست نازانم، وشەی شکست یەکانگیر نییە لەگەڵ جەنگی ئوحود دا، ئەگەر بەچاوێکی ورد تەماشای ئەو جەنگە بکەین موسڵمانان شکستی جەنگیان نەخوارد، چونکە سوپای مەککە هیچ جێیەکی موسڵمانانیان داگیر نەکرد، سوپای بنەڕەتی لەگەڵ پێغەمبەردا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ لە مەیدانی جەنگدا مانەوە، هەڵنەهاتن بۆ شاری مەدینە، بەڵکو سەنگەری دیکەیان گرت بۆ جووڵەیەکی دیکە، ئەوە قورەیش بوو ئامادەی جەنگی زیاتری تێدا نەبوو و گەڕانەوە بۆ شاری مەککە، ئەوانەی لە مەیدان دا بوون لەگەڵ پێغەمبەری خوادا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ جەنگیان کرد و هەندێکیان شەهیدی بووە نسیبیان، تەنانەت سوپای مەککە شوێن سوپای موسڵمانانی هەڵاتوو نەکەوتن، هەوڵی ئەوەشیان نەدا سەرکەونە سەر چیای ئوحود، لەکاتێکدا دەیانزانی سوپای سەرەکی لەوێدان و ژمارەشیان کەمە!

بەپێوەر بە جەنگی بەدر موسڵمانان (٧٠) دیلیان لە کافرەکان گرت، بەڵام موشریکی مەککە نەیانتوانی لە مەیدانی جەنگدا یەک دیل لە موسڵمانان بگرن، هیچ غەنیمەت و دەستکەوتێکیان لە موسڵمانان نەگرت، وەکو سوپای سەرکەوتووی ئەو سەردەمە سێ شەو و ڕۆژ لەخاکی جەنگدا نەمانەوە، کە پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ لەخاکی بەدر ئەنجامیدا، بەڵکو بەپەلە گەڕانەوە بۆ شاری مەککە، چونکە کولتووری عەرەب بوو ئەگەر لە جەنگدا سەرکەوتوو بوونایە دەمانەوە، بۆ ئەوەی سوپای دۆڕاو بزانێت هیچ ترس و بیمێکیان لێیان نییە، بەڵام ئەوە ڕووی نەدا. پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ لەهەموو جەنگێکیدا سێ ڕۆژ یان زیاتر دەمایەوە، جاری وا هەبوو لەخاکی دوژمندا بەمانگ دەمایەوە، پاشان موشریکەکان



بیریان لەوە نەکردەوە هێرش بکەنە سەر شاری مەدینە، لەکاتێکدا خاڵی بوو لە سوپای موسڵمانان.

لەبەر ئەو هۆکارانە ناو نانرێ شکستی موسڵمانان، بەڵکو خوای گەورە ناوی ناوە موسیبەت، لەجەنگەکەدا بەسەر موسڵماناندا هات، بەهۆکاری خۆشەویستی ژیانی دونیا، ئەمەش بووە هۆکاری سەرلێشێواوی سوپاکە خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿أَوَلَمَّآ أَصَٰبَتۡكُم مُّصِيبَةٞ قَدۡ أَصَبۡتُم مِّثۡلَيۡهَا قُلۡتُمۡ أَنَّىٰ هَٰذَاۖ قُلۡ هُوَ مِنۡ عِندِ أَنفُسِكُمۡۗ إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٞ ۝ وَمَآ أَصَٰبَكُمۡ يَوۡمَ ٱلۡتَقَى ٱلۡجَمۡعَانِ فَبِإِذۡنِ ٱللَّهِ وَلِيَعۡلَمَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ۝﴾ [آل عمران]

واتە: ئایا کاتێک بەڵاو ناخۆشیەکتان تووش هات (لە جەنگی ئوحود)دا بۆ دەڵێن: ئەمە چی بوو، بۆ وامان بەسەرهات؟ لەکوێوە ئەمەمان بۆ هات؟ (ئەی بۆ لەیادیان چوو لە جەنگی بەدردا) بەڕاستی ئێوە دوو ئەوەندەتان بەوان کرد، ئینجا پێیان بڵێ: ئەو بەڵایە لەلایەن خۆتانەوە تووشتان هات، (کاتێک بێفەرمانی پێغەمبەرتان کرد و تەماعی دونیا لەدڵتان جووڵا)، بەڕاستی خوا دەسەڵاتی بەسەر هەموو شتێکدا هەیە، (بەندە چاکەکانیشی کاتێک هەڵە بکەن تووشی بەڵایان دەکات)، ئەوەش کە تووشتان بوو لەڕۆژی بەیەکگەیشتنی هەردوو ئۆردووەکە (لە جەنگی ئوحود)دا ئەوە بە فەرمان و ویستی خوا بوو، تا ئیمانی باوەڕداران دەربخات.

پاشان موسیبەت لە حەفتا کەسەکەدا نییە کە شەهید بوون، بەڵکو ئەوانە لە باشترینی موسڵمانان بوون پلەی شەهیدیان بەدەست هێنا و چوونە بەهەشتی خوای گەورە، کە لەڕاستیدا ئامانج چوونە بەهەشتە، خوای پەروەردگار هەڵیبژاردن، خوای پەروەردگار لەبارەی شەهیدەکانی ئوحود دەفەرموێت:

﴿... وَيَتَّخِذَ مِنكُمۡ شُهَدَآءَۗ...۝﴾ [آل عمران]

واتە: هەندێکتان بکات بە شایەت بە پلەی شەهیدی بگەن.

ئەم موسیبەتە موسڵمانانی تووشی شڵەژان و سەرلێشێواوی کرد، جا زۆرجار ئەو موسیبەتە لەیەک چرکەساتدا ڕووبەڕووت دەبێتەوە تووشی شڵەژان و لەدەستدانی کۆنترۆڵ و پارسەنگیت دەکات.

جا موسڵمانانیش لە چرکەساتێکدا تووشی ئەو موسیبەتە بوون، پارە و غەنیمەت و سەروەت و سامان چووە دڵیانەوە، هەموو هاوکێشەکەیان پێچەوانە کردەوە، پێشتر لەپێناوی خوادا دەژین، لەو چرکە ساتەدا گۆڕا و بووە پێناوی غەنیمەت و دونیا، ئەو موسیبەتە چووە



دڵی هەندێک لە موسڵمانان فەرمانی پێغەمبەری خوایان ﷺ شکاند، لەکاتێکدا شەش جار ئاڕاستەی کردن جێگەی خۆیان بەجێنەهێڵن، پاشان ئەمیرەکەیان بانگی کردن و بیری خستنەوە کە قسەی پێغەمبەری خوا ﷺ نەشکێنن، لەکاتی سەرپێچییەکان خالید ئەو هەلەی قۆستەوە و توانی لەو جەولەیەدا تا ڕادەیەک سەرکەوتوو بێت، سوپای موسڵمانان تووشی شڵەژان بکات، پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمووێت: وەڵڵاهی سەبارەت بە ئێوە لە هەژاری ناترسم، بەڵکو دەترسم دونیا بەسەرتاندا زاڵ بێت. خوای پەروەردگار وەسفی ئەو حاڵەمان بۆ دەکات و دەفەرمووێت:

﴿وَلَقَدْ صَدَقَكُمُ ٱللَّهُ وَعْدَهُۥٓ إِذْ تَحُسُّونَهُم بِإِذْنِهِۦ ۖ حَتَّىٰٓ إِذَا فَشِلْتُمْ وَتَنَٰزَعْتُمْ فِى ٱلْأَمْرِ وَعَصَيْتُم مِّنۢ بَعْدِ مَآ أَرَىٰكُم مَّا تُحِبُّونَ ۚ مِنكُم مَّن يُرِيدُ ٱلدُّنْيَا وَمِنكُم مَّن يُرِيدُ ٱلْءَاخِرَةَ ۚ ثُمَّ صَرَفَكُمْ عَنْهُمْ لِيَبْتَلِيَكُمْ ۖ وَلَقَدْ عَفَا عَنكُمْ ۗ وَٱللَّهُ ذُو فَضْلٍ عَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿١٥٢﴾﴾ [آل عمران]

واتە: سوێند بێت خوا بەڵێنی خۆی بۆ ئێوە بەڕاستی بردە سەر، (لەسەرەتای جەنگی ئوحود)، هەر بە مۆڵەت و یارمەتی ئەو دوژمنانتان بەگیرهێنا و تێکتان شکاندن، هەتا ئەو کاتەی ساردی ڕووی تێکردن بوو بە کێشەتان لەسەر هەندێک شت یاخی بوون (لە فەرمانی پێغەمبەری خوا و سەنگەرتان چۆڵکرد)، دوای ئەوەی هەندێک شتی نیشاندان حەزتان لێ دەکرد، هەتانە دونیای دەوێت و هەتانە قیامەتی مەبەستە، لەوەودوا دەستی ئێوەی کۆتا کرد لە (دوژمنان)، تا تاقیتان بکاتەوە، سوێند بێت بەڕاستی خوا چاوپۆشی لێکردن و لێتان خۆشبوو، خوا فەزڵ و ڕێزی هەیە بۆ ئیمانداران.

بەڵام هەندێک لە موسڵمانان بوونە ئەو بەشەی لەپێناوی خوای گەورە بجەنگێن، خۆ ئەم حاڵەتە لە جەنگی بەدردا دووبارە بوویەوە بەڵام چونکە نەچووە بواری سەرپێچی خێرا گەڕانەوە بۆ مەنهەج و ڕازی بوون بە حوکمی خواو پێغەمبەرەکەی ﷺ، سوورەتی ئەنفال ئایەتی یەک باسی ئەو ڕووداوەمان بۆ دەکات و دەفەرمووێت:

﴿يَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلْأَنفَالِ ۖ قُلِ ٱلْأَنفَالُ لِلَّهِ وَٱلرَّسُولِ ۖ فَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَأَصْلِحُوا۟ ذَاتَ بَيْنِكُمْ ۖ وَأَطِيعُوا۟ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥٓ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ﴿١﴾﴾ [الأنفال]

واتە: ئەی موحەممەد پرسیارت لێدەکەن لەبارەی دەستکەوتەکان، تۆ بڵێ: هەموو دەستکەوتەکان هی خوا و پێغەمبەرن، کەواتە: لەخوا بترسن و چاکسازی لەنێوانی خۆتاندا بکەن، (مەیەڵن لەسەر تەماعی دونیا نێوانتان بشێوێت)، ئەگەر ئێوە ئیماندارن فەرمانبەرداری خوا و پێغەمبەرەکەی بن.



تەنانەت عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود دەڵێ: (تا ئەو ئایەتە دانەبەزی نەمدەزانی لەنێو دڵی هاوەڵان تێدا جێگای دنیا دەبێتەوە)

﴿... مِنكُم مَّن يُرِيدُ ٱلدُّنْيَا وَمِنكُم مَّن يُرِيدُ ٱلْآخِرَةَ...﴾ [آل عمران]

واتە: هەتانە دنیای دەوێت و هەتانە قیامەت.

باشە بۆ نومێر؟

نومێر: باشە بۆچی بەهۆکاری (٤٠) کەس سوپایەکی گەورەی حەوت سەد کەسی تووشی ئەو موسیبەتە ببێ، نەدەکرا تەنها ئەوانەی سەرپێچی دەکەن ئەوان تووشی موسیبەت بن؟

ماکوان: نا، ئەم هاوکێشەیە تەواو نییە، چونکە ئەو حەوت سەد کەسە بەیەکەوەن، یەک ئامانجیان هەیە، لێرەدا باسی فەرمان بەچاکە و ڕێگری لە خراپە دێتە ئاراوە، لەکاتێکدا کۆمەڵێک بوونەتە پایە و کەپریان بۆ هاوڕێکانیان دروست کرد کە کۆڵەگەکە ڕووخا سەقفی کەپرەکەیش بەسەر ئەوانی تردا دەڕووخێ، لەبەر ئەوەی هەموو بەیەکەوە تەواوکەری کارەکەن، دەبێت یەک ئاراستە وەربگرن، دەنا وەکو ئەوەیان لێدێت کە بەسەر موسڵمانانی ئوحود دا هات، ئەمە هەڵەی یەکەم بوو، تەنها ئەم هەڵەیان نەبوو، بەڵکو چەندین هەڵەی تر ڕوویدا.

هەڵەی دووەم: بەهۆکاری ئەوان حەفتا کەس شەهید بوو، لۆمەکردن لە شەهیدبوونەکەدا نییە، بەڵکو لۆمەکردن لە کارە هەڵەکەدایە، کە هۆکارەکەی ئەوان بوون، خۆ لە جەنگی بەدردا شەهید درا، بەڵام هۆکاری هەڵە نەبوو. بەڵکو لە بەرگریدابوون لە خاکی جیهاد و جەنگدا، شەهیدان یەکێکە لە هۆکاری سەرکەوتن، لە سوپای سەرکەوتوو پەیوەست بە فەرمانی خوا و پێغەمبەر ﷺ، بەڵام بەهۆکاری هەڵەی ناوخۆ بەڕاستی ئەوە پێویستی بە هەڵوەستە کردن هەیە لەسەری.

هەڵەی سێیەم: ئەوەبوو کە تووشی نائومێدی و بێهیوایی تەواو بوون لەناو خاکی جەنگدا تا وایان لێهات لەجێگەی خۆیاندا دانیشتن، بێئومێدی و بێهیوایی پیشەی مرۆڤی کافرە، خوای گەورە دەفەرمووێت:

﴿قَالَ وَمَن يَقْنَطُ مِن رَّحْمَةِ رَبِّهِۦٓ إِلَّا ٱلضَّآلُّونَ﴾ [الحجر]

واتە: ئایا کێ نائومێد دەبێ لە ڕەحمەتی بەخشەکانی پەروەردگاری، مەگەر کەسانێک کە گومڕا و سەرگەردانن.

هەروەها دەفەرمووێت:



﴿... وَلَا تَاْيْـَٔسُواْ مِن رَّوْحِ ٱللَّهِۖ إِنَّهُۥ لَا يَاْيْـَٔسُ مِن رَّوْحِ ٱللَّهِ إِلَّا ٱلْقَوْمُ ٱلْكَٰفِرُونَ﴾ [يوسف]

واتە: لە سۆز و میهرەبانی خوا نائومێد مەبن، چونکە بەڕاستی کەس لە سۆز و میهرەبانی خوا نائومێد نابێت، جگە لە کەسانی خوانەناس و بێباوەڕ.

دەبێت موسڵمانان یەقینیان لە هەواڵ و پڕو پاگەندەکان بێت کە دوژمن بڵاوی دەکاتەوە، نابێت بەهەموو قسەیەک بڕوخێن.

هەڵەی چوارەم: بریتی بوو لەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ بانگی کردن ئەی بەندەکانی خوا وەرنە لای من، نەک هەر وەڵامیان نەدایەوە بەڵکو ڕایان کردەوە بۆ شاری مەدینە، ئەمەش یەکێکە لە تاوانە گەورەکان.

ئەم هەڵانەی باسم کرد لەئەنجامی موسیبەتەوە هات، هەموو ئەو موسیبەتانەش لەئەنجامی تاوانێکەوە هات کە لە پێناسە و سیفاتی ئوممەتی موسڵماندا نییە، ئوممەتی ئیسلامی حەزی بە دنیا نییە، بەڵکو حەزی لە زووهدو تەقوایە، کە خۆشەویستی دونیاش هاتە دڵەوە مرۆڤ ترسنۆک دەبێ کە ترسا ئیتر لە مردن ڕادەکات و دۆڕاوە. ئەمەش فەرموودەی پێغەمبەری خوایە ﷺ بە (الوهن) باسی کردووە، پرسیاریان کرد ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ (الوهن) چییە؟

فەرمووی: خۆشویستنی دونیا و ڕق بوونەوە لە مردن، (حب الدنیا وکراهیە الموت) بە ئەندازەیەکی وا تووشی وەهن بوون بەتەنها ئافرەتێک ئاڵای موشریکەکانی بەرز کردەوە، ئەوان ڕایانکرد بەڵام پێشتر لەپێناوی بەهەشت خوای پەروەردگاردا بوو، هیچ پیاوێک نەیتوانی ئاڵای کافران هەڵبگرێت، هەموو بنەماڵەی عەبدوداریان لەناو برد بە ئاڵاکەیانەوە، کافرانیش لەدەوریدا دەجەنگن، جا ئەم پێوەرانە پێویستە مرۆڤ بیریان لێ بکاتەوە، چونکە سەرکەوتن بەدەست پەروەردگارە و خوای پەروەردگار یاسای بۆ داناوە، کە گوێڕایەڵ بوویت سەردەکەویت کە سەرپێچیت کرد بەدڵنیاییەوە شکست خواردوو دەبیت، بەڵام سەرەڕای ئەو هەموو کارەساتانە، کەچی خێری زۆری لەناواخنی خۆیدا هەڵگرتبوو، ئەگەرچی (٧٠) کەسیان لێ شەهید بوو، بەشێوەیەک ڕایانکردەوە بۆ مەدینە هەستیان بە تاوان و کەمتەرخەمی و زەلیلی کرد، بەڵام لەگەڵ ئەوەدا خێرێکی زۆر لەو هاوەڵە بەڕێزانەدا هەبوو، هەموو پەشیمانی دایگرتن و وانەیەکی نوێ فێربوون بۆ جەنگی داهاتوویان.



## حیکمەتی موسیبەتی ئوحود

ماکوان: ئەم موسیبەتە حیکمەتی زۆری لەناخی خۆیدا هەڵگرتبوو، لەو ڕۆژە ناڕەحەتەدا حیکمەت لەو موسیبەتە سەختە بریتی بوو لە:

یەکەم: پاکژکردنەوەی ڕیزی موسڵمانان، حیکمەت و هەڵبژاردن هەمووشی بەقەزا و قەدەری خوای پەروەردگارە، گەورەترین نهێنی ژیان و ئیمان و زانست...هتد، جگە لەخوا کەس لە زانستی پەنهان شارەزا نییە.

﴿وَمَآ أَصَٰبَكُمۡ يَوۡمَ ٱلۡتَقَى ٱلۡجَمۡعَانِ فَبِإِذۡنِ ٱللَّهِ وَلِيَعۡلَمَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ وَلِيَعۡلَمَ ٱلَّذِينَ نَافَقُواْۚ وَقِيلَ لَهُمۡ تَعَالَوۡاْ قَٰتِلُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ أَوِ ٱدۡفَعُواْۖ قَالُواْ لَوۡ نَعۡلَمُ قِتَالٗا لَّٱتَّبَعۡنَٰكُمۡۗ هُمۡ لِلۡكُفۡرِ يَوۡمَئِذٍ أَقۡرَبُ مِنۡهُمۡ لِلۡإِيمَٰنِۚ يَقُولُونَ بِأَفۡوَٰهِهِم مَّا لَيۡسَ فِي قُلُوبِهِمۡۚ وَٱللَّهُ أَعۡلَمُ بِمَا يَكۡتُمُونَ ١٦٧﴾ [آل عمران]

واتە: ئەوەش کە تووشتان بوو لە ڕۆژی بەیەکگەیشتنی هەردوو ئۆردووەکە (لە جەنگی ئوحود)دا ئەوە بە فەرمان و ویستی خوا بوو، تا ئیمانی باوەڕداران دەربخات. دووڕوویی و نالەباری دووڕووەکانیش دەربخات، کاتێک پێیان وترا وەرن بجەنگن لەپێناوی خوادا یان هیچ نەبێت بەرگری لە خۆتان و ماڵ و منداڵتان بکەن وتیان: ئەگەر بمانزانییایە شەڕ و جەنگ پەیدا دەبێت ئەوە شوێنتان دەکەوتین و دەجەنگاین، ئەوانە ئەو ڕۆژە لە کوفرەوە نزیکترن تا لە ئیمان، بەدەمیان شتێک دەڵێن لەدڵ و دەروونیاندا نییە، خوایش زانایە بەوەی دەیشارنەوە.

کەواتە: ڕاکردن لە شەهید بوون و بریندار بوون هەموو ئەوەی ڕوویدا لە ستراتیژی و قەدەرو ئەندازەگیری خوای گەورە دەرناچێت، هەمووی حیکمەتی تێدایە، پێش هەموو شتێک خوای پەروەرودگار مرۆڤ تووشی ئەشکەنجە و ئازار و ناڕەحەتی و زیندان و برسێتی و بێ پارەیی و ترس...هتد دەکات. بۆ ئەوەی مونافیق لەگەڵ موسڵمانی ڕاستەقینە جیابێتەوە، خۆ ئەگەر هەموو ژیانی موسڵمانان سەرکەوتن و غیرەت و سەربەرزی بوایە، هەموو چاک و خراپێک لە خەڵکی شوێنی دەکەوتن، بەڵام ئیبتیلا و ناڕەحەتی چاک لە خراپ جیا دەکاتەوە، موسڵمانی ڕاستەقینە لە خۆشی و ناخۆشیدا لەسەر خواناسی و دینداری و سوپاسگوزاری بەردەوامە، بەڵام مونافیق تەنها لەخۆشیدا لەگەڵ ئیمانداران و موسڵمانان دایە، نموونەی گەورەی موناففیقەکان عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی کوڕی سەلوول، لەگەرمەی جەنگدا خۆی و (٣٠٠) کەسی لە سوپای موسڵمانان جیاکردەوە، ئەمەش لەڕاستیدا گەورەترین خێر و باشە بوو، کە ئەو کارە ڕوویدا خوای گەورە دەفەرمووێت:



﴿لَوْ خَرَجُواْ فِيكُم مَّا زَادُوكُمْ إِلَّا خَبَالًا وَلَأَوْضَعُواْ خِلَٰلَكُمْ يَبْغُونَكُمُ ٱلْفِتْنَةَ وَفِيكُمْ سَمَّٰعُونَ لَهُمْ وَٱللَّهُ عَلِيمٌۢ بِٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٤٧﴾﴾ [التوبة]

واتە: لەکاتی ناڕەحەتی و ناهەمواری ئیمانداران، مونافیق زۆر بەدەردەکەوت بەڵام لەکاتی بەهێزی ئیمانداران خۆیان دەشاردەوە، بەواتای ئەوەی موسڵمانان خاوەنی هێزبوون، ئەوان وەلای خۆیان نیشان دەدەن کە دڵسۆزن لەگەڵ خواناساندا، بەڵام کە ناڕەحەتی و لاوازی ڕوو دەکاتە موسڵمانان ئەوا بەتەواوەتی خۆیان ئاشکرا دەکەن لە دژی موسڵمانان و گاڵتەیان پێ دەکەن، هەروەکو چۆن لەدونیای ئەمڕۆدا مولحید و عەلمانی زۆرە لەبەر ئەوەی ئوممەتی موسڵمان زۆر لاوازن، کە ئیمانداران بوونە خاوەنی هێز ئەوان دەگەڕێنەوە بۆ کاری دووڕوویی نیفاقیان و خۆیان وا دەردەخەن کە هاوکار و دڵسۆزی موسڵمانانن، پێغەمبەری خوا ﷺ هەموو مونافیقەکانی دەناسی، بەڵام جەنابیان بەهۆکاری وەحی دەیزانی، بۆ ئەوەی لەدوای خۆیەوە تا ڕۆژی قیامەت دووڕوو دەبڵ مۆڕاڵەکان بناسین، پێویستە بنەمایەکمان لەبەردەستدا بێ چونکە دوای پێغەمبەری خوا ﷺ وەحی نامێنێت، ئەویش ئەو بنەمای موسیبەت و ناڕەحەتی بەسەر موسڵماناندا هات، ڕاستەوخۆ ئەوان خۆیان دەردەخەن و یەکسەر دەناسرێنەوە، بەئاشکرا و بێ پەردە و دووڕوویی قسەی ناشیرین و دەم خوار دەکەنەوە لە موسڵمانان، لەنێو موسڵمانان و دەوڵەتی ئیسلامیدا ئەوان بەو شێوەیە دەناسرێنەوە، تەور و داسی دەستی دوژمنان لەدواوە بۆ پشتی ئیمانداران بەکار دەهێنرێت.

دووەم: حیکمەتی ئەوەی تێدا بەدی هات کە موسڵمانان دەبێت بزانن تاوانکردن و لاساری کردن بە مەنهەج و سەرپێچی کردن تووشی چ موسیبەت و سزا و بەڵایەکت دەکات، خوای پەروەردگار دەفەرمووێت:

﴿فَلَا وَرَبِّكَ لَا يُؤْمِنُونَ حَتَّىٰ يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيْنَهُمْ ثُمَّ لَا يَجِدُواْ فِيٓ أَنفُسِهِمْ حَرَجًا مِّمَّا قَضَيْتَ وَيُسَلِّمُواْ تَسْلِيمًا ﴿٦٥﴾﴾ [النساء]

واتە: نەخێر سوێند بە پەروەردگارت ئەوانەی (لافی بڕوا) لێدەدەن بڕوا ناهێنن، هەتا لەهەموو کێشەیەکدا کە ڕوودەدات لەنێوانیاندا تۆ نەکەن بە دادوەر و گوێڕایەڵی تۆ نەکەن، دوای ئەوەش نابێت لە دڵ و دەروونیاندا هیچ ناڕەزاییەک دروست بێت، بەرامبەر ئەوەی داوەریت لەسەر کردووە و دەبێت بەتەواوەتی تەسلیم و ڕازی بن.

ڕاستە ئەم ئایەتە بەهۆکاری باسێکی تر بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ هاتووە، بەڵام واتاکەی گشتییە و هەموو بوارەکانی سەرپێچی و تاوانکاری دەگرێتەوە، گومانی تێدا نییە دەبێ پێغەمبەری خوا ﷺ حوکم و فەرمان بکات لەهەموو ڕووداوەکانی



ژیانماندا، لەبەر ئەوەی فەرمانی پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ لەپێناوی بەرژەوەندی و دەست کەوتە بۆ ئیمانداران بەگشتی، خۆ ئەگەر گوێ بۆ فەرمان و فەرمایشتەکانی نەگیرێت کارەساتیان بەسەردێت بەو شێوەیە بەسەر موسڵمانانی ئوحود دا هات.

چونکە کێشەی ئەو کۆمەڵە موسڵمانەی کە سەرپێچیان لە فەرمانی پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ کرد بەهیچ شێوەیەک خاوەنی هیچ بژاردەیەکی تر نەبوون، بەڵام فەرمانەکەیان وەلانا و غەنیمەتیان هەڵبژارد.

خوای پەروەردگاریش دەفەرموێت:

﴿وَمَا كَانَ لِمُؤْمِنٍ وَلَا مُؤْمِنَةٍ إِذَا قَضَى ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥٓ أَمْرًا أَن يَكُونَ لَهُمُ ٱلْخِيَرَةُ مِنْ أَمْرِهِمْ ۗ وَمَن يَعْصِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدْ ضَلَّ ضَلَٰلًا مُّبِينًا﴾ [الأحزاب]

واتە: بۆ هیچ پیاوێکی ئیماندار یان ژنێکی ئیماندار نییە کاتێک خوا و پێغەمبەرەکەی فەرمانێک دەربکەن ئەوان سەرپشک بن (لە ئەنجامدانی ئەو کارە)، ئەوەی سەرپێچی بکات لە فەرمانی خوا و پێغەمبەرەکەی ئەوە ئیتر بە ئاشکرا گومڕا و سەرلێشێواوە.

خۆ ئەگەر لە قسەی پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ دەرچووین ئەوە بەدڵنیاییەوە تووشی

﴿ضَلَّ ضَلَٰلًا مُّبِينًا﴾ دەبین، خوای پەروەردگار لە قورئاندا چەندجار فەرمانی پێکردووین واز لە ڕیبا و کاری داوێن پیسی و دەست پیسی و دزی...هتد، بەڵام خەڵکی موسڵمان ئەنجامی دەدەن. ئەمە بەدڵنیاییەوە سەرپێچییە و تووشی ئەو هەموو نارەحەتییە دەبنەوە، لە ئەزموون و لەبەرچاوماندا ڕۆژانە چ بەڵا و موسیبەت و نارەحەتی دێ بەسەر موسڵماناندا بەدەستی خۆیان.

سێیەم: حیکمەتی سەرنج ڕاکێشانی موسڵمانان بۆ زوهد و دڵ وابەستەبوون بە تەقواو خواناسی، بە بچووک سەیرکردنی ژیانی دونیا، سەروەت و سامان نەچوونە دڵ، بەڵکو تەنها لەدەستدا بێ بۆ سەرف کردنی لەپێناوی خوا.

فەرموودەی خوا و پێغەمبەری خوامان صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ زۆرە لەسەر زەم کردنی دونیا، دوور کەوتنەوە لە ڕوکن و لە هەوڵدان بۆی کردنە ئامانج، داواکاری هەندێک لە موسڵمانان لە دونیا کاریگەری و موسیبەتی لەسەر گشت سوپاکە دروست کرد.

پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ دەفەرموێت: دونیا شیرین و سەوزە، (بەگشتی بەواتای خۆشی و شادییەکان) خوای پەروەردگار ئێوەی تێدا جێنشین کردووە، تەماشاتان دەکات کە



چی دەکەن و چ کارێک ئەنجام دەدەن، جا لە خۆشی و جوانی خۆتان بپارێزێن و لە ئافرەتانیش (کە گەورەترین شەهوەتی جوانی و خۆشین) جا پارێزگاربن لە دونیا و لە ژنان، چونکە یەکەم فیتنەی نەوەکانی ئیسرائیل لە ئافرەت بوو (إن الدنيا حلوة خضرة وإن الله مستخلفكم فيها فناظر كيف تعملون فاتقوا الدنيا واتقوا النساء فأول فتنة بنى إسرائيل كانت فى النساء)[١٤٣]

بەهەرحاڵ هاوەڵانمان بینی کە وتیان: غەنیمەت، غەنیمەت، چی بەسەرهات.

چوارەم: هەڵەی نوخبەی سەرەکی هەموو ئوممەت دەگرێتەوە، ئەوەی سەرپێچی کرد (٤٠) جەنگاوەری سەر شاخی ڕومات بوو، بەڵام کاریگەری تەواوی لەسەر هەموو سوپاکە دانا، لێرەدا گرنگی ئەمر بەچاکە و ڕێگری لە خراپە دێتە ئاراوە لەناو موسڵمانانداا، هەرکات ئوممەتی ئیسلامی ویستی سەر بەرز بکاتەوە، دەبێ فەرمان بەچاکە و ڕێگری لە خراپە لەنێو کۆمەڵگەدا ڕەنگ بداتەوە.

جا لە کوێدا بینیمان سەرپێچی یاخود خوار و خێچی و خراپەکاری هەیە، دەبێ خەڵکی حەکیم و لێزان خێرا پشکنینی بۆ بکەن، بەخێرایی چارەسەری هەڵەکان بکەن، چونکە هەر هەڵەیەکی کۆمەڵ کاریگەری لەسەر تاک دروست دەکات هەروەها بە پێچەوانەوە، جا پێویستە مرۆڤی خواناس هەمیشە لە فەرمان بە چاکە و ڕێگری لە خراپەدا بێت لەگەڵ نەفسی خۆی و ماڵ و منداڵی و دراوسێ و خزم و کەسوکاری...هتد.

پێغەمبەری خوا ﷺ لە نموونەیەکی زۆر نایابدا ئەو ڕەوشەمان بۆ شیکاری دەکات، دەفەرمووێت: نموونەی ئەوانەی فەرمان بە چاکە دەکەن وەک کەسانێک وان لەناو کەشتییەکدا ئەو کەشتییە دوو نهۆمە، هەموو جارێ ئەوانەی خوارەوە بۆ هێنانی ئاو دەبێت بڕۆنە نهۆمی دووەم و ئاو لە دەریاکە هەڵگۆزن. پاشان ئەوانەی خوارەوە بیریان کردەوە بۆ ئەوەی خەڵکی سەرەوە ئیزعاج نەکەن بڕیارياندا کونێک بکەنە کەشتییەکە بۆ ئەوەی ئاو بهێنن، ئیتر ئەوانەی سەرەوە خۆشیان نارەحەت ناکەن، پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمووێت: خۆ ئەگەر ئەوانەی سەرەوە وازیان لێ بهێنن ئەوا هەمووی بەیەکەوە نقومی دەریاکە دەبن ئەگەر وتیان نابێت و ڕێگریان لێکردن ئەوا هەموو ڕزگاریان دەبێت.[١٤٤]

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

[١٤٣] أخرجه مسلم (٢٠٩٨/٤، رقم ٢٧٤٨). وأخرجه أيضًا: أحمد (٢٢/٣، رقم ١١١٨٥)، وعبد بن حميد (ص ٢٧٤، رقم ٨٦٧)، والبيهقي (٩١/٧، رقم ١٣٣٠١).

[١٤٤] ـ (مَثَلُ الْقَائِمِ عَلَى حُدُودِ اللَّهِ وَالْوَاقِعِ فِيهَا كَمَثَلِ قَوْمٍ اسْتَهَمُوا عَلَى سَفِينَةٍ فَأَصَابَ بَعْضُهُمْ أَعْلَاهَا وَبَعْضُهُمْ أَسْفَلَهَا فَكَانَ الَّذِينَ فِي أَسْفَلِهَا إِذَا اسْتَقَوْا مِنْ الْمَاءِ مَرُّوا عَلَى مَنْ فَوْقَهُمْ فَقَالُوا لَوْ أَنَّا خَرَقْنَا فِي نَصِيبِنَا خَرْقًا وَلَمْ نُؤْذِ مَنْ فَوْقَنَا فَإِنْ يَتْرُكُوهُمْ وَمَا أَرَادُوا هَلَكُوا جَمِيعًا وَإِنْ أَخَذُوا عَلَى أَيْدِيهِمْ نَجَوْا وَنَجَوْا جَمِيعًا) البخاري (٢٣٦١).



کەواتە: لەڕاستیدا دیدی ئەوان بۆ باشە و چاکە بوو، بەڵام لە ڕاستیدا ڕێگەیەکی زۆر هەڵە و خوار و خێچ هەڵدەبژێرن بۆ گەیشتن بە ڕێگەی ڕاست، ئەگەر فەرمان بەچاکە و ڕێگری لە خراپە هەبوو ئەوا هەموو ڕزگاریان دەبێت، بەڵام ئەگەر سەرپێچی و گوێنەدان بەگوێڕایەڵی نەما و فەرمانکردن بە چاکە و ڕێگری لە خراپە نەبوو ئەوا تووشی ئەو شکست و موسیبەتە دەبن، کەواتە: پێویستە دەستی ئەوە بگیرێت کە ڕێگەی هەڵە بەکاردەهێنێت بۆ ئەوەی کەشتییەکە بگاتە جێگەی ئامانجی دیاریکراو.

پێنجەم: حیکمەتی مانەوەی ئەو سەرکردانەی کوفر لەو جەنگەدا هیچیان نەکوژران، لەناو نەچوون، چونکە لەداهاتوودا هەموو ئیمان دەهێنن، ئیسلامەتی و خواناسیشیان لێ دەردەچێت، لەو قیادانەی کە کافرن لە ئوحود دا جەنگ لەدژی موسڵمانان دەکەن (ئەبو سوفیانی کوڕی حەرب، خالیدی کوڕی وەلید، عیکریمەی کوڕی ئەبو جەهل، سەفوانی کوڕی ئومەییە) کە هەموویان خەڵکی بەهێز و قیادەی بەهێزن، لەدواییدا بە ئیسلام بوونیان هێزیان دەخەنە سەر هێزی موسڵمانان، یاخود هیندی کچی عوتبە، ئافرەتانی تر کە نموونە دەبن بۆ گەیاندنی ئەحکامی ئیسلامی بۆ ئوممەتەکە و پیاوانیش گەورەترین سەرکردەی سەربازییان لێ دەردەچێ، لە جەنگی حونەین و یەرمووک و فارس و ڕۆمدا.

لەکاتی خۆیدا باسی قارەمانی ئەبو سوفیان و خێزانی هیندی کچی عوتبە لەجەنگی یەرمووکدا قارەمانانەیان تۆمار دەکەن بێ وێنەیە. مانەوە و پاراستی خوێنیان حیکمەتێکی زۆر گەورەیە خوای گەورە ئارەزوو هەروەها ویستی لەسەرە.

شەشەم: ناساندنی حیکمەتی شەهیدبوونی شەهیدان و پلەو پایە و ئامانجیان لەپێناوی خوادا، خوای گەورە هەندێک لە ئیمانداران هەڵدەبژێرێت بۆ ئەوەی شەهیدیی بکات بە نسیبیان، خوای گەورە دەفەرمووێت:

﴿۞ إِنَّ ٱللَّهَ ٱشۡتَرَىٰ مِنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ أَنفُسَهُمۡ وَأَمۡوَٰلَهُم بِأَنَّ لَهُمُ ٱلۡجَنَّةَۚ يُقَٰتِلُونَ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ فَيَقۡتُلُونَ وَيُقۡتَلُونَۖ وَعۡدًا عَلَيۡهِ حَقّٗا فِي ٱلتَّوۡرَىٰةِ وَٱلۡإِنجِيلِ وَٱلۡقُرۡءَانِۚ وَمَنۡ أَوۡفَىٰ بِعَهۡدِهِۦ مِنَ ٱللَّهِۚ فَٱسۡتَبۡشِرُواْ بِبَيۡعِكُمُ ٱلَّذِي بَايَعۡتُم بِهِۦۚ وَذَٰلِكَ هُوَ ٱلۡفَوۡزُ ٱلۡعَظِيمُ ﴿١١١﴾﴾ [التوبة]

واتە: بەڕاستی خوا ماڵ و گیانی لە ئیمانداران کڕیوە بەوەی کە بەهەشت بۆ ئەوانە و بەشیانە، ئەوانە دەجەنگن لەپێناو ئایینی خوادا دوژمنانی ئایینی خوا دەکوژن یان دەکوژرێن و (شەهید دەکرێن) ئەو پاداشت و بەڵێنە بەڕاستی لەسەر خوایە و باسکراوە لە تەورات و ئینجیل و قورئان دا، جا کێ هەیە بەقەدەر خوا بەوەفا و بە ئەمەک بێت، بۆ جێبەجێکردنی بەڵێنەکانی؟ کەواتە: زۆر دڵخۆش و کامەران بن بەو مامەڵەیەی کە ئەنجامتان داوە، بەو کڕین



و فرۆشتنەی لەسەری ڕێکەوتوون بێگومان هەر ئەوەشە سەرفرازی و سەرکەوتنی نەبڕاوەو بێ سنوور.

جیهاد لە پێناوی خوادا دەشێ بە پارە و بەخشینی گیان بێت، بەڵام جیهادی بەخشینی سەروەت و سامان ناگاتە ئاستی شەهیدانی بەخشینی ڕۆح لەپێناوی خوای پەروەردگاردا، شەهید بوون لەپێناوی ئیسلام و دینەکەیدا شتێکە هەروا ئاسان نییە، چونکە گیان و ماڵی بەخت دەکات لەپێناوی خوادا، خوای موتەعال دەفەرمووێت:

﴿لَا يَسْتَـْٔذِنُكَ ٱلَّذِينَ يُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْـَٔاخِرِ أَن يُجَٰهِدُوا۟ بِأَمْوَٰلِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ ۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌۢ بِٱلْمُتَّقِينَ ﴿٤٤﴾﴾ [التوبة]

بەڵام ئەوانەی باوەڕیان بەخوا و بەڕۆژی دوایی هەیە مۆڵەتت لێ ناخوازن، چونکە ئامادەن ماڵ و سامان و گیانیان بەخت بکەن لەپێناوی خوادا، خواش زانایە بە خاوەن تەقوا و پارێزکاران.

گەیشتن بە پلەی شەهیدی هەروا ئاسان نییە، ئەو کەسەی حەز دەکات لەپێناوی خوادا بکوژرێت لەلای خوای موتەعال زۆر گەورە و بەڕێزە، بەم بە قۆناغ بەو پلە و گەورەییە دەگات.

پێغەمبەری خوا ﷺ لەوەڵامی موعازی کوڕی جەبەل دا دەفەرمووێت: موعاز دەڵێ: لەگەڵ پێغەمبەردا هاوسەفەر بووم لێی نزیک بووم، بەیانییەکیان پرسیارم لێکرد بەدەم ڕێگا ڕۆیشتنەوە پرسیم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئاگادارم بکەوە لەکارێک بەهۆی ئەو کارەوە بڕۆمە بەهەشت و لەئاگر دووربکەومەوە.

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەی موعاز پرسیاری شتێکی زۆر گەورەت کردووە، ئەگەر ئەو ڕێگەیە هەڵبژێریت دەتگەیەنێتە خوای پەروەردگار، ئەویش خوای پەروەردگارت بە تەنهایی بپەرستە و هاوبەشی بۆ بڕیار مەدە، نوێژەکانت ڕابگرە و بیانکە (مەبەست لە فەرزەکانە)، زەکات بدە و لە مانگی ڕەمەزان دا بەڕۆژووبە، حەجی ماڵی خوای پەروەردگار بکە، پاشان فەرمووی: ئەی موعاز دەتەوێ پێت بڵێم کام دەرگا دەرگای خێر و چاکەیە؟ ڕۆژوو پارێزەر و پەرژینە بۆ تاوان (مەبەست سوننەتە)، بەخشین و هاوکاری تاوان و گوناح دەکوژێنێتەوە، شەونوێژ لە نیوە شەودا، پاشان ئەم چەند ئایەتەی لە سوورەتی السجدةی خوێندەوە:



﴿تَتَجَافَىٰ جُنُوبُهُمْ عَنِ ٱلْمَضَاجِعِ يَدْعُونَ رَبَّهُمْ خَوْفًا وَطَمَعًا وَمِمَّا رَزَقْنَٰهُمْ يُنفِقُونَ ﴿١٦﴾ فَلَا تَعْلَمُ نَفْسٌ مَّآ أُخْفِىَ لَهُم مِّن قُرَّةِ أَعْيُنٍ جَزَآءًۢ بِمَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿١٧﴾ أَفَمَن كَانَ مُؤْمِنًا كَمَن كَانَ فَاسِقًا ۚ لَّا يَسْتَوُۥنَ ﴿١٨﴾ أَمَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ فَلَهُمْ جَنَّٰتُ ٱلْمَأْوَىٰ نُزُلًۢا بِمَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿١٩﴾﴾ [السجدة]

واتە: (ئەو ئیمانداره بەختەوەرانە) نێوانیان خۆش نییە لەگەڵ ڕاکێشان لە جێگە و نەرم و گەرمدا، (واتە: بەنوێژ و خواپەرستن بەشێکی شەو دەبەنە سەر)، هەمیشە نزا و پاڕانەوەیان ڕوو بە پەروەردگاریانە، لە خەشم و قین و دۆزەخ دەترسن، ئاواتی ڕەزامەندی بەهەشتیان هەیە، لەو ڕزق و ڕۆزیی و توانایيەی پێمان بەخشیون دەبەخشن، جا هیچ کەس لەو بەختەوەرانە نازانێت چی بۆ هەڵگیراوە و شاراوەتەوە لەناز و نیعمەتی جۆراو جۆر لای پەروەردگاری، چاوان پێی گەش دەبنەوە و بەدیتنی شاد دەبن، لە پاداشت و کارو کردەوەی پاک و چاکیاندا کە ئەنجامیان داوە، ئایا ئەو کەسەی ئیماندار بووبێت وەک ئەو کەسەیە تاوانبار بووبێت؟ وەک یەک نین، بەڵکو ئەوانەی ئیمانیان هێناوە و کردەوە چاکەکانیان ئەنجامداوە شوێنیان باخچەکانی بەهەشتە، هەر لەوێ دادەبەزن لە پاداشتی کارو کردەوەیەک کە دەیانکرد.

پاشان فەرمووی: ئەی دەتەوێ بزانی لەسەرووی هەموویانەوە، واتە: کۆڵەکەکەی، لوتکەکەی؟ موعاز وتی: بەڵێ، ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: سەرتۆپ و کۆڵەکەی چاکە و خێرکاری نوێژە، پاشان لوتکەی هەموویان جیهادە لەپێناوی خوا پاشان فەرمووی: ئەی کارێکت پێ بڵێم هەموو ئەوانەی تێدا کۆبووبێتەوە، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بەدڵنیاییەوە.

دەستی برد بۆ زمانی موبارەکی و فەرمووی: واز لەوە بهێنە.

وتم: بۆ لەسەر ئەوە لێپێچینەوەمان لەگەڵ دەکرێت کە قسەی پێ دەکەین؟

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەی دایکت ڕۆڕۆت بۆ بکات ئەی نازانیت خەڵکی بەهۆی قسەی زمانیان لە قیامەتدا لەسەر ناوچاوانیان ڕادەکێشرێن بۆ دۆزەخ.[١٤٥]

---

[١٤٥]ـ (عَنْ أَبِي وَائِلٍ عَنْ مُعَاذِ بْنِ جَبَلٍ قَالَ كُنْتُ مَعَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي سَفَرٍ فَأَصْبَحْتُ يَوْمًا قَرِيبًا مِنْهُ وَنَحْنُ نَسِيرُ فَقُلْتُ يَا رَسُولَ اللَّهِ أَخْبِرْنِي بِعَمَلٍ يُدْخِلُنِي الْجَنَّةَ وَيُبَاعِدُنِي عَنْ النَّارِ قَالَ لَقَدْ سَأَلْتَنِي عَنْ عَظِيمٍ وَإِنَّهُ لَيَسِيرٌ عَلَى مَنْ يَسَّرَهُ اللَّهُ عَلَيْهِ تَعْبُدُ اللَّهَ وَلَا تُشْرِكْ بِهِ شَيْئًا وَتُقِيمُ الصَّلَاةَ وَتُؤْتِي الزَّكَاةَ وَتَصُومُ رَمَضَانَ وَتَحُجُّ الْبَيْتَ ثُمَّ قَالَ أَلَا أَدُلُّكَ عَلَى أَبْوَابِ الْخَيْرِ الصَّوْمُ جُنَّةٌ وَالصَّدَقَةُ تُطْفِئُ الْخَطِيئَةَ كَمَا يُطْفِئُ الْمَاءُ النَّارَ وَصَلَاةُ الرَّجُلِ مِنْ جَوْفِ اللَّيْلِ قَالَ ثُمَّ تَلَا تَتَجَافَى جُنُوبُهُمْ عَنْ الْمَضَاجِعِ حَتَّى بَلَغَ يَعْمَلُونَ ثُمَّ قَالَ أَلَا



کەواتە: موسڵمان تا دەگاتە ڕێی شەهادەت دەبێ ڕێیەکی دوور ببڕێت ئەگەر تەمەشای گفتوگۆی پێغەمبەری خوا ﷺ و موعاز بکەین لەسەرەتاوە بە فەرزەکان دەست پێدەکات چونکە شەهیدی دەست ناکەوێت ئەگەر پلەی فەرزەکان نەبڕدرێت، ئەویش (نوێژ و ڕۆژوو و زەکات و حەجە) دوای ئەوە بۆ هەندێک لە سوننەتەکان ڕۆیشت، کە ئاماژەی بۆ چەسپاندنی ئیمان لەدڵ و دەروونداکە مرۆڤی موسڵمان ڕۆژووی سوننەت دەگرێت و دەستگیرۆیی خەڵکی هەژار دەکات و شەونوێژی هەیە، پاشان ئەو ڕاهێنانەی کرد ئامادەیە بۆ جیهاد لەپێناوی خوادا.

داواکردنی شەهیدیش بە ڕاستگۆیی دەبێت، بە ئیخلاس لەپێناوی خوادا بەڵام جیهاد و کۆشش و خەبات لەپێناوی نیشتمان و نەتەوە...هتد، ناگاتە پلەی شەهیدی.

پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمووێت: ئارەزوومە لەپێناوی خوای پەروەردگاردا بکوژرێم پاشان زیندوو بکرێمەوە، پاشان بکوژرێمەوە و دیسان زیندوو بکرێمەوە بۆ جارێکی تر بکوژرێم هەم دیسان زیندوو ببمەوە و بکوژرێم (لَوَدِدْتُ أَنِّي أُقْتَلُ فِي سَبِيلِ اللَّهِ ثُمَّ أُحْيَا ثُمَّ أُقْتَلُ ثُمَّ أُحْيَا ثُمَّ أُقْتَلُ ثُمَّ أُحْيَا ثُمَّ أُقْتَلُ)[١٤٦] ئەم داواکردنی شەهادەتی پێغەمبەری خوایە ﷺ بەچەند جار ئەوەندە ئاواتی بۆ دەخوازێ، هەر جەنابیان بۆمنی ڕوون دەکەنەوە، لە فەرموودەیەکی دیکەدا دەفەرمووێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەو کەسەی دەچێتە بەهەشت هەرگیز حەز ناکات بێتەوە بۆ ژیانی دونیا ئەگەر خاوەنی هەموو سەر زەوی بێت، تەنها شەهید ئارەزوومەندە بگەڕێتەوە بۆ دونیا دە جاری تر لەپێناوی خوای گەورەدا شەهید بێت، چونکە دەزانێت خوای پەروەردگار چ کەرامەتێکی پێ دەبەخشێت.

(مَا أَحَدٌ يَدْخُلُ الْجَنَّةَ يُحِبُّ أَنْ يَرْجِعَ إِلَى الدُّنْيَا وَلَهُ مَا عَلَى الْأَرْضِ مِنْ شَيْءٍ إِلَّا الشَّهِيدُ يَتَمَنَّى أَنْ يَرْجِعَ إِلَى الدُّنْيَا فَيُقْتَلَ عَشْرَ مَرَّاتٍ لِمَا يَرَى مِنْ الْكَرَامَةِ)[١٤٧] داخۆ دەبێت چی بێت وای لێ دەکات جاری تر حەز بکات بۆ گەڕانەوە بۆ مردن لەپێناوی خواو لەم دونیایەدا؟

پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمووێت: لەبەر ئەوەی شەهید خاوەنی چەند تایبەتمەندی و خەسڵەتێکە کە پێکهاتووە لە (٧) خەسڵەت:

---

أُخْبِرُكَ بِرَأْسِ الْأَمْرِ كُلِّهِ وَعَمُودِهِ وَذِرْوَةِ سَنَامِهِ قُلْتُ بَلَى يَا رَسُولَ اللَّهِ قَالَ رَأْسُ الْأَمْرِ الْإِسْلَامُ وَعَمُودُهُ الصَّلَاةُ وَذِرْوَةُ سَنَامِهِ الْجِهَادُ ثُمَّ قَالَ أَلَا أُخْبِرُكَ بِمَلَاكِ ذَلِكَ كُلِّهِ قُلْتُ بَلَى يَا نَبِيَّ اللَّهِ فَأَخَذَ بِلِسَانِهِ قَالَ كُفَّ عَلَيْكَ هَذَا فَقُلْتُ يَا نَبِيَّ اللَّهِ وَإِنَّا لَمُؤَاخَذُونَ بِمَا نَتَكَلَّمُ بِهِ فَقَالَ ثَكِلَتْكَ أُمُّكَ يَا مُعَاذُ وَهَلْ يَكُبُّ النَّاسَ فِي النَّارِ عَلَى وُجُوهِهِمْ أَوْ عَلَى مَنَاخِرِهِمْ إِلَّا حَصَائِدُ أَلْسِنَتِهِمْ) الترمذي (٢٦١٦).

[١٤٦] صحيح البخاري ٦٧٩٩

[١٤٧] البخاري: ٢٦٦٢



١- خوای گەورە لەهەموو گوناحەکانی خۆش دەبێت، لەگەڵ دەرچوونی یەکەم دڵۆپە خوێن لە لاشەیدا.

٢- ڕاستەوخۆ جێگە و شوێنی خۆی لە بەهەشتدا دەبینێ.

٣- پارێزراوە لە عەزابی قەبر و گۆڕەفشار.

٤- خوای پەروەردگار لە ترسی ڕۆژی قیامەت دەیپارێزێ.

٥- تاجێک یاخود مەدالیای ئیمان و شەهیدی پێ دەبەخشرێت.

٦- حوورو عەینی لێ مارە دەکرێ.

٧- شەفاعەت بۆ (٧٠) کەس لە کەسە نزیکەکانی دەکات.

(للشهيد عند الله سبع خصال، يغفر له في أول دفعة من دمه ويرى مقعده من الجنة، ويحلى حلة الإيمان ويزوج اثنتين وسبعين زوجة من الحور العين، ويجار من عذاب القبر، ويأمن من الفزع الأكبر، ويوضع على رأسه تاج الوقار الياقوتة منه خير من الدنيا وما فيها، ويشفع في سبعين إنسانا من أهل بيته)[١٤٨]

ئەو هەموو ئیمتیازە (خەڵاتە) کە دەدرێتە شەهید ئەوەی کە بەڕاستی خاوەنی ئیمان بێت و گەیشتبێت بە پلەی خواناسی حەز بە شەهید بوون دەکات، ئاواتی پێ دەخوازێت کاتێک هاوەڵان لەگەڵ پێغەمبەردا بوون بەو شێوەیە باسی شەهیدی و شەهادەتیان بۆ دەکرا، ئارەزوومەند بوون لەپێناوی خوای پەروەردگاردا بکوژرێن، لەناو خاکی ئوحود دا چەندین شەهید درا، بەڵام ئەوان گەیشتنە ئامانج، لەدونیادا ئامانج و ئەوەی کە تەمکینە هەموو کەس پێی ناگات، چونکە هەندێک لەسەرەتا و ناوەندی ڕێگە شەهید دەکرێن، ئەوان تەنیا کارکردنیان لەسەرە بۆیە ئامانج تەنها کارکردنە، گەیشتنە بە پلەی بەرز لە ڕۆژی قیامەتدا، چونکە دواڕۆژی ڕاستی و موستەقبەلی خەڵکی قیامەتە.

---

[١٤٨] ـ أخرجه أحمد (١٣١/٤، رقم ١٧٢٢١)، والترمذي (١٨٧/٤، رقم ١٦٦٣)، وقال: حسن صحيح غريب. وابن ماجة (٩٣٥/٢، رقم ٢٧٩٩)، والبيهقي في شعب الإيمان (٢٥/٤، رقم ٤٢٥٤).



## چەند نموونەیەک لە شەهیدانی ئوحود

ماکیان: شەهیدانی ئوحود پیاوانێک بوون پێغەمبەری خوا ﷺ پەروەردەی کردبوون، دونیایان بۆ قیامەت فرۆشتبوو، بە گرنگترین نرخ ئەویش ڕۆحی خۆیان بوو، بەهەشتیان کڕی بەخوێنیان خوای پەروەردگار هەڵیبژاردن، پێشەنگن بۆ ئەوانەی دوای خۆیان، بۆ ئەوانە کە بەڕاستگۆیی خوا و پێغەمبەر و ئیسلامیان بەگشتی خۆش دەوێت، خوای پەروەردگار دەفەرموێت:

﴿وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَٱلرَّسُولَ فَأُوْلَٰٓئِكَ مَعَ ٱلَّذِينَ أَنۡعَمَ ٱللَّهُ عَلَيۡهِم مِّنَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ وَٱلصِّدِّيقِينَ وَٱلشُّهَدَآءِ وَٱلصَّٰلِحِينَۚ وَحَسُنَ أُوْلَٰٓئِكَ رَفِيقٗا﴾ [النساء]

واتە: ئەوەی فەرمانبەرداری خوا و پێغەمبەر ﷺ دەکات جا ئەوانە لەگەڵ ئەو کەسانەدا دەبن (لەبەهەشتی بەریندا) کە خوا ناز و نیعمەتی ڕژاندووە بەسەریاندا لە پێغەمبەران و ڕاستگۆیان و شەهیدان و پیاوچاکان ئای ئەوانە هاوەڵ و هاوڕێ و هاودەمێکی چاک و بێوێنەن.

جا کەباسی شەهیدانی ئوحود دەکەم گومانی تێدا نییە دەبێت لە سەید و گەورەی شەهیدان دەست پێ بکەم ئەویش حەمزەی کوڕی عەبدولموتەڵیبە -خوا لێی ڕازی بێ-، پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: گەورەی هەموو شەهیدان حەمزەیە (سید الشهداء حمزة).

یەکەم: حەمزەی کوڕی عەبدولموتەڵیب -ڕەزامەندی خوای لەسەر بێت-

لەساڵی شەشەمی پێغەمبەرایەتی موسڵمان بووە، پێش ئیسلام ژیانی هەموو لە ڕابواردن و ڕاو و بەندایەتی بۆ بت بەکاردەهێنا، ژیانی قیمەتێکی ئەوتۆی نەبووە، بەڵام کە موسڵمان بوو لەوەی کە گەورەیەک بوو لە گەورەکانی عەشیرەتی خۆی لەناو قوڕەیشدا، بەڵام بە پێوانەکردن بەوەی بووە گەورەی هەموو شەهیدانی سەر زەوی پێشتری بۆ بچووک بووە، ڕۆژی قیامەت سەرکردەی هەموو شەهیدانە، ژیانی دوای موسڵمان بوونی بریتی بوو لە سەروەری و جوانی و چ لە بەرپەچدانەوەی سەرکردەکانی قوڕەیش، هەروەها لە دۆڵی بەنی هاشم یاخود لە جەنگی بەدردا، پاشان لە جەنگی ئوحود دا.

تەنانەت لە جەنگی بەدردا موشریکەکان وتیان: کێیە ئەو سەربازە کە ڕاست و چەپی بە چەرمی ئاژەڵ تەنیوە و پەڕێکی نەعامەی لەسەر سینگە؟

وتیان: ئەوە حەمزەیە، ئەوانیش وتیان ئەوەی لە جەنگی بەدردا پێمان کرا، ئەو پێی کردین.



زۆری بەخشی لەپێناوی خوا زۆر ماندووبوو گیان بەخشەر بوو، بەڕاستی تاکیشە پلەی شەهیدی بۆ ئەو پلەیە هەوڵی زۆریدا بەڕاستگۆیانە تا خوای پەروەردگار کردیە نسیبی، ڕاستگۆیە لەگەڵ خوای پەروەردگار ڕاستی دەبینێتەوە.

دووەم: موصعەبی کوڕی عومەیر-ڕەزامەندی خوای لەسەر بێت-.

ئەم هاوەڵە بەرێزە زۆر ڕێگەی بڕی و ماندووبوو لەدوو ڕێگاکە تاگەیشتە پلەی شەهادەت لەپێناوی خوا، زۆر لەمێژە موسڵمان بوو خەبات و جیهادی زۆری کرد لەشاری مەککە، پاشان لە وڵاتی حەبەشە دوای ئەوە لەشاری مەدینە و لە جەنگی بەدرو ئوحود دا، تا گەیشتەوە خزمەتی خوای پەروەردگاری بە ڕاستگۆیی و سەرڕاستی، خوای پەروەردگار لەسەر موسعەب ئایەتی دابەزاند دەفەرمووێت:

﴿مِّنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ رِجَالٌ صَدَقُوا۟ مَا عَـٰهَدُوا۟ ٱللَّهَ عَلَيْهِ ۖ فَمِنْهُم مَّن قَضَىٰ نَحْبَهُۥ وَمِنْهُم مَّن يَنتَظِرُ ۖ وَمَا بَدَّلُوا۟ تَبْدِيلًا ﴿٢٣﴾﴾

واتە: مەردانێکی زۆر هەن لەنێو ئیمانداران ئەو پەیمانەی داویانە بەخوا ڕاستیان کرد لەسەری ژیان و پابەند بوون و لایان نەدا لێی، جا هەیانە پەیمانەکەی جێبەجێ کرد و مرد لەسەری، هەشیانە چاوەڕوانە بەهیچ شێوەیەک گۆڕان و لاری ڕووی تێنەکردوون.

پێغەمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ خواحافیزی لە تەرمی موسعەب کرد ئەو ئایەتەی لەسەر خوێندەوە:

﴿مِّنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ رِجَالٌ صَدَقُوا۟ مَا عَـٰهَدُوا۟ ٱللَّهَ عَلَيْهِ ۖ فَمِنْهُم مَّن قَضَىٰ نَحْبَهُۥ وَمِنْهُم مَّن يَنتَظِرُ ۖ وَمَا بَدَّلُوا۟ تَبْدِيلًا ﴿٢٣﴾﴾ [الأحزاب]

پاشان پێغەمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ فەرمووی: لەڕۆژی قیامەتدا شایەتی دەدەم ئەوانە شەهیدن، پاشان فەرمووی: وەرنە سەر گۆڕەکانیان و سەردانیان بکەن، فەرمووی: سوێند بەوەی گیانی منی بەدەستە، تا ڕۆژی قیامەت هەرکەس سڵاویان لێ بکات ئەمان وەڵامی دەدەنەوە.[١٤٩]

سەردانیکردنی شەهیدانی ئوحود سوننەتی پێغەمبەری خوایە صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ هەمیشە سەردانی کردوون و دوعای بۆ کردوون.

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

[١٤٩] ـ (أشهد أن هؤلاء شهداء عند الله إلى يوم القيامة فأتوهم وزوروهم والذى نفسى بيده لا يسلم عليهم أحد إلى يوم القيامة إلا ردوا عليه) أخرجه الحاكم (٢٧١/٢، رقم ٢٩٧٧) وقال: صحيح على شرط الشيخين. وتعقبه الذهبى فى التلخيص وقال: أحسبه موضوعاً، وقطن لم يرو له البخارى. وعبد الأعلى لم يخرجا له.



سێیەم: سەعیدی کوڕی ڕەبیع-ڕەزامەندی خوای لەسەر بێت-.

ئەو هاوەڵە بەڕێزە خوا لێی ڕازیبێ هەر لە سەرەتاوە زۆر ئەرێنی بیری دەکردەوە، کاتێک پێغەمبەری خوا ﷺ تەشریفی هێنایە مەدینە هاوەڵانی کردە برا، ئەم هاوەڵە بەڕێزەی کردە برای عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوفی موهاجیر و سەعدی کوڕی ڕەبیعی ئەنساری، پێشنیاری کرد بۆ عەبدوڕەحمان نیوەی سەروەتەکەی خۆی بداتێ، دوو هاوسەری هەیە یەکێکیان هەڵبژێرێت و بۆی تەڵاق بدات و بیکاتە خێزانی خۆی، بەڵام عەبدوڕەحمان ڕازی نەبووە پێی فەرموو: (بارك الله في أهلك ومالك) کاتێک لە جەنگی ئوحود بەشدار بوو، جەنگێکی زۆر ئازایانەی کرد زۆر دڵسۆزانە جیهادی کرد، تا گیانی خۆی پێشکەش بەخوای پەروەردگار کرد.

لەدوای جەنگەکە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: کەسێک بڕوات هەواڵی سەعدی کوڕی ڕەبیعم بۆ بزانێت، بزانێت لە زیندووەکانە، یان مردووەکان؟ یەکێک لە ئەنسارەکان وتی: من ئەو کارە ئەنجام دەدەم، بەدوایدا گەڕا دۆزییەوە لە خاکدا کەوتبوو بە ڕم بریندار کرابوو، کەسەکە دەڵێ: پێموت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێکردووم بزانم لە زیندووەکانی یان لە مردووەکانی، سەعدی کوڕی ڕەبیع فەرمووی: من لە مردووەکانم، بەڵام هەواڵم بگەیەنە بە پێغەمبەر ﷺ سڵاوی لێ دەکەم، پێی بڵێ: خوا جەزای بداتەوە بەوەی کە هێناویەتی بۆ ئوممەتەکەی، پاشان هەواڵم بگەیەنە بە هۆزەکەم پێیان بڵێ: سەعدی کوڕی ڕەبیع دەیوت: سڵاوتان لێ بێت، هیچ عوزر و بەهانەیەکتان نییە بۆ ئەوەی واز لە پێغەمبەرەکەتان ﷺ بهێنن، لەگەڵیدا هاوکار بن نابێ بۆ چاوترووکانێکیش جێی بهێڵن، پاشان کەسەکە دەڵێ: یەشتا لەلای نەڕۆیشتبووم گیانی سپارد.

بەڕاستی سەعدی کوڕی ڕەبیع تا چرکەساتی کۆتایی کەسێکی ڕاستگۆو ئەرێنی بوو، هانی ئیماندارانی دەدا بۆ جیهاد وتی: لەلای خوای پەروەردگار هیچ عوزر و بەهانەیەکتان نییە واز لە پێغەمبەرەکەتان بهێنن ئەگەر بۆ چاوترووکانێکیش بێ.[١٥٠]

چوارەم: عەبدوڵڵای کوڕی حەڕام -ڕەزامەندی خوای لەسەر بێت-

---

[١٥٠] ـ (من رجل ينظر لي ما فعل سعد بن الربيع، وأخو بالحارث بن الخزرج في الأحياء أو في الأموات؟ فقال رجل من الأنصار: أنا أنظر لك يا رسول الله ما فعل، فنظر فوجده جريحاً في القتلى، به رمق، فقال له: إن رسول الله أمرني أن أنظر له في الأحياء أنت أم في الأموات، قال: فأنا في الأموات فأبلغ رسول الله عني السلام، وقل له: إن سعد بن الربيع يقول: جزاك الله عنا خير نا جزى نبياً عن أمته، وأبلغ قومك عني السلام وقل: إن سعد بن ربع يقول لكم: أنه لا عذر لكم عند الله إن يخلص إلى نبيكم ومنكم عين تطرف، قال: ثم لم أبرح حتى مات) السيرة النبوية لابن إسحاق، ج١، ص ١١٨.



بەر لە شەهید بوونی خۆی بۆمان دەگێڕێتەوە و دەڵێ: پێش جەنگی ئوحود خەونم بە (موبەشیری کوڕی عەبدولعەزیز) بینی، ئەو یەکێک بوو لە شەهیدەکانی جەنگی بەدر، دەڵێ: پێی وتم: تۆ لەو ڕۆژانە دێیتە لامان، عەبدوڵلا دەڵێ: منیش پێم وت: ئەی تۆ لەکوێی؟ لەوەڵامدا وتی: من لە بەهەشتم و لە خۆشی و شادی بەهەشتدا چۆنم بوێت دەژیم.

عەبدوڵلا دەڵێ: لە خەونەکەمدا پێموت: مەگەر تۆ لە جەنگی بەدردا نەکوژرایت؟ لەوەڵامدا وتی: بەڵێ، بەڵام زیندوو کرامەوە، پاشان دەڵێ: خەونەکەم بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ گێڕایەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەی باوکی جابر ئەوە نیشانەی شەهادەتە. باوکی جابر لە جەنگی ئوحود یەکەم کەس بوو شەهید بوو، گەڕایەوە لای پەروەردگار و ڕاستەوخۆ بۆ بەهەشت، بۆ لای هاوڕێ شەهیدەکانی دیکەی، هەر عەبدوڵلای کوڕی حەڕام بوو چووە لای عەبدوڵلای کوڕی ئوبەی کوڕی سەلوول پێی وت: لەگەڵماندا بمێنەوە و مەگەڕێرەوە، بەڵام کە زانی هەر دەگەڕێتەوە پێی وت: ئەی خوای گەورە ناشیرینترت بکات وا لەکاتی تەنگانەدا پێغەمبەری خوا ﷺ جێدەهێڵیت، پاشان دەستی کرد بە جەنگێک شێر ئاسا هەڵمەتی دەبرد، زۆری لە موشریکەکان کوشت هەتا خۆی شەهید بوو.

پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەی جابر بۆ وا بەسەر یەکدا تێکشکاوی؟ جابر وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ باوکم شەهید بوو و منداڵێکی زۆری بەجێهێشتووە، لەگەڵ قەرزێکی زۆر بەسەرمەوە.

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: موژدەت بدەمێ چۆن گەڕایەوە بۆ لای خوای گەورە؟

جابر وتی: بەڵێ، ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ.

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: خوای پەروەردگار لەگەڵ هیچ کەسدا قسەی نەکردووە خۆی پیشان بدات، باوکت خوای پەروەردگاری بینی، خوای پەروەردگار ڕاستەوخۆ قسەی لەگەڵ کرد و فەرمووی: ئەی بەندەی خوا داوا و هیوا و ئومێد بخوازە، بەندەکەیش وتی: خوای پەروەردگار زیندووم بکەوە با جارێکی دیکەیش لەپێناوی تۆدا شەهید ببم، خوای پەروەردگار فەرمووی: (إنه سبق مني أنهم لا يرجعون) خوای پەروەردگار جارێکی تر سیستەمی ژیان و مردن ناگۆڕێت.

پاشان فەرمووی: خوا گیان هەواڵی شەهید بوونم بگەیەنە بە خەڵکی، پاشان خوای پەروەردگار ئایەتی (١٦٩)ی سورەتی آل عمران دابەزاند دەفەرمووێت: وا پەی نەبەن بەو کەسانەی لەپێناوی خوادا شەهید دەبن دەمرن، بەڵکو زیندوون خوای پەروەردگار ڕۆزییان دەدات.



تەنانەت لەدوای مردنیشی لە قیامەتدا هەر جەخت لەسەر ئەوە دەكاتەوە، هانی موسڵمانان دەدات بۆ جیهاد و خەبات و شەهیدی لەپێناوی ئیسلام، لەبەر ئەوەی هیچ پلە و پایەیەكی دیكە ناگاتە پلە و پایەی شەهیدی، مەگەر پێغەمبەران -سەلامی خوایان لێبێت- پلەو پایەی ئەوانیان هەبێ.[١٥١]

پێنجەم: خەیسەمەی باوكی سەعد -ڕەزامەندی خوای لەسەر بێت-

لە جەنگی بەدردا خەیسەمە و سەعدی كوڕی بەشدار بوون، بەڵام لەو جەنگەدا سەعد خوای پەروەردگار پلەی شەهیدی بەنسیب كرد، بردیەوە لای خۆی و خستییە بەهەشت، لەنێو خاكی ئوحودا شەوێك پێش جەنگ دەڵێت: خەونم بە پێغەمبەری خواوە ﷺ بینی، سەعدی كوڕی لەنێو بەهەشتدا بوو، لە خۆشی و خواردنی بەهەشتی دەخوارد، چەند خۆش بوو بە ئارەزووی خۆی لە بەروبوومی بەهەشتی دەخوارد، سەعدی كوڕم لە خەوەكە پێی وتم: باوكە وەرە بۆ لامان بیرت دەكەم حەز دەكەم لێرە لە بەهەشتدا بەیەكەوە بین.

ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ دوعام بۆ بكە، كە هاوڕێیەتی سەعدی كوڕم بكەم لە بەهەشت دا، پاشان بە پێغەمبەری خوا ﷺی فەرموو: تەمەنم زۆرە، پیری لە لاشە و ئێسقانەكانی داوم، جا داوای دوعای خێرت لێ دەكەم بۆ شەهیدی؟ پێغەمبەری خوا ﷺ دوعای بۆ كرد و لە جەنگی ئوحود شەهادەتی بەدەست هێنا.

شەشەم: عەمری كوڕی جەمووح -ڕەزامەندی خوای لەسەر بێت-

ئەم هاوەڵە بەڕێزە كەسێكی شەل بوو و تەمەنیشی هەبوو، چوار كوڕی لەگەڵ پێغەمبەری خوادا لە جەنگەكان بەشدار بوون، لە گەنجە چاو نەترس و ئازاكان بوون، ئەمیش حەزی دەكرد لە جەنگ و جیهاد دا بەشدار بێت و خۆی بۆ جەنگی ئوحود ئامادە كرد، كوڕەكانی وتیان: باوكە پێویست ناكات تۆ بێیت بۆ جیهاد، چونكە خوای پەروەردگار جیهادی لەسەر تۆ هەڵگرتووە، ئێمە لەجیاتی تۆ دەچین.

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

[١٥١] ـ حَدَّثَنَا إِبْرَاهِيمُ بْنُ الْمُنْذِرِ الْحِزَامِيُّ وَيَحْيَى بْنُ حَبِيبِ بْنِ عَرَبِيٍّ قَالَا حَدَّثَنَا مُوسَى بْنُ إِبْرَاهِيمَ بْنِ كَثِيرٍ الْأَنْصَارِيُّ الْحَرَامِيُّ قَالَ سَمِعْتُ طَلْحَةَ بْنَ خِرَاشٍ قَالَ سَمِعْتُ جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ يَقُولُ لَمَّا قُتِلَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ عَمْرِو بْنِ حَرَامٍ يَوْمَ أُحُدٍ لَقِيَنِي رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ يَا جَابِرُ أَلَا أُخْبِرُكَ مَا قَالَ اللَّهُ لِأَبِيكَ وَقَالَ يَحْيَى فِي حَدِيثِهِ فَقَالَ يَا جَابِرُ مَا لِي أَرَاكَ مُنْكَسِرًا قُلْتُ يَا رَسُولَ اللَّهِ اسْتُشْهِدَ أَبِي وَتَرَكَ عِيَالًا وَدَيْنًا قَالَ أَفَلَا أُبَشِّرُكَ بِمَا لَقِيَ اللَّهُ بِهِ أَبَاكَ قَالَ بَلَى يَا رَسُولَ اللَّهِ قَالَ مَا كَلَّمَ اللَّهُ أَحَدًا قَطُّ إِلَّا مِنْ وَرَاءِ حِجَابٍ وَكَلَّمَ أَبَاكَ كِفَاحًا فَقَالَ يَا عَبْدِي تَمَنَّ عَلَيَّ أُعْطِكَ قَالَ يَا رَبِّ تُحْيِينِي فَأُقْتَلُ فِيكَ ثَانِيَةً فَقَالَ الرَّبُّ سُبْحَانَهُ إِنَّهُ سَبَقَ مِنِّي أَنَّهُمْ إِلَيْهَا لَا يَرْجِعُونَ قَالَ يَا رَبِّ فَأَبْلِغْ مَنْ وَرَائِي قَالَ فَأَنْزَلَ اللَّهُ تَعَالَى وَلَا تَحْسَبَنَّ الَّذِينَ قُتِلُوا فِي سَبِيلِ اللَّهِ أَمْوَاتًا بَلْ أَحْيَاءٌ عِنْدَ رَبِّهِمْ يُرْزَقُونَ) إبن ماجة: (١٩٠).



بەڵام عەمری کوڕی جەمووح هات لەلای پێغەمبەری خوا ﷺ سکاڵای تۆمار کرد، کە کوڕەکانی ناهێڵن بێت بۆ جەنگ، منیش تەمەنای شەهیدی دەکەم و حەز دەکەم بەم قاچە شەلەوە بڕۆمە بەهەشت.

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: تۆ جیهادت لەسەر نییە و خوای پەروەردگار مۆڵەتی داویت کە جیهاد نەکەیت، بەڵام ڕووی کردە کوڕەکانی و وتی: واز لە باوکتان بهێنن بەڵکو خوای گەورە شەهیدی بکاتە نسیبی.

ئەو ڕۆژە لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ دەرچوو بۆ جەنگی ئوحود، بەشدار بوو لە جەنگەکەدا و ڕاستگۆ بوو لەگەڵ خۆیدا و خوای پەروەردگار شەهادەتی بەقسمەت کرد. کارەکەی بۆ ئاسان بوو.

حەوتەم: حەنزەڵەی کوڕی ئەبی عامر -ڕەزامەندی خوای لەسەر بێت-

ئەم هاوەڵە بەڕێزە زۆر موشتاقی جیهاد بوو، کە بانگی جیهاد درا بە پەلە خۆی کرد بەنێو سوپای پێغەمبەری خوادا ﷺ، هەر ئەو ڕۆژە خێزانی گواستبووەوە، بۆ ئەوەی لە جەنگەکەدا بەشدار بێت بیری چوو غوسڵ دەربکات، کاتێک لە ئوحود دا شەهید بوو فریشتەکان شۆردیان ئیتر ناو نرا بەوەی فریشتەکانی ئاسمان شۆردوویانە (غسيل الملائكة) پێغەمبەری خوا ﷺ پرسیاری کرد بۆچی فریشتەکان شۆردوویانە؟چونکە پێغەمبەر ﷺ بینی کە فریشتەکان دەیشۆرن (لقد رأيت الملائكة تغسله).

خێزانەکەی وتی: بۆ ئەوەی فریای سوپاکە بکەوێت بۆ جەنگی ئوحود. لە شەوی پەردەیدا دەرچوو بۆ جیهاد و غوسڵی دەرنەکرد، بەڵام بە شەهیدی گەڕایەوە بۆ لای خوای پەروەردگار.

هەشتەم: عەبدوڵڵای کوڕی جەحش -ڕەزامەندی خوای لەسەر بێت-

ئەم هاوەڵە بەڕێزە لە ڕێگەی جیهادێکی دوور و درێژدابوو، لەشاری مەککە و لە حەبەشە و جیهاد لەشاری مەدینە و لە جەنگی ئوحود.

گفتوگۆیەکی زۆر نایاب ڕوویدا لەنێوان سەعدی کوڕی ئەبی وەقاس و عەبدوڵڵای کوڕی جەحش لەڕۆژی بەدردا.

عەبدوڵڵا بە سەعدی وت: وەرە بەیەکەوە دوعا بکەین لەخوا بپاڕێینەوە، هەردووکیان چوونە جێگایەک دوور لە سوپاکە دانیشتن، دەستیان کرد بە پاڕانەوە لە خوای پەروەردگار، سەعد دەڵێ: لەخوا پاڕامەوە لەو ڕۆژەدا ڕووبەڕووی یەکێک ببمەوە ئازا و قارەمانی موشریکەکان بێت، لەهونەری جەنگدا لێزان بێت بە شمشێرەکەم بیکوژم، هەموو کەرەستەی جەنگەکەی بە غەنیمەت بۆخۆم ببەم.



پاشان عەبدوڵڵای کوڕی جەحش دەستیکرد بە پاڕانەوە و فەرمووی: خوایەگیان سبەینێ ڕووبەڕووی موشریکەکان ببمەوە، ئازا و قارەمانی ئەوان بێت لەپێناوی تۆدا جەنگی لەگەڵ بکەم بمکوژێت و لووت و گوێم ببڕێت، ئەگەر گەڕامەوە بۆ لات فەرمووت: کێ لووت و گوێی بڕیوی؟ منیش بڵێم: لە پێناوی زاتی تۆ و پێغەمبەرەکەت وام لێ هاتووە، پاشان خوای پەروەردگار بڵێیت ڕاستت کرد. سەعد دەڵێ: دوعاکەی عەبدوڵلا لەهی من باشتر و هێزی زیاتر بوو، لەکۆتایی نیوەڕۆدا بینیم لووت و گوێی بڕابوو کرابوو بە پەتێکەوە.

تەماشای ئەو هەڵوێستە نایاب و ناوازەیە بکە، چۆن لەپێناوی خوای گەورەدا بەدوای شەهیدی دا دەگەڕێت و حەزدەکات بەخوای گەورە بگات. لەوپەڕی ئیخلاص و ڕاستگۆیی تا پلەی نایابی شەهادەکەی بەدەست بهێنێت، هەموو ئەو کارانەش بۆ ئەوەیە بڕواتە بەهەشتی خوای پەروەردگار.

نۆیەم: ئەصیرەم -ڕەزامەندی خوای لەسەر بێت-

وەک پێشتر ئاماژەم بۆکرد تا دەگەیت بە پلەی شەهیدی لەپێناو خوادا دەبێ ڕێگەیەکی دوورو درێژت بڕیبێ، زۆر لە کات و سەروەت و سامانەکانت ببەخشیت، هەوڵێکی یەکجار زۆر بدەیت تا دەگەیتە ئەو شەهادەتە، ئەویش پێویستی بە یەقین و ئیخلاس هەیە، پاشان داواکارییەکی بەڕاستگۆیی تا ئەو کاتەی خوای پەروەردگار ئەو شەهیدییە دەکاتە نسیب و قسمەتت.

بەڵام زۆرجار خوای گەورە زۆر ئاسانی دەکات بۆ هەندێک لە بەندەکانی نیعمەتی شەهیدی دەبەخشێت زۆر بەزوویی بەبڕینی ڕێگەیەکی زۆر کەم، زۆرجار لە گۆڕانگارییەکی زۆر خێرا لەناو کوفرەوە بۆ خانەی ئیمان، پاشان ڕاستەوخۆ بۆ پلەی شەهیدی.

بۆ نموونە ساحیر و جادووبازەکانی فیرعەون، زۆر ڕوون و ئاشکرایە لە قورئاندا لەسەربازگەی کوفرەوە بۆ سەربازگەی ئیمان و بۆ پلەی شەهیدی، دوای ئەوەی ڕاستییان زانی و ئیمانیان پێهێنا، پاشان فیرعەون لەداری دان و هەموو شەهید بوون، خوای پەروەردگار لەوبارەوە دەفەرموێت:



﴿قَالُواْ لَن نُّؤْثِرَكَ عَلَىٰ مَا جَآءَنَا مِنَ ٱلْبَيِّنَٰتِ وَٱلَّذِى فَطَرَنَا فَٱقْضِ مَآ أَنتَ قَاضٍ إِنَّمَا تَقْضِى هَٰذِهِ ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَآ ﴿٧٢﴾ إِنَّآ ءَامَنَّا بِرَبِّنَا لِيَغْفِرَ لَنَا خَطَٰيَٰنَا وَمَآ أَكْرَهْتَنَا عَلَيْهِ مِنَ ٱلسِّحْرِ وَٱللَّهُ خَيْرٌ وَأَبْقَىٰٓ ﴿٧٣﴾ إِنَّهُۥ مَن يَأْتِ رَبَّهُۥ مُجْرِمًا فَإِنَّ لَهُۥ جَهَنَّمَ لَا يَمُوتُ فِيهَا وَلَا يَحْيَىٰ ﴿٧٤﴾ وَمَن يَأْتِهِۦ مُؤْمِنًا قَدْ عَمِلَ ٱلصَّٰلِحَٰتِ فَأُوْلَٰٓئِكَ لَهُمُ ٱلدَّرَجَٰتُ ٱلْعُلَىٰ ﴿٧٥﴾﴾ [طه]

واتە: جادووگەرانی تاوێک لەوەوبەر بە باوەڕێکی بەتینەوە وتیان: تازە هەرگیز باوی تۆ نادەین بەسەر ئەو بەڵگە و نیشانانەدا کە بۆمان هاتووە، سوێند بەو زاتەی دروستی کردووین چیت لە دەست دێ ئەنجامی بدە و درێخی مەکە، بەڕاستی تۆ هەر دەتوانیت ژیانی ئەو دونیایەمان لێ زەوت بکەیت، ئێمە ئیتر بەڕاستی باوەڕمان هێناوە بە پەروەردگارمان تاوەکو لە گوناهەکانمان خۆش بێت و لەو جادووگەریەش کە بەزۆر پێت کردین، هەمیشە خوای گەورە لەهەمووکەس چاکترە و لەهەموو کەس پایەدارتر و بەردەوامترە، ئێمە دڵنیاین لەوەی ئەوەی بە تاوانەوە بگەڕێتەوە لای پەروەردگاری بێگومان ئەوە دۆزەخ بۆی ئامادەیە نە دەمرێت تیایدا نە دەژیت، ئەو کەسەش بە ئیمانەوە بگەڕێتەوە لای و کردەوە چاکەکانی بەڕاستی ئەنجام دابێت ئەوە بۆ ئەوان پلەو پایەی بەرزو بڵند ئامادەیە.

## بەیانییەکەی ساحیر بوون ئێوارەکەی شەهید

لە جەنگی ئوحود دا کەسێک کە ناوی عەمر بوو بە ئەسیرەم[152] ناسرابوو، ئەو ڕۆژەی کە سوپای ئوحود لە بەیانییەکەیدا دەرچوون ئەویش هاتە خزمەتی پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ و موسڵمان بوو، پێشتر هەموو کەسوکارەکەی موسڵمان بووبوون ئەو ئیمانی نەدەهێنا، تا بەرەبەیانی ئوحود دوای نوێژی بەیانی کە سوپاکە دەرچوو ئەویش ئیمانی هێنا و چووە خزمەتی پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ موسڵمان بوونی خۆی ڕاگەیاند، شمشێرەکەی هەڵگرت بەرەو ئوحود کەوتە ڕێ، ئەوەندە بەهێزبوو لە جەنگەکەدا سەرنجی هەموو موجاهیدەکانی بەنی عەبدولئەشهەلی ڕاکێشا، وتیان خۆ ئەوە ئەسیرەم جەنگ دەکات، ئێمە کاتێ بەجێمان هێشت کافر بوو، چی هێناویەتی بۆ ئێرە؟

پاشان هەندێک لە هاوڕێ و کەسوکاری هاتن بۆ لای و وتیان: ئەی عەمر چی تۆی هێناوە بۆ ئەم جەنگە؟ جەنگ دەکەیت لەپێناوی قەومەکەت، یان لەپێناوی ئیسلام؟ ئەسیرەم وتی: بەڵکو لەپێناو ئیسلام و خواو پێغەمبەرەکەی دەجەنگم، پاشان لە جەنگەکەدا شەهید کرا و

[152] ـ اصيرم.



گەڕایەوە لای پەروەردگاری، چوونە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ باسی ئەسیرەمیان بۆ گێڕایەوە و فەرمووی: لە ئەهلی بەهەشتە.

ئەبو هورەیرە -ڕەزامەندی خوای لەسەر بێت- لەبارەی ئەو هاوەڵە کۆمێنتێکی هەیە و دەڵێ: ئەو لەژیانیدا نوێژێکی نەکردووە بۆ خوای پەروەردگار، کەچی خوای پەروەردگار ئەو پلە بەرزەی پێ بەخشی.

دەیەم: مەخەیریق -ڕەزامەندی خوای لەسەر بێت-

کاتێک پێغەمبەری خوا ﷺ سوپاکەی بۆ ئوحود ڕێکخست، مەخەیریقی یەهوودی بە هۆزەکەی خۆی وت: ئێوە موحەممەد سەرناخەن، سوێند بەخوا چاک دەزانن سەرخستنی موحەممەد حەقە لەسەرتان.

یەهوودی هۆزەکەی وتیان: ئەمڕۆ شەممەیە و ڕۆژی پشوومانە، ئەویش دەستی دایە شمشێرەکەی و وتی: بۆمن شەممە هیچ نییە، لەدوای خۆی هەموو سەروەتەکەی دایە پێغەمبەری خوا ﷺ بە گەلەکەی وتو چووە ئوحود و شەهید بوو، ئەوەی دووبارە کردەوە لەکاتی بریندار‌بوونی وتی: هەموو سەروەتەکەم بۆ موحەممەد ﷺ هەرچی لێدەکات ئازادە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: باشترین خەڵکی یەهوود مەخەیریقە (مخيريق خير اليهود).

سبحان الله بە پێچەوانەی ئەوەوە بینیمان (قەزمان) لە ئوحود دا چ جەنگێکی کرد، ئاڵای موشریکەکانی خستە سەر زەوی، حەوت بۆ هەشت کەسی لێ کوشتن، لەدواییدا جەنگێکی زۆر نایابی کرد موسڵمانان زۆر خۆشحاڵ بوون بە ئازایەتی و تواناو هێزی، لە جەنگەکەدا بریندار بوو، ئارامی نەگرت و خۆی بەدەستی خۆی خۆیکوشت، کاتێک پێغەمبەری خوا ﷺیان ئاگادار کردەوە فەرمووی: ئەو لەئاگردایە (قزمان من أهل النار).

ئەو کەسە دەچێتە بەهەشت کە لە جیهاد دا تەنها دەیەوێ ناوی خوا بەرز ڕابگرێت، ئەوانەی تر لەپێناو خاک و نەتەوە و ئاڵا...هتد هیچی نابێتە شەهید، شەهید وشەیەکی ئیسلامییە تەنها موسڵمانان بەکاری دەهێنن، یەکەمجار پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ سومەییەی دایکی عەممار خوا لێیان ڕازیبێ بەکاری هێنا.

تەنانەت هیندی خێزانی ئەبو سوفیان وتی: سەیرە بە مردووەکانیان دەڵێن شەهید، ئەوەی وشەکەی بردووە یاخود دزیوە بەکاری دەهێنێت بۆ مەرامی گڵاوی خۆی، وەکو شەیتان دەیەوێ خەڵکی پێ چەواشە بکات.



پیاوێک هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: کەسێک لەپێناوی غەنیمەت دەجەنگێت، کەسێکی تر لەپێناوی ئەوەی باسی بکەن و لەناو خەڵکدا ناسراو بێت، کەسێکی دیکە دەجەنگێت بۆ ئەوەی ئازایە و چاو نەترسە، شۆڕشگێرە...هتد.

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: جەنگ لەپێناوی خوادا ئەوەیە بەتەنها ڕایگریت و لەپێناوی ئەودا جیهاد بکەیت (من قاتل لتکون کلمة الله هی العلیا فهو فی سبیل الله).[153]

ئەمەش باسی خێرو چاکەی ناو ئەو موسیبەتە بوو کە خوای گەورە بەسەر موسڵمانانیدا هێنا، ئەشێت زۆر خێری گەورەتریشی تێدا بێت بەڵام بۆ تێگەیشتنمان ئەوەندە بەسە. مانای ئەوە نییە کە موسیبەت هات ئیتر کۆتایی دونیایە.

[153] ـ صحيح البخاري ١٢٣.



# چارەسەری شکستی ئوحود بۆ شکۆی موسڵمانان

ماکوان: ئەوانەی باسم کردن شەهیدەکان بوون، ئەی داخۆ حاڵی ئەوانە چۆن بێت کە ڕایان کردووە بۆ شاری مەدینە لەخاکی ئوحودا هەڵهاتن، پێغەمبەری خوا ﷺ بانگی کردن بەڵام ئەوان هەر هەڵاتن. مەنهەجی ڕەبانی هات بۆ چارەسەری ئەو کێشەیە، چۆن ئەو موسیبەتە چارەسەر دەکات؟

ئینجا سورەتی (آل عمران) باسی ئەو واقیعەیە، فێرمان دەکات لەکاتی شکست چۆن چارەسەری بکەین، ئەگەرچی سەرپێچی شەریعەت و مەنهەجیش کرابێت یاخود تووشبوونی تاوانی گەورە وەکو ڕاکردن و پشت هەڵکردن لە مەیدانی جەنگدا، ئەو چارەسەرە خوای پەروەردگار بەچەند ئاڕاستەیەک بۆی دەستنیشان کردووین.

## ئاڕاستەی یەکەم:

بەرزکردنەوەی باری دەروونی موسڵمانان و سەرنج ڕاکێشانیان بۆ سەنتەری هێزەکەی تێیاندا هەیە بەبەردەوامی، خوای گەورە دەفەرمووێت:

﴿وَلَا تَهِنُوا۟ وَلَا تَحْزَنُوا۟ وَأَنتُمُ ٱلْأَعْلَوْنَ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ﴿١٣٩﴾﴾ [آل عمران]

واتە: ئەی ئیمانداران کۆڵ مەدەن و سارد مەبنەوە و خەفەت مەخۆن، چونکە هەر ئێوە سەرفراز و سەرکەوتوون، ئەگەر ئیمانداری چاک و ڕاست و دروست بن.

هەموو مرۆڤێک لایەنی چاکە و خراپەی هەیە، سروشتی مرۆڤ وایە خوای گەورە بەو شێوەیە دروستی کردووە، لەم ئایەتەدا تەنها باسی لایەنی ئەرێنی و چاکەی موسڵمانان دەکات، ڕاستە کەوتوونەتە شکست و موسیبەت و قەیرانی گەورە، بەڵام ئێوە هەر موسڵمانن و ئیمانتان لەدەست نەداوە، بڕوات بەخوا و پێغەمبەر ﷺو فریشتە و کتێب و ڕۆژی دوایی هەیە، ئەمەش لەدوای هەموو گەڵاڕێزان و پایزێک و مردنی زستان، بەڵام خۆ بەهار دێتەوە سەرلەنوێ قەدو پەلەکان چرۆ دەکەنەوە و هاوین بەروبوومەکەی دەخۆن. کەواتە: مادەم ئیمانداری هەڵسانەوە ئەستەم نییە، تۆ خۆت هەر بەرزی.

وانەزانیت دەوڵەتانی دونیا کە خاوەنی تەکنەلۆژیای سەربازی و هێزی گەورە و ئابووری زەبەلاحن، بەڵام ئوممەتی موحەممەد ﷺ خاوەنی کەرەستەی هەڵسانەوەی زۆرە. نەک هەر زۆرە، بەڵکو زۆر زۆرە و توانای ستراتیژی ماددی و مرۆیی بەسە بۆ هەڵسانەوەی ئوممەت.



ئاڕاستەی دووەم:

بەرزکردنەوەی ئاستی دەروونی لە سەرنج ڕاکێشانیان بۆ ئەوەی کە خودی موسیبەتەکە خێری زۆر گەورەی تێدایە، ئەو موسیبەتە فێری کردین کە تاوانکردن هۆکاری شکستە. قورئان فێری کردن کە چۆن ڕزگاریان بوو لەدەستی مونافیقەکان، ئاشکرا کردن و سەرپێچی کردنی پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ ترسناکی ژیانی دونیا چوونە نێو دڵ، شەهید بوونی ژمارەیەک لە موسڵمانان لایەنی باشی ئەو موسیبەتە وات لێ دەکات جارێکی دیکە داوای لێبوردن و تۆبە بکەیت، نەهێڵیت کاری وا دووبارە ببێتەوە.

ئاڕاستەی سێیەم:

موسیبەت و ناڕەحەتی لە ژیاندا هەر وجودی هەیە، هەر چەند مرۆڤ هەوڵ بدات ڕوونەدات بەڵام لە دەسەڵاتیدا نییە، کەواتە: هەرگیز دەرگای (ئەگەر) مەکەرەوە، شەیتان لەبەردەم دەرگای ئەگەردا وەستاوە، بڵێیت ئەگەر وام نەکردایە وا دەرنەدەچوو، ئەگەر وام بکردایە وا دەردەچووا! کە ڕوویدا هەوڵ بدە چارەسەری بکە و بەدیارییەوە دامەنیشە، لەسەریەتی کار بکات هەڵە و گریان و مردن و ناهەمواری لەم ژیانەدا بوونی هەیە، گرنگ ئەوەیە لەدوای کەوتن هەڵبسیتەوە، ئەوەی کەوتۆتە نێو چاڵ پێویست ناکات پرسیاری لێ بکەیت بۆچی کەوتۆتە نێو چاڵ، پێویستە بڵێی دەستتم بدەیە با دەرت بهێنمەوە.

پێویستە هەوڵ بدرێت کار بەهۆکار بکرێت، بەڵام لەگەڵ هەموو ئەمانەدا موسیبەت هەر ڕوودەدات، بەڵام پێویستە مرۆڤ پێشتر حەزەر و ئامادەکاری هەبێت، ئامادەکاری بەرپەرچی قەدەر ناداتەوە، بەڵام گرنگە هەرکاتێک ڕوویدا بتوانی دەستبەجێ چارەسەری بکەیت، یان بۆی بدۆزیتەوە لەبەر ڕۆشنایی مەنهەجی ڕەبانی، کەواتە نا بۆ بێئومێدی و بێهیوایی و تەمەڵی، بەڵکو کارکردن بۆ چارەسەرکردنی موسیبەت.

ئاڕاستەی چوارەم:

پەیمانی سەرلەنوێ هەڵسانەوە، خوای پەروەردگار دەفەرموێت:

﴿إِن يَنصُرْكُمُ اللَّهُ فَلَا غَالِبَ لَكُمْ وَإِن يَخْذُلْكُمْ فَمَن ذَا الَّذِي يَنصُرُكُم مِّن بَعْدِهِ وَعَلَى اللَّهِ فَلْيَتَوَكَّلِ الْمُؤْمِنُونَ﴾ [آل عمران]

واتە: ئەگەر خوا سەرکەوتنتان پێ ببەخشێت، ئەوا هیچ کەس ناتوانێت سەرکەوتووبێت بەسەرتاندا، خۆ ئەگەر پشتتان بەربدات ئەوا کێ هەیە دوای ئەو کۆمەکیتان بکات و سەرتان بخات، دەبا ئەوانەی ئیماندارن هەر پشت بەخوا ببەستن.

ئەگەر خوای گەورە سەرت بخات ئەوا کێ دەتوانێت دەست بنێتە ڕێگات، بەڵام بەو مەرجەی سەرخستنی خوای پەروەردگار بێت، لەو پێناوەدا هەنگاو هەڵبنێیت بەگوێرەی شەرعەکەی، چونکە ئایەتەکەی کە ئاماژەم پێکرد پەیمانی سەرلەنوێ هەڵسانەوەی داوە.

## ئاڕاستەی پێنجەم:

پەروەردەکردنیان بە مێژوو و ئەزموونی گەلانی دیکە کە لە ڕووداوەکانیاندا چۆن تێکشکاون، سەرلەنوێ هەڵساونەتەوە، خوای پەروەردگار لە قورئان دا زۆر ڕووداوی بۆ باس کردووین، پاشان دەفەرموێت:

﴿وَكَأَيِّن مِّن نَّبِيٍّ قَٰتَلَ مَعَهُۥ رِبِّيُّونَ كَثِيرٌ فَمَا وَهَنُواْ لِمَآ أَصَابَهُمۡ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ وَمَا ضَعُفُواْ وَمَا ٱسۡتَكَانُواْۗ وَٱللَّهُ يُحِبُّ ٱلصَّٰبِرِينَ﴾ [آل عمران]

واتە: چەندەها پێغەمبەر هەبوون کە خواناس و پیاوچاکانی زۆر لەگەڵیدا بوون، دژ بە دوژمنان جەنگاون، جا ئەوانەی هیچ کات سستی و بێتاقەتی و بێزاری ڕووی تێنەکردوون بەهۆی ئەوەی کە تووشیان هاتووە لەپێناو ڕێبازی خوادا لاوازو بێهێزو سەرشۆڕیش نەبوون بۆ دوژمنان، خوای گەورەش ئەو ئارامگر و خۆڕاگرانەی خۆش دەوێت. خوای گەورە پێیان دەفەرموێت: ئەوەی بەسەر ئێوەدا هاتووە، بەسەر گەلانی دیکەشدا هاتووە، بۆ هەڵسانەوە پێویستە موسڵمانان بنەماکانی هەڵسانەوە بگرنە بەر.

## ئاڕاستەی شەشەم:

ئەوەی فێرکردن ئەوەی تووشی تۆ بووە بە ناڕەحەتی، بەهەمان شێوە و بگرە زیاتریش دوژمنەکەت تووشی بووە، لەتۆ زیاتر ئازار دەچێژێت، خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿إِن يَمۡسَسۡكُمۡ قَرۡحٌ فَقَدۡ مَسَّ ٱلۡقَوۡمَ قَرۡحٌ مِّثۡلُهُۥۚ وَتِلۡكَ ٱلۡأَيَّامُ نُدَاوِلُهَا بَيۡنَ ٱلنَّاسِ وَلِيَعۡلَمَ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَيَتَّخِذَ مِنكُمۡ شُهَدَآءَۗ وَٱللَّهُ لَا يُحِبُّ ٱلظَّٰلِمِينَ﴾ [آل عمران]

واتە: ئەگەر زام و سەختی و ناخۆشییەک (لە جەنگی ئوحود)دا تووشی ئێوە بووە، ئەو خەڵکەی لە (جەنگی بەدر)دا تووشی هەمان زام و سەختی و ناخۆشی هاتن، ئێمە ئەو ڕۆژگارانە لەنێو خەڵکیدا دەستاو دەست پێدەکەین، (تا لە جیهانی واقعیشدا) ئەوانەی باوەڕیان هێناوە بەخوا دەریان بخات و هەندێکتان بە شایەت بە پلەی شەهیدی بگەن، بێگومان خوا ستەمکارانی خۆش ناوێت.



لەڕۆژی ئوحود موشریەکەکان (٣٧) کەسیان لێ کوژرا جگە لە بریندار، ئەوەش ژمارەیەکی زۆرە سەرەڕای ئەوەی لە جەنگی ئوحود دا (٧٠) کەس تەنها لە قیاداتیان کوژران، قورەیش قەیرانی سەرکردەی بۆ دروست بوو.

ئاڕاستەی حەوتەم:

سوننەتی خوای گەورە لەو کەونە دا وایە کە هێز دەستا و دەست پێ دەکات، کێ هەوڵی بۆ بدات بۆ ئەو دەبێت.

﴿... وَتِلْكَ ٱلْأَيَّامُ نُدَاوِلُهَا بَيْنَ ٱلنَّاسِ...﴾ [آل عمران]

ئیسلام و موسڵمانانیش لەدەرەوەی ئەو یاسا کەونییە نین، بەڵکو خوای گەورە وای داناوە کێ هەوڵ و کۆششی زیاتر بکات ئەو دەبێتە خاوەنی.

ئاڕاستەی هەشتەم:

موسڵمان ناتوانێت بڵێت: من هەڵە ناکەم و هەمیشە لاپەڕەم سپییە، هیچ گوناح و تاوانێک ئەنجام نادەم، شتی وا نییە و هەرگیز ڕوونادات. خوای پەروەردگار سروشتی مرۆڤی وا دروست کردووە تاوان دەکات، بەڵام باشترین مرۆڤەکان ئەوانەن دوای ئەوەی هەڵە دەکەن تەوبە دەکەن و سوود لە ئەزموونی تاوانەکەیان وەردەگرن و دووبارەی ناکەنەوە، خۆ ئەگەر دووبارەیش بوویەوە بەهەمان پرۆسەی تۆبەدا دەڕواتەوە، بەپەلە دەگەڕێتەوە بۆ لای پەروەردگار، خوای پەروەردگار دەفەرمووێت:

﴿۞ وَسَارِعُوٓاْ إِلَىٰ مَغْفِرَةٍ مِّن رَّبِّكُمْ وَجَنَّةٍ عَرْضُهَا ٱلسَّمَٰوَٰتُ وَٱلْأَرْضُ أُعِدَّتْ لِلْمُتَّقِينَ﴾

[آل عمران]

واتە: بەپەلە بن و پێشبڕکێ بکەن هەتا دەگەنە لێخۆشبوونی پەروەردگارتان و بەهەشتێک کە پانتاییەکەی ئاسمانەکان و زەوی گرتۆتەوە و ئامادە کراوە بۆ پارێزکاران. خوای پەروەردگار وەعد و پەیمانی لێخۆشبوون بە موسڵمانان دەدات.



﴿وَالَّذِينَ إِذَا فَعَلُوا فَاحِشَةً أَوْ ظَلَمُوا أَنفُسَهُمْ ذَكَرُوا اللَّهَ فَاسْتَغْفَرُوا لِذُنُوبِهِمْ وَمَن يَغْفِرُ الذُّنُوبَ إِلَّا اللَّهُ وَلَمْ يُصِرُّوا عَلَىٰ مَا فَعَلُوا وَهُمْ يَعْلَمُونَ﴾ [آل عمران]

واتە: ئەوانەیش کە تاوان یاخود گوناحێک ئەنجام دەدەن یان ستەم لەخۆیان دەکەن خوا دێتەوە یادیان ئەوسا داوای لێخۆشبوون دەکەن، جا جگە لە خوا کێ هەیە لە گوناح خۆشبێت، هەروەها لەسەر گوناح و تاوانیان بەردەوام نابن.

هەروەها دەفەرموویت:

﴿إِنَّ الَّذِينَ تَوَلَّوْا مِنكُمْ يَوْمَ الْتَقَى الْجَمْعَانِ إِنَّمَا اسْتَزَلَّهُمُ الشَّيْطَانُ بِبَعْضِ مَا كَسَبُوا ۖ وَلَقَدْ عَفَا اللَّهُ عَنْهُمْ ۗ إِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ حَلِيمٌ﴾ [آل عمران]

واتە: بێگومان ئەوانەی پشتیان هەڵکرد (لە جەنگی ئوحود) لەکاتی بەیەکگەیشتنی هەردوو ئۆردوو، ئەوانە تەنها شەیتان تووشی هەڵەی کردن و لە خشتەی بردن، بەهۆی هەندێک گوناحەوە کە ئەنجامیان دابوو بەڕاستی خوا لێیان خۆشبوو، چونکە خوا لێخۆشبووە و ئارامگر و خۆڕاگرە.

## ئاڕاستەی نۆیەم:

مرۆڤ لەڕۆژی قیامەتدا لەسەر ئامانج لێپرسینەوەی لەگەڵدا ناکرێت، بەڵکو لەسەر کردار و کارەکانی کە ئەنجامی داوە لێی دەپرسرێتەوە، خوای گەورە دەفەرمووێت:

﴿لَا يَغُرَّنَّكَ تَقَلُّبُ الَّذِينَ كَفَرُوا فِي الْبِلَادِ ۝ مَتَاعٌ قَلِيلٌ ثُمَّ مَأْوَاهُمْ جَهَنَّمُ ۚ وَبِئْسَ الْمِهَادُ﴾ [آل عمران]

واتە:(ئەی ئیماندار) هەرگیز هێز و دەسەڵاتی ئەوانەی بێباوەڕن لە وڵاتاندا تۆ لە خشتە نەبات، ئەمە هەمووی ڕابواردنێکی کەمە، لەوەودا شوێن و جێگەیان دۆزەخە کە ناخۆشترین جێگە و ڕێگەیە.

چونکە کافرو بێدین و موشریکەکان وا سەرکەوتن جەنگێک دوو جەنگ یان دە ساڵ تا سەد ساڵ، کۆتاییەکەیان هەر دۆزەخە. کۆتایی سەرگەردانی و نەهامەتی بۆ ئەبەدی لە قیامەتدا بەو بەڵایەی خۆیاندا دەمێننەوە.

بەڵام سەبارەت بە موسڵمانان خوای گەورە دەفەرمووێت:



﴿فَـَٔاتَىٰهُمُ ٱللَّهُ ثَوَابَ ٱلدُّنْيَا وَحُسْنَ ثَوَابِ ٱلْـَٔاخِرَةِ وَٱللَّهُ يُحِبُّ ٱلْمُحْسِنِينَ ١٤٨﴾ [آل عمران]

واتە: ئەوسا ئیتر خوا پاداشتی دونیای پێبەخشین (بەسەرکەوتن و پایەداری) پاداشتی قیامەتیشی بۆ مسۆگەر کردن و خوا ئەو چاکەکارانەی خۆش دەوێت.

ئاراستەی دەیەم:

ئاگاداریی موسڵمان لە تەمەڵی و دانیشتنی دوور و درێژ بێ کارکردن، هێواش و گوێنەدان. مرۆڤ دەبێ هەمیشە لەنێوان هیوا و ترسدا بێت، چۆن هەڕەشە هەیە لەسەر تاوان و سەرپێچی، بەهەمان شێوە موژدەی پاداشت و پلەو پایەش هەیە، گوێڕایەڵی مەنهەجی خوا و پێغەمبەری خوا ﷺ هەمیشە سەرکەوتوت دەکات، پێچەوانەکەی سەرگەردانییە. بەم پێوەرە پارسەنگە کاری موسڵمانان هەمیشە ئاسان دەبێت، لەکاری ڕۆژانە و ژیان و سیاسەت...هتد.

بەم شێوەیە خوای گەورە لە قورئاندا چارەسەری ئەو شکستەی بۆ کردن و ناوی نا بە موسیبەت، سەرلەنوێ دەستی گرتنەوە بۆ هەڵسانەوە، جێگەو مەکانەتێکی نوێی پێ بەخشین و ئامادەیکردنەوە بۆ سەرکەوتنێکی تر.



# خۆ ئامادەکردن بۆ جەنگ، لەڕۆژی دووەمی ئوحود
# جەنگی "حمراء الأسد"

لە گەڕانەوەی بۆ ڕۆژی دوای جەنگ پێغەمبەری خوا ﷺ بڕیاری دەرکرد بۆ دەرچوون بەدوای سوپای قوڕەیش، لەناوچەی (حمراء الأسد) نزیکەی هەشت میل لەشاری مەدینەوە دوورە، پێغەمبەری خوا ﷺ زانی قوڕەیش (٣٠) میل دوورکەوتوونەتەوە، لەگەڵ ئەو هەموو ئازار و برینداربیەی پێغەمبەری خوا ﷺ لەڕۆژی دووەمدا، سوپاکەی ئامادە کرد ڕەتی کردەوە هیچ کەسی دیکە جگە لەو (٧٠٠) کەسەی لەسەرەتای جەنگی ئوحود لەگەڵیاندا بوون بە سوپاکەوە بلکێنرێن، تەنها ئەوانەی دوێنێ بەشدار بوون ئەوانە دەردەچن بۆ جەنگ.

ئەمەش بڕیارێکی زۆر حەکیمانە و وردبینانە بوو، بۆ ئەوەی جارێکی دیکە متمانە بۆ سەربازەکانی دروست بکاتەوە، بۆ ئەوەی پێیان بڵێ: من متمانەم پێتانە، ئەگەرچی هەڵەیش ڕوویدابێ، متمانەم بە توانا و هێزی جەنگیان هەیە، ئەوەی دوێنێ ڕوویدا درزێکی بچووک بوو لە پیاوانی گەورە ڕوودەدات، لە ڕووبەڕووبوونەوەی داهاتوودا دەتوانن کۆنترۆڵی جەنگەکە بکەنەوە، وانەیەک بدەنە موشریکەکان کە هەرگیز بیریان نەچێتەوە.

خوای پەروەردگار دەفەرمووێت:

﴿ٱلَّذِينَ قَالَ لَهُمُ ٱلنَّاسُ إِنَّ ٱلنَّاسَ قَدْ جَمَعُوا۟ لَكُمْ فَٱخْشَوْهُمْ فَزَادَهُمْ إِيمَٰنًا وَقَالُوا۟ حَسْبُنَا ٱللَّهُ وَنِعْمَ ٱلْوَكِيلُ ۝ فَٱنقَلَبُوا۟ بِنِعْمَةٍ مِّنَ ٱللَّهِ وَفَضْلٍ لَّمْ يَمْسَسْهُمْ سُوٓءٌ وَٱتَّبَعُوا۟ رِضْوَٰنَ ٱللَّهِ ۗ وَٱللَّهُ ذُو فَضْلٍ عَظِيمٍ ۝﴾ [آل عمران]

واتە: ئەوانەی کە خەڵکی باوەڕلاواز پێیان دەڵێن: بەڕاستی خەڵکی بێباوەڕ و خوانەناس خۆیان بۆ ئێوە کۆکردۆتەوە، خۆیان بۆ ئێوە مەڵاس داوە لێیان بترسن (خۆتان تووشی بەڵا مەکەن) بەڵام ئەوان (واتە ئیمانداران بەو پڕوپاگەندەیە) باوەڕیان زیاتر دامەزرا و وتیان: خوامان بەسە کە یارمەتیدەر و یاریدەدەرێکی چاکە. ئەوسا ئیتر موسڵمانان گەڕانەوە هاوڕێ لەگەڵ فەزڵ و ناز و نیعمەتی خواییدا هیچ ناخۆشیەکیشیان بۆ پێش نەهات، چونکە شوێنی ڕەزامەندی خوا کەوتبوون و (هەر ئەوەشیان مەبەست بوو) خوای گەورەش هەر خۆی خاوەن فەزڵ و ڕێزێکی زۆر گەورەیە.



ئەبو سوفیان بیری لەوە کردەوە بگەڕێتەوە بۆ شاری مەدینە و داگیری بکات، موسڵمانان دەربکاتە دەرەوە، چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ زیندووە و ئەبوبەکر و عومەر هەردووکیان لە ژیاندان، نەیانتوانیوە یەک دیل لە موسڵمانان بگرن، وا خێرا گەڕاونەتەوە بۆ مەککە بگرە هەرچی توانایان بوو بەکاریان هێناوە هیچ ئامانجێکی ستراتیژیان نەپێکاوە.

هەربۆیە خێرا سوپاکەی ڕێکخستەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ دەیزانی لە ئێستادا سوپاکەی زۆر ماندو و لاوازە، بەڵام پلانێکی زۆر نایابی بەکارهێنا لەخاکی حەمراء ئەلئەسەد دا، کە گەیشتە ئەوێ پیاوێکی نارد بەناوی (مەعبەدی کوڕی ئەبو مەعبەد) تا هەڕەشە و چاوترسێنی قوڕەیش بکات، ڕۆیشت و گەیشتە نێو سوپای قوڕەیش ئەبو سوفیان بانگی کرد، لەگەڵ یەکتردا کەوتنە قسە و گفتۆگۆ، ئەبو سوفیان وتی: بزانم چیت پێیە ئەی مەعبەد؟

مەعبەد وتی: موحەممەد لەگەڵ هاوەڵەکانی دەرچوونە و بەدواتانەوەن، شتی وام نەدیوە لە تووڕەیی خەریکە لەداخی ئێوەدا دەسووتێن، چاویان ئاگری لێ دەبێتەوە ژمارەیان یەکجار زۆرە.

ئەبو سوفیان: ئەی ماڵوێران ئەوە چی دەڵێیت؟ (زۆر ترسا) وا خۆم ئامادەکرد بگەڕێمەوە سەریان و هەموویان لەناو ببەم.

مەعبەد وتی: سوێند بەخوا من وای بەباش دەزانم کاری وا نەکەیت بەپەلە بگەڕێوە تا ئەوانیش هێمن ببنەوە کە جێ پێی وڵاخەکانتان ببینن گەڕاونەتەوە، ئیتر ئەبو سوفیان زۆر ترسا و بەپەلە گەڕایەوە بۆ شاری مەککە، خوای پەروەردگار ڕاستی فەرمووە:

﴿وَلَا تَهِنُواْ فِي ٱبۡتِغَآءِ ٱلۡقَوۡمِۖ إِن تَكُونُواْ تَأۡلَمُونَ فَإِنَّهُمۡ يَأۡلَمُونَ كَمَا تَأۡلَمُونَۖ وَتَرۡجُونَ مِنَ ٱللَّهِ مَا لَا يَرۡجُونَۗ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلِيمًا حَكِيمًا﴾ [النساء]

لەبەرانبەر (لەشکری بێباوەڕانەوە کە شەڕتان پێ دەفرۆشن یان بەربەستن لەڕێگەی بانگەوازی خوا) سستی و کەمتەرخەمی مەکەن و بکەونە دوایان چونکە ئەگەر ئێوە ئێش و ئازار و ماندوێتیتان بۆ پێش بێت بۆ ئەوانیش هەر پێش دێت، بەڵام ئەوەی ئێوە بەتەمان لەلایەن خواوە دەستان بکەوێت ئەوان بەتەمای نین، خوا هەمیشە و بەردەوام زانا و بەتوانایە.

پێغەمبەری خوا ﷺ وەکو پیشەی سوپای سەرکەوتوو سێ ڕۆژ لە ناوچەی (حمراء الأسد) مایەوە، چاوەڕوانی سوپای قوڕەیشی دەکرد، ئێستا ئەو لە جێگەی سەرکەوتن دایە و چاوەڕوانی دوژمن دەکات، پاشان ئەبو سوفیان لە گەڕانەوەیدا بۆ شاری مەککە کاروانێکی (عەبدولقەیسی) پێگەیشت بەرەو شاری مەدینە دەڕۆیشت، ئەبو سوفیان وتی: وا



بە موحەممەد بڵێ: خۆمان ئامادەكردووە جارێكی دیكە بێینەوە سەریان، تا خۆی و هاوەڵانی لەناو ببەین.

پاشان كاروانەكە لە ئەبو سوفیان ڕەت بوو ڕاستی نەكردو گەڕایەوە بۆ شاری مەككە، سوارەكانی عەبدولقەیس گەیشتنە لای پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوەی ئەبو سوفیان وتی گەیاندیان بە پێغەمبەر ﷺ ئەوانیش هەموو وتیان: خوای گەورە ئایەتی دابەزاند:

﴿ٱلَّذِينَ ٱسْتَجَابُوا۟ لِلَّهِ وَٱلرَّسُولِ مِنۢ بَعْدِ مَآ أَصَابَهُمُ ٱلْقَرْحُ ۚ لِلَّذِينَ أَحْسَنُوا۟ مِنْهُمْ وَٱتَّقَوْا۟ أَجْرٌ عَظِيمٌ ۝ ٱلَّذِينَ قَالَ لَهُمُ ٱلنَّاسُ إِنَّ ٱلنَّاسَ قَدْ جَمَعُوا۟ لَكُمْ فَٱخْشَوْهُمْ فَزَادَهُمْ إِيمَـٰنًا وَقَالُوا۟ حَسْبُنَا ٱللَّهُ وَنِعْمَ ٱلْوَكِيلُ ۝ فَٱنقَلَبُوا۟ بِنِعْمَةٍ مِّنَ ٱللَّهِ وَفَضْلٍ لَّمْ يَمْسَسْهُمْ سُوٓءٌ وَٱتَّبَعُوا۟ رِضْوَٰنَ ٱللَّهِ ۗ وَٱللَّهُ ذُو فَضْلٍ عَظِيمٍ ۝ إِنَّمَا ذَٰلِكُمُ ٱلشَّيْطَـٰنُ يُخَوِّفُ أَوْلِيَآءَهُۥ فَلَا تَخَافُوهُمْ وَخَافُونِ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ۝﴾ [آل عمران]

واتە: ئەوانەی بەدەم بانگەوازی خوا و پێغەمبەرەوە چوون دوای ئەوەی تووشی ناخۆشی و ئێش و زام بوون، بۆ ئەوانەیان كە چاكەیان كرد و پارێزكار بوون پاداشتی زۆر گەورە و بێسنوور ئامادەیە، ئەوانەی كە خەڵكی باوەڕ لاواز پێیان دەڵێن: بەڕاستی خەڵكی بێباوەڕ و خوانەناس خۆیان بۆ ئێوە كۆكردۆتەوە، خۆیان بۆ ئێوە مەڵاس داوە لێیان بترسن (خۆتان تووشی بەڵا مەكەن) بەڵام ئەوان (واتە ئیمانداران بەو پروپاگەندەیە) باوەڕیان زیاتر دامەزراوە وتیان: خوامان بەسە كە یارمەتیدەر و یاریدەدەرێكی چاكە. ئەوسا ئیتر موسڵمانان گەڕانەوە هاوڕێ لەگەڵ فەزڵ و ناز و نیعمەتی خواییدا، هیچ ناخۆشیەكیشیان بۆ پێش نەهات، چونكە شوێنی ڕەزامەندی خوا كەوتبوون و (هەر ئەوەشیان مەبەست بوو) خوای گەورەیش هەر خۆی خاوەن فەزڵ و ڕێزێكی زۆر گەورەیە، ئەوە بەڕاستی تەنها شەیتانە یاوەرەكانی خۆی دەترسێنێت، ئێوەی ئیماندار لێیان مەترسن، بەڵكو هەر لەمن بترسن ئەگەر ئیماندارن.

بەم شێوەیە موسڵمانان بە بۆچوونی شكستەوە بەرەو شكۆی تەواو ڕۆیشتنەوە، بەسەربەرزییەوە ڕۆڵی جەنگاوەریان بۆ گەڕاوە، لەباری دەروونی ڕوخاوەوە بۆ باری دەروونی پڕ سەروەری، گەڕانەوە بۆ دۆخی قارەمانی و سوارچاكانی خۆیان. ڕاستە موسیبەت بوو، بەڵام خێرا چارەسەریان كرد، بە مەنهەجی ڕەبانی خوای موتەعال كە هیچ خێچ و خوارییەكی تێدا نییە.



﴿لَّا يَأْتِيهِ ٱلْبَٰطِلُ مِنۢ بَيْنِ يَدَيْهِ وَلَا مِنْ خَلْفِهِۦ ۖ تَنزِيلٌ مِّنْ حَكِيمٍ حَمِيدٍ ۝﴾ [فصلت]

واتە: هیچ ناحەقی و نادروستی و ناتەواونییەک ڕووی تێناکات لەهیچ کاتێکدا، ڕەوانەکراوی زاتێکە کە خاوەنی حیکمەت و داناییە شایەنی سوپاس و ستایشە.





# هێزی ترسناکی دژی موسڵمانان

ماکوان: لەدوای گەڕانەوەی موسڵمانان لەناوچەی حەمراء ئەسەد، ئەبو سوفیان پەیامی بۆ موسڵمانان نارد، کە لەساڵی ئاییندەدا لەدۆڵی بەدردا جەنگ دەکەین، لەمانگی شەوالی ساڵی (٤)ی کۆچی، ئەبو سوفیان ئەو کاتەی دەستنیشان کرد، موسڵمانان و موشریکەکان ڕازی بوون.

بەڵام لەڕاستیدا موسیبەتی ئوحود هەندێ کاریگەری خراپی بەدوای خۆیدا هێنا، هەندێک لە هۆز و عەشیرەتەکانی عەرەب دەستدرێژی زۆریان کردە سەر موسڵمانان، گومانی تێدا نییە ئوحود سومعەی موسڵمانانی کەمکردبوو، نارەحەتترین و ناخۆشترین قۆناغی ژیانی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو سێ ساڵەیە کە بەدوای یەکدا دێن هەموو عەرەب دژیان کۆدەبنەوە، ئەگەرچی لەدوای جەنگی بەدر پێغەمبەری خوا ﷺ و دەوڵەتەکەی توانای زۆریان هەبوو بەسەر نیوەدوورگەی عەرەبیدا، ئەگەرچی زۆرینەشی هەر موشریک بوون بەڵام گوێڕایەڵ بوون بۆ دەوڵەتی ئیسلامی لەشاری مەدینە، ئەنجامی جەنگی بەدر کاریگەری لەسەریان دانابوو، موسڵمانان لەڕوی دینی و سەربازییەوە سەرکەوتوو بوون.

بەڵام دوای جەنگی ئوحود و ئەو ڕووداوانەی ڕوویدا قوڕەیش تا ڕادەیەک سومعەی بۆ گەڕاوە، لە بەرانبەردا جورئەت و دەمدرێژی و دەستدرێژی بۆ دوژمنەکانی موسڵمانان دروست بوو کە هێرش بکەنە سەر موسڵمانان بە چەک پاشان لەڕووی ڕاگەیاندنەوە.

کە دەڵێین: ڕاگەیاندن واتە: هەواڵ و باسی قوڕەیش و موسڵمانان و کاریگەری شاعیرانی سەردەم، هێنان و بردنی هەواڵ لەلایەن پۆستەچییەکانی ئەو سەردەمە، ئەمەش ئەنجامەکەی بە کوشتن و لەناوچوونی زۆرێک لە هاوەڵان کۆتایی دێت، کە خوێنی پاکیان لەپێناوی ئەو دینەدا بەخشیوە، خەڵکی فرتوفێڵ و پیلانی دۆزەخییان لەدژدا دەگێڕن، ئەوانیش ئامانجیان خۆشنوودی و کامەرانی و بەهەشت بوو بۆ خەڵکی بە گشتی.

ئەنجامی ئەو جورئەتەی هۆزەکان بۆیان دروست بوو لەسەر هاوەڵان زۆر ترسناک بوو، سەرەتا با تەماشایەکی ڕەوشەکە بکەین دوای ئوحود، دوژمنانی ئوممەتی ئیسلامی پێکهاتوون لەچوار هێزی سەرەکی. بەڵام پێش ئەوەی باسی ئەو چوار هێزە بکەم نومێر لەلام نەماوە نازانم لەکوێیە و چی بەسەر هاتووە، چوو بۆ کوێ؟ ڕووداوەکانیش من بەشەو و بەڕۆژ لەناویدا دەژیم نامەوێت جێی بهێڵم، دەمەوێت وەک خۆی بەجوانی ڕووداوەکان ڕووماڵ بکەم. کەواتە: نومێر هەر دەدۆزمەوە گرنگە بۆمن شوێن ڕووداوەکان بکەوم، دەگەڕێمەوە بۆ ناو ڕەوشەکە ئەو چوار هێزە بریتی بوون لە:



## هێزی یەکەم: قورەیش و عەرەبە هاوپەیمانەکانی

قورەیش تا ڕادەیەک هێور بوویەوە بە سەرکەوتنێکی کاتی لە ئوحود دا، بەڵام خۆی بۆ موسڵمانان مەڵاس داوە و لە پیلان و کێشە دەگەڕێت بۆ موسڵمانان، موسڵمانانیش بەبەردەوام هەموو ناوچەی بازرگای شام لەبەردەستیاندایە، قورەیش ناتوانێت هەنگاو هەڵبهێنێتەوە، بازرگانی قورەیش لەژێر هەڕەشەی موسڵماناندایە، هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ زیندووەو سەرکردایەتی دەوڵەتەکەی دەکات، وەزیرەکانی ئەبوبەکر و عومەر زیندوون، ئیدارەی دەوڵەت بەڕێوە دەبەن لەگەڵ پێغەمبەرەکەیان ﷺ.

هەرکات بیانەوێ دەتوانن هەڵبکوتنە سەر نیوەدوورگەی عەرەب، بەڵام قورەیش ئارام بوویەوە لەو ماوەیە، وەلێ دژی موسڵمانان لەسەر ئاگر دەکوڵان.

## هێزی دووەم: دووڕووەکان

ئەمانە لەناوەوەی شاری مەدینەدا بوون، ترسناکترین دوژمنی موسڵمانان بوون، لەدوای شکستی ئوحود دەنگیان بەرز کردەوە، زۆربەیان کوفری ئاشکرایان دەکرد، بە ئاشکرا دژی موسڵمانان بوون، ئەوەشمان لەبیر نەچێت عەبدوڵلای کوڕی ئوبەی کوڕی سەلوول یەک لەسەر سێی سوپاکەی گەڕاندەوە بۆ شاری مەککە لە جەنگی ئوحود دا. ئەمانە دڕک و داڵن بەپشتی موسڵمانانەوە نووساون لەنێو دەوڵەتەکەدا دەژین.

## هێزی سێیەم: یەهوود

پێغەمبەری خوا ﷺ زۆر بە ئاگایانە مامەڵە لەگەڵ یەهوود دا دەکات، چونکە زۆر باش لە سروشتی یەهوود شارەزا بوو، ئەگەر لە بەنوو قەینوقاع ڕزگاری بوو، بەڵام یەشتا دوو هۆزی گەورەی یەهوود لەشاری مەدینەدا ماون، بەنو نەزیر و بەنو قورەیزە. یەهوود بە غەدر و خیانەتەوە ناسراون، ئەوەشمان لەبیرت نەچێت بەشێک لە هۆکارەکانی جەنگی ئوحود کەعبی کوڕی ئەشرەف بوو هانی دان بۆ جەنگ، خۆی لە هۆزی بەنو نەزیر بوو.



## هێزی چوارەم: ئەعرابی ناوچەکە بەگشتی

هۆزە دەشتەکییەکان بەچواردەوری شاری مەدینەدا زۆر بوون، ئەوانیش دەستیان کرد بە فێڵ و خراپەکاری، دژی موسڵمانان دوای جەنگی ئوحود.

چونکە ژیانی دەشتەکییەکان لەسەر دزی و چەتەیی و ڕێگری بوو، پێغەمبەری خوا ﷺ لەشاری مەککەدا ڕێگری لەکارە قێزەونەکانیان دەکات، گومانی تێدا نییە ئەوانیش لە گەڕاندان بۆ ڕووخاندنی ئەو دەوڵەتە.



## چوار پیلانی ترسناک

موسڵمانان لەدوای نەهامەتی ئوحود تووشی قەیرانی زۆر هاتن، خەریک بوو ئەو بینا و دیوارە پۆڵایینەی پێغەمبەری خوا ﷺ دروستی کردبوو بیڕوخێنن.

﴿... وَتِلْكَ ٱلْأَيَّامُ نُدَاوِلُهَا بَيْنَ ٱلنَّاسِ... ﴾ [آل عمران]

واتە: دەستاودەستکردنی دەسەڵات سوننەتێکی کەونی خوای گەورەیە.

ئەو قەیران و پیلان و فێڵانە چی بوون تووشی موسڵمانان بوونەوە، دووانیان موسڵمانان زۆر سەرکەوتووانە لێی دەرچوون، بەڵام دوانی تریان زیانی زۆری لە موسڵماناندا، لەدوای جەنگی ئوحود لەماوەی مانگێکدا هەشتا هاوەڵ شەهید کران.

### پیلانی یەکەم:

بانگەشەی هۆزی ئەسەد بوو بۆ جەنگ کردن دژی موسڵمانان، سەرکردایەتی ئەو بانگەوازە کەسێک دەیکرد بەناوی (تولەیحەی کوڕی خوەیلیدی ئەسەدی) سوپایەکی زۆری کۆکردەوە، تا جەنگ دژی موسڵمانان بکەن.

پێغەمبەری خوا ﷺ سوپایەکی دژیان ئامادە کرد، بەسەرکردایەتی ئەبو سەلەمە، ئەو پیلانەی دایانڕشتبوو بۆ ئەو سوپایە توانیان سەرکەوتووبن بەسەریانداو توانی ئەو سوپایە بڵاوە پێبکات کۆکردنەوەی سوپای بەنی ئەسەد، سەری نەگرت و فەشەلی هێنا، ئەمەش لەساڵی چواری کۆچیدابوو.

### پیلانی دووەم:

کۆکردنەوەی سوپای (هۆزی هوزەیل)، بەسەرکردایەتی کەسێکی جەنگزان بەناوی (خالیدی کوڕی سوفیانی هوزەیلی)، هۆزو عەشیرەت و تیرەکانی هوزەیل زۆر بوون، سوپایان بۆ سەر موسڵمانان کۆکردەوە، خالیدی کوڕی سوفیان یەکێک بوو لە سوارچاک و ئازاکانی عەرەب، پێغەمبەری خوا ﷺ هاوەڵی بەڕێزی (عەبدوڵڵای کوڕی ئونەیس) بۆ کوشتن و ئیغتیال کردنی ڕاسپارد.

عەبدوڵڵا خۆی دەگێڕێتەوە و دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ ناردی بەشوێنمدا بۆ ئەوەی ئەو پیاوە بکوژم، فەرمووی: هەواڵم پێ گەیشتووە کە (خالیدی کوڕی سوفیانی کوڕی



ئوبەیح)ی هوزەلی خەڵک بۆ جەنگ لە دژمان کۆدەکاتەوە، ئەو لە جێگەیەکدا بەناوی عورەنە-یە برۆ بیکوژە، لەناوی ببە بۆ ئەوەی ئەو کارەی ئەو سەرنەگرێت.

عەبدوڵلا وتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وعلى آله وسلم هەندێ نیشانەیم بۆ باس بکە بتوانم بیناسمەوە، پێغەمبەر صلى الله عليه وعلى آله وسلم فەرمووی: کە بینیت شێوەی (پێستی لە خاکی بێئاو دەچێت، هەمووی قڵیشاوە) وە لەرز دەتگرێت (لەشت دەلەرزێت) عەبدوڵلا دەڵێ: دەرچووم شمشێرەکەم تیژکرد تا گەیشتمە ناوچەی عورەنە، لەگەڵ کۆمەڵێکدا لەجێگەیەک ماڵیان دروست کردبوو بۆ ئافرەتەکانی لەگەڵیدابوون، پاشان دەڵێ: کاتی نوێژی عەسر بوو کە چوومە ئەو جێگەیە بینیم ئەو وەسفە بوو کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وعلى آله وسلم بۆی باسکردبووم، (دەموچاوی قڵیشابوو)، نزیکی کەوتمەوە بەڵام لەوە ترسام بکەومە گفتوگۆ لەگەڵیدا نوێژەکەم بفەوتێت، لەکاتی قسەکردنمان نوێژەکەم لەدەست دەرچێت، بۆیە نوێژم دابەست، بەدەم ڕێگەوە سوجدە و ڕکووعم بەسەر دەبرد، نوێژی عەسرم کرد.

(ئەم شێوە نوێژە ناوی نوێژی (الطالب المطلوب) بەو شێوەی کە عەبدوڵلای کوڕی ئونەیس کردی، پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وعلى آله وسلم دانی پێدا نا کە کارێکی چاکی کردووە)

دەڵێ: دوای ئەوەی لە نوێژەکەم تەواو بووم چوومە لای وتی: تۆ کێیت؟ وتم یەکێک لە پیاوەکانی عەرەب، گوێبیستی ئەوەبووم کە پیاوێک خەریکی کۆکردنەوەی سوپایە منیش بۆ ئەوە هاتووم؟

ئەویش واتە: خالیدی کوڕی سوفیان وتی: بەڵێ من ئەو کەسەم و خەریکی ئەو کارەم.

عەبدوڵلا دەڵێ: ماوەیەک لەگەڵیدا ڕۆیشتم، تا بردمە جێگەیەک دەستم لێی گیر بوو، خوای گەورە بۆی ئاسان کردم و شمشێرم لێی دەرهێنا و کوشتم، لاشەکەیم جێهێشت و گەڕامەوە لای پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وعلى آله وسلم دوای هەژدە ڕۆژ، کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وعلى آله وسلم بینیمی فەرمووی: (دەموچاوی سەرکەوتنی پێوە دیارە)، منیش وتم: ئەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وعلى آله وسلم کوشتم، پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وعلى آله وسلم فەرمووی:ڕاست دەکەیت.

پاشان پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وعلى آله وسلم هەڵسا منی لەگەڵ خۆیدا برد، چووە ماڵی خۆی و گۆچانێکی بۆ هێنام، فەرمووی: ئەوە بگرە با لەلات بمێنێتەوە. عەبدوڵلا دەڵێ: بە گۆچانەکەمەوە چوومەوە، هەموو خەڵک پرسیاریان دەکرد ئەو گۆچانە چییە؟ منیش دەمگوت : پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وعلى آله وسلم پێیداوم فەرمانی پێکردووم لەگەڵ خۆمدا هەڵیبگرم، وتیان: ئەی بۆ ناچی لە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وعلى آله وسلم بپرسیت ئەو گۆچانەی بۆچی پێداوی؟ دەڵێ: چوومە خزمەت پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وعلى آله وسلم عەرزم کرد ئەو گۆچانەت بۆچی پێداوم؟



پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەوە بەڵگە و نیشانەیەکە لەنێوانی من و تۆدا بۆ قیامەت، بۆ ئەوەی کاتێک لێپرسینەوەت لەگەڵ کرا خاوەنی ئەو نیشانە بیت، عەبدوڵڵای کوڕی ئونەیس دەڵێ: هەمیشە لەگەڵ شمشێرەکەمدا هەڵمدەگرت، تا ئەو ڕۆژەی وەفاتی کرد و لەگەڵیدا خستیانە نێو کفن و گۆڕەکەیەوە. موسڵمانان زۆر بەباشی لەو دوو قەیرانەدا دەرچوون، بەڵام دوو قەیرانەکەی تر زۆر خەمناک بوو.

## پیلانی سێیەم:

ئەم ڕووداوە لە مانگی سەفەری ساڵی (٤)ی کۆچی ڕوویدا، لەدوای کوشتنی هوزەیل، مەبەستم خالیدی کوڕی سوفیانی هوزەیلییە، تیرەکەی کە لە بەنی لحیان-ە چوون بۆلای دوو هۆزی تر، بەناوی (عەزەل و قارە) داوا لە پێغەمبەری خوا ﷺ بکەن چەند کەسێکیان بۆ بنێرێت تا فێری دینداریيان بکات، وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ کۆمەڵێک لە هاوەڵانت بنێرە تاکو قورئان و ئەحکامی شەرعیمان فێر بکەن.

پێغەمبەری خوا ﷺ دە هاوەڵی بۆ هەڵبژاردن لە شارەزاکانی دین و شەریعەت و قورئان (عاسمی کوڕی سابت)ی کردە ئەمیری دە هاوەڵەکە، بەڵام لە پشتی ئەمەوە پیلان هەبوو بۆ فرۆشتنی هەر دە هاوەڵەکە بە قورەیش، ئەم هاوەڵانە گەیشتنە نزیکی هۆزەکە لە جێگەیەک پێی دەوترێ: (الرجیع) هۆزی هوزەیل لەوێدا بۆیان دانیشتبوون، بۆ جەنگ و کوشتن و ئەسیر کردنیان، هەموو چواردەوریان بەشمشێر گیرا، بۆ ئەوەی جەنگیان لەگەڵ بکەن، بەڵام بەئاشکرا وتیان: ئێمە نامانەوێت بتانکوژین، بەڵام بە قورەیشتان دەفرۆشین و لە بەرانبەردا پارە وەردەگرین، بە ڕاشکاوانە ئامانجی خۆیان وت، چونکە قورەیش وتوویەتی: هەرکەس لە هاوەڵانی موحەممەدمان بۆ بهێنێت ئێمە دەیانکوژین لەبەرانبەر کوژراوەکانمان لە بەدرو ئوحود، بۆ ئەوەی یاری بە لاشەیان بکەین و لاشەیان بشێوێنین.

عاسمی کوڕی سابت قبووڵی نەکرد وتی: هیچ عەهدو پەیمانێک لەگەڵ موشریک نابەستم، دەستی کرد بە جەنگکردن هەتاکو شەهید بوو لەگەڵ شەش هاوەڵی تر لەوێدا شەهید بوون، بەڵام سێ دانەیان بەدیل گیران (زەیدی کوڕی دەسنە، خوبەیبی کوڕی عەدی و عەبدوڵڵای کوڕی تارق) ئەم سێ هاوەڵە بەرەو شاری مەککە بران لەنزیک ناوچەی زەهران(ظهران) عەبدوڵڵای کوڕی تاریق، دەستی خۆی ڕاپرسکاند و دەستی دایە شمشێرێک و جەنگی کرد، هەموو لێی کۆبوونەوە هەر لەوێدا بەبەرد شەهیدیان کرد و گۆڕەکەی لە (زەهران)ە.

هەردوو هاوەڵەکەی تر بردیانن بۆ شاری مەککە و لەوێ لە بازاڕی مەکەدا فرۆشران بە (بەنوو حارس بن عامر بن نەوفل) کوشتیانەوە لەجیاتی باوکی حەلیفەکەی کە برای خۆی بوو



لە دایکەوە. پاشان زەید فرۆشرایە سەفوانی کوڕی ئومەییە بۆ ئەوەی لەبری باوکیدا بیکوژێتەوە، هەردووکیان لە مانگی زولقیعدەدا فرۆشران کە مانگێکە لە مانگە حەرامکراوەکان، هەردووکیان زیندانی کران تا مانگی موحەڕەم تەواو بوو، خوبەیب لە ماڵێکدا زیندانی کرابوو، ئافرەتی ماڵەکە گوێی لە دەنگی دەبوو خوبەیب قورئانی دەخوێند و دەگریا، ئافرەتەکە ناوی (ماریە) بوو خزمەتکاری حیجر بوو، جارێک هاتە لای وتی: چیت دەوێ بۆت بکەم؟

خوبەیب لە وەڵامدا وتی: هیچ جۆرە شەراب و مەیەک ناخۆمەوە تەنها ئاوی سازگارم بدەرێ پاشان خواردنی قومارم بۆ مەهێنە، ئاگادارم بکەوە لەو کاتەی دەیانەوێ بمکوژن. ئافرەتەکە ئاگاداری کردەوە کەی دەیکوژن، هیچ ترسێکی نەبوو تەنها وتی: ڕێگەم بدەن دوو ڕکات نوێژ بکەم، وازیان لێ هێنا و بەپەلە دوو ڕکات نوێژی کرد وتی: ئەگەر لەبەر ئەوە نەبوایە دەیانوت: دەترسێت نوێژەکەم دوور و درێژ دەکردەوە، پاشان بەدارێکەوە بەستیانەوە و لەخاچیان دا، لێیان پرسی: حەزت دەکرد موحەممەد لەجێگەی تۆ بووایە، لەوەڵامدا وتی: سوێند بەخوا حەزناکەم دڕکێک بچێت بەقاچی موبارەکیدا، (ئەبو سروعە کوڕی حارس کوڕی عامر) کوشتی و بەشەهیدی گەڕایەوە لای پەروەردگاری.

ئەوەی سەرنجی منی ڕاکێشاوە خۆشەویستی بێوێنەی هاوەڵانە بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ کە لەسێدارە دراوە بۆ کوشتن، لەگەڵ ئەوەشدا حەزناکات پێغەمبەری خوا ﷺ دڕکێک بچێت بەقاچیدا لەماڵەکەی خۆیدا.

بەهەمان شێوە لەکاتی شەهیدکردنی زەیدی کوڕی دەسنەدا پرسیاریان لێ کرد حەزت دەکرد پێغەمبەری خوا ﷺ لەشوێنی تۆ بووایە، ئەویش هەمان وەڵامی دایەوە. ئەبو سوفیان وتی: کەسم نەدیوە بەوێنەی هاوەڵانی موحەممەد خۆشیان بووێت، ئەو کەسەی زەیدی کوشت ناوی (نیستاس) بوو.

کاتێک ئەمیرەکەیان لە ڕەجیع شەهید بوو، واتە: (عاسمی کوڕی سابت) کەسێک شەهیدی کرد ناوی هوزەیل بوو، ئەو کات دەیویست سەری عاسم ببڕێت و بیبات بۆ لای ئافرەتێک بەناوی (سەلافەی کچی سەعدی کوڕی شەهید)ە، ئەو ئافرەتە نەزری کردبوو هەرکەسێک کەللە سەری عاسمی بۆ بێنێت پارەی دەداتێ، دەیویست لە کەللە سەری عاسم دا شەراب و عارەق بخواتەوە، چونکە کوڕەکەی لە جەنگی ئوحود دا بەدەستی عاسم کوژرا بوو.

هوزەیل هەرچی هەوڵیدا بۆ سەربڕینی عاسم نەیتوانی، کۆمەڵێک زەردەواڵەی لێ پەیدا بوو ناچار وازی هێناو وتی: دوایی دەگەڕێمەوە سەری، لەدوورەوە دانیشت تا زەردەواڵەکان بڕۆن، دەڵێ: لەپڕ هەورێک دامێنی شۆڕکرد کە چوومە جێگاکە لاشەی عاسم نەمابوو!



لەدواییدا بۆ عومەری کوڕی خەتابیان گێڕایەوە، ئەویش فەرمووی: عاسم نەزری کردبوو هەتا لەژیاندایە دەستی بەر موشریکەکان نەکەوێت، لەژیانیدا خۆی نەزرەکەی بردە سەر لەدوای مردنیشی خوای گەورە لاشەکەی پاراست و هیچ موشریکێک نەیتوانی یاری بەلاشەی بکات، مەلائیکەت لاشەکەیان برد. ئەوەی باسم کرد ڕووداوی ڕەجیع بوو کە دە هاوەڵ تێیدا بوونە قوربانی.

## پیلانی چوارەم:

تراژیدیایەکی بێوێنەیە کارەساتی بیری مەعونە، لەمانگی سەفەری ساڵی (٤)ی کۆچی، پیاوێک بەناوی (ئەبو بەرائی کوڕی عامری کوڕی مالیک) لە هۆزی عامر کە هۆزێکی زۆر گەورەن، ئەو پیاوە پیاوێکی زمان لووس و دووڕوو خۆبەرە پێش بوو، چەند دیارییەکی بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ هێنا، پێغەمبەری خواش ﷺ بانگەوازی کرد بۆ ئیسلام، موسڵمان نەبوو داوای کاتی کرد، بەڵام بە پێغەمبەری خوا ﷺی وت: ئەی موحەممەد ﷺ ئەگەر کۆمەڵێک لە هاوەڵانت بنێری بۆ نێو هۆز و عەشیرەتەکەمان بانگەوازمان بکەن، هیوادارم وەڵامیان بدەنەوە. پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: دەترسم شتێکیان لێ بکەن، ئەبو بەڕا وتی: من لەخۆمیان دەگرم و ناهێڵم کەس زەفەریان پێ ببات.

پێغەمبەری خوا ﷺ ڕازی بوو (٧٠) هاوەڵی شارەزا لە قورئان و شەریعەت و ئەحکام کە شەو و ڕۆژ خەریکی خوێندنەوەی زانستی ئیسلامی بوون بە ئەمیرایەتی هاوەڵی بەڕێز: (مونزیری کوڕی عەمر و خەزرەجی) لەناویاندا هاوەڵانی بەڕێزی وەکو: (حەڕامی کوڕی میلحان) و (عامری کوڕی فەهیرە)ی تێدابوو، گەیشتنە نێو خاکی بەنی عامر لەلای بیرێکی ئاو لایاندا، حەڕامی کوڕی میلحانی نارد بۆ لای هۆزی بەنی عامر کە ناوی سەرۆک هۆزەکە عامری کوڕی توفەیل بوو، ئەوان لای بیری مەعونە چاوەڕێیان کرد کە برازای (ئەبو بەرائی کوڕی عامری کوڕی مالیک) بوو، بەڵام عامری کوڕی توفەیل زۆر دڕندەو خراپەکار بوو، لەدواوە کەسێکی دانا کە حەڕام نامەکەی پێغەمبەری خوا ﷺی دایە، ڕمێکیان کرد بەسکیدا و غەدریان لێ کرد و کوشتیان، بەڵام حەڕام پێش گیان دەرچوونی خوێنەکەی دا لە دەموچاوی وتی: (سوێند بەخوای کەعبە سەرکەوتم)، دووجار دووبارەی کردەوە هەتا گیانی دەرچوو، ئەو کەسەی کوشتی ناوی (جەباری کوڕی سەلما) بوو، وتی: سەرکەوتنی چی من کوشتم!

پاشان جەبار زۆر لەلای سەیر بوو هەر پرسیاری لە قسەکەی میلحان دەکرد، بۆ وای وتووە! تا پێیان ڕاگەیاند موسڵمانان کە لەپێناوی خوادا دەمرن شەهید دەبن. ئەویش گەیشتنە بە



پلەی سەرکەوتن، پاشان هۆکاری ڕۆشنبیری میلحان و وتەکەی، وای لێکرد بڕواتە شاری مەدینە و موسڵمان ببێت، هۆکاری ئیسلام بوونی غەدرەکەی بوو.

هۆکاری چی بوو عامری کوڕی توفەیل بەم شێوەیە بەرخوردی لەگەڵ نێردراوەکەی پێغەمبەر کرد؟ هۆکارەکەی دەگەڕێتەوە بۆ شاری مەککە، کاتێک پێغەمبەری خوا ﷺ داوای داڵدەدانی لە هۆزەکانی عەرەب دەکرد، لەنێویاندا داوای لە بەنی عامر کرد، کە عامری کوڕی توفەیل سەرۆک هۆزیان بوو.

بە پێغەمبەری خوا ﷺی وت: من لە هەموو عەرەب داڵدەت دەدەم، بەڵام سێ مەرجم هەیە:

یەکەم: هەموو خەڵکی دەشتەکان بۆ تۆ.

دووەم: هەموو خەڵکی گرد و شاخییەکان بۆ من.

سێیەم: یان لەدوای تۆ من خەلیفەت بم، یاخود بە غەتەفان جەنگت لەگەڵ دەکەم، بێگومان ئەو سەردەمە پێغەمبەری خوا ﷺ هەموو مەرجەکانی ڕەت کردەوە، چونکە مەرجی جاهیلی بوون، ئەویش هەر ئەو داخە لەدڵیدا بوو، بۆیە هەر نامەکەی پێغەمبەری خوا ﷺی نەخوێندەوە، خەڵکی بەنی عامر و بەنی سولەیمی کۆکردنەوە، چوونە سەریان و هەموویانیان شەهید کرد. تەنها هاوەڵێک لەناویاندا دەرچوو، بەناوی (کەعبی کوڕی زەید) ئەویش بریندار بوو، جێیان هێشت وایانزانی مردووە، پاشان دوو کەسیان دوور کەوتبوونەوە لە حەفتا کەسەکە کە بینییان باڵندەی گۆشتخۆر بەسەر لاشەکاندا کۆبوونەتەوە ئەوانیش بەپەلە گەڕانەوە، یەکێک لەوانە مونزیری کوڕی عوفییە بوو، جەنگی لەگەڵیاندا کرد تا ئەویش شەهید بوو، کەسی دووهەم: (عەمری کوڕی ئوممەییە) بوو بەدیل گیرا، عامری کوڕی توفەیل لەگەڵ خۆیدا بردی، کە گەیشتەوە لای بەنی عامر دایکی نەزری کردبوو بەندەیەک ئازاد بکات، ئیتر عەمری کوڕی ئوممەییە لە ڕێگەدا بەرەو شاری مەدینە دوو کەسی لە هۆزی بەنی کیلاب هەر لە تیرەی بەنی عامر، هەردووکیانی کوشت لە حەقی هاوڕێیەکانی، بەڵام نەیزانی کە عەهدیان لەلای پێغەمبەری خوا ﷺ وەرگرتووە، کە ڕووداوەکەی بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ گێڕایەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: دەبێ دییەکانیان )بەدەل خوێن) بدەین، چونکە پەیمانیان لێ وەرگرتووین.

ئەوە ڕەوشت بەرزی ئیسلام و موسڵمانان و پێغەمبەرەکەیانە ﷺ، حەفتا کەسیان بە غەدر و خیانەت لێ شەهید کردوون، دوو کەس لەوان بەهەڵە کوژراوە دەبێت خوێنەکەی بدەن!



ئەوەش گەورەیی ئیسلام و بانگەوازە حەق و ڕاستەکەی لە جیهاندا بڵاوی دەکاتەوە، ئیسلام و پێغەمبەرەکەی ڕەحمەتن بۆ هەموو جیهان.

ئەمەش ئەو پلانە چەپەڵە بوو کە لە مانگی سەفەری ساڵی (٤)ی کۆچیدا ڕوویدا، حەفتا کەس لە بیری مەعونە و دە کەس لە رەجیع شەهید بوون، بەدەستی سێ هۆز کە بریتی بوون لە بەنی (عامرو ڕەعل و زەکوان) پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ یەک مانگ لەهەموو نوێژەکاندا قنووتی دەخوێند دوعای لێدەکردن لە نوێژی جەهرو نهێنیدا.

هەموو ڕووداوەکە لە یەک مانگ ڕوویدا کاریگەری زۆری لەسەر موسڵمانان و دەوڵەتی ئیسلامی دانا، پێشتریش لە جەنگی بەدر و ئوحود دا موسڵمانان زۆریان لێ شەهید بوو.



## پیلانێکی نوێ بۆ کوشتنی پێغەمبەری خوا ﷺ لەلایەن جوولەکەوە

ماکوان لەدوای ڕووداوەکانی ڕەجیع و بیری ماعوونە دوو کەس بەهەڵە کوژران، پێغەمبەری خوا ﷺ وەفدێکی لە کۆمەڵێک لە هاوەڵان ڕێکخست، کە ئەبو بەکر و عومەر و عەلی و کۆمەڵێک بوون چوون بۆ لای بەنوو نەزیر بۆ ئەوەی لەسەر ئەو عەهدو پەیمانەی کە لەنێوانیاندا هەیە هاوکاربن، لەدانی خوێنی دووکەسە کوژراوەکە بەناحەق بەدەستی عەمری کوڕی ئومەییەی زەمری کوژرابوون بەهەڵە، کاتێک پێغەمبەری خوا ﷺ تەشریفی برد داوای هاوکاری کرد بۆ دانی خوێنی دوو کەسە کوژراوەکە زۆر بەڕێزەوە جوولەکەکانی بەنوو نەزیر وتیان: بەسەرچاو تۆ چیت پێ خۆشە ئەی ئەبو قاسم ئێمە هاوکاریت دەکەین.

لەکاتی قسەکانیدا پیلانێکیان داڕشت لەگەڕانەوەی پێغەمبەردا ﷺ بەناو گەڕەک و قەڵای بەنوو نەزیر بەردێک لە سەربانێکەوە بخەنە سەر پێغەمبەری خوا ﷺ لەکاتی ڕەت بوونیدا. ئەیانزانی موسڵمانان کارەسات دوای کارەسات تووشیان بووە، بۆیە بەهەلیان زانی سەرۆکی دەوڵەتی ئیسلامی کە پێغەمبەری خوایە ﷺ بکوژن.

لەنێو مەجلیسی پیلانەکەدا وتیان: کێ بەهێزە و بەردەکە فڕێ دەدا بۆ موحەممەد، ڕزگارمان بکات لەدەستی ئیتر پشوو بدەین؟ کەسێک بەناوی (عەمری کوڕی جەحاش) وتی: ئەو کارە ئەنجام دەدەم پێش ئەوەی عەمر بەکارەکە هەڵبستێت و بڕوات جووبرەیل -سەلامی خوای لێبێت-پێغەمبەری خوا ﷺی ئاگادار کردەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ خێرا هەڵسا و بێ قسەکردن و خواحافیزی لەلایان ڕۆیشت و هاوەڵان شوێنی کەوتن.






جولەکەکانی چواردەووری مەدینە

پێغەمبەری خوا ﷺ خێرا گەڕایەوە بۆ نێو شاری مەدینە، هاوەڵان زۆریان لەلا سەیر بوو کەس نەیزانی چی ڕوویداوە، پێغەمبەری خوا ﷺ سوپای کۆکردەوە، خێرا بڕیاریدا کە نابێت بەنو نەزیر لەشاری مەدینەدا بمێنن. هاوەڵان هۆکارەکەیان پرسی پێغەمبەری خوا ﷺ ڕووداوەکەی بۆ گێڕانەوە، پلانەکەی لەلایەن ئاسمانەوە بۆ ئاشکرا بوو.

سوپا ئامادەبوو بە سەرکردایەتی هاوەڵی لاوی خوێن گەرم (موحەممەدی کوڕی مەسلەمە) دەبێت ئەمریان پێ بکات بەزووترین کات شاری مەدینە جێ بهێڵن و نەمێنن، ماوەی دە ڕۆژیان بۆ دانان، دوای ئەو دە ڕۆژە هەر کەسێک لە بەنی نەزیر ببینرێت دەستبەجێ لە گەردنی دەدرێت، لەماوەی ئەو دە ڕۆژەدا عەبدوڵلای کوڕی ئوبەی کوڕی سەلوول سەرۆکی مونافیقەکان وەفدی دەنار کە لە شاری مەدینە دەرنەچن، ئەم هاوکاریان دەکات و پشتیان دەگرێت و سەریان دەخات.

خوای گەورە بۆ موسڵمانانی ئاشکرا کردو فەرمووی:



﴿أَلَمۡ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ نَافَقُواْ يَقُولُونَ لِإِخۡوَٰنِهِمُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِنۡ أَهۡلِ ٱلۡكِتَٰبِ لَئِنۡ أُخۡرِجۡتُمۡ لَنَخۡرُجَنَّ مَعَكُمۡ وَلَا نُطِيعُ فِيكُمۡ أَحَدًا أَبَدًا وَإِن قُوتِلۡتُمۡ لَنَنصُرَنَّكُمۡ وَٱللَّهُ يَشۡهَدُ إِنَّهُمۡ لَكَٰذِبُونَ ۝ لَئِنۡ أُخۡرِجُواْ لَا يَخۡرُجُونَ مَعَهُمۡ وَلَئِن قُوتِلُواْ لَا يَنصُرُونَهُمۡ وَلَئِن نَّصَرُوهُمۡ لَيُوَلُّنَّ ٱلۡأَدۡبَٰرَ ثُمَّ لَا يُنصَرُونَ ۝﴾ [الحشر]

واتە: ئایا سەرنجت نەداوە لەوانەی دووڕووبوون و بەبرا بێباوەڕەکانیان لە خاوەن کتێبەکان دەڵێن: ئەگەر ئێوە دەربکرێن ئێمەش لەگەڵتاندا دەردەچین، هەرگیز دژی ئێوە بەقسەی کەس ناکەین، خۆ ئەگەر جەنگتان دژ بکرێت ئێمە پشتیوانیتان لێ دەکەین، بەمەرجێک خوا خۆی شایەتە کە ئەوانە درۆزنن، سوێند بەخوا ئەگەر دەربکرێن لەگەڵیاندا دەرناچن، ئەگەر جەنگیان دژ بکرێت پشتیوانییان لێ ناکەن ئەگەر پشتیوانیشیان لێ بکەن، پاش تاوێک پشت هەڵدەکەن و سەرکەوتوو نابن.

دووڕووەکان زۆر ترسناک و بەدفەڕ بوون لەسەر موسڵمانان و دەوڵەتی ئیسلامی، زۆر بەسادەیی ئەوانە کافرن و لەبەرگی ئیماندا دەردەکەون، هەربۆیە خوای پەروەردگار دەفەرمووێت:

﴿إِنَّ ٱلۡمُنَٰفِقِينَ فِي ٱلدَّرۡكِ ٱلۡأَسۡفَلِ مِنَ ٱلنَّارِ وَلَن تَجِدَ لَهُمۡ نَصِيرًا ۝﴾ [النساء]

واتە: بەڕاستی دووڕووەکان لەچینی هەرە خوارەوەی ناو دۆزەخن هەرگیز بۆ ئەوان پشتیوانێکت دەستناکەوێت.

لەکافر خراپتر سزا دەدرێن، سزایان لەوان زیاترە، هەندێک سیفاتی یەهوود هەیە پێویستە موسڵمانان باش بیزانن، لەخوا ناترسن کە ڕزق و ڕۆزی و ژیانیانی بەدەستە، بەڵام لە موسڵمانان دەترسن، خوای گەورە دەفەرمووێت:

﴿وَلَتَجِدَنَّهُمۡ أَحۡرَصَ ٱلنَّاسِ عَلَىٰ حَيَوٰةٍ وَمِنَ ٱلَّذِينَ أَشۡرَكُواْ يَوَدُّ أَحَدُهُمۡ لَوۡ يُعَمَّرُ أَلۡفَ سَنَةٍ وَمَا هُوَ بِمُزَحۡزِحِهِۦ مِنَ ٱلۡعَذَابِ أَن يُعَمَّرَ وَٱللَّهُ بَصِيرُۢ بِمَا يَعۡمَلُونَ ۝﴾ [البقرة]

واتە: سوێند بێت ئەو جوولەکانە دەبینیت کە لەهەموو خەڵکی پەرۆشترن بۆ دونیا و ژیانی دونیا، بەهەرجۆرێک بێت، هەتا بگرە لە هاوەڵپەرست و موشریکەکانیش، هەریەک لەوانە ئاوات دەخوازێت کە هەزار ساڵ تەمەنی بێت، هەرچەندە وەنەبێت تەمەنی درێژیان لە سزا ڕزگاریان بکات، خوایش زۆر بینایە بەو کردەوانەی ئەنجامی دەدەن.



ڕەوشەکە سەختە بەڵام یەهوود خیانەتکارە و هەمیشە وەکو مار خۆی مەڵاس داوە، بۆ پێوەدانی موسڵمانان، بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ ناچار ڕووبەڕوویان بوویەوە، ئەنجام هەرچی بێت دەبێ بەنی نەزیر لەنێو مەدینەدا بەهیچ شێوەیەک بوونیان نەمێنێت، خیانەتی گەورەیان کردووە، هەوڵی کوشتنی سەرۆکی دەوڵەتەکەیان داوە، ئەگەرچی لەمانگی داهاتوو لە شەعباندا ساڵی (٤)ی کۆچییە، موسڵمانان خۆیان ئامادە کردووە بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی قوڕەیش و پەیمانیان دۆلی بەدرە وەکو ساڵی دووی کۆچی.

دەگەڕێمەوە بۆ لای سەرۆکی بەنی نەزیر حویەی کوڕی ئەختەب، کە وەفدی عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی کوڕی سەلوولی بینی و پەیمانی هاوکاری دابوونێ، وەڵامی نارد بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ وتی: کە ناچنە دەرەوە و جەنگ دەکەن، ئنجا پێغەمبەری خوا ﷺ خۆی و سوپای ئامادەکرد بۆ سەریان، لەشاری مەدینەدا شەش ڕۆژ گەمارۆی دان، هاوەڵی بەڕێز عەبدوڵڵای کوڕی مەکتوومی کردە ئەمیر و خۆی لە بەرەی جەنگدا بوو، ئەم جەنگە لەمانگی ڕەبیعول ئەوەل دا بوو، دوای ئەوەی موونافیقەکان هیچیان بۆ نەکردن و پاشەکشەیان کرد، نەیانتوانی یەهوود سەربخەن، یەهوود ترس و بیم چووە دڵیان و خۆیان بۆ نەگیرا، یەکێک لە سەربازانی خوای گەورە (ترسە)، دەینێرێت بۆ دوژمنانی ئەو دینە، خوا فەرمانی کرد دارخورماکانیان ببڕنەوە،، لەسەر دارخورماکانەوە تیر بهاوێن بۆ موسڵمانان، هەربۆیە فەرمانیکرد بە سووتاندن و بڕینەوەیان لە نزیکی قەڵاکانیان

چارەیان نەما و خۆیان دا بەدەستەوە، لەناو هەموو هۆزی جوولەکەی بەنو نەزیر تەنها دوو کەس موسڵمان بوون، ئەویش (یامین کوڕی عومەیر) لەگەڵ (ئەبو سەعد کوڕی وەهب)، جوولەکەکان داوایان لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد کە شاری مەدینە جێدەهێڵن بەس نەکوژرێن، پێغەمبەری خوا ﷺ ڕازی بوو بەو مەرجەی هەموو چەکەکانیان دابنێن، تەنها سەروەت و سامانیان بە وشتر بەرن، هەموو ڕویان کردە باکووری شاری مەدینە بۆ ناوچەی خەیبەر، کە زۆرترین جوولەکەی تێدا دەژیا.



## چوونی سوپا بۆ جەنگی بەدری دووەم

لەدوای دەرچوونی بەنو نەزیر پێغەمبەری خوا ﷺ چەند هێرشێکی کردە سەر عەرەبەکانی نەجد، ئەوانەی لە بەنی عامر و قارلە و عەزەل....هتد خیانەتیان کرد، هەموو هەڵاتن سەرلەنوێ سەروەری و دەسەڵات بۆ موسڵمانان لە ناوچەکەدا گەڕایەوە، پاشان کاتی پەیمانی جەنگی بەدرە، بڕیاریان وابوو قورەیش و موسڵمانان ساڵی (٤)ی کۆچی لەمانگی شەعبان هەردوو سوپا بۆ جەنگ بەیەکتر بگەن، ئەم جێگا و کات و پەیمانە ئەبو سوفیان داینا و پێغەمبەر ﷺ ڕازی بوو.

پێغەمبەری خوا ﷺ لەکاتی خۆیدا دەرچوو بە (١٥٠٠) موجاهیدەوە، لە مانگی شەعبانی ساڵی (٤)ی کۆچی لەسەر شاری مەدینە، عەبدوڵڵای کوڕی ڕەواحەی دانا، ئاڵای سوپاکەی دایە عەلی کوڕی ئەبو تاڵیب کە (١٠) سواری لەگەڵدا بوو، لەولاشەوە ئەبو سوفیان بە (٢٠٠٠) سەربازی موشریکەوە لەشاری مەککە دەرچوون و (٥٠) سواری لەگەڵدا بوو، گەیشتنە ناوچەی (زەهران) لەوێدا ئەبو سوفیان بیانوویەکی دروستکرد بۆ گێڕانەوەی سوپا کە، سوپاکەی گەڕاندەوە شاری مەککە بەهەنجەتی (بیانووی) ئەوەی ساڵی باران و تێراوکردنی دارە، هەندێک بیانووی تر لە خواردنەوەی شیر، پاشان ئەهلی مەککە کەوتنە گاڵتەکردن پێیان و ناویان نا سوپای دەرچوو بۆ خواردنەوەی شیر گەڕانەوە، پاشان زانرا کە پلانی ئەبو سوفیانە بۆ گەڕانەوەیان، توانای جەنگیان نەبوو، تەنها بۆ ئەوەیش دەرچوو کە وەعدەکەی خۆی بباتە سەر و نەڵێن: خاوەنی پەیمان و گفتی خۆی نەبوو، تەنانەت یەک کەس لە قیاداتی موشریک دژی بۆچوونە گاڵتە جاڕییەکەی ئەبو سوفیان نەبوو، هەر (٢٠٠٠) سەربازەکە گەڕانەوە بۆ شاری مەککەی پیرۆز. ئەبو سوفیان پیاوێکی نارد بۆ نێو سوپای موسڵمانان بۆ ئەوەی قسە لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ بکات، بەناوی (نەعیم) بۆ ئەوەی ترس بخاتە دڵی موسڵمانان و پێغەمبەری خوا ﷺ بیانگەڕێننەوە، گەڕانەوەی موسڵمانان ببێتە بیانوو بۆ گەڕانەوەی ئەبو سوفیان.

بەڵام پێغەمبەری خوا ﷺ هەر گوێی پێنەدا و گرنگی پێنەدا بەژمارەی سوپای دوژمن، قسەیەکی زۆر ئازایانەی بۆ نەعیم کرد و فەرمووی: سوێند بەوەی گیانی منی بەدەستە، ئەگەر کەسم لەگەڵ دەرنەچووایە خۆم بەتەنها دەردەچووم (لو لم يخرج معي أحد، لخرجت وحدي).

پێغەمبەری خوا ﷺ هەشت ڕۆژ لەخاکی بەدردا مایەوە، چاوەڕوانی ئەبو سوفیانی دەکرد بۆ ئەوەی هەموو عەرەب و قورەیش بزانێت کە موسڵمانان ناترسن و



پڕوپاگەندەی سەرکەوتن دەکەن لە ئوحود دا، بەڵام شڵەژانێکی کاتی بوو بۆ موسڵمانان شکست نەبوو، وا خۆیان ئامادە کردووە بۆ جەنگ، ئەوە قوڕەیشە ترسی لێ نیشتووە توانای جەنگی نییە.



چالاکی سەربازی پێغەمبەری خوا ﷺ لە نێوان جەنگی بەنو قەینوقاع و جەنگی بەنو نەزیر



## دوای بەدری بچووک

بۆ هەموو لایەک ئاشکرا بوو کە موسڵمانان هیچ ترسێکیان لە قورەیش نییە، بەڵکو قورەیش ترسی لە موسڵمانان هەیە، هەر لەخاکی بەدرەوە پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ تەمێکردنی هێرشی کردە سەر زۆرێک لە هۆز و تیرە و عەشیرەتەکانی عەرەب، (بەنو ئەسەد، زوولئەمر، مەقروهـ بیئر مەعونە، بووحران، بەنوو سولەیم، عەسفان، ڕەجیع) هەرچەندە هیچ ڕووبەڕووبوونەوەیەکی ئەوتۆ ڕووی نەدا، هەموو هۆز و تیرە و عەشیرەتەکان کە سوپای موسڵمانانیان دەبینی هەڵدەهاتن و جێگە و مەنزڵگەکانی خۆیان جێدەهێشت، ئەمەش وایکرد سەرلەنوێ موسڵمانان هەیبەت و هێزو ناوەندەکانی هێز بێننەوە لای دەوڵەتی ئیسلامی، سەروەری تەواوەتی بۆ موسڵمانان گەڕایەوە.

ئەو ماوەیە ئارامییەکی زۆر بە ناوچەکەوە دەبینرا، موسڵمانان هێز و ئابووریان پەرەی سەند و دەستیانکرد بە بازرگانی، موسڵمانان سوودێکی باشیان لە ئاسایشی ناوچەکە وەرگرت، قازانجی زۆر باشیان کرد لە بازرگانیکردن لە ڕێگەی شامەوە.



## جەنگی دەومەتول جەندەل

خەڵکی ناوچەی نزیک شام بەتایبەت عەرەبەکانی (غەسان) خەڵکیان بۆ جەنگ دژی موسڵمانان کۆکردەوە، ئەگەرچی نێوان مەدینە و ناوچەی عەرەبە غەسانییەکان (٤٥٠) کم بوو سوپایان لێرەو لەوێ کۆکردەوە بۆ هێرشکردنە سەر موسڵمانان، هێز و دەزگای هەواڵگری پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ خێرا زانیان بەهەوڵی عەرەبەکانی ئەو ناوچەیە، پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ سوپای ئامادەکرد کە پێکهاتبوون لە (٤٠٠) سەرباز و بەرەو ناوچەکە ڕۆیشتن، لەناوچەی زاتول ڕیقاع و پاشان دەومەتول جەندەل، هەموویان ڕایان کردو سوپای ئیسلام توانی هەوڵەکەیان شکست پێ بهێنێت و کۆتایی بێنێت بە کۆکردنەوەی هێزیان و پەرشو بڵاوی کردنەوە، ئەم سەرکەوتنە دەنگدانەوەیەکی زۆری لەنێو عەرەبدا دایەوە، دەنگی موسڵمانان لەهەموو جێگەکانی شام و فارس و ڕۆم دەبیسترا و دەوترا: دەوڵەتێکی بچووک لە ناوچەکەدا دروست بوو، بەڵام یەشتا دەنگدانەوەکە نەچۆتە ئاستی ئەوەی کە هێز و سوپای بۆ ڕێکبخرێت ترسیان لەسەر بێت دوو ئیمپراتۆریەتەکەی جیهان فارس و ڕۆم، بەڵام لەدوورەوە چاودێری دەکرێن و لێکۆڵینەوە دەربارەیان دەکرێت.



چالاکی سەربازی پێغەمبەری خوا ﷺ لە نێوان چۆڵکردنی بەنو نەزیر و جەنگی بەنو قورەیزە

لەنێو شاری مەدینەدا من دەگەڕێم و نومێرم لێ ون بووە، هەرچی دەکەم نومێرم بۆ نادۆزرێتەوە، ناچمەوە سەر ئەو ڕێگەیەی کە بەرەو دەوار و جێگاکانی ناو ئەوانم دەباتەوە، هەر بەچواردەورمدا خول دەخۆم و بەدوای نومێردا دەگەڕێم.



زۆرم برسیبوو ئاگام لە کوڕێکی گەنج بوو چووبووە سەر دارخورمایەک خورمای دەخوارد، منیش هاوارم لێکرد هەندێک خورمایش بۆمن هەڵدە، پووشێ خورمای بۆ هەڵدام، چووم هەڵمگرتەوە و دوورکەوتمەوە دەستم کرد بەخواردنی خورماکە، ماوەیەکی پێچوو کوڕە گەنجەکەم بەدەست پیاوێکی ئەنسارییەوە بینی شمشێری خستبووە سەر ملی، تومەس دزە و خورمای دزیوە، منیش وامزانی خۆی خاوەنی باخەکەیە، بەهەرحاڵ لەدوورەوە شوێنی کەوتم تا بردیە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ و پێی وت: ئەو دزەم گرتووە، خورمای دزیوە! پێغەمبەری خوا ﷺ بە پیاوەکەی وت: ئەگەر ئەو گەنجە برسی بێت و داوای خورمات لێ بکات، دەیدەیتێ؟ پیاوە ئەنسارییەکە وتی: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ دەیدەمێ، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: برۆ سکی تێر بکە با دزی نەکات، منیش لەو کاتەدا بیرم دەکردەوە کە ئەو گەنجە دزی کردووە دەستی دەبڕدرێت، بەڵام کە پێغەمبەری خوا ﷺ بەو شێوەیە مامەڵەی لەگەڵ کرد ئەو کات تێگەیشتم لە ئایەتی:

﴿وَمَآ أَرۡسَلۡنَٰكَ إِلَّا رَحۡمَةٗ لِّلۡعَٰلَمِينَ ١٠٧﴾ [الأنبياء]

لەشاری مەدینەدا گەڕام پیاوێکی کاملم لێ پەیدا بوو وتی: بەدوای چیدا دەگەڕێی؟

ماکوان: هاوڕێیەکم لێ ون بووە، خەڵکی ئەو ناوچەیەیە ناوی نومێرە، بەدوای ئەودا دەگەڕێم. پیاوەکە وتی: نومێر زۆر نەخۆشە لەسەر جێگەیە، داوای کردووە من بێم بۆ لات.

ماکوان: ئێ باشە دەبا بگەڕێینەوە بۆ لای.

پیاوەکە وتی: ئاخر نومێر لەسەر جێگایە لە ماڵی خۆیەتی لە میسر، نەک لەژێر دەوار کاروانەکەیدا.

ماکوان: ئەی تۆ کێیت، من تێگەیشتم کە ئەو گەڕاوەتەوە بۆ سەردەمی خۆی.

پیاوەکە وتی: من دۆستی نزیکی ئەوم ناوم (ڕاغیبە) تا تۆ لەو ناوچەیە بیت منیش لەگەڵتدا دەبم.

ماکوان: خۆشحاڵم بەڵام ماوەی چەند شەو و ڕۆژێکە لەم ناوەدام و ماندووم، ئەگەر بکرێت بگەڕێمەوە بۆ ژێر دەوارەکە و پشوویەک بدەم.

لەگەڵ ڕاغیب گەڕامەوە بۆ ناوچەی دەوارەکە و ماوەیەک مامەوە، دیسان داوام لە ڕاغیب کرد من بۆیە لەم ناوچەیەم تەنها بۆ گەڕانە بەشوێن ڕووداوەکانی ژیانی پێغەمبەری خوا ﷺ.



ڕاغیب: بەڵێ دەزانم، منیش وەکو تۆ بەشوێن ڕووداوەکاندا دەگەڕێم، پێشتخۆشە دەچین و تەماشای ڕووداو و ڕەوشەکە دەکەین، ئەگەر پێتخۆشبوو بەیەکەوە شیکاری بۆ دەکەین.

ماکوان: بەخۆشحاڵییەوە دەرچووین بۆ شاری مەدینە و هەرچاو دەگێڕین و لە ڕووداوەکان دەگەڕێین، لە ڕاغیبم پرسی ئێستا ڕووداوەکان چۆنە و لەکوێداین.



# هەوڵی هاوپەیمانی هۆزەکانی عەرەب

ڕاغیب: هەوڵ دەدەم باسی ڕەوشی ئێستای ناوچەکە لەڕووی سیاسی و سەربازی و ئابوورییەوەت بۆ بکەم، لە ئێستادا مونافیقەکان تا ڕادەیەک ملکەچ بوون بۆ فەرمانی پێغەمبەر و ناوێرن هیچ چالاکییەکیان هەبێت، چونکە دەوڵەت زۆر بەهێزە بەتایبەت لەدوای ڕووداوی بەدری دووەم و ڕووداوەکانی دەومەتول جەندەل.

یەهوود خەریکی چالاکین دژی موسڵمانەکان بەتایبەت ئەوانەی چوونە ناوچەی خەیبەر لەهۆزی بەنو نەزیر، بەڵام هۆزێکی تری گەورەی جوولەکە لەشاری مەدینە ماوە بەناوی بەنو قورەیزە (قريظة)، ئەوان پەیمانیان بە پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ دابوو لەسەر وەفا و عەهدی خۆیان دەمێننەوە و هیچ جۆرە سەرپێچییەک ناکەن، پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ وەکو هاوڵاتی شاری مەدینە مامەڵەی لەگەڵدا دەکردن، ئەوانیش لە هێزی موسڵمانان دەترسان.

سەرکردە سەربازییەکانی بەنو نەزیر بەردەوام لە پیلانگێڕی دابوون دژی موسڵمانان بەتایبەت (سەللامی کوڕی ئەبی حوقەیق و حوویەی کوڕی ئەختەب)، هەرگیز خێر لە یەهوود نابینی، ترسناکترین خەڵکن دژی موسڵمانان، ئەو هێز و کۆبوونەوە گەورەیەی خەیبەر لە هەوڵی زۆردابوون بۆ لەناوبردنی موسڵمانان.

قورەیش: لەدوای نەهاتنی بۆ جەنگی بەدری بچووک ترسێکی گەورەی لێنیشتبوو پاشان هەستی بە خەتەرێکی گەورە دەکرد لەسەری، دەشیزانی توانای ڕووبەڕووبوونەوەی موسڵمانانی نییە.

لەلایەکی تریشەوە بازرگانی لە ڕێگەی شامەوە بەتەواوی وەستابوو، لەدوای دروستبوونی دەوڵەتی ئیسلامی لەشاری مەدینە، لەهەمان کاتدا ئەو هۆز و عەشیرەتانەی لەدەوری شاری مەدینەدا بوون هەستیان بەخەتەر و دڵەڕاوکێ دەکرد لەسەریان، نموونە هۆزی: (غەتەفان، بەنی سولەیم، هوزەیل و بەنی لەحیان) ئەو هۆزانە بوون کە غەدریان لە موسڵمانان کردبوو لەبیری مەعونە و ڕەجیع لەگەڵ هۆزی بەنی فیرارە کە تیرەیەک بوون لە هۆزی بەنی سولەیم، سەرکردەکەیان بەناوی (عەیینیەی کوڕی حوسەین) هەموو ئەمانە هێز کۆدەکەنەوە دژی موسڵمانان هەموو ئەوانەی باسم کرد کار بۆ نەهێشتن و لەناوبردنی موسڵمانان دەکەن بەگشتی.



# ڕۆڵی یەهوود لە دروستکردنی هاوپەیمانی

ڕاغیب: لە ڕابردوودا موسڵمانان کە جەنگیان دەکرد لەگەڵ هێزێک یاخود دوو هێزدا جەنگ دەکرا، عەرەب هەرگیز کۆنەبوونەوە جەنگ بکەن، چونکە هەموو عەشیرەت و هۆز و تیرە بوون، لەناو عەرەبدا هەرگیز نەبیستراوە هەموو بەیەکەوە جەنگ بکەن، لەمێژووی عەرەبدا تەنها یەک جار یەکیان گرتووە دژی فارس، عەرەب لەو جەنگەدا سەرکەوت ئەویش ناوی جەنگی زیقاڕ بوو، بێجگە لەوە عەرەب هەمیشە لە بەرژەوەندی هۆز و تیرە و عەشیرەتەکەی خۆی کاری کردووە، بیری لە دامەزراندنی دەوڵەت و ئیمپراتۆرییەت نەکردۆتەوە.

بەڵام وا هەموو عەرەب بەنیازی هاوپەیمانین دژی موسڵمانان ئەمەش زۆر ترسناکە بۆ سەر دەوڵەتی ئیسلامی، لەهەمان کاتدا زۆر نامۆیە، بەڵام ئەوەی بەکارەکە هەڵسا و ڕۆڵی سەرەکی تێدا بینی بریتی بوو لە یەهوود. لەگەڵ ئەوەی خۆی بەشداری جەنگ نەبوو، بەڵام ڕۆڵی سەرەکی بۆ یەکگرتنی عەرەب دژی موسڵمانان یەهوودی خەیبەر بوو.

ماکوان: ڕاغیبی برام بڕوا بکە لەسەردەمی پێغەمبەر ﷺ تا ئەم سەردەمەش من تێیدا دەژیم ئەوە کاری یەهوودە، لە ئێستادا ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بەکار دەهێنێت دژی هەموو ئەوانەی کە دوژمنی یەهوودن، خۆیشی لەدوورەوە تەماشا دەکات.

ڕاغیب: بەڵێ وایە، زۆر لێزان و پرۆفیشناڵن لەو کاتەدا یەهوود بەگشتی لەجەنگی عێراق و ئەفغان و خوارووی سوودان و هاندانی ڕووسیا بۆ لێدانی چیچان، زۆری تر بەگشتی لە پیلانی یەهوود و سەهیۆنییەتە.

کۆمەڵێک لە سەرکردەکانی یەهوودی خەیبەر و بەنی نەزیر دەرچوون بۆ هاندانی هەموو هۆز و تیرە و عەشیرەتەکانی عەرەب، سەرەتا چوونە لای قوڕەیش وەفدی یەکەمیان بۆ لای ئەوان بوو چونکە دوژمنی سەرەکی موسڵمانانن. هانی قوڕەیشیاندا بۆ جەنگ، ئاگاداری قوڕەیشیان کردەوە ئەمجارە ئێوە بەتەنها لەگەڵیان ناجەنگن، بەڵکو هەموو هۆزەکانی عەرەبتان لەگەڵدایە، بۆیە ناونرا بە جەنگی حیزبەکان (الأحزاب) واتە: جەنگی هەموو بەشەکانی عەرەب دژی موسڵمانان، قوڕەیش دەستی کرد بە کۆکردنەوەی چوار هەزار سەربازو سوپای ڕێکخست.

دوای قوڕەیش وەفدەکەی یەهوودی خەیبەر و بەنو نەزیر چوون بۆ لای هێزی (غەتەفان)، ئەگەرچی ئەو هۆزە زۆر زۆر بوون لە سەرمایەی مرۆڤ، بەڵام لە موسڵمانان دەترسان. یەهوود هانیدان بەوەی ئەگەر جەنگ لەگەڵ موسڵماناندا بکەن بەروبوومی ساڵێک لە



کوشتوکاڵی خەیبەریان پێدەدات، سەرۆکەکەیان پێشتر پەیمانی لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ بەستبوو، بەڵام کە باسی بەروبوومی خەیبەر کرا خێرا پەیمانی شکاند و ئامادەیی جەنگی لەگەڵیان دەربڕی، سەرۆکەکەیان بەناوی: (عویینیەی کوڕی حوسەین) بوو، چونکە خەیبەر زۆر دەوڵەمەند بوو لەهەموو بوارەکانی بەروبووم.

غەتەفان کە زانییان پارەی تێدایە شەش هەزار لەوان ئامادەبوون بۆ جەنگ بەپارەی یەهوودی خەیبەر، جوولەکە ئەو هەموو پارەیدا بۆ لەناوبردنی موسڵمانانان. هەموو کۆمەڵەکان کۆبوونەوە کە ناونران بە (الأحزاب)، ١٠ هەزار سەربازییان کۆکردەوە بۆ سەر موسڵمانان.

ئەم هەواڵە ترسناکە گەیشتە شاری مەدینە، ژمارەیەکی یەکجار زۆر ئەوەندەی شاری مەککە خەڵکیان کۆکردەوە، لەو سەردەمەدا ئەگەر عەرەب (١٠٠٠) کەسی کۆکردبایەتەوە شانازی پێوە دەکرد، بەڵام ئەم ژمارە زۆرە بۆ سەر موسڵمانان! ئایا موسڵمانان چۆن ڕووبەڕوویان دەبنەوە؟ کە هەواڵەکە گەیشتە ئیمانداران تەنها ئیمانیان زیادی کرد زانیان کە کوفر یەک میللەتن، بۆیە ئیمان و خواناسیان زیاتر بوو لەجاران!

خوای پەروەردگار لەبارەیانەوە دەفەرمووێت:

﴿وَلَمَّا رَءَا ٱلۡمُؤۡمِنُونَ ٱلۡأَحۡزَابَ قَالُواْ هَٰذَا مَا وَعَدَنَا ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥ وَصَدَقَ ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥۚ وَمَا زَادَهُمۡ إِلَّآ إِيمَٰنٗا وَتَسۡلِيمٗا ﴿٢٢﴾﴾ [الأحزاب]

واتە: کاتێک ئیمانداران ئەو هەموو دەستەو گرووهەیان بینی وتیان: ئەمە ئەوەیە کە خوا و پێغەمبەرەکەی ﷺ هەواڵی پێداوین، دیارە کە خوا و پێغەمبەرەکەی ﷺ ڕاستیان فەرموو لەپێش هاتنیدا، بێگومان ئەو دژایەتییە باوەڕ و ملکەچی نەبێ هیچی تری بۆ زیاد نەکردن.

پێشتر خوای پەروەردگار ئاگاداری کردبوونەوە کە لە دژیاندا هاوپەیمانی دەبەسترێ ئەوانیش وتیان: خوا و پێغەمبەری خوا ﷺ ڕاستیان کرد، خوای گەورە وەعدی سەرکەوتنی پێدان. ئەو هەواڵە ترسناکترین هەواڵ بوو لەژیانی شاری مەدینە و دەوڵەتی ئیسلامیدا ١٠هەزار کەس بۆیان کۆبوونەتەوە، بەڵام موسڵمانان زوو وەریان گرت و قورئان و پێغەمبەرەکەیان هەبوو دەیانزانی خوای گەورە لەپشتیانە و دەستیان لێ بەرنادا.

لەلایەکی دیکەوە دووڕووەکانی شاری مەدینە ئەژنۆیان شکا، خێرا وتیان چۆن دەتوانین ڕووبەڕووی ئەو هەموو سوپا زۆرە ببینەوە، خوای پەروەردگار لەبارەیانەوە دەفەرمووێت:



﴿وَإِذۡ يَقُولُ ٱلۡمُنَٰفِقُونَ وَٱلَّذِينَ فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٞ مَّا وَعَدَنَا ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥٓ إِلَّا غُرُورٗا﴾ [الأحزاب]

واتە: کاتێکیش دووڕووەکان ئەوانەی دڵیان نەخۆشی گومانی تێدابوو دەیانوت: بەڵێنی خوا و پێغەمبەرەکەی تەنها بۆ خەڵەتاندن بوو، هیچی تر نەبوو.

ئیتر دووڕووەکان هەر لەسەرەتاوە بڕیاریاندا لەپاڵ موسڵماناندا نەجەنگن، چونکە بڕوایان بەخوا نییە تا سەرکەوتنیان بەنسیب بکات، لەڕاستیدا ترسناکترین خەڵکن لەسەر ئەو ئوممەتی ئیسلامیی، هیوا و ئاواتیان ئەوەیە موسڵمانان لەناو بچن، لەناو شاری مەدینەدا نەمێنن.

بەڕاستی موسڵمانان دوچاری بەڵا و موسیبەتێکی دیکە بوونەوە، دەبێ خۆیان بۆ جەنگکردن لەگەڵ دە هەزار زاڵم و موشریک و کافر ئامادە بکەن کە بەخوێنی سەریان تینوون.

خۆ ئەگەر خۆیان بگرن و ئارام بگرن لەم قەیرانەدا دەردەچن، ئەستەمە هیچ هێزێکی دیکە بتوانێ ڕووبەڕوویان ببێتەوە، دەبنە خاوەنی سیادە و سەروەری و قسە ڕۆیشتوو دەبن لەناو هەموو عەرەبدا.

ماکوان: لەگەڵ ڕاغیب دا هەڵاوێردی باسەکانمان دەکرد لەگەڵ ڕەوشەکەدا، بەداخەوە منیش گەڕامەوە بۆ زیندانی خاچپەرستانی ڕۆم لە ئیتاڵیا، بەیانی بوو بەدەنگی مامۆستا کرێکار بەخەبەر هاتم بانگی بەیانی دەفەرموو. لەژووری زیندانەکەمەوە هەڵسام بۆ نوێژ، بەڵام زۆر خەفەتبار بووم، سەرەتا بۆ گەڕانەوەم لەناو گەرموگوڕی ڕووداوەکان، ئاگام لەنومێر نەبوو چی بەسەرهاتووە هەمووی ڕۆژێک بوو ڕاغیبم ناسیبوو. وەکو هەموو ڕۆژانی دیکەی زیندان ژیانمان بەسەر دەبرد بەخوێندنی قورئان و پیاسەی حەوشە و ئەوەی ڕۆتیناتی زیندانە.

باقی ڕووداوەکان لە بەرگی سێیەم دەخوێنییەوە.



# پێرست




جەنابتان کتێبی موعجیزەتان وەک یادگارییەک بۆ ئێمە بەجێهێشت، بەڵام چیمان لێکرد...

خستمانە پەڕۆیەکی سەوز و لەسەر تاخچەکانمان دامان ناوە، یان کاتێک ئازیزێکمان لێ دەمرێت بۆی دەخوێنین. موعجیزەت بۆ ئێمە بەجێهێشت تا بیخوێنینەوە، بیری لێبکەینەوە و ڕێگایەک بدۆزینەوە، بەڵام ئێمە تەنها خوێندمانەوە و تەواومان کرد و پەیامەکەتمان پێنەگەیشت، ئێمە لە ئەرکی تۆ تێنەگەیشتین و ڕێگاکەمان ون بوو، ئێمە موعجیزەیەکی هێندە گەورەمان بەدەستەوەیە کە ئەگەر ئایینی تر هەیانبوایە چییان بەم موعجیزە نەدەکرد، بەڵام ئێمە؟



کتێبخانەی حاجی قادری کۆیی

لقی یەکەم: بەرامبەر دەرگای قەڵا - بازاڕی ڕۆشنبیری
لقی دووەم: چوار ڕیانی شێخ مەحمود بەرامبەر مزگەوتی محمود عەلاف

٠٧٥٠٤٦٧١٣٩٤ - ٠٧٨٢٤٦٧١٣٩٤ /M.Ktebxana نرخ: ٣٠٠٠٠




Design: Braw Al-Najjar